خالد حوسێنی

# هزار رۆژێن گەش

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی
دیان جەمیل



# هزار ڕۆژێن گەش

خالد حوسێنی

- ناڤێ پەرتووکێ ب ئینگلیزی: A thousand splendid Suns
- وەرگێڕان ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: رەمەزان عەبدوللا
- دیزاینا بەرگی: فەرسەت زوبێر
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل
- بابەت: ڕۆمان

ل ڕێڤەبەریا کتێبخانێن گشتی ل پارێزگەها دهۆکێ ژمارا سپاردنێ (D- /2232/18) یا سالا 2018 پێ هاتیەدان

# 1

ژیێ مەریەمێ پێنج سال بوون دەمێ بۆ یەکەم جار گوهـ ل پەیڤا "بیژی" بووی.

ئەڤ چەندە ژی ل ڕۆژا پێنج شەمبی بوو. چ پێ نەڤێت دێ ئەو ڕۆژ بیت، چونکی باش بیرا وێ دهێت ل وێ ڕۆژێ ئەو یا نەئارام و پۆسیدە بوو. هەلبەت ئەڤ هەستێن نەخوش ب تنێ ل ڕۆژێن پێنج شەمبیان ل دەڤ وێ دووبارە دبوون، ئانکو ل هەمان وێ ڕۆژا جەلیلی ژ بۆ دیتنا وێ سەرەدانا وێ ل کولبەی* دکری.

ژ بۆ بوراندنا دەمێ خوە هەتا بابێ وێ دگەهیت، وێ پیاسە دناڤ وی گیایی دا دکرن یێ دگەهشتە سەر چوکێن وێ و دلڤلڤی.

ل دووڤ دا مەریەم چوو سەر کورسیەکێ و ب شاشی ڤە دەستێ وێ ب سێتێ قوریك و فنجانێن چینی کەفت و هەموو ل ئەردی دان. ئەڤ سێتە بیرهاتنەکا پیرۆز یا دایکا وێ "نانا"یێ بوو کو هێشتا ژیێ وێ ژی دوو سال بوون دەمێ دایکا وێ وەغەر کری ئەڤ سێتە بۆ وێ مابوو.

نانایێ گرنگیەکا مەزن ددا پارچەیێن فەیفوری یێن شین و سپی، وێنەیێن ب دەستی هاتینە کێشان، گول بەیبین و ئەژدەهایێ ل سەر شەکردانکێ کو ل دەڤ وێ هێمایێ بەرهنگاربوونا خراپیێ بوو.

پارچەیا دوماهیێ ژ دەستێ مەریەمێ کەفت و کەفتە سەر فەرشێ داری یێ مالێ و شکەست. دەمێ نانایێ دیتی شەکردانکا وێ پرت پرت بوو، دێمێ وێ سۆر بوو و لێڤا وێ یا سەری لەرزی و ب هەردوو چاڤێن خوە، کو یەك یێ لاواز بوو و یێ دی تا ڕادەیەکی یێ باش بوو، ب ناڤچاڤگرێ ڤە تەماشەی مەریەمێ کر بێی کو مژیلانکێن خوە بلڤلڤینیت.

پیچەك مابوو دا نانا دین بیت، ل وی دەمی مەریەم ژی گەلەك ترسیا ژبەرکو هزرکر جارەکا دی ئەهریمەن دێ چیتە دناڤ گیانێ دایکا وێ دا و دێ تۆڕەبیت و وێ قوتیت، لێ ڤێ

* کولکێ ئاخێ یێ بێ سەروبەر.

جارێ ئەهریمەن نەچوو دناڤ گیانێ وێ دا بەلکو نانایێ هەردوو زەندکێن وێ گرتن و نێزیکی خوە کر و ب تۆڕەیی ڤە گوتێ: "تو کچەکا بیژی یا بێ ئاقلی، ئەرێ ئەڤە پاداشتێ وان نەخوشیێن منە یێن چەندین سالە ئەز خوە ل بەر دگرم، هەی بیژیا بێ ئاقل."

ل وی دەمی، مەریەم د چ تشتان نەدگەهشت و نەدزانی کا ڕامانا پەیڤا بیژی چیە، هەروەسا نەگەهشتبوو ژیەکێ هۆسا کو تێبگەهیت نەدادپەری ل بەرامبەر وێ دهێتە کرن، ژبەرکو د ڕاستی دا پێدڤیە ئەو کەسێ بوویە ئەگەرێ ئافراندنا زارۆیەکا بیژی بهێتە تاوانبارکرن نەك ئەو زارۆك ب خوە.

ب وی شێوازێ دایکا وێ ئەڤ ئاخفتنە دگوتین، مەریەم تا ڕادەیەکی تێگەهشت کو بیژی تشتەکێ پیس و کرێت و نەخوشتڤی یە. ب دیتنا وێ یا سادە ڕەنگە بیژی جورەکێ مێشوموران بیت وەك کولییێن زیانبەخش یێن کو هەموو گاڤان نانایێ نەفرەت لێ دکرن و ب گێسکا ژ خانی دکرنە دەرێ.

پشتی هینگێ دەمێ مەزن بووی، تشتێ مەریەم پتر پێ خەمگین دبووی، شێوازێ گوتنا ڤێ پەیڤێ بوو ژ لایێ دایکا وێ ڤە پتر ژ ڕامانا پەیڤێ ب خوە، ژبەرکو هەر گاڤا دایکا وێ ئەڤ ناڤە دگوتییێ هەروەکو دا بێژی یا تفەکێ دکەتە ناڤ چاڤێن وێ.

ئێدی مەریەم تێگەهشت کا مەرەما دایکا وێ ژ ڤێ پەیڤێ چیە. ئەوێ زانی بیژی کەسەکا نەخوشتڤی یە ل دەڤ هەموو کەسان. ژبەرکو مەریەم کچەکا بیژی یە، کەواتە ئەو زارۆکەکا نە شەرعی یە و مافێ بدەستڤەئینانا وان تشتان نینە یێن زارۆکێن دی بدەستخوەڤە دئینن وەك حەژێکرن و مال و خێزان و پەسەندکرنێ ژ لایێ جڤاکی ڤە.

بابێ وێ، جەلیلی، چ جاران ئەڤ پەیڤە نەدگوتە کچا خوە بەلکو وی هەموو گاڤان دگوتێ گولا من یا بچووك. وی کچا خوە دکرە د کوشا خوە دا و چیرۆك و سەرهاتی بۆ ڤەدگێڕان وەك سحبەتێن وی ل سەر باژێرێ "هێرات"ێ کو ئەو باژێر بوو یێ مەریەم ل سالا 1959 لێ هاتیە سەر دنیایێ، ئەو باژێر لاندکا شارستانیەتا فارسی و وەلاتێ نڤیسەر و نیگارکێش و سۆفیان بوو.

بابێ وێ ب کەنی ڤە گوتێ: "تو نەشێی خۆ پێنگاڤەکێ ب هاڤێژی ئیلا دێ پێ تە ب پشتا هوزانڤانەکی کەڤیت."

جەلیلی سەرهاتیا شاهژن "گەوهەر شاد"ێ بۆ وێ ڤەدگێڕا ئەوا کو هژمارەیەکا مەزن یا منارەیێن بلند و ناڤدار ل چەرخێ پازدێ زاینی ئاڤاکرین وەك نیشانەك ل سەر حەژێکرنا وێ ژ بۆ باژێرێ هیراتێ. هەردیسان وی بەحسێ زەڤیێن گەنمی یێن کەسك یێن هیراتێ و بیستان و کەپرێن تری و بازارێن پڕی قەرەبالغ یێن باژێری بۆ دکر.

ڕۆژەکێ جەلیلی گوتێ: "ل هیراتێ دارەکا پیستاکیو* هەیە و ب ڕەخ دارێ ڤە گۆڕێ هوزانڤانێ مەزن "جافی" لێ هەیە. ئەڤ هوزانڤانە بەری پێنج سەد سالان یێ ژیای، جارەکێ من تو بربوویە بن وێ دارێ لێ هینگێ تو گەلەك یا بچووك بووی ژبەر هندێ نوکە بیرا تە لێ ناهێت.

ب ڕاستی ژی بیرا مەریەمێ ل وێ دارێ نەدهات  هەرچەندە ئەو د ژیانا خوە یا بهێت دا دێ بۆ ماوەیێ پازدە سالان ل باژێرێ هیراتێ ژیت لێ ئەو ب چ ڕەنگان وێ دارێ نابینیت، هەروەسا ئەو وان منارەیێن ناڤدار ژ نێزیك ژی ڤە نابینیت و چ فێقیان ژ بیستانێن هیراتێ ناکەت و بخوت و دناڤ زەڤیێن گەنمی یێن کەس دا پیاسەیان ناکەت.

سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ ژی دەمێ جەلیلی ئەڤ سحبەتە بۆ مەریەمێ دکرن، وێ ب کەیف و خوشیەکا مەزن ڤە گوهداریا وی دکر و گەلەك ب وی یا داخبار بوو ژبەر زانین و ئاشنابوونا وی یا بەرفرەهـ دگەل جیهانێ. مەریەمێ شانازی ب خوە دبر کو وێ بابەکێ هۆسا زانا و ڕەوشەنبیر هەیە.

پشتی جەلیل ژ دەڤ مەریەمێ چووی، نانایێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "ئاخ بۆ درەوێن وی یێن مەزن، چ پێنەڤێت زەلامەکێ وەکو وی یێ زەنگین دێ درەوێن مەزن ژی کەت."

هەروەسا وێ بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "وی چ جاران تو نەبریە گەڕیانان و چ دار ژی نیشا تە نەداینە، نەهێلە ئەو تە ب درەوێن خوە د سەردا ببەت. بابێ تە ئەوێ ل دەڤ تە گەلەك یێ خوشتڤی، ئەم بجهـ هێلاین و هاڤێتینە کولانان. وی ئەم ژ خانیێ خوە یێ مەزن کرینە دەرێ هەروەکو مە چ بهایێ خوە ل دەڤ وی نەی. وی ئەڤ چەندە ب نیڤا دلێ خوە کر و یێ ب ڤی کارێ خوە کەیخوش و بەختەوەر بوو.

---

* جورەکێ دارێن ژی درێژە کو بۆ ماوەیێ چەندین سالێن درێژ دژیت و خوە لبەر کاودانێن ژینگەهێ یێن دژوار و هشك دگریت، شێوێ وێ وەکو یێ دارا فستەقێ یە.

مەریەمێ ب گومان ڤە گوهداریا پەیڤێن دایکا خوە دکر لێ ب چ ڕەنگان ئەو وێرەکی نەبوو د بەر وێ ڕا باخڤیت و بێژیتێ هۆسا ب خڕابی بەحسێ بابێ من نەکە.

د ڕاستی دا، مەریەم دگەل بابێ خوە ڤەت هەست ب هندێ نەدکر ئەو کچەکا بیژی یە. ل هەموو ڕۆژێن پێنج شەمبیان بۆ ماوێ دەمژمێرەکێ یان دوو دەمژمێران دەمێ جەلیل دهاتە سەرەدانا وێ، گەلەك دیاری دگەل خوە بۆ وێ دئینان و سەرەدەریەکا نەرم و پڕی ڤیان و حەژێکرن دگەل وێ دکر، ژبەر هندێ مەریەمێ هەستپێدکر ئەو ژ هەژی هەموو وێ جوانی و مەردینیێ یە یا ژیان پێشکێشی وێ دکەت، هەردیسان هەر ژبەر ڤێ چەندێ وێ گەلەك حەز ژ جەلیلی دکر.

★★★

جەلیلی سێ هەڤژین و نەهـ زارۆك هەبوون و هەموو ژی زارۆکێن شەڕعی بوون، لێ مەریەمێ خۆ یەك ژ وان نەدنیاسی و بۆ وێ وەکو کەسێن بیانی بوون.

جەلیل یەك بوو ژ زەنگینێن باژێرێ هیڕاتێ و خودانێ هۆلەکا سینەمایێ بوو. هەرچەندە مەریەمێ چ جاران ئەو هۆل نەدیتبوو لێ وێ دزانی سەروبەرێ وێ یێ چەوایە، چونکی جەلیلی ب درێژاهی بەحسێ وێ هۆلێ بۆ مەریەمێ کربوو.

وێ دزانی کو پێشیا وێ هۆلێ ژ کاشیێن شین و برۆنزێ ڤەهوای هاتیە دروستکرن و هندەك بەلەکونێن تایبەت هەنە زێدەباری بن بانەکێ داری یێ جوان، دوو دەرگەهێن مەزن ژی ژ هەردوو لایان ڤە ڤەدبن و بەرەڤ هۆلێ ڤە دهێن کو پوستەرێن فلمێن هندی ل سەر پارچەیێن شووشەیێن ڕوهن و تەنك هاتینە بەرچاڤ کرن.

هەروەسا بەری هینگێ ڕۆژەکێ جەلیلی گوتبوویێ ل ڕۆژێن سێ شەمبی زارۆك ئایس کریمان بێ بەرامبەر ل کوژیێ فرۆتنێ وەردگرن.

نانایێ ب دەنگەکێ بلند کرە کەنی دەمێ وێ گوهـ ل ڤان ئاخفتنێن جەلیلی بووی، لێ شیا خوە نەئاخڤیت هەتا ئەو ژ وێرێ چووی ژ نوو ب کەنی ڤە گوت: "زارۆکێن بیانی بێ بەرامبەر ئایس کریمان وەردگرن، لێ کا بێژە من مەریەم تە چ تشت ژ بابێ خوە وەرگرتیە؟ ب تنێ گوتگوك ل دور ئایس کریمان"

ژ بلی سینەمایێ، جەلیلی پارچەیێن ئەردی ل هەردوو گوندێن "کاروك" و "فەرەهێ" هەبوون کو نێزیکی باژێرێ هیڕاتێ بوون. زێدەباری سێ کۆگەهێن جهنڤێژکان و دکانەکا جلوبەرگان و ترۆمبێلەکا ژ جورێ بویك ڕودماستەرا ڕەش مودێل 1956.

هەروەسا ئەو یەك ژ زەلامێن خودان دەستهەلات و پەیوەندی بوو ل باژێرێ هیڕاتێ، چونکی ئەو هەڤالەکێ نێزیك یێ سەروکێ باژێرڤانییێ و پارێزگەرێ هیڕاتێ بوو. وی دناڤ مالا خوە دا زادلێنەر و شۆفێر و سێ خزمەتکار هەبوون.

نانا ژی یەك بوو ژ خزمەتکارێن دناڤ مالا وی دا کاردکر تا وی دەمێ زکێ وێ مەزن بووی. دەمێ ئەڤ چەندە ڕوودای، دەنگوباسێ هەتکبەریا خێزانا جەلیلی هەتا دەرڤەی باژێرێ هیڕاتێ ژی چوو، ژبەر هندێ کەسوکارێن هەڤژینێن وی گەلەك تۆڕەبوون و سوز دا خوین بهێتە ڕێژتن ئەگەر ب زووترین دەم ئەڤ ئاریشە نەهێتە چارەسەکرن. هەڤژینێن وی ژی داخواز ژێ کر نانایێ ژ مال بکەتە دەرێ.

بابێ نانایێ ژی کو پەیکەرتاشەکێ بەلەنگاز بوو و ل نێزیکی گوندێ "گول دامان" دژیا، دەمێ گوهـ ل دەنگوباسێ دووگیانبوونا کچا خوە ژ جەلیلی گوهلێبووی، حاشاتی ژ کچا خوە کر و کەلوپەلێن خوە لێکدان و سوواری پاسەکێ بوو و چوو ئیرانێ، پشتی هینگێ کەسێ ئەو نەدیتبوو و چ دەنگوباس ژی ژێ نەزانیبوون.

ڕۆژەکێ سپێدی زوو دەمێ نانایێ ژ دەرڤەی مالێ خوارن ددایە مریشکان، گوت: "هندەك جاران، ئەز خوزیان ڕادهێلم و دبێژم خوزی بابێ من ئەو وێرەکی هەبایە کێرکا خوە خوشکربایە و کارەکێ ب شەڕەف کربایە و ناموسا خوە پاقژ کربایە. ڕەنگە ئەڤ چەندە بۆ من ژی گەلەك باشتر بایە."

پاشی وێ مستەکا دی یا دانودکاکی کرە د کوپەکی دا و ل جهێ خوە ڕاوەستیا و تەماشەی مەریەمێ کر و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "ئەڤ کارە دا بۆ تە ژی باشتر بیت، ژبەرکو دا بیتە ئەگەر وێ خەمێ ژ تە دوور بکەت دەمێ تو دزانی کا تو ب دروستاهی کی و چەوا پەیدابوویە. لێ ب ڕاستی ژی ئەو کەسەکێ ترسنوك بوو، وێرەکی و دلێ هندێ نەبوو."

هەروەسا جەلیلی ژی ئەو وێرەکی نەبوو کارەکێ هۆسا بکەت و ل بەر سینگێ خێزان و هەڤژین و کەسوکارێن خوە براوەستیت و بەرپرسیاریا کارەکێ ب ڤی ڕەنگی بێخیتە د ستوییێ خوە دا. ل شوونا ڤێ چەندێ و ل پشت دەرگەهێن گرتی، وی هەر زوو چارەسەریەکا

ب لەز بۆ هەتکبەریا خوە دیت. ل ڕۆژا پاشتر وی داخواز ژ نانایێ کر کەلوپەلێن خوە ژ ژوورا خزمەتکاران کوم بکەت کو بەری هینگێ تێڤە دژیا، پاشی دەستێ وێ گرت و ژ مال کرە دەرێ.

وێ گوت: "تو دزانی وی چ گوتە هەڤژینێن خوە داکو بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت؟ وی گوتبوویێ کو من خورتی یا ل وی کری و خوە هاڤێتیە سەر کەلەخێ وی و داخوازا کریارا سێکسی ژێ کریە، هەروەکو ئەڤ چەندە خەتاییێن من بوون. تە زانی نوکە؟ ئاها ئەڤە ڕامانا وێ چەندێ کو ل ڤێ جیهانێ تو ژن بی."

نانایێ ئەو کوپێ خوارن پێ ددا مریشکان دانا ئەردی و ب تبلێن خوە ئەرزینکا مەریەمێ گرت و گوتێ: "باش تەماشەی من بکە، مەریەم."

مەریەمێ نە ژ دل سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی وێ کر.

نانایێ گوت: "کچا من دڤێت هەر ژ نوکە تو ڤێ چەندێ باش بزانی. هەروەکو کا چەوا هەموو گاڤان بەرێ دەرزیا قیبلەنمایێ بەرەڤ ئاڕاستەیێ باکوری ڤەیە، ئاها هۆسا هەموو گاڤان تبلا زەلامی ژی ئاماژێ دکەتە ژنێ داکو وێ گونەهبار بکەت، بلا ئەڤ چەندە باش ل بیرا تە بیت."

# 2

"ل دەڤ جەلیلی و هەڤژینێن وی ئەز وەکو ڕهێن ژەهراوی یێن گیایێ موگورتی بووم، هەروەسا تو ژی، دەمێ هێشتا تو ژدایك نەبووی ژی تو یا هۆسا بووی"

مەریەمێ پرسیار کر : "ئەرێ موگورت چیە؟"

نانایێ بەرسڤ دا: "گیایەکێ زیانبەخشە، گەلەك جاران مرۆڤ ڕهێن وی ژ بنی دهەلکێشیت و دهاڤێتە لایەکێ دی."

مەریەم د دلێ خوە دا خەمگین بوو، چونکی جەلیلی چ جاران هۆسا سەرەدەری دگەل وێ نەدکر کو ئەو وەکو گیایەکێ زیانبەخش بیت، نەخێر ئەوی چ جاران ئەڤ چەندە ژی نەگوتیە وێ، ژبەر هندێ مەریەمێ هزرکر بۆ وێ باشترە بەرسڤا دایکا خوە نەدەت و خوە ل سەر ڤێ نەڕازیبوونێ بێدەنگ بکەت.

"بەروڤاژی گیایێ زیانبەخش، پێدڤی بوو ئەو من ل جهەکێ دی یێ باش بچینیت، تو تێدگەهی مەریەم؟ پێدڤی بوو هەر چ نەبیت ژبەر تە، وی ئاڤ و خوارن دابایە من، لێ ئەو دگەل خێزانا خوە ڕێکەفت کو من و تە ژ مال بکەنە دەرێ."

نانایێ دیارکر کو ئەو ب خوە ژی ڕازی نەدبوو ئێدی ل باژێرێ هیراتێ بژیت.

"تو زانی بوچی ئەز ڕازی نەبووم؟ من نەدڤیا ئەز ڕۆژانە زێرەڤانیا وی بکەم و ب چاڤێن خوە ببینم دەمێ ئەو هەڤژینێن خوە ل ترۆمبێلێ سووار دکەت و ل ناڤ باژێری دگێڕینیت."

هەروەسا نانایێ دیارکر کو وێ ب خوە نەدڤیا ل مالا بابێ خوە یا ڤالاڵ ل گوندێ گول دامان بژیت، ئەو خانیێ بێسەروبەر یێ ل سەر گرەکێ تیژ و نێزیکی دوو کیلومەتران ژ باژێرێ هیراتێ دوور. وێ دڤیا ل جهەکێ ڤەدەر و دووری مرۆڤان بژیت داکو جیران هەموو گاڤان تەماشەی زکێ وێ نەکەن و ئاخفتن و گوتنێن کرێت د دەرحەڤا وێ دا نەبێژن یان ژی ب دلوڤانیەکا سەختە و درەو سەرەدەریێ دگەل نەکەن.

نانایێ گوت: "باوەر بکە خوشتڤیا من، بۆ بابێ تە گەلەك خوشتر بوو کو مە ژ مالێ بکەتە دەرێ و ئەم ژ وی دوور بکەڤین، ئەڤ چەندە بۆ وی گەلەك یا گونجایی بوو."

موحسنی، کورێ جەلیلی یێ مەزن ژ هەڤژینا وی یا یەکێ خەدیجایێ، پێشنیارکر ئەم ل جهەکێ ڤەدەر بژین و ئەو جهە ژی ل دەوروبەری گوندێ گول دامان بوو. هەتا مرۆڤ دگەهیتە ڤی جهی، نەچار دبیت رێکەکا ئاسێ و پری کەند و کور بەرەڤ گری ببڕیت کو رێکەکە ژ رێکا سەرەکی یا دناڤبەرا هیرات و گول دامانێ دا ڤەدبیت. ل هەردوو لایێن ڤێ رێکێ گەلەك گیاییێن درێژ و بلند هەنە و هەتا سەر چوکێن مرۆڤی درێژ دبن و گولێن سپی و زەرێ تەیسوك پێڤە هەنە.

ئەڤ رێکە هەتا سەرێ گری گەلەك یا خواروڤیچ بوو هەتا دگەهشتیە سەری، ژ نوو زەڤیەکا راست و پری دار چنارێن بلند و زەڤیەکا پەمبی کو ب شێوەیەکێ بوش و چڕ ل وان جهان شین ببوون.

ل سەرێ ڤی گری، مرۆڤ دشێت پەروانێن ژەنگی یێن ئاشێن بایی یێن گوندێ گول دامانێ ببینیت. هەروەسا ل لایێ چەپ و لایێ راستێ ژی دیمەنێ باژێرێ هیراتێ دکەفتە پێش چاڤێن مرۆڤی. ئەڤ رێکە ب شێوەیەکێ ستونی بەرەڤ رووبارەکێ ئاڤێ ب دوماهی دهات کو یێ پڕبوو ژ ماسیێن سەلەمون، ئەڤ رووبارە ب خو ژی ژ بنارێ چیایێ "سافید کوخ" دزا و ل دورماندوری گوندێ گول دامان دا درێژ دبوو.

ب دووراتیا نێزیکی دووسەد دونەمان بۆ ئاراستەیێ چیایی، دارستانەکا شێوە بازنەیی یا پری دار چناران لێ هەبوو، لێ نیڤەکا ڤێ دارستانێ و ل بن سیبەرا ڤان داران ئەرد یێ ڤالا بوو چ تشت لێ شین نەببوون.

پاشی نانایێ گوت: "بابێ تە جەلیل چوو ناڤ وێ دارستانێ داکو بزانیت چ لێ هەیە، دەمێ زڤری، هۆسا دئاخفت دا بێژی ئەو گەلەك گرنگیێ ب پاقژیا دیوار و فەرشێ رائێخستنێ یێ زیندانا خوە ددەت، ب ڤی رەنگی ئەوی ئەڤ کونا مشك و جردان بۆ مە ئاڤاکر."

***

دەمێ ژیێ نانایێ پازدە سال، ئەو خواستیا گەنجەکی بوو ل گوندێ "شەنداند" و کارێ فرۆتنا بەبەغایان دکر. مەریەمێ ئەڤ چیرۆکە ژ دایکا خوە گوهلێبوو. دەمێ وێ

تەماشەی چاڤێن دەیکا خوە دکرین، ژ ئاورینێن چاڤێن وێ یێن خەمگین بۆ وێ دیاربوو کو ل وی دەمی دایکا وێ گەلەك یا کەیفخوش و بەختەوەر بوو. ڕەنگە دەمێ ئەو د ڕۆژێن نیشانیا خوە دا دبوری، ئەو بۆ جارا یەکێ بیت وێ هەست ب بەختەوەریێ کربیت.

دەمێ نانایێ ئەڤ چیرۆکە بۆ مەریەمێ ڤەدگێڕای، مەریەم چوو د کوشا وێ دا و دیمەنێ دەهواتا دایکا خوە ئینا پێش چاڤێن خوە دەمێ کراسەکێ سپی دکریە بەر خوە و ل سەر هەسپەکی یا سووار بووی و ب شەرمینی ڤە ل بن عەبایەکێ کەسك دگرنژی. هەردوو دەستێن وێ ژی ب خەنایێ هاتینە سۆرکرن و پرچا وێ ژی ب زریچەکێ زیڤی هاتیە نەخشاندن و ب توقەیان هاتیە گرێدان.

هەردیسان وێ دیمەنێ موزیکژەنان ژی ئینا پێش چاڤێن خوە دەمێ پووف دکریە ئامیرێ نای و دەهۆل دقوتای و زارۆکێن جادەیێ ژی فیتك ڤەددان و ل دووڤ وان دکرە غار.

لێ نەخوشبەختانە، بەری حەفتیەکێ بۆ ژڤانێ دەهواتێ، ئەجنەك چوو د لەشێ نانایێ دا، لێ مەریەم پێدڤی ب شرۆڤەکرنا ڤێ چەندێ نەبوو چونکی گەلەك جاران وێ ئەڤ چەندە ب چاڤێن خوە دیتبوو کا چ ل دایکا وێ دهێت.

ل وێ ڕۆژێ دەمێ ئەجنە چوویە دناڤ لەشێ نانایێ دا، ژ نیشکەکێ ڤە لەشێ وێ ڕەقبوو و چاڤێن وێ بەرەڤ پاشڤە چوون و دەست و پێن وێ لەرزین خو دا بێژی کەسەکێ دناڤ لەشێ وێ دا و یێ بزاڤێ دکەت وێ بخەندقینیت. پشتی هینگێ کەفەکا سپی دگەل چەند چپکێن خوینێ ژ ڕەخەکێ دەڤێ وێ هاتنە خوارێ. وێ هندەك پەیڤێن نەڕوهن و ئاشکەرا دگوتن و کەس د ڕامانا وان نەدگەهشت.

دەمێ دەنگوباسێ ڤێ ڕوودانێ گەهشتیە گوندێ شەنداندێ، هەر زوو خێزانا گەنجێ بەبەغافرۆش بڕیاردا ڤێ دەهواتێ بهەلوەشینن و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئێدی کەس بۆ خوە نانایێ نەخوازیت. ئەڤ ئەجنەیێ چوویە دناڤ لەشێ وێ دا نەهێلا ئێدی ئەو کراسێ بووکینیێ بکەتە بەر خوە.

***

ل وێ دەڤەرا ڤەدەر و بێ مرۆڤ، جەلیلی و هەردوو کورێن خوە فەرهاد و موحسنی خانیەکێ بچووك بۆ نانایێ ئاڤاکر کو وێ پازدە سالێن ل دووڤ دا یێن ژیانا خوە ل وێرێ

بوراندن. وان ئەڤ خانیە ب بلوکێن تەڤنێ یێن هشك کری ل بەر هەتاڤێ دروستکرن و دیوارێن وی ب تەڤنێ و پیشی نخافتن.

وان دوو تەخێن نڤستنێ و مێزەیەکا داری و دوو کورسێکێن کو دهێنە پێچان بۆ کرنە تێڤە. هەروەسا د ڤی خانی دا پەنجەرەك هەبوو و هندەك ڕەفە ل سەر دیواری دانان داکو نانا ئامانێن خوە یێن ژ تەڤنێ دروستکری و ڤوریکێن خوە یێن چایێ یێن چینی بدانتە سەر.

جەلیلی سوپەیەکا ئاسنی بۆ دناڤ خانی دا دانا داکو ل زڤستانێ خوە ل بەر گەرم بکەن، پاشی ل پشتا خانی کومەکا داران بۆ دانان و تەنیرەك ژی ل بەر سینگێ خانی بۆ دروستکر داکو بۆ خوە نانی دروست بکەت. هەروەسا ڤەفەسکەکا مریشکان بۆ دروستکر و هندەك بزن بۆ ئینان و ئالف و خوارن ژی بۆ دانا ڕەخەکی. ل دووڤ دا فەرهاد و موحسنی بیرەکا کوور کولا و ژوورەکا بچووك بۆ جهێ دەستئاڤ و سەرشوویێ ل سەر دروستکر.

نانایێ دیارکر کو جەلیل دشیا هندەك کرێکاران بینیت داکو ڤێ کاری پێش وان ڤە بکەن، لێ وی هزرکر دکر ئەگەر ئەو ب دەستێ خوە ڤی کاری بکەت دێ بیتە ئەگەر گونەها وی بهێتە ژێبرن."

***

ل دووڤ گوتنێن نانایێ، دەمێ خودای مەریەم دای، کەس نەهاتبوو هاریکاریا وێ بکەت. مەریەم ل ڕۆژەکا پڕی عەور ل بهارا سالا 1959 هاتیە سەر دنیایێ کو سالا 26 یا دەستهەلاتداریا شاهـ "زاهر شاهی"ی بوو ئەوێ بۆ ماوەیێ چل سالان دەستهەلات ل وەلاتێ ئەڤغانستانێ دکری.

نانایێ دیارکر کو جەلیلی ڤەت خوە دلتەنگ  نەکر و نە فرێکرە دووڤ چ نوشداران یان دادوکان ڕا، سەرەڕای هندێ کو وی دزانی دوور نینە جارەکا دی ئەجنە بچنە دناڤ لەشێ وێ دا و زیانێ بگەهینە وێ دەمێ زارۆکا خوە ددانیت. نانایێ خوە ل سەر فەرشێ مالێ درێژ کر و کێرکەك دانا ب ڕەخ خوە ڤە و خوهـ ژ لەشێ وێ دباری.

نانایێ گوت: "دەمێ ژانێن من گران بووین، من لەڤەك ل بالیفکێ دا ب شێوەیەکێ ب هێز ب ددانێن خوە گرتبوو و د دلێ خوە دا دکرە ڤێژی هەتا دەنگێ من کر بووی. سەرەڕای

ڤێ نەخوشیێ هەموویێ ژی کەس د هەوارا من نەهات و سەروچاڤێن من پاقژ نەکرن یان گلاسەکا ئاڤێ نەدا من.

تو ب خوە ژی نەیا ب لەز بووی بهێیە ژ دەرڤە، بەلکو تو بوویە ئەگەر بۆ ماوەیێ دوو ڕۆژان ئەز ل سەر پشتێ و ل بەر سەرمایێ و ل سەر ئەردێ ڕەق یا ڕازای بم. د وان هەردوو ڕۆژان دا من چ تشت نەخوارن و ڤەخوارن بەلکو ب تنێ من دوعا دکرن و خوە دگڤاشت داکو تو ب سلامەتی بهێیە سەر دنیایێ."

"ل من ببورە، نانا."

"من ب دەستێ خوە وەریسکێ مالبچووکی یێ دناڤبەرا خوە و تە دا قەتاند، ژبەر هندێ من بەری هینگێ کێرکەك دانابوو ب ڕەخ خوە ڤە."

"ل من ببورە."

نانایێ هەر جارا بەحسێ ڤێ چەندێ کربایە، گرنژینەکا سڤك و گران ل سەر لێڤێن وێ پەیدادبوو هەروەکو دا بێژی ئەو یا بەرسڤا تاوانا خوە ددەت یان ژی داخوازا گونەهـ ژێبرنێ دکەت. مەریەمێ قەت نەدگوتە وێ کو مەرەما وێ ژ داخوازا لێبورینێ نە ژبەر کاودانێن وێ یێن ژ دایکبوونێ یە.

دەمێ ژیێ مەریەمێ بوویە دەهـ سال، ئێدی وێ باوەر ژ ڤێ چیرۆکا ژ دایکبوونا خوە نەدکر بەلکو وێ باوەر ژ ئاخفتنێن جەلیلی دکر. هەرچەندە ل وی دەمی جەلیل یێ ژ وێ دوور بوو لێ وی کاروبارێن چوونا وێ بۆ نەخوشخانێ ڕێکخستبوون ب ڕەنگەکی داکو زارۆکا خوە ل ژێر چاڤدێریا نوشداران بدانیت و ل سەر تەختەکێ گونجایی و پاقژ و د ژوورەکا ڕوهن ڤە بنڤیت هەتا دووبارە ڕادبیتە ڤە سەر خوە.

دەمێ مەریەمێ پرسیارا کێرکێ ژ بابێ خوە کری، وی ب خەمگینی ڤە سەرێ خوە هەژاند. ل ڤێرێ مەریەم ژی ب گومان کەفت کو بابێ وێ ببوو ئەگەر دایکا وێ بۆ ماوەیێ دوو ڕۆژان نەخوشیان ببەت.

جەلیلی گوت: "وان گوتە من کو ئەڤ چەندە هەموو ب تنێ د ماوەیێ دەمژمێرەکێ دا ڕوویدا بوو، مەریەم جان تو زارۆکەکا گەلەك جوان و بالکێش بووی، هەتا دەمێ یەکەم ڕۆژا تو هاتیە سەر دنیایێ تو هەر یا جوان بووی."

نانایێ لێ کره ڤێژی و گوتێ: " باوەر ژ ئاخفتنێن وی نەکە چونکی د ڕاستی دا دەمێ تو هاتیە سەر دنیایێ ئەو ل دەڤ مە نەبوو، بەلکو ل وی دەمی ئەو دگەل هەڤالێن خوە ژ بۆ سوواربوونا هەسپان چووبوو سەیرانگەها "تەختێ سەفەر" و دەمێ گوتیە وی کو تە زارۆکەکا نوو یا هەی، وی ئەڤ چەندە ب چ ڤە نەوەرگرت و هەر ل سەر گەڕیانا خوە ل تەختێ سەفەر بۆ ماوەیێ دوو حەفتیێن دی ژی یێ بەردەوام بوو.

"د ڕاستی دا هەتا ژیێ تە بوویە هەیڤەك ژی وی چ جاران تو نەدابوویە بەر سینگێ خوە، بەلکو ب تنێ جارەکێ وی تو هەلگرتبووی و تەماشەی تە کر و گوتی تە دێمەکێ درێژ یێ هەی، پاشی دووبارە وی تو دایەڤ من ڤە."

مەریەمێ باوەر ژ ڤی بەشێ چیرۆکێ نەکر، ڕاستە جەلیلی دانپێدان ب هندێ کر کو دەمێ مەریەم هاتیە سەر دنیایێ ئەو ل سەیرانگەها تەختێ سەفەر بوو لێ دەمێ وی دەنگوباسێ ژ دایکبوونا مەریەمێ گوهلێبووی یەکسەر گەڕیانا خوە ب دوماهی ئینا و ل هەسپێ خوە سووار بوو و زڤڕی باژێرێ هیراتێ و پاشی هەر یەکسەر وی کچا خوە هەلگرت و تبلا خوە ل سەر بریێن وێ ڕا ئینا و بر ستڕانەك بۆ گوت.

مەریەمێ باوەر نەدکر کو جەلیل بێژیتە وێ دێمێ تە گەلەك یێ درێژە هەرچەندە د ڕاستی دا دێمێ وێ یێ هۆسا ژی بوو.

نانایێ دیارکر کو وێ ناڤێ مەریەم بۆ وێ یێ هەلبژارتی، چونکی ئەڤە ناڤێ دایکا وێ بوو، لێ جەلیلی ژی دگوت من ناڤێ وێ یێ هەلبژارتی چونکی مەریەم ناڤێ گولەکا جوانە.

مەریەمێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ ئەو گولا تە یا خوشتڤی یە؟" وی ب گرنژین ڤە بەرسڤ دا: "بەلێ، ئەو یەکە ژ گولێن من یێن خوشتڤی."

# 3

یەك ژ بیرهاتنێن دەستپێکێ یێن مەریەمێ، دەنگێ وێ عەرەبانی بوو یاکو تائیرێن وێ یێن ئاسنی ل سەر بەران دخشیان. ئەڤ عەرەبانە هەیڤێ جارەکێ دهاتە مالا وان کو یا پڕ بوو ژ برنج و ئار و شەکر و چا و زەیت و سابین و مەعجینێ ددانان. پتریا جاران ژی ژ لایێ هەردوو برایێن مەریەمێ، موحسن و ڕامینی ڤە دهاتە پاڵدان، هندەك جاران ژی ڕامین و فەرهادی پاڵددا.

ڤان هەردوو کورێن جەلیلی عەرەبانا پڕی ئازوقە ل سەر ڕێکێن ئاسێ و پیس و ل سەر بەر و کەڤران و ل دورماندور کورك و جهێن کوور ڕادکێشا هەتا دگەهشتنە بەر لێڤا وی ڕووبارێ ئاڤێ یێ ل نێزیکی مالا مەریەمێ وان.

دەمێ دگەهشتنە وێرێ ژی، دا نەچاربن وی ئازوقەی هەموویێ ب دەستی کێشنە لایێ دی یێ ئاڤێ و پاشی دا عەرەبانێ دناڤ ئاڤێ ڕا بەن هەتا دگەهشتنە لایێ دی و دووبارە دا ئازوقەی کەنە تێدا ڤە و نێزیکی دوو سەد یاردێن* دی دا دناڤ گژوگیاییێن چڕ و بوش و دارێن تێکئالیایی ڕا بورن هەتا دگەهشتنە مالا وان.

ل سەر ڕێکێ بەردەوام بەڤان خوە ژ ڕێکا وان ددا پاش و هندەك جاران وان ب خوە ژی خوها واستیانێ ل سەر دێمێ خوە پاقژ دکر.

مەریەمێ گوتە دایکا خوە: "بابێ من گەلەك خزمەتکار هەنە، بوچی وی ئەڤ کارە ب خزمەتکارەکی نەددا کرن؟"

نانایێ پێ کرە کەنی و گوت: "چونکی ئەو هزر دکەت ب ڤی ڕەنگی دێ گونەها وی هێتە ژێبرن."

مەریەم و نانا ل دووڤ دەنگێ تائیرێن عەرەبانێ ددەرکەفتنە ژ دەرڤە. بیرا مەریەمێ هەموو گاڤان ل وان ڕۆژان دهێت کا دیمەنێ دایکا وێ یێ چەوا بوو دەمێ کورێن جەلیلی

---

* یارد یەکەیەکا پیڤانێ یە بۆ درێژاهیێ دهێتە بکارئینان و بۆ یەکەم جار ژلایێ شاهێ ئینگلتەرا (هێنری یێ یەکێ) ڤە هاتیە بکارئینان. هەر یاردەك یەکسانە ب 91.44 سانتیمەتران

ئازوقه بۆ دئینایه مال. ئەو ژنەکا بلند و هەستی گر و پێخاس بوو، پشتا خوه ددا دەرگەهی و چاڤێن خوه تێکدبرن و دەستێن خوه ژی کرنه دناڤ یەك دا و ل سەر سینگێ خوه ددانان و ب ناڤچاڤگرێ ڤه تەماشەی هەردوو کورکان دکر.

هەروەسا پرچا وێ ژی یا کورت و ڤژاڤژ و نەلێکدایی بوو. وێ قەمیسەکێ ڕەنگ گەور* یێ ڤەبی دکره بەر خوه کو هەتا حەفکا وێ یێ درێژ بوو و بەریکێن خوه ژی پڕ دکرن ژ بەرێن هندی کیزان.

ئەو هەردوو کورك ل سەر جوکا ئاڤێ دڕوونشتنه خوارێ و چاڤەڕێی مەریەم و نانایێ دکر هەتاکو ئازوقەیێ خوه ڤەدگوهێزنه د ژوور ڤه. وان دزانی کو بۆ وان باشترە ئەو خوه هند نێزیکی نانایێ نەکەن و ب دووراتیا سیهـ یاردان ژ وێ د دوور بن، چونکی هەر بەرەکێ نانایێ د وان وەرکربایە دوور نینە سەرێ یەك ژ وان شکاندبایە.

نانایێ دگەل هەلگرتنا کیسکێن برنجی دەمێ دبرنە د ژوور ڤە، ل هەردوو کورکان دکره ڤێژی و هندەك ناڤ و ئاخفتنێن کرێت ژی دگوتنێ، لێ مەریەم د ڕامانا وان نەدگەهشت. هەروەسا وێ نەفرەت ل دایکێن وان دکرن و کەرب و کینا خوه د سەرێ وان دا دادڕێژت. سەرەڕای ڤێ چەندێ ژی وان کورکان ب چ ڕەنگان بەرسڤا وێ نەددا و ئاخفتنێن وێ ژی پشتگوهـ دهاڤێتن.

دلێ مەریەمێ گەلەك دما ب هەردوو براێن وێ ڤە چونکی ئەو گەلەك د واستایی بوون و دەست و پێن وان ب دووراتیا ڕێکێ ڤە شل دبوون و  گەلەك د تێهنی بوون. مەریەمێ گەلەك حەزدکر هندەك ئاڤێ بدەتە وان لێ ژبەر دایکا خوه نەدوێریا وەبکەت. هەکە وان گازی وێ ژی کربایە دا خوه ب سەرڤە بەت و بەرسڤا وان نەددا.

جارەکێ ژ جاران داکو کەیفا دایکا وێ پێ بهێت، مەریەمێ ل موحسنی کره ڤێژی و گوتێ دفنا تە وەکو یا کیسەلانە، ژبەر ڤێ ڕەفتاری مەریەمێ هەست ب شەرمزاری و گونەهـ و ترسێ کر نەکو ئەو ڤێ چەندێ بێژنە بابێ خوه. کەیفا نانایێ گەلەك ب مەریەمێ هات و دەست ب کەنیەکا بێ ڕامان کر تا وی ڕادەی ددانێن وێ یێن ڕزی د دەڤێ وێ دا ب باشی خویا دکرن، وێ هند کره کەنی مەریەم ترسیا جارەکا دی دیناتی خوه ل سەرێ وێ بدەتە

---

* ڕەنگێ گەور یان ژی خولیکی (Gray، رمادی) نفیسەری ئەڤ ڕەنگە بۆ پتریا کارەکتەرێن رۆمانا خوه بکارئینایە ژبەر هندێ ژی دێ گەلەك جاران ئەڤ پەیڤە کەڤیتە پێشچاڤێن تە.

ڤە. پاشی وێ تەماشەی مەریەمێ کر و گوتێ: "تو کچەکا باش و وێرەکی، ئاها من دڤێت تو یا هۆسا بی." دەمێ عەرەبانا ئازوقەی ڤالاڵ بووی، هەردوو برایێن مەریەمێ پیچەکێ گەنگەشە کر و پاشی وان جارەکا دی عەرەبانك پاڵدا و چوونە مال. مەریەم پیچەکێ ما ل بەر دەرگەهی هەتاکو هەردوو برایێن وێ ژ وێرێ دوورکەفتین و ل پشت گیایێ درێژ بەرزەبووین.

"کچا من تو هاتیە ژوور ڤە؟"

"بەلێ نانا ئەڤە ئەز هاتم."

" ئەز دزانم ئەو یێ ب تە دکەنە کەنی، من گوهـ ل دەنگێ وان هەیە."

"ئەڤە ئەز هاتمە ژوور."

"تو بوچی باوەر ژ من ناکەی؟"

"سەحکێ ئەڤە ئەزم، ئەز هاتمە ژوور ڤە."

"تو دزانی مەریەم جان، ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم."

***

ل هەموو سپێدەهیان، مەریەم و دایکا خوە ل دووڤ دەنگێ پەزی و بلوولا شڤانێ گوندێ گول دامان هشیار دبوون دەمێ پەزێ خوە پاڵددای داکو بەرەڤ سەرێ گری بچن و ل وێرێ بچەرینیت.

مەریەم و نانایێ دەست ب دووشینا بزانان دکر و خوارن ددا مریشکان و هێکێن وان کوم دکرن و پاشی سەوك ب تەنیرێ ڤەددان. هەر ژ بچووکاتی نانایێ مەریەم فێردکر کا چەوا دێ هەڤیری کەت و ئاگرێ کوچکی و تەنیرێ هەلکەت و کا چەوا دێ سەوکان ب دیوارێ تەنیرێ ڤەدەت. هەردیسان وێ مەریەم فێرێ درواری و لێنانا برنجی و هندەك خوارنێن دی کر وەك ئافکا شێلمان و سپیناغ و قەرنابیت دگەل زەنجەبیلێ.

گومان تێدا نینە کو نانایێ حەز ژ هاتنا مێهڤانان نەدکر ب تایبەت مێهڤانێن گشتی، لێ وێ پێشوازی ب تنێ ل هژمارەکا کێم و هەلبژارتی دکر. یەك ژ وان مێهڤانێن بەردەوام سەرەدانا وان دکری، موختارێ گوندێ گول دامان بوو کو ئەو ب خوە خەلکێ گوندێ "ئەرباب"ێ بوو و ناڤێ وی "حەبیب خان" بوو.

سەرێ وی یێ بچووك بوو و ڕهێن ویژی د درێژ و بوش بوون و زکەکێ مەزن هەبوو. ئەو هەموو هەیڤان جارەکێ دگەل خزمەتکارەکێ خوە دهاتە مالا وان و مریشك و برنج بۆ وان دگەل خوە دئینان و هندەك جاران تەبەقەکا هێکێن ڕەنگاوڕەنگ بۆ مەریەمێ دئینان.

هەردیسان پیرەژنەکا دی یا دانعەمر ژی هندەك جاران دهاتە سەرەدانا وان کو نانایێ دگوتێ "بیبی جان". هەڤژینێ وێ ژی کارێ شکاندنا بەران دکر و هەڤالەکێ نێزیك یێ بابێ نانایێ بوو. دەمێ ئەو ژی دهاتیە سەرەدانا نانایێ دا یەك ژ هەر شەش بووکێن خوە و نەڤیەك یان دوو نەڤیێن خوە دگەل خوە ئینیت.

هەتا ئەو ب وێ ڕێکا ئاسێ و نەخوش سەردکەفت، گەلەك تۆڕە دبوو پت پت دکر ژبەر وێ ئێشان و واستیانا ب ڕێکێ ڤە ددیت، لەوڕا دا دەستەکێ خوە ئێختە سەر ناڤتەنگا خوە و یەکسەر ل سەر وێ کورسیکێ ڕوونتە خوارێ یا نانایێ بۆ وێ ددانایە بەر دەرگەهی داکو باش بێهنا خوە ڤەدەت.

بیبی جانێ ژی بەردەوام دیاری بۆ مەریەمێ دگەل خوە دئینان وەك کارتۆنەکا شریناهی و دیشلەمەیان و سەلکەکا تژی بیه. بۆ نانایێ ژی وێ ب تنێ گازندە ژ ساخلەمیا خوە بۆ دکرن و پاشی دا بەحسێ دەنگوباسێن هیڕات و گول دامانێ بۆ کەت. وێ ب درێژاهی بەحسێ ڤان تشتان بۆ دکر. بووکا وێ ژی ب شێوەیەکێ بێدەنگ و گوماناوی دا ل پشت وێ ڕوونتە خوارێ و گوهداریا سحبەتێن وێ کەت.

لێ کەسێ ژ هەمیان خوشتڤیتر ل دەڤ نانایێ، هەلبەت پشتی جەلیلی، مەلا "فەیزوللاهـ" بوو کو کەڤنترین ماموستایێ فێرکرنا قورئانێ بوو ل گوندی. ئەو حەفتیێ جارەکێ یان دوو جاران ژ گوندێ گول دامان دهاتە سەرەدانا وان داکو هەر پێنج نڤێژ و قورئانێ نیشا مەریەمێ بدەت، هەروەکو کا چەوا وی قورئان نیشا نانایێ ژی ددای دەمێ هێشتا ئەو یا بچووك.

مەلا فەیزوللاهی ژ بلی قورئانێ، مەریەم فێری خواندن و نڤیسینێ ژی دکر، وی ب ئارامی و بێهنفرەهی تەماشەی ملێن مەریەمێ دکر داکو بزانیت کا چەوا دێ شێت ب بێدەنگی و د دلێ خوە دا پەیڤان بێژیت و هێدی هێدی تبلێن خوە ل بن پەیڤان دگەل خواندنا وان دبر داکو ئەو ڕامانا هەر پەیڤەکێ یان هێمایەکی ب باشی فێرببیت.

مەلا فەیزوللاهی دەستێ وێ دگرت و نیشا وێ ددا کا چەوا دێ پیتان نڤیسیت، بۆ نموونە کا چەوا دێ پیتا "ئا" بلند کەت و پیتا "ب" خوار کەت و هەرسێ خالێن پیتا "ش" دانیتە سەر.

مەلا فەیزوللاھـ زەلاّمەکێ دانعەمر و پشت خوار بوو، ددانێن وی ژی هەموو کەفتبوون لێ بەردەوام گرنژین ل سەر لێڤێن وی بوو، هەروەسا رهێن وی ژی هەتا بن حەفکا وی ددرێژ بوون. ئەڤ پیرەمێرە پتریا جاران ب تنێ دهاتە مالا وان لێ هندەك جاران ژی نەڤیێ خوە یێ بچووك "حەمزە" دگەل خوە دئینا کو پرچا وی یا سۆر بوو چەد سالەکان ژ مەریەمێ مەزنتربوو.

دەمێ ئەو دهاتیە مالا وان، بەری کو ئەو بچنە د ژوور ڤە و دەست ب وانەیا خوە بکەن، مەریەم یەکسەر دا چیت دەستێ وی ماچیکەت، لێ خو دا بێژی ئەو یا پرتەکا داری یا هشك و نخافتی ب پیستەکێ رەق ماچی دکەت.

پشتی ب دوماهی هاتنا وانەیێ، ئەو هەردوو دا چنە ژ دەرڤەی مالێ و دەست ب خوارنا بندەڤان و ڤەخوارنا چایا کەسك کەن، هەروەسا دا تەماشەی بلبلان کەن دەمێ ژ سەر دارەکێ دفرینە سەر دارەکا دی و ئاوازێن خوش دژەنین. هندەك جاران ژی دا پیاسەیان دناڤ بەلگێن وەریای یێن دارێن رەنگ برۆنزی کەن و چنە بن دارێن دەوروبەری رووبارێ ئاڤێ یان ژی هەتا بنارێ چیایی چنە پیاسەیان.

دەمێ وان ئەڤ پیاسە دکرین، مەلا فەیزوللاهی بەردەوام دەستێ خوە ب تزبیێن خوە دا دئینا خوارێ و ب دەنگێ خوە یێ لەرزی بەحسێ سەرهاتیێن خوە یێن گەنجینیێ و ئەو تشتێ ب چاڤێن خوە دیتی بۆ مەریەمێ دکر، وەکو وی مارێ ب دوو سەر یێ وی ل ئیرانێ دیتی، سکرێ ئەسفەهانێ یێ سیھـ و سێ کڤان هەین، هەروەسا ئەو شتیێ وی کەرکری ل مزگەفتا شین ل مەزاری دەمێ کو دناڤ رەخەکێ توفکێن وی دا پەیڤا "الله" و ل رەخێ دی پەیڤا "اکبر" یا ل سەر نڤیسبوو.

مەلا فەیزوللاهی دانپێدان بۆ مەریەمێ کر کو ل وی دەمی، ئانکو دەمێ هێشتا ئەو یێ گەنج، ئەو د رامانا پەیڤێن قورئانێ نەدگەهشت، لێ وی هەست ب ئارامیەکا مەزن دکر دەمێ وی گوھـ ل خواندنا قورئانێ دبووی ب تایبەت دەمێ وی ب ئەزمانێ خوە قورئان ب

زمانێ عەرەبی دخواند. هەروەسا وی گوت کو ڤێ چەندێ بەختەوەریەکا بێ وێنە ل دەڤ وی پەیدادکر و دلێ وی ئارام دکر.

وی گوت: "خوشتڤیا من مەریەم جان، قورئان دێ دلێ تە تژی ئارامی کەت، هەر دەمێ تو پێدڤی بووی تو دشێی هەلگری و بخوینی و ئەو قەت تە بێ هیڤی ناکەت، پەیڤێن خودایێ مەزن چ جاران خیانەتێ ل مروڤی ناکەن، کچا من یا بچووك."

هەردیسان مەلا فەیزوللاهی ژی ب بێهنفرەهی گوهێ خوە ددا سحبەت و چیرۆکێن مەریەمێ. هەردەمێ مەریەمێ دەست ب ئاخفتنێ کربایە، وی ب هشیاری و ئارامی گوهێ خوە ددا وێ و پێنگاڤێن خوە هێدی هێدی دهاڤێتن و جار جارە بۆ دگرنژی داکو هەست ب هندێ نەکەت کو چیرۆکێن وێ بۆ وی د گرنگ نینن.

ژبەر ڤێ چەندێ، مەریەم بێی دوودلی دشیا دلێ خوە بۆ مەلای ڤەکەت و هەر تشتێ ئەو نەشیابا بێژیتە نانایێ یان داخواز ژێ بکەت، دا ب سانەهی بێژیتە مەلای. ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دەمێ وان پێکڤە پیاسە دکرین، مەریەمێ گوتە وی کو یەك ژ هیڤیێن وێ ئەوە نانا بهێلیت ئەو ژی وەکو هەموو قوتابیێن دی بچیتە قوتابخانێ.

مەریەمێ گوت: "مەرەما من قوتابخانەیەکا ڕاستەقینە و پولێن ڕاستەقینە لێ هەبن و ماموستا وانەیان لێ بێژن هەروەکو وان قوتابخانەیان یێن زارۆکێن دی یێن بابێ من دچن لێ دخوینن."

مەلا فەیزوللاهی پشتی گوهلێبوونا ڤێ داخوازیێ، یەکسەر د جهێ خوە دا ڕاوەستیا.

حەفتیا بەری هینگێ دەمێ بیبی جان هاتیە مالا وان و وەکو هەرجار دەنگوباس بۆ نانایێ دگەل خوە دئینان، وێ گوتبوو کو هەردوو کچێن جەلیلی، سەعیدا و ناهید، یێن چووینە قوتابخانەیا "مێهری" یا کچان ل باژێرێ هیراتێ.

ژ هینگێ وەرە هزرێن پولێن قوتابخانەیێ و ماموستایان بەردەوام خوە ل سەرێ مەریەمێ ددەن. ئەو هزرا خوە د پەرتووکێن خیچدار و ستوونێن ژمارەیان و پێنۆسێن ڕەنگاوڕەنگ دا دکەت. وێ بەردەوام هزردکر ئەو ژی یا دگەل کومەکا کچێن دی یێن هەڤژیێ خوە د پولەکێ ڤە وانەیان دخوینیت و یا ڕاستەهێلی ب دەستێ خوە دگریت و هێلێن درێژ ل سەر لاپەرەکێ سپی دکێشیت.

ل وی دەمی کو مەلا فەیزوللاهی هەردوو دەستێن خوە دانابوونە سەر پشتا خوە یا خوار و سیبەرا دەرسوکا وی کەفتبوو سەر کومەکا گولێن بهارێ، وی ب هەردوو چاڤێن خوە یێن کز تەماشەی مەریەمێ کر و گوتێ: "ئاها تە ئەڤ چەندە دڤیا؟"

"بەلێ"

"نوکە ئەز تێگەهشتم کو تە دڤێت ئەز ڤێ چەندێ بێژمە دایکا تە و داخوازێ ژێ بکەم دەستوورییێ بدەتە تە داکو بچیە قوتابخانێ"

مەریەم گرنژی، وێ هزردکر ژ بلی جەلیلی، کەسێ دی ل ڤێ جیهانێ ژ بلی ڤی مەلایێ دانعەمر د وێ ناگەهیت.

مەلای دەستەکێ خوە ب ڕوویێن خوە دا ئینا خوارێ و گوت: "باشە ئەز دێ شێم بۆ تە چ کەم؟ خودایێ مەزن ب زیرەکی و ژیریا خوە هەر یەك ژ مە هندەك خالێن لاوازیێ یێن داینێ، لاوازترین خالا من ژی ئەوە ئەز نەشێم ب چ ڕەنگان داخوازیێن تە ڕەت بکەم، مەریەم جان."

پشتی هینگێ دەمێ مەلای ئەڤ بابەتە دگەل نانایێ ڤەکری، یەکسەر کێرکا وێ ژ دەستێن وێ دا کەفت ئەوا بەری هینگێ پیڤاز پێ هوور دکرن.

"ڤێجا بوچی وێ دڤێت بچیتە قوتابخانێ؟"

"عەزیزا من، مادەم ڤێ کچێ دڤێت فێری خواندن و نڤیسینێ بیت، نابیت تو ببیە ڕێگر د ڕێکا وێ دا، بهێلە کچا تە فێر ببیت."

"فێر ببیت؟ فێری چ تشت ببیت؟ ئەی مەلایێ هێژا."

پاشی وێ بەری خوە دا مەریەمێ، ل وی دەمی مەریەم پیچەك ترسیا و سەرێ خوە نزم کر.

"چ مفا د هندێ دا هەیە کچەکا وەکو تە بچیتە قوتابخانێ؟ ئەڤ چەندە وەکو وی ئامانی یە یێ تو تف دکەیە تێدا. هەروەسا تو چ تشتێ ب مفا ل ڤان قوتابخانەیان فێرنابی. ل ڤێرێ ب تنێ تشتەك هەیە کو هەر ژنەکا وەکو من و تە د ڤێ ژیانێ دا پێدڤی دبیتی و ب چ ڕەنگان وی تشتی ل قوتابخانەیان نیشا قوتابیان نادەن، باش تەماشەی من بکە."

"کچا من نابیت تو ب ڤی ڕەنگی دگەل زارۆکێن بچووك باخڤی."

مەریەمێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی نانایێ کر.

"ب تنێ تشتەك هەیە پێدڤیە تو فێر ببیێ، ئەو ژی خوە لبەرگرتن و بێهنفرەهی یە."

"خوە ل بەر چ بگریت؟ نانا."

"ئوه، خوە تۆرە نەکە مەلا، چونکی گەلەك خەم و نەخوشی د ڤێ ژیانێ دا هەنە کو ئەو خوە ل بەر بگریت و یا بێهنفرەهـ بیت."

پاشی وێ بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و بەحسێ هندێ دکر کا چەوا بەردەوام هەڤژینێن جەلیلی ناسناڤێ وێ کربوو ژنا کرێت و بێ سەروبەر و کچا شکێنەرێ بەران یا بێ بها. هەروەسا کا چەوا بەردەوام وان دگوتێ هەرە ژ دەرڤە ل بەر سەرمایێ جلکان بشو تا وی رادەی دێمێ وێ سرێ بربوو و دەستێن وێ هەموو پەق پەق ببوون.

"ئەڤ چەندە قەدەرا مەیە د ژیانێ دا مەریەم جان، یا ل سەر ژنێن وەکو مە پێدڤیە د خوەراگر و بێهنفرەهـ بین، مە ب تنێ ئەڤ چەندە یا هەی تە زانی؟ زێدەباری ڤێ چەندێ ئەگەر تو بچیە قوتابخانێ ژی دێ زارۆك هەموو یاریان ب تە کەن و ب ناڤێ کچکا بیژی گازی تە کەن، دبیت هندەك ئاخفتنێن کرێتر بێژن، ل وی دەمی تو نەشێی خوە ل بەر ئاخفتنێن وان بگری."

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند بێی کو ئاخفتنەکێ بێژیت.

"ژ نوکە وێ ڤە ب چ رەنگان بەحسێ قوتابخانێ نەکە، من ب تنێ تو یا هەی و قەت ئەز یا بەرهەڤ نینم ل سەر خاترا وان تە ژدەستبدەم. تەماشەی من بکە و خوە ژیر بکە. ژ نوکە وێ ڤە بەحسێ قوتابخانێ نەکە.

پشتی هینگێ، مەلا فەیزوللاهی دەست ب ئاخفتنێ کر.

"کچا من نانا، دڤێت تو پیچەکێ ب شێوەیەکێ کەتواری و بەرئاقل هزرا خوە بکەی، مادەم کچکێ دڤێت بچیتە قوتابخانەیێ رامانا وێ ئەوە چ ئاریشە تێدا نینە."

"تو ئەی مەلایێ هێژا و قەدرگران، دگەل هەموو رێزێن من بۆ تە، لێ پێدڤیە تو پتر یێ هشیاربی و ڤان هزرێن بێ رامان نەکەیە د سەرێ کچێ دا و پشتەڤانیا وێ نەکەی. ئەگەر تە ژ دل دڤێت هاریکاریا وێ بکەی، پێدڤیە تو وێ تێبگەهینی کو جهێ وێ ب تنێ یێ ل ڤێ مالێ و نابیت ژێ دەرکەڤیت، ژ دەرڤەی مالێ چ تشت پێشوازیا وێ ناکەن ژبلی دل

ئێشان و ڕەتکرنا وێ ژ لایێ خەلکی ڤە. ئەز دزانم ئەی مەلا، ئەز باش دزانم کا بابەت یێ چەوایە."

# 4

مەریەمێ گەلەك حەز ژ هاتنا مێهڤانان دکر  ب تایبەت کو سەرەدانا وان ل مال بکەن، هەر ژ موختارێ گوندی بگرە دەمێ ب دیاری ڤە دهاتە سەرەدانا وان هەتا بیبی جانا دانعەمر دەمێ دهات و بەحسێ ئێش و ژانێن خوە یێن بێ دوماهی دکر. مەلا فەیزوللاهی ژی رێزو بهایەکێ تایبەت ل دەڤ وێ هەبوو. لێ گومان تێدا نینە ژ ڤان هەموو مێهڤانان، مەریەمێ پتری هەمووان حەز ل سەر دیتنا جەلیلی هەبوو.

هەر ژ شەڤا سێ شەمبی، مەریەم دا ئازرییێت و بێهنا وێ تەنگ دبوو هەتا سپێدێ بۆ ماوەیەکێ کێم دنڤست چونکی دترسیا نەکو ژ نیشکەکێ ڤە کارەکێ بلەز بۆ جەلیلی پەیدابببیت و ببیتە رێگر ل رۆژا پێنج شەمبی سەرەدانا وێ نەکەت کو ئەو وێ حەفتیێ هەموویێ ل هیڤیا هاتنا وی بوو.

ل رۆژا چوارشەمبی ژی، ئەو بەردەوام ل دورماندوری مال دهات و دچوو بێهنا وێ ل چ جهان نەدهات، هندەك جاران دا تومکی دەتە مریشکان بێی کو وێ ئاگەهـ ل سەر هندێ هەبیت کا ئەو چ دکەت. هەردیسان وێ پیاسە دکرن و گول ژ داران ڤەدکرن و تەپ ل دەست و ملێن خوە ددان داکو مێش و پێشیان ژ خوە دوور بکەت.

ل دوماهیێ و ل رۆژا پێنج شەمبی، ئەو سپێدی زوو دا ژ خەو هشیار بیت و چیتە ژ دەرڤەی مالێ و پالاێ  خوە دەتە دیواری و بەرێ وێ ل لایێ دی یێ رووباری بوو و چاڤەرێی دما. دەمێ رۆژەکێ جەلیل پیچەکێ گیرو بایە، هێدی هێدی هەستەکا ترسێ ل دەڤ وێ پەیدادبوو و پێن وێ دلەرزین، ژبەر هندێ دا چیتە جهەکی و ب دامایی ڤە روونتە خوارێ.

پشتی هینگێ دا نانا گازی کەتە وێ و بێژیتێ: "ها ئەڤە بابێ تە ب هەموو مەزناهی و سەربلنداهیا خوە ڤە هات."

مەریەم دا رابیتە ڤە و تەماشەی بابێ خوە دکر دەمێ خوە ل سەر بەرێن رووباری دا دهاڤێتی و ب هەموو دلوڤانی و حەژێکرن ڤە تەماشەی مەریەمێ دکر و سلاڤ دکرێ. مەریەمێ دزانی نانا ژی یا تەماشەی وێ دکەت و دزانی کا کارڤەدانا وێ ژبەر هاتنا جەلیلی

یا چەوایە. نانایێ بزاڤ دکر ب هەر ڕەنگێ هەبیت نەچیتە د ژوور ڤە بەلکو دا ل بەر دەرگەهێ مالێ ڕاوەستیت و زێرەڤانیا جەلیلی کەت هەتا دگەهشتە مالا وان.

مەریەم ژی ب حەز و ڤیانەکا مەزن ڤە ل هیڤیا بابێ خوە بوو و چاڤێ وێ لێ بوو کا چەوا بابێ وێ یێ دناڤ گژوگیایەکێ بلند دا ڕێکا خوە دکەت و چاکیتێ خوە ژی یێ هاڤێتیە سەر ملێن خوە و با یێ بوینباغا وی یا سۆر دلڤلڤینیت. دەمێ جەلیل دگەهشتیە دەڤ وان، دا چاکیتێ خوە دانیتە سەر تەنیڕێ و دەستێن خوە باش ڤەکەت و خوە د مەریەمێ وەرکەت و هەردوو دەستێن خوە دئێخستنە ناڤتەنگا وێ و بلند دکرە بەر ئەسمانان، مەریەمێ ژی ژ کەیفان دا دکرە ڤێری و هەوار.

دەمی مەریەم بلند دبوویە ئەسمانی، وێ باشتر سەروچاڤێن بابێ خوە و گرنژینا وی یا فرەهـ و پێتی و پەحنیا سەرێ وی و ئەرزنکا وی یا خیچ خیچ و ددانێن وی یێن تا ڕادەیەکی ڕزی ددیتن. وێ حەز ژ ڕهێن وی یێن درێژ دکر.

ئەگەر خو ڕەوشا سەڤای یا چەوابایە، ئەو دا هەر ڤاتەکا ڕەنگ ڤەهوای کەتە بەر خوە ژبەرکو وی گەلەك حەز ژ ڤی ڕەنگی دکر. هەروەسا بەردەوام دەستمالەکا سێگوشە د بەریکا وی یا سنگی دا بوو. لحافە و بوینباغێن وی ژی هەموو گاڤان د سۆر بوون. مەریەم د شیا ب سانەهی وێنێ خوە یێ بەروڤاژی د هەردوو چاڤێن جەلیلی یێن ڤەهوای دا ببینت. د چاڤێن وی دا، وێ ددیت با یێ ل پرچا وێ ددەت و بەربەلاڤ دکەت و دیمەنێ ئەسمانی ژی ل پشت وێ خویا دکەت.

ڕۆژەکێ نانایێ خوە نەڕازیکر و گوتە جەلیلی ئەز دترسم جارەکێ تو هەڤسەنگیا خوە ژ دەستبدەی و مەریەم ژ دەستێن تە دەرکەڤیت و ب ئەردی بکەڤیت و هەستیکێن لەشێ وێ هەموو بشکێن، لێ مەریەمێ هند باوەری ب جەلیلی هەبوو تا وی ڕادەی ڤەت باوەرنەدکر ڕۆژەکێ ئەو دێ وێ ئێخیت و ل ئەردی دەت چونکی وێ دزانی جەلیل گەلەك باش وێ دهەلگریت و ب شێوەیەکێ هێدی و ئارام دئینتە خوارێ.

پشتی هینگێ جەلیل دا ل بەر دەرگەهێ مالێ و ل بن سیبەرێ ڕوونتە خوارێ و نانا ژی دا چایێ بۆ ئینیت. ل وی دەمی جەلیل و نانایێ نە ژ دل تەماشەی هەڤدوو دکر و سلاڤەکا هشك و ژ نەچاری دگەل هەڤدوو دگوهۆڕی خو دا بێژی ئەو هەڤدوو نانیاسین.

جەلیلی ژی قەت بابەتێ تێوەرکرنا بەران و گوتنا قەسە و ئاخفتنێن کرێت یێن وێ دگوتنە کورێن وی دگەل نانایێ گەنگەشە نەدکر.

هەرچەندە نانایێ ل پشت جەلیلی ڕا گەلەك ب خڕابی بەحسێ وی دکر، لێ دەمێ جەلیل دهاتیە سەرەدانا وان، پیچەکێ ژ کەرب و کینا خوە دهاتە خوارێ و ئارام دبوو، هەروەسا وێ پرچا خوە جوان شانە دکر و ددانێن خوە دشووشتن و جوانترین جوبەیێ خوە ل وێ ڕۆژێ دکرە بەر خوە. ل دووڤ دا، دا ل سەر کورسیکەکا نێزیکی وی ڕوونتە خوارێ و دەستێن خوە کەتە د کوشا خوە دا. وێ ب شێوەیەکێ ڕاستەخو تەماشەی وی نەدکر و زوو ب زوو دگەل نەدئاخفت، دەمێ کربایە کەنی ژی دا دەستێ خوە دانیتە بەر دەڤێ خوە، داکو بشێت ددانێن خوە یێن ڕەش پێ بڤەشێریت.

هندەك جاران نانا دا پرسیارا حالێ وی و هەڤژینێن وی ژێ کەت، دەمێ وێ گوتیە جەلیلی کو وێ ژ بیبی جانێ گوهلێبوویە دێ هەڤژینا وی یا گەنج "نێرگز" زارۆکێ خوە یێ سیێ ئینتە سەر دنیایێ، جەلیلی پێ دکرە کەنی و سەرێ خوە هەژاند.

نانایێ گوت: "باشە، دڤێت نوکە تو یێ کەیخوش و بەختەوەر بی، ئەڤە هژمارا زارۆکێن تە بوونە دەهـ، مانە هۆسایە؟ چاڤێ خودای لێ بیت ئەڤە دەهـ زارۆك."

جەلیلی بەرسڤا وێ دا: "بەلێ ئەڤە دێ بنە دەهـ."

"یازدە زارۆك، چ پێنەڤێت ئەو ژی هەکە تو مەریەمێ ژی وەکو زارۆکەکا خوە ب هەژمێری."

پشتی جەلیل ژ وێرێ چووی، نانایێ و مەریەمێ گەنگەشە سەرا ڤێ چەندێ کر و مەریەمێ گوتێ کو وێ ژ ئەنقەست ئەڤ پرسیارە ژ وی دکرن، لێ نانایێ بۆ وێ دیارکر کو وێ ئەڤ ئاخفتنە ژبەر بەرژەوەندیا وێ دگوت نەك زێدەتر.

پشتی ڤەخوارنا چایێ، دا جەلیل مەریەمێ دگەل خوە بەتە سەر ڕووباری و نیشا وێ دەت کا چەوا دێ دەرزیێ نێچیکرنا ماسیان گریت، هەروەسا کا چەوا دێ سەرەدەریێ دگەل ماسیێن سەلەمون کەت و ب ڕێکەکا دروست دێ هناڤێن وان ئینتە دەرێ و باش پاقژ بکەت و کا چەوا دێ ب پێنگاڤەکێ ب تنێ گوشتێ وان ژ هەستیێن وان ڤەکەت.

جەلیلی وێنەیێ مەریەمێ دکێشا دەمێ ئەو یا ڕاوەستای ل هیڤیا گرتنا ماسیان، پاشی وی نیشا مەریەمێ دا کا چەوا دێ وینەیێ فیلەکی کێشیت بێی کو پێنۆسێ خوە ل سەر کاغەزێ ڕاکەت، هەروەسا دا ڕیتمێن هوزانان نیشا وێ دەت و پێکڤە ستڕانان بێژن:*

لی لی لی لی حەوزا بالندا

ل سەر حەوزەکا پیس ڕوونشت

میناو* یا ل سەر لێڤا وێ ڕوونشتی و ئاڤێ ڤەدخوت

تەحسی و د ئاڤێ دا نقووم بوو

جەلیلی هندەك بەرپەڕێن ڕۆژنامەیا هیراتێ یا ب ناڤێ "ئیتیفاقا ئیسلامێ" دگەل خوە دئینان و بو وێ دخواندن. ئەڤ بەرپەڕێن ڕۆژنامەیان وەکو پرەکێ بوون دناڤبەرا مەریەمێ و جیهانا ژ دەرڤە دا، چونکی ب ڕێکا وان مەریەمێ دزانی کا چ ل جیهانا ل پشت دیوارێن مالا وان و گوندێ گول دامان و باژێرێ هیراتێ ڕوودەت.

جیهانەك بوو یا پڕ بوو ژ ناڤێن سەرکردەیان کو بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو ناڤێن وان ژبەر بکەت. هەردیسان ناڤێن شەمەندەفرِ و موزەخانە و یارییێن تەپا پێی و موشەکەێن ل دور ئەردی و هەیڤێ دزڤرن. هەموو ڕۆژێن پێنج شەمبی، جەلیلی پیچەك ژ دەنگوباسێن ڤێ جیهانێ دگەل خوە دئینانە مالا وان.

جەلیلی بۆ وێ بەحسێ هندەك ڕوودانێن هاڤینا سالا 1973ێ کرن کو ل وی دەمی ژیێ وێ چواردە سال بوون، هەتا وی دەمی ئەو بۆ ماوەێ چل سالان بوو شاهـ زاهری دەستهەلات ل کابولێ دکر، لێ ل وێ هاڤینێ ب کودەتایەکا سەربازی یا بێی خوین ڕێژتن هاتە لادان.

---

* دەقێ وێ ب زمانێ ئینگلیزی:

*Lili Mi birdbath،*
*Sitting on a dirt path،*
*Minnow sat on the rim and drank،*
*Slipped، and in the water she sank*

* جورەکێ ماسیێن ئەوروپی یە

"پسمامێ وی "داود خان" ب ڤێ کودەتایێ ڕابوو دەمێ شاهـ بۆ چارەسەریا پزیشکی چوویە وەلاتێ ئیتالیا. بیرا تە ل داود خانی دهێت مانە؟ من بەری نوکە بۆ تە بەحسێ وی کربوو. دەمێ تو هاتیە سەر دنیایێ ئەو ل وی دەمی سەروك وەزیرێن کابولێ بوو.

هەرچەوا بیت ، نوکە ئەفغانستان نەمایە وەلاتەکێ شاهنشین، بەلکو نوکە یا بوویە وەلاتەکێ کوماری و داود خان سەروکێ وێ یە. هندەك گوتگوتك هەبوون کو هێزێن شیوعی هاریکاریا وی کر هەتا بهێتە سەر کورسیکا دەستهەلاتێ، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت ئەو ژی شیوعی بوو یان ببیتە شیوعی. لێ ئەڤ چەندە ب تنێ گوتگوتکە و چ ڕاستی بۆ نینە."

مەریەمێ پرسیار ژێ کر کا شیوعی کینە و د چەوانە، وی ژی ب درێژاهی بەحسێ وان بۆ کر لێ ب خورتی مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ وی دبوو.

"گوهێ تە ل منە؟"

"بەلێ"

جەلیلی دیت چاڤێ مەریەمێ یێ ل بەریکا وی ئەوا مەزن خویا دکری.

"ئوهـ کچا من، من ژ بیرکربوو بدەمەڤ تە."

جەلیلی دەستێ خوە کرە د بەریکا خوە دا و ڤالکەك ژێ ئینا دەرێ و داڤ مەریەمێ، وی جار جار هندەك دیارییێن بچووك بۆ وێ دگەل خوە دئینان. جارەکێ بازنکەکێ دەستی کو ژ مووروێکین سۆر هاتبوو دروستکرن بۆ دگەل خوە ئینابوو، جارەکا دی ژی ڕستکەکا بەرێن گرانبها یا گەردەنێ بۆ ئینابوو. دەمێ ئەڤ جارە مەریەمێ ئەو ڤالك ڤەکری، دیت بابێ وێ ڕستکەکا جوان یا بۆ دگەل خوە ئینای کو موریکێن وێ وەکو بەلگێن داران بوون و وێنەیێ هەیڤێ و ستێران ل سەر هاتبوو نەخشاندن.

"مەریەم جان نوکە بکە ستوویێ خوە."

"بۆچونا تە چیە باب، ژ من دهێت؟"

"ئەز نوکە تە وەکو شاهژنەکێ ل پێشچاڤێن خوە دبینم."

پشتی جەلیل ژ وێرێ چووی، نانایێ ڕستك ل ستوییێ مەریەمێ دیت.

"گەوهەرێن نومادی، من بەری نوکە یا دیتی کا چەوا ڤان ڕستکان دروست دکەن. ئەو وی پارەیێ خەلك ددەتە وان د حەلینن و ڤان گەوهەران ژێ دروست دکەن. دا سەحکەینێ کا جارا بهێت بابێ تە یێ خوشتڤی دێ ڕستکەکا زێڕی بۆ تە ئینیت یان نە."

دەمێ جەلیل ژ دەڤ وان دچووی، مەریەم دا ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیت و تەماشەی وی کەت هەتا ژ وێرێ دوورکەفتبایە و ل دوماهیێ ل پێشچاڤێن وێ بەرزە دبووی. هەرچەندە ئەو ب چوونا وی گەلەك خەمگین دبوو لێ وێ هیڤی دخواست جارەکا دی ژی بابێ خوە ببینتە ڤە.

ب شەڤێ دەمێ مەریەم دچوو سەر جهێن خوە، دا هزرا خوە کەت کا نوکە خانیێ جەلیلی ل هیڕاتێ یێ چەوایە. هەروەسا وێ پرسیار دکر کا ژیانا وێ دێ یا چەوا بیت ئەگەر ئەو دگەل وی بژیت و ڕۆژانە وی ببینیت. وێ دئینا پێشچاڤێن خوە دەمێ ئەو ڕهێن خوە دتراشیت و ئەو بۆ خاولیێ دهەلگریت و دەمێ خوە بریندار دکەت دبێژیتە وێ هاریکاریا من بکە.

هەروەسا دەمێ چایێ بۆ تێدکەت و قولبکێن قەمیسێ وی یێن ژێڤەبووی بۆ دئێخیتێ. دەمێ ئەو هەردوو پێکڤە پیاسەیان دناڤ جادەیێن هیڕاتێ دا دکەن و ل ناڤ بازاڕی دا جەلیل دبێژتێ هەر تشتێ دلێ تە بخوازیت بێژە دا بۆ تە بکرم. دەمێ ئەو سوواری ترۆمبێلێ دبن و خەلك تەماشەی وان دکەن و دبێژن ئەڤە جەلیل خان و کچا خوە مەریەمن. هەروەسا دەمێ ئەو دێ وێ بەتە بن وێ دارا ناڤدار یا گۆڕێ هوزانڤانەکی ل بن هاتیە دانان.

ڕۆژەکا نێزیك، مەریەمێ بڕیار دا ڤان تشتان هەمیان بێژیتە جەلیلی. چ پێنەڤێت دەمێ جەلیل گوهـ ل ڤان تشتان دبیت و دزانیت کا مەریەم چەند ژ وی غەریب دبیت دەمێ وێ بجهـ دهێلیت، هەر یەکسەر دێ بڕیارێ دەت وێ ژی دگەل خوە ببەتە هیڕاتێ داکو وەکو هەموو زارۆکێن وی یێن دی دناڤ مالا وی دا بژیت.

# 5

مەریەمێ گوتە جەلیلی: "ئەز دزانم کا من چ دڤێت."

ئەڤ چەندە ل بهارا سالا 1974ێ بوو کو ل وێ سالێ ژیێ مەریەمێ ببوونە پازدە سال. مەریەم و جەلیل و نانا ل بەر دەرگەهێ مالێ و ل بن سیبەرا دار چنارێ ڕوونشتبوونە خوارێ و کورسیکێن خوە ل سەر شێوەیێ سێگوشەیێ دانابوون و بەرێ وان ل هەڤدوو بوو.

"بۆ جەژنا ژ دایکبوونا من، ئەز دزانم کا من چ دڤێت."

"تو دزانی کا تە چ دڤێت؟"

جەلیلی ئەڤ پرسیارە ژێ کر و پاشی گڕنژی.

بەری دوو حەفتیان، دەمێ جەلیلی سەرەدانا وێ کری و مەریەمێ گەلەك خورتی لێکری بۆ وێ بەحسێ سینەمایێ بکەت، جەلیلی گوت: " نوکە فلمەکێ ئەمریکی ل هۆلێن سینەمایا وی دهێتە نیشاندان. ئەو ب خوە جورەکێ تایبەتە دبێژنێ فلمێن کارتۆنی. د ڕاستی دا ئەڤ فلمە ژ هژمارەکا وێنەیان پێکدهێت کو ڕەنگە هژمارا وان بگەهیتە هزار وێنەیان. دەمێ ل سەر شاشەیا سینەمایێ دهێنە نیشاندان دێ هزرکەی ئەڤ وێنەیە یێ دلڤلڤن."

پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "ئەڤ فلمە بەحسێ زەلامەکێ دانعەمرێ پۆسیدە و دامایی و بێ زارۆك دکەت کو کارێ وی دروستکرنا یارییێن زارۆکانە و هەموو هیڤییێن وی ئەون کورەك هەبیت. ژبەر هندێ ئەو بیکەکا لاستیکی دروست دکەت و ب شێوەیەکێ بالکێش گیان دهێتە د لەشێ وێ بیکێ دا."

ئەڤ چیرۆکە گەلەك سەرنجا مەریەمێ ڕادکێشیت، ژبەر هندێ داخوازێ ژ جەلیلی دکەت پتر بەحسێ وی زەلامی بۆ بکەت و جەلیل ژی دلێ وێ ناهێلیت و ل سەر ڤەگێڕانا چیرۆکا فلم کارتۆنی بەردەوام دبیت و دبێژیت: "ئەڤ زەلامێ دانعەمر و بیکا خوە یا لاستیکی سەرەدانا گەلەك جهان دکەن و گەلەك ڕوودان ب سەرێ وان دهێن، ئەو دچنە جهەکی دبێژنێ "وەلاتێ بەختەوەرییێ" کو ل وی وەلاتی زارۆکێن شیم و نەگوهدار دبنە

گوهدرێژ. پاشی ل وی وەلاتی کورکەکا کوور هەیە، وی زەلاّمی و بیکا وی یا لاستیکی دداعوریت."

پشتی هینگێ مەریەمێ سەرهاتیا ڤێ چیرۆکێ هەموو بۆ مەلا فەیزوللاهی ڤەگۆهاستبوو.

مەریەمێ گوتە جەلیلی: "من دڤێت نوکە تو من دگەل خوە ببەیە سینەمایێ، من ژی دڤێت وان وێنەیێن لڤوك و وێ بیکا لاستیکی ببینم."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، مەریەمێ هەستپێدکر ڕەوشا وێ یا دەروونی پیچەکێ باشترە، ل وی دەمی دایك و بابێن وێ پیچەکێ کورسیکێن خوە لڤاندن و تەماشەی هەڤدوو دکر.

نانایێ گوت: "مەریەم جان، بدیتنا من ئەڤ چەندە نە هزرەکا باشە."

هەرچەندە ئەڤ جارە دەنگێ نانایێ یێ نزم و ئارام بوو، شێوازێ ئاخفتنا وێ ژی دگەل مەریەمێ هەر وەکو وی شێوازی بوو وەختێ وێ دگەل جەلیلی دئاخفتی، لێ مەریەمێ ژ ئاورینێن وێ یێن دژوار دزانی ئەڤ داخوازیە ب دلێ وێ نینە.

جەلیلی پیچەکێ کورسیکا خوە لڤاند و کوخی داکو گەوریا خوە پاقژ بکەت و گوت: "تو دزانی مەریەم، ڤان فلمان وێنەیێن وان نە هند دباشن و دەنگێ فلمی ژی دروست دەرناکەڤیت و ل ڤێ دوماهیێ ئامیرێ نیشاندانا فلمان ژی یێ ژ کارکەفتی، دایکا تە ڕاست دبێژیت کو ئەڤ هزرا تە نەیا د جهێ خوە دایە، تو دشێی هزرا خوە د یاریەکا دی دا بکەی."

نانایێ گوت: "سەحکێ تە دیت، بابێ تە ژی نەیێ ڕازی یە تە دگەل خوە ببەتە سینەمایێ."

★★★

پشتی هینگێ دەمێ مەریەم و جەلیل چووینە سەر ڕووباری ژی، وێ هەر داخواز ژ جەلیلی دکر دگەل خوە ببەتە پێش سینەمایێ.

جەلیل گوت: "باشە ئەز دێ بێژمە تە کا دێ چ کەین. دێ کەسەکی فرێکەمە د دووڤ تە ڕا و دێ بێژمێ بلا تە بدانتە جهەکێ تایبەت و هەر شریناهی و ساڕدەمەنیەکا تە بڤێت بلا بۆ تە بینیت."

"نه نه، من دڤێت تو من دگەل خوە ببەی."

"مەریەم جان!"

"هەروەسا من دڤێت تو خوشك و برایێن من یێن دی ژی دگەل خوە بینی، من دڤێت وان بنیاسم و ئەم هەموو پێکڤە بچینە سینەمایێ، من ب تنێ ئەڤ چەندە دڤێت."

جەلیل بۆ ماوەیەکی بێدەنگ ما و تەماشەی ئاراستەیێ چیایی کر و هزرێن خوە دکرن کا چەوا دێ مەریەمێ رازی کەت.

مەریەمێ ئینا بیرا وی کو جارەکێ وی گوتبوویێ سەروچاڤێن مرۆڤان ل سەر شاشەیا سینەمایێ گەلەك مەزن خویا دکەن و قەبارەیێ وان هندی یێ خانیەکی یە. هەردیسان گوتبوویێ دەمێ د فلمەکی دا ترۆمبێلەك تووشی روودانەکێ دبیتن مرۆڤ هەست پێدکەت ئاسنێن وی دچنە دناڤ هەستیکێن لەشێ مرۆڤی را.

دگەل گوتنا ڤان سحبەتان، مەریەمێ دئینا پێشچاڤێن خوە ئەو یا ل جهەکێ تایبەت یێ سینەمایێ رووشنتیە خوارێ و یا ئایس کریمان دگەل خوشك و برایێن خوە و جەلیلی دخوت.

پاشی وێ گوت: "باب، من ب تنێ ئەڤ داخوازیە هەیە و من چ تشتێ دی نەڤێت."

جەلیلی ب دێمەکێ بێزار تەماشەی وێ کر و گوت: "باشە سوباهی ل دەمێ نیڤرو، ئەز و تو ل ڤی جهی دێ هەڤدوو ببینە ڤە. باشە، سوباهی."

پاشی وی داخواز ژێ کر بهێتە نێزیکی وی و ئەو دا بەر سینگێ خوە و بۆ ماوەیەکێ درێژ هەمبێز کر.

★★★

ل دەستپێکێ نانا گەلەك تۆرەبوو بەردەوام ل دور خانی دزڤری و ب دەستێن خوە کولم ل دیواری ددان.

"ژ ناڤ هەموو کچان، نزا بوچی خودای ئەڤ کچە دا من؟ ل سەر خاترا وێ من خوە ل بەر گەلەك دەرد و نەخوشیان گرت. تو چەوا دوێری ئەڤرۆکە هزرا هندێ بکەی ژ دەڤ من بچی و من بهێلیە ب تنێ؟ ژ راستا تو کچەکا بیژی و خاپینوکی."

پاشی وێ ل مەریەمێ کرە هەوار و بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "ئاه بۆ تە ئەی کچکا بێ ئاقل! تو هزر دکەی تو گەلەك یا گرنگ و خوشتڤی ل دەڤ وی؟ تو هزر دکەی دێ

یا ب قەدر بی دناڤ مالا وی دا؟ تو هزر دکەی تو کچا وی و ئەو دێ تە دگەل خوە بەت دا دناڤ مالا وی دا بژی؟ دا بۆ تە تشتەکی بێژم و گوهێ خوە باش بدە من: دلێ زەلاّمی گەلەك یێ ڕەق و بێ دلوڤانیە، ئەو نە وەکو مالبچووکێ دایکێ یە و خوین ژێ ناهێت و مەزن نابیت داکو جهێ تە دناڤ دا بکەت. د دنیایێ هەموویێ دا ب تنێ ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم و من ژبلی تە کەسێ دی نینە. ئەگەر ئەز بمرم، تە کەسێ دی ل ڤێ جیهانێ نامینیت و دێ مینیە بێ خودان و کەس گرنگیێ ب تە نادەت."

لێ پشتی دەمەکێ کورت، پیچەکێ هەست ب پەشیمانیێ کر و ب خەمگینی ڤە گوت: "ئەگەر تو بچی ئەز دێ مرم، یەکسەر دێ ئەجنە هێنە د گیانێ من دا و دێ من کوژن. سەحکێ مەریەم ئەڤ جارە ئەز نامینمە ساخ. هیڤی دکەم من نەهێلە ب تنێ و ژ دەڤ من نەچە. تو بچی ئەز دێ مرم."

لێ مەریەم هەر بێدەنگ ما و چ ئاخفتن نەگوتن.

"تو دزانی مەریەم جان ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم."

مەریەمێ بۆ وێ دیارکر کو ئەو وێ ناهێلتە ب تنێ و ژدەڤ ناچیت بەلکو ب تنێ دێ چیتە پیاسەکێ و سەڤایێ خوە گوهۆڕیت.

مەریەم نەشیا زێدەر بمینتە ل دەڤ دایکا خوە چونکی دترسیا دایکا وێ هندەك تشتان بێژیتێ و دلێ وێ بریندار بکەت، هەردیسان بابەتێ چوونا ئەجنەیان ژی بۆ ناڤ گیانێ وێ دا درەو بوو، ژبەرکو جەلیلی گوتبوو مەریەمێ کو چ ڕاستی بۆ ڤێ چەندێ نینن، بەلکو ئەڤ چەندا ب سەرێ وێ دهێت نەساخیەکە و ئەگەر ئەو حەبك و دەرمانان بخوت دێ ڕەوشا وێ باشتر لێ هێت. وی داخواز ژ مەریەمێ کر بلا پرسیارا دایکا خوە بکەت کا بوچی ڕازی نابیت نوشدارێ جەلیلی یێ تایبەت چارەسەریا وێ بکەت و کا بوچی وان حەبکان ناخوت یێن جەلیل بۆ وێ دئینیت.

هەروەسا وی گوتێ ئەگەر تە شیانێن دەربڕینێ هەبن، پێدڤیە تو ئێدی ل بەر سینگێ نانایێ ڕاوەستی و بێژیێ: "ئەز ئێدی ژبەر فەند و فێل و درەوێن تە واستیام و ڕازی نابم ئێدی وەکو ئامیرەکی بم د دەستێن تەدا و تو ب کەیفا خوە من بینی و ببەی. ئەز ماندی بووم هندی تو ڕاستیێن ژیانا من بەرزەدکەی و هندەك تشتێن ب درەو بۆ من دبێژی."

تو دشێی بێژیێ: "نانا تو دترسی، تو دترسی ئەز وێ بەختەوەریێ ب دەستخوە ڤە بینم یا کو تو نەشیای ب دەستخوە ڤە بینی. تە نەڤێت ئەز یا بەختەوەر بم و تە نەڤێت من ژیانەکا خوش و ئارام هەبیت. ب ڕاستی تو خودانا دلەکێ ڕەق و بێ دلوڤانی."

***

ل سەر لێڤا گرەکێ نێزیکی مالا وان، جهەکێ بلند هەبوو مەریەمێ گەلەك حەز ژێ دکر و بەردەوام دچوو وێرێ و دروونشت. ل وی جهی گیایەکێ گەرم و بایەکێ فێنك دهات. ل بەر سینگێ وی ژی دیمەنێ خانیێن باژێرێ هیراتێ خویا دکر هەروەکو یاریا پارچەیێن پێکڤە گرێدانێ. باخچەیێ ژنان دکەفتە لایێ باکوری و بازاڕ و شوونوارێن کەلها ئەسکەندەرێ مەزن ژی ل باشوری بوون. هەروەسا ئەو دشیا ژ دوور ڤە منارەیێن بلند یێن مزگەفتان ژێکجوودا بکەت هەروەکو کا چەوا مرۆڤ تبلێن دەستێن خوە ژێکجوودا دکەت.

هەردیسان وێ جادەیێن پڕی مرۆڤ و ب قەرەبالغ و عەرەبانێن ب دووڤ هێستران ڤە ددیتن. وێ کومەکا چووچکان دیتن کو یێن ب ئازادی و بلەز دفڕن. وێ حەسوودی ب ڤان چووچکان دبر چونکی ئەو یێ ل هیراتێ و ل سەر مزگەفت و باژێری دفڕن، دبیت وان هندەك جاران دادابیتە سەر دیوارێن مالا جەلیلی یان ژی کورسیکێن پێشیێ یێن سینەمایا وی.

وێ دەهـ بەر ئینان و برێزکرن و پاشی ل سەر سێ گرۆپان دابەشکرن. وێ هندەك جاران ئەڤ یاریە بۆ خوە دکر ب تایبەت دەمێ چاڤێ نانایێ ل وێ نەبایە یان یا ژێ دووربایە. وێ چوار بەر ددانانە د گرۆپێ یەکێ دا کو دەربڕین بوو ژ هەر چوار زارۆکێن هەڤژینا جەلیلی یا یەکێ کو خەدیجا بوو، سێ بەر ژی د گرۆپێ دووێ دا کو ئەو ژی زارۆکێن هەڤژینا وی ئەفسونێ بوون و سێ بەر ژی د گرۆپێ سیێ دا کو ئەو ژی زارۆکێن هەڤژینا وی نێرگزێ بوون، ل دوماهیێ ژی، دا گرۆپێ چوارێ پیچەکێ ژ وان دوورتر دانیت و دا بەرێ ژمارە یازدە ب تنێ کەتە د وی گرۆپی دا.

***

ل سپێدەهیا ڕۆژا پاشتر، وێ کراسەکێ ڕەنگ پیڤازی و پەنتەرۆنەکێ پەمپی کرنە بەر خوە و دەرسوکەکا کەسك ژی کرە سەرێ خوە. هەرچەندە ئەو پیچەکێ یا دوودل بوو

ژبەر ڕەنگێ دەرسوکا خوە کو ل سەر جلکێن وێ نەدهات لێ ئەو یا نەچاربوو بکەتە سەرێ خوە چونکی دەرسوکا وێ یا سپی هندەك کون تێدا پەیدابببوون.

پاشی وێ دەمژمێرا خوە یا دەستی کرە دەستێ خوە کو دەمژمێرەکا کەڤن و ڕەنگ کەسك بوو، لێ میل و ژمارەیێن وێ د ڕەش بوون. ئەڤ دەمژمێرە دیاریا مەلا فەیزوللاهی بوو ژ بۆ وێ.

دەمێ تەماشە کریێ دیت نوکە دەمژمێر نەهی سپێدێ یە. وێ د دلێ خوە دا پرسیار دکر کا نانا ل کیڤەیە. هزرکر بچیتە ژ درەڤە و ل وێ بگەرییێت، لێ دترسیا نانا ببیتە ڕێگر د ڕێکا وێ دا و ل بەر سینگێ وێ ڕاوەستیت و ئاخفتنێن کرێت بێژیتێ و وێ ب کەسەکا خیانەتکار ل قەلەم بدەت و سفکاتییێ ب خەون و هیڤیێن وێ بکەت.

داکو وەخت زووکا بچیت، وێ دەست هاڤێتە پێنۆس و کاغەزەکێ و دەست ب کێشانا وێنەیێ فیلەکی کر بێی کو پێنۆسێ خوە ل سەر کاغەزێ ڕاکەت هەروەکو کا چەوا بەری نوکە جەلیلی نیشا وێ دای، وێ چەندین جاران ئەڤ وێنەیە دووبارە کر هەتا شڕبووی و ژ ڕوونشتنێ بێزار بووی، لێ دگەل هندێ ژی وێ خوە درێژ نەکر داکو کراسێ وێ نەقورمچیت.

دەمێ دەمژمێر بوویە یازدە و نیڤ، مەریەمێ بەرێ خوە یێ ژمارە یازدە ژ دەستێن خوە هاڤێت و چوو ژ مالێ دوورکەفت. دەمێ ئەو ب ڕێکێ ڤە دچوویە سەر ڕووباری، وێ دیت نانا ل سەر کورسیکەکێ ل بن سیبەرا دار چنارێ یا ڕوونشتیە لێ وێ نەزانی کا بەرێ نانایێ ل وێ بوو یان نە.

دەمێ ئەو چوویە سەر ڕووباری، ل وی جهی ما چاڤەڕێ یێ ڕۆژا بەری هینگێ بابێ وێ گوتییێ سوباهی ل ڤێرێ بە، ل وی دەمی هندەك عەورێن ڕەنگ گەور ل ئەسمانی بوون و شێوێ وان وەکو یێ ڤەرنابیتێ بوون کو دچوونە دناڤ یەك دا و ژێکدهاتنە دەرێ.

بەری هینگێ جەلیلی گوتبوویێ کو عەورێن گەور ڕەنگێ خوە ژ چراتیا چپکێن ئاڤێ وەردگرن و بەشێن وان یێن سەری تیرۆژکێن ڕۆژێ دمێژن و دبنە ئەگەر ل بەشێن وان یێن خوارێ ب ڕەنگێ گەور خویا بکەن. وی گوتبوویێ: تو دبینی مەریەم جان کا چەوا تارپاتییێ خوە دناڤ ناخێ خوە دا ڤەشارتیە.

پشتی بورینا دەمەکی ئەو زڤڕی مال، لێ ئەڤ جارە د ڕەخێ سیمەیێ ڕۆژئاڤایێ خانی و د پشت ڕا هاتە د ژوور ڤە داکو نانا وێ نەبینیت. پاشی وێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر. وێ هزرا خوە کر و گوت: "جەلیل کەسەکێ خۆدان کارە، چ پێنەڤێت کارێ وی ئەو یێ گێرو کری."

دووبارە ئەو زڤڕی سەر ڕووباری و بۆ ماوەیەکێ درێژ چاڤەڕێی وی ما، باڵندەیێن ڕەش ل نێزیکی وێ دادان و خوە دناڤ گیایی دا دڤەشارتن. هەروەسا وێ تەماشەی پەلاتینکان دکر کا چەوا بۆ خوارنێ ل سەر کولیلکێن داران دگەرییێن.

ئەو هند چاڤەڕێی جەلیلی ما هەتا پێن وێ واستیاین، ل دوماهییێ وێ بڕیاردا ژ دەڤ ڕووباری بچیت، لێ ئەڤ جارە ئەو بەرەڤ مال نەچوو بەلکو پەنتەرۆنێ خوە هەتا سەر چووکان هلدا و د ناڤ ئاڤا ڕووباری ڕا دەربازبوو. ئەو بۆ یەکەم جار بوو ئەو ژ وی گری بهێتە خوارێ و بەرەڤ باژێرێ هیڕاتێ بچیت.

***

ئەو گوتگوتکێن نانایێ ل دور باژێرێ هیڕاتێ بۆ وێ دڤەگێڕان هۆسا نەدەرکەفتن، کەسێ تەماشەی وێ نەکر و کەسێ پێ نەدکرە کەنی ژی. مەریەم دناڤ جادەیێن پڕی ڤەرەبالغ ڕا دەرباز دبوو کو یا پڕ بوو ژ خودانێن پایسکلان و عەرەبانێن ب دووڤ هێستران ڤە. کەسێ بەر د وێ وەرنەدکرن و کەسێ ژی نەدگوتێ کچکا بیژی، هەتا کەسێ ئاگەهـ ژ وێ نەبوو. ب ڕاستی ژی ئەڤ چەندە بۆ وێ گەلەك یا سەیر بوو ڤەت وێ باوەرنەدکر کو ئەو ژی کەسەکا ئاسایی یە وەکو هەموو کەسێن دی یێن دناڤ باژێری دا.

مەریەم بۆ ماوەیەکی ل دەڤ برکەکا ئاڤێ یا ڕەنگ سپی یا بازنەیی ل نیڤا باخچەیەکێ مەزن ڕاوەستیا کو چەندین ڕێکێن بەران ل دوماهیا وێ د گەهشتنە یەك. وێ دەستێ خوە ل هندەك بەرێن مەرمەری یێن ل سەر لێڤا برکا ئاڤێ ددا و تەماشەی ئاڤا وێ دکر. هەروەسا ل ویێڤەتری وێ هندەك زارۆکێن بچووك پاپۆرێن کاغەزی بۆ خوە دروستکربوون و دهاڤێنە د برکێ دا و یاری پێ دکرن.

دناڤ وی باخچەی دا، وێ گەلەك جورێن داروبار و گولان دیتن وەك گول شلێر و گولەباخ و گول پەتونیا. ڤان گولێن جوان تیرۆژکێن ڕۆژێ دناڤ خوە دا هەمبێز دکرن.

خەلك ژی ل سەر وان ڕێكێن بەران دهاتن و چوون و ل سەر كورسیكان دڕوونشت و بێهنا خوە ڤەددان و هندەكان ژی چا ڤەدخوار.

وێ قەت باوەرنەدكر ئەو یا ل جهەكێ هۆسا، دلێ وێ گەلەك بلەز خوە دقووتا و هیڤی دخواست نوكە مەلا فەیزوللاهی ئەو ل ڤێرێ دیتبایە و هاتبایە دەڤ وێ داكو ب چاڤێن خوە ببینیت ئەو چەند یا وێرەك و ب جسارەتە. ئەوێ ب خوە بۆ خوە ژیانەكا نوی هەلبژارت ئەو ژیانا ل ڤی باژێری چاڤەڕێی وێ دكەت. ژیانەكا نوو دگەل باب و خوشك و برا، ژ نوكە وێ ڤە ئەو دشێت حەژێكرنێ بێی بەرامبەر وەربگریت بێی كو كەسەك خورتییێ ل وێ بكەت یان بۆ وێ ب شەرم بهەژمێریت.

پشتی هینگێ ئەو چوو سەر جادەیا گشتی یا بەرفرەه. ئەوا ب ڕەخ باخچەی ڤە و ل بەر چەندین فرۆشیارێن گەرۆك ڕا بوری كو ژبەر تیشكا ڕۆژێ یا دژوار دێمێن وان ڕەش ببوون. ئەڤ فرۆشیارە ل بن سیبەرا داران ل بەر كەلوپەلێن خوە وەك برنج و ئار و سندوقێن تری د ڕاوەستای بوون و تەماشەی خەلكی دكرن بچن تشتەكی ژێ بكرن.

زارۆكێن پێخواس ژی ب دووڤ ترۆمبێل و پاسان دكرە غارێ و چانتێن بیهان ب ملێن وان ڤە بوون. مەریەم ل گوشەیەكا سەر جادێ ڕاوەستیا و تەماشەی وی خەلكی دكر یێ د وێرێ ڕا دهات و چوو، ئەو حێبەتی دما و تێنەدگەهشت كا بوچی ڤی خەلكی ئاگەه ژ دیمەنێن بالكێش یێن دەروبەری خوە نینە.

پشتی بێهنەكێ، وێ وێرەكی دا خوە و پرسیار ژ خودانێ پاسەكێ یێ دانعەمر كر كا ئەو مالا جەلیلێ خودانێ سینەمایێ ڤێدكەڤیت. ڕوویێن وی پیرەمێرێ دانعەمر د مەزن بوون و عەبایەكێ نەخشاندی ب ڕەنگێن كەسك و سۆری ل بەربوون. وی بەرسڤا مەریەمێ دا و گوتێ: "هۆسا دیارە تو نە خەلكا هێراتێی، مانە هۆسایە؟ چونكی هەموو خەلكێ ڤی باژێری دزانن كا مالا جەلیل خانی ل كیڤەیە."

"تو دێ شێی مالا وی نیشا من دەی؟"

پیرەمێرێ دانعەمر چكلێتەكا نخافتی ژ بەریكا خوە ئینا دەرێ و دا مەریەمێ.

"ئەرێ ما تو یا ب تنێ؟"

"بەلێ."

"باشە سوواری پاسێ بە دێ تە گەهینمە بەر دەرگەهێ مالا وی."

"بەلێ پا من چ پارە نینن کریا سوواربوونێ بدەمە تە."

"باشە ئاریشە نینە، هەتا دوو دەمژمێرێن دی من چ کار نینن و بەری نوکە ژی د پلانا من دا بۆ بچمە مال، هەرچەوا بیت مالا جەلیلی ژی یا د ڕێکا من دا."

مەریەم سوواری ترۆمبێلێ بوو و ل سەر کوشنەکێ ل بەر پەنجەرکێ ڕووشنتە خوارێ. ئەو ڕێك تا ڕادەیەکی یا بێدەنگ و ڤالا بوو. ب ڕێکێ ڤە وێ تەماشەی جهێن فرۆتنا گیایێن نوشداری و دکانێن دەرگەهـ ڤەکری و بەردای دکر کو کەلوپەل و فێقی یێن خوە وەك پرتەڤال و هرمیك دانابوونە بەر دەرگەهی، هندەکان ژی پەرتووك دفرۆتن و هندەکێن دی باڵندەیێن جوان و باز د فرۆتن.

پیرەمێرێ دانعەمر چوو سەر جادەیەکێ کو هەردوو لایێن وێ پڕی دارێن کاژان بوون، پاشی پاسا خوە ل نیڤا ڕێکێ ڕاوەستاند و گوتە مەریەمێ: "ئاها وا هە مالا وی یە، سەحکێ هۆسا دیارە ئەڤرۆ تو یا ب بەختی چونکی ترۆمبێلا وی یا ل بەر دەرگەهی."

مەریەم ژ پاسێ هاتە خوارێ و سوپاسیا خودانێ پاسێ کر و بۆ گڕنژی.

★★★

بەری نوکە مەریەمێ دەستێ خوە نەکربوو چ ترۆمبێلان، ژبەر هندێ دەمێ ئەو دبەر ترۆمبێلا جەلیلی ڕا هاتی دەستێ خوە ل سەر لایەکێ وێ دخشاند. ڕەنگێ ترۆمبێلا وی یا ڕەش بوو و تائیرێن وێ ژی د پاقژ بوون. مەریەمێ ڕەنگڤەدانا دێمێ خوە ب مەزناهی ل سەر لایێ ترۆمبێلێ ددیت. کوشنێن ترۆمبێلا وی ب قوماشەکێ سپی هاتبوونە نخافتن. ل پشت ستێرنێ هاژووتنێ، وێ هندەك ڤودیکێن ڕۆناهیێ یێن بادای ددیتن کو میل ب پشتا وان ڤە بوون.

بۆ ماوەیێ خولەکەکێ، دەنگێ نانایێ خو د سەرێ وێ دا ڤەدا دەمێ لێ دکریە ڤێری و خەون هیڤیێن وێ ژ بنی د هەلکێشاین.

ب دوو پیێن لەرزی ڤە، مەریەم هەتا بەر دەرگەهێ حەوشا مالا جەلیلی چوو پاشی دەستێن خوە دانانە سەر دیوارێ مالێ کو تا ڕادەیەکی یێ بلند بوو، ژبەر هندێ ئەو نەچاربوو ستۆیێ خوە بلند بکەت داکو گوپیتکا دارێن کاژێن دناڤ مالا وی دا ببینیت. ژ لایەکێ ڤە، چەڤێن هندەك داران ژبەر بای دچەمیان، مەریەمێ بۆ خوە خوشکر و هزرکر

ئەڤ بەلگە يێ ب خێرهاتنا وێ دکەن و سەرێ خوە ژ بۆ وێ د چەمینن. پشتی هینگێ وێ خوە ئارام کر و دەرگەهێ مالێ قوتا.

ژنەکا گەنج و پێخاس هات دەرگەهـ ڤەکر، نیشانەك ل بن لێڤا وێ یا بنی بوو.

"ئەز یا هاتیم دا جەلیلی ببینم، ئەز مەریەما کچا وی مە."

ل دەستپێکێ ئەو ژن پیچەکێ نەئارام بوو، لێ پاشی وێ مەریەم نیاسی و گرنژینەکا سادە و پێتی ل سەر دێمێ وێ دیاربوو. وێ گوت: "باشە نوکە ل ڤێرێ چاڤەرێ بە."

پشتی بورینا چەند خولەکان، زەلامەکی دەگەهـ ڤەکر کو بەژنا وی یا درێژ و ملێن وی د پەحن بوون و سیمایەکێ ئارام و ل سەر خوە هەبوو. وی ب دەنگەکێ تا رادەیەکی تۆرە گوتە مەریەمێ: "ئەز شۆفێرێ جەلیل خانی مە، تە چ دڤیا؟"

"تو کی؟"

"من گوت ئەز شۆفێری وی مە، لێ ئەو ئەڤرۆکە نە ل مالە."

"بەلێ پا من ترۆمبێلا وی دیت."

"ئەو گەلەك یێ ژ ڤێری دوورە و بو کارەکێ تەنگاڤ یێ دەرکەفتی."

"باشە دێ کەنگی زڤریت؟"

"نەگوتیە دێ کەنگی زڤرم."

"باشە پا ئەز دێ ل ڤێرێ چاڤەرێی وی بم.

ئەو زەلام چوو د ژوور ڤە و دەرگەهـ گرت، مەریەم ل بەر دەرگەهێ مالێ روونشت و چوکێن خوە گەهاندنە بەر سینگێ خوە.

ئەو دەم دەستپێکا ئێڤاری بوو، مەریەم ژی گەلەك یا برسی بوو ژبەر هندێ ئەو چکلێتا شۆفێرێ پاسێ دایێ ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و خوار. پشتی بێهنەکێ جارەکا دی شۆفێرێ جەلیلی دەرگەهـ ڤەکر و گوتێ: "پێدڤیە تو نوکە ژ ڤێرێ بچی چونکی پشتی دەمژمێرەکا دی دێ دنیا بیتە تاری."

"من چ ئاریشە دگەل تاریاتیێ نینن و ژمێژە ئەز یا فێری وێ بوویم."

"بەلێ دێ کەشوهەوا ژی گەلەك سار بیت، تو چ دبێژی ئەز تە ب ترۆمبێلێ بگەهینمە مال؟ ئەگەر ئەو زڤری مال دێ بێژمێ کو تو هاتبوویە ڤێرێ."

مەریەمێ تەماشەی وی کر بێی کو بەرسڤا وی بدەت.

"باشه، دێ ته گەهینمه هوتێلەکێ و تو ل وێرێ دشێی بێهنا خوه ڤەدەی و سەحکێ کا هەتا سپێدێ دێ چ ڕوودەت."

"بهێله ئەز بهێمه د ژوور ڤه."

"ببوره من ئەو دەستهەلاْت نینه ته ببەمه د ژوور ڤه. گوهێ خوه باش بدێ، کەس نزانیت کا کەنگی ئەو دێ زڤڕیت، دوور نینه بۆ ماوەیێ چەندین ڕۆژان گیرو ببیت."

مەریەمێ هەردوو دەستێن خوه کرنه تێکدا و دانانه سەر سینگێ خوه، شۆفێری ژی بێهنا خوه کوور هەلکێشا و ب ئارامی تەماشەی مەریەمێ کر.

بۆ ماوەیێ چەندین سالان ل سەر بورینا ڤێ ڕۆژێ، مەریەمێ بەردەوام هزرێن خوه دکرن کا چەند ئاڕاستەیێ ژیانا وێ دا هێته گوهۆڕێن ئەگەر وێ هێلابایه شۆفێرێ جەلیلی وێ بگەهینته مال، لێ ئەوێ ئەڤ چەنده نەکر.

مەریەم ل بەر دەرگەهێ مالا جەلیلی ڕوونشت ڤه و چاڤێ وێ ل ئەسمانی بوو کا چەوا ڕەشاتیا شەڤێ هێدی هێدی یا پەڕێن خوه ب سەر باژێری داددەت و بەر دەرگەهێ مالێ ژی تاڕی بوو. ئەو ژنا خودانا نیشانێ هندەك نان و سێنیکەکا برنجی بوو ئینان. مەریەمێ گوتێ ئەز ناخوم لێ وێ ئەو خوارن نەزڤڕاند، بەلکو هێلا ل بەر دەرگەهی.

پشتی هینگێ مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ پێن خەلکی دبوو دەمێ ل سەر جادەیێ بەرەڤ مالێن خوه دچووین، هێدی هێدی ڕۆناهی دهاتنه هەلکرن و گلۆپێن کارەبێ مال ڕوهن دکرن و دەنگێ ڕەوینا سەیان ژی بلند دبوو. دەمێ مەریەمێ زێدەتر خوه ل بەر برسێ نەگرتی، نەچاربوو وێ پارچا نانی و برنجێ بخوت.

دەمێ دنیا بوویه سپێدە، مەریەمێ دیت کەسەکی ئەو یا نخافتی. هۆسا دیارە شڤێدی کەسەکی بەتەنیەك یا دانایه سەر لەشێ وێ داکو سارڕ نەبیت.

شۆفێری ملێ وێ هەژاند و گوتێ: "ئەڤ چەنده بەسە، هیڤی دکەم زێدەتر نەخوشیێ بۆ مه چێنەکە، نوکه دەم هات تو ژ ڤێرێ بچی."

مەریەم ڕابوو ڤه و چاڤێن خوه پەرخاندن. پشتا وێ و ملێ وێ ژبەر نڤستنا وێ یا شڤێدی ل بەر دەرگەهی شل ببوون. وێ گوته شۆفێرێ: "نەخێر ئەز دێ هێشتا چاڤەڕێی وی بم."

"گوهێ خوە بدە من، جەلیل خانی گوتی پێدڤیە نوکە تو وێ بزڤڕینیە مال، تو تێگەهشتی؟ جەلیل خانی یا وەگوتی."

پاشی شۆفێری دەرگەهێ پشتێ یێ تڕۆمبێلێ و ڤەکر و ب ئارامی گوتێ: "نوکە وەرە سووار ببە."

مەریەمێ ب چاڤێن ڕۆندك ڤە گوت: "بەلێ پا من دڤێت ئەز وی ببینم."

"گوهێ خوە بدە من خانما بچووك، وەرە دا تە بزڤڕینمە مال."

مەریەم پیچەکێ ڕاوەستیا و پاشی کرە غار و بەرەڤ دەرگەهێ مال ڤە چوو، هەرچەندە شۆفێری ئەو ژ پشتێ ڤە گرت و نەهێلا بچیتە ژوور لێ هەر زوو ئەو شیا خوە ژ دەستێن شۆفێری بینتە دەرێ و دەرگەهـ ڤەکر و چوو د ژوور ڤە.

د ماوەیێ چەند خولەکێن مەریەم دناڤ باخچەیێ مالا جەلیلی دا مای، چاڤێن وێ ب گەلەك دیمەنێن جوان کەفتن. خانیەکێ شووشەی کو هندەك دار و شینکاتی تێدا هاتبوونە چاندن، هەروەسا چەڤێن دارا تری بەرەڤ مێوێ ڤە بلند ببوون. حەوزەکا ماسیان کو ب بەرێن ڕساسی هاتبوو چوارچووڤە کرن، دارێن فێقی و دارێن بچووك ل هەموو جهان هەبوون.

پشتی وێ تێر تەماشەی ڤان دیمەنان کری، بەرێ وێ ب پەنجەرکەکێ ل ڤاتێ دووێ کەفت کو کەسەك تێدا بوو. هەرچەندە زووی ژبەر پەنجەرکێ چوو دەستێ خوە هاڤێتە پەردێ و دا بەر، لێ د وی ماوەیێ کورت دا مەریەم شیا هەردوو چاڤێن وی یێن مەزن و دەڤێ وی یێ پەحن ببینیت.

پشتی هینگێ دوو دەستان ژ پشتێ ڤە ئەو بلند کر، مەریەمێ چووکەك ل بن زکێ وی دا و بەرێن وێ هەموو ژ بەریکا وێ کەفتن، مەریەمێ بەردەوام پێهن ددانا شۆفێری و دکرە گری هەتا ئەو کریە د پشتا تڕۆمبێلێ دا.

***

شۆفێری دەمێ تڕۆمبێل دهاژووتی، ب دەنگەکێ نزم و ئارام دگەل مەریەمێ دئاخفت. لێ مەریەمێ ڤەت گوهداریا ئاخفتنێن وی نەدکر و ب درێژاهیا ڕێکێ بەس دکرە گری، ڕۆندکێن وێ یێن خەمگینی و تۆڕەیی و بێهیڤیبوونێ بوون. لێ ب شێوەیەکێ گشتی ڕۆندکێن وێ یێن شەرمینییێ بوون، شەرمینیەکا کوور ل دەڤ وێ پەیدابوو.

ژ نوو هاته سەر هزرا وێ کا ئەو چەند یا خشیم و نەفام بوو دەمێ وێ هندە حەز ژ جەلیلی دکری ئەوێ نوکە نەهێلای بچیتە د مالا وی ڤە. ل سەر خاترا وی، ئەو چەند یا دوودل بوو کا کیژ کڕاسی بکەتە بەر خوە، یان کیژ دەرسوک دێ ل سەر جلکێن وێ هێت، یان ژی کا چەوا وێ ئەڤ ڕێکا هندە دوور دابوو بەر سینگێ خوە و نەدڤیا ژبەر دەرگەهێ مالا وی بچیت. مەریەم وەکو سەیەکێ بەردای وێ شەڤێ هەتا سپێدێ ل بەر دەرگەهێ مالا وی نڤست.

ئەوێ گەلەك شەرم ژ خوە دکر کا چەوا وێ دیمەنێ خەمگین یێ دایکا خوە و چاڤێن وێ یێن پڕی ڕۆندك ژبیرکرن. نانایێ بەردەوام ئەو ژ ڤان تشتان ئاگەهدار دکر، ئەوێ هەموو گاڤان ڕاستی دگوت و نوکە ژی ئاخفتنا وێ ڕاست دەرکەفت.

مەریەمێ بەردەوام هزرێن خوە د وان سەروچاڤان دا دکر یێن وێ د پەنجەرکا ڤاتێ دووێ دا دیتین. وی دل دا مەریەم وێ شەڤێ هەموویێ ل بەر دەرگەهی بنڤیت، بەلێ ل بەر دەرگەهی. مەریەمێ بەردەوام دکرە گری و هزر دکر نوکە خەلکێ هیڕاتێ هەموویێ ل وێ سپێدێ زانیە کا چ هاتیە سەرێ وێ و شەرما وێ چوویە ڤە. وێ هیڤی دخواست نوکە مەلا فەیزوللاھ ل دەڤ وێ بایە داکو سەرێ خوە دانابایە سەر پێ وی و دلەك ل بەر دلێ وێ دابایە.

پشتی دەمەکی، ئەو گەهشتنە ڕێکەکا ئاخێ یا خواروڤیچ و دەنگێ ترۆمبێلێ نەخوش بوو، هۆسا دیارە ئەو گەهشتنە ڕێکا دناڤبەرا هیڕاتێ و گوندێ گول دامانێ دا. مەریەمێ د دلێ خوە دا پرسیار دکر کا ئەو دێ چ بێژیتە نانایێ و دێ چەوا داخوازا لێبورینێ ژێ کەت و چەوا دێ چیتە بەر سینگێ وێ.

ترۆمبێل ڕاوەستیا و شۆفێر ژێ هاتە دەرێ و گوتێ: "ئەز دێ هەتا مال دگەل تە هێم."

شۆفێری دەستێ وێ گرت و هاریکاریا وێ کر هەتا ژ ڕووباری دەرباز بووی و پاشی پێکڤە بەرەڤ مالا وان چوون و ب ڕێکێ ڤە بەحسێ هندێ بۆ دکر کا چەوا ل دەمەکێ نێزیك بایێ هیڕاتێ یێ ناڤدار بۆ ماوەیێ 120 ڕۆژان هەر سپێدێ هەتا نیڤ شەڤێ دێ بلند بیت و کا چەوا خیز و ئاخ وەکو باهۆزان دێ ڕابن.

پاشی ژ نیشکەکێ ڤە شۆفێری خوە هاڤێتە بەر سینگێ وێ و بزاڤ کر چاڤێن وێ بگریت و بەرەڤ پاشڤە پاڵدەت و دووبارە بەرەڤ وێ ڕێکێ بچن یا بەری نوکە ژێ دهاتین.

"بزڤڕە، نە سەحکە بەر سینگێ خوە، بزڤڕە و بەرەڤ پاش ڤە هەڕە!"

لێ بزاڤێن شۆفێری هند بلەز نەبوون ببنە ئەگەر مەریەم پاش ڤە بزڤڕیت.

مەریەمێ دیت بایەکێ ب هێز یێ بەلگێن دار چناران دهەژینیت، پاشی چاڤێ وێ ب دار چنارا ل بەر دەرگەهێ مالا وان کەفت، کورسیکەك ل بن دارێ بوو وەریسکەك ژی ب سەرێ دارێ ڤە هاتبوو گرێدان، ل دوماهیا وەریسکی کەلەخێ نانایێ پێڤەبوو کو خوە خەندقاندبوو.

# 6

نانا ل کوژیەکێ گۆڕستانا گوندێ دامان هاتە ڤەشارتن. ل سەر گۆڕی، مەریەم ما ل دەڤ بیبی جانێ و ژنێن دی یێن گوندی، مەلا فەیزوللاهـ ژی ل سەر لێڤا گۆڕی ڕاوەستیا و هندەك ئایەت و سەڵەوات خواندن پشتی کو کۆمەکا زەلاّمان تەرمێ نانایێ یێ کفنکری کریە دناڤ گۆڕی دا.

پشتی هینگێ، جەلیل دگەل مەریەمێ چوونە مالا وان و هندەك گوندی بۆ سەرەخوشیێ هاتنە دەڤ مەریەمێ و دلەك ل بەر دلێ وێ ددا. جەلیلی کەلوپەلێن وێ کرنە د چانتەیەکی دا و پاشی هاتە دەڤ وێ و دەستێ خوە ب سەرێ وێ دا ئینا و ب دەربڕینەکا خەمگین و ئارام پرسیار ژ مەریەمێ کر کا ئەو پێدڤی چیە.

مەریەمێ گوت: "من دڤێت مەلا فەیزوللاهی ببینم."

"چ پێ نەڤێت تو دشێی وی ببینی، ئەو یێ ژ دەرڤە و نوکە دێ گازی وی کەم دا بهێتە ژوور ڤە."

دەمێ مەلا فەیزوللاهی دەستێ خوە هاڤێتیە دەرگەهی و ب تبلێن خوە یێن زراڤ و لاواز ڤەکری، بۆ یەکەم جار د وێ ڕۆژێ هەموویێ دا ژ نوو مەریەمێ کرە گری.

مەلا هاتە ب ڕەخ وێ ڤە و دەستێ خوە ب سەر سەرێ وێ دا ئینا و دا بەر سینگێ خوە.

"بکە گری مەریەم جان. هندی تە دڤێت بکە گری چونکی چ شەرم د گریێ دا نینە، لێ کچا من بلا ل بیرا تە بیت کا قورئانا پیرۆز چ دبێژیت. خودای مەزن د قورئانێ دا دبێژیت: (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُور). قورئان ڕاستیێ دبێژیت کچا من مەریەم، ل پشت هەر تاقیکرنەك و هەر نەخوشیەکا خودا دئینتە ڕێکا مە، وی مەرەمەك پێ هەیە و حکمەتەك تێدا هەیە.

لێ مەریەمێ چ بێهنفرەهی ژ گوهلێبوونا پەیڤێن قورئانێ نەوەرگرت نە ل وێ ڕۆژێ و نە پشتی هینگێ، چونکی بەردەوام گوتنا نانایێ خوە د سەرێ وێ دا د هەژاند دەمێ گوتییێ ئەگەر تو من بجهـ بهێلی دێ مرم. چ ژ مەریەمێ نەدهات ژبلی گرییێ، ڕۆندکێن وێ یێن بێگونەهـ ژی دکەفتنە سەر دەستێن مەلا فەیزوللاهی.

★★★

دەمێ ئەو چووینە مال، جەلیل دگەل مەریەمی چوونە د پشتا ترۆمبێلێ دا و دەستێ خوە دانا سەر ملێ مەریەمێ و گوتێ: "مەریەم جان، تو دشییێ ژ نوکە وێ ڤە دگەل من بژی، من یا گوتیە مال هەر نوکە بۆ تە ژوورەکێ پاقژ بکەن، ژوورەکێ ل قاتێ دووێ، ئەز یێ پشتڕاستم تو دێ گەلەك حەز ژێ کەی چونکی د پەنجەرکا وێ ژوورێ دا تو دشێی دیمەنێ باخچەی ب تەمامی ببینی.

بۆ یەکەم جار، مەریەمێ ب گوهێن نانایێ گوهداریا ئاخفتنێن وی کر، نوکە وێ باش گوهـ ل دووڕیاتیا وی هەیە ئەوا ئەڤە چەندین سالە ئەو ل بن هێجەتێن خوە یێن درەو دڤەشێریت، ژبەر هندێ مەریەم نەشیا خوە و ب ناڤچاڤ گرێ ڤە تەماشەی وی کر.

دەمێ ترۆمبێل ل بەردەگەهێ مالا جەلیلی ڕاوەستیای، شۆفێری دەرگەهـ بۆ وان ڤەکر و چانتێ مەریەمێ ب دەستێ خوە هەلگرت. جەلیلی دەستێ خوە دانا سەر ملێ مەریەمێ و دەرگەهـ ڤەکر و پێکڤە چوونە د ژوور ڤە. د وی دەرگەهی دا یێ بەری دوو ڕۆژان مەریەم ل بەر نڤستی و چاڤەڕێی هاتنا وی دکر، ل وی دەمێ کو مەریەمێ چ تشت نەدڤیان ب تنێ ئەو نەبیت دگەل جەلیلی دناڤ باخچەیێ مالێ دا پیاسەیان بکەت.

مەریەمێ هەستپێکر کو سەردەمەکێ دی یە، وێ پرسیار ژ خوە دکر ئەرێ چەوا ژیانا وێ هۆسا بلەز سەروبنێك بوو. وێ تەماشەی ئەردی کر و پاشی تەماشەی پێن خوە کر کو یا ل سەر ڕێکەکێ ڕا دچیت ب بەرێن مەرمەری یێن ڕەنگ گەور هاتیە نخافتن.

هێشتا مەریەم ل سەر هووشێن خوە بوو، وێ دزانی هندەك کەس یێ دناڤ باخچەی دا پست پستێ دکەن، لێ دەمێ جەلیل د بەر وان ڕا چووی، خوە دانە ڕەخەکی و بێدەنگ بوون. هەردیسان وێ هەست پێدکر دوو چاڤ ب ئاورینەکا گران د پەنجەرکەکا قاتێ دووێ دا یێ تەماشەی وێ دکەن.

دەمێ مەریەم چوویە د ژوور ڤە ژێ، سەرێ وێ هەر یێ چەماندی بوو. د ژووڤە ئەو ل سەر مەحفیرکەکا گەور یا نەخشاندی ب شێوەیێن ڕەنگ زەر و سپی یێن دووبارەکری بووری. ل دووڤ دا ئەو و جەلیل ب سەر هندەك دەرەجکان کەفتن کو ئەو ژی ب هەمان جورێ مەحفیرێ هاتبوو نخافتن.

دەمێ ئەو گەهشتینە ڤاتێ دووێ، جەلیلی بەرێ وێ دا لایێ چەپێ کو مەمەرێ وێ ژی هەموو ب مەحفیران هاتبوو نخافتن. پاشی چوونە بەر دەرگەهێ ژوورەکێ و جەلیلی بۆ دەرگەهـ ڤەکر و کرە د ژوور ڤە و گوتێ: "هندەك جاران خوشکێن تە، نیلوڤەر و عەتیا، یاریان بۆ خوە د ڤێ ژوورێ ڤە دکەن، لێ پتریا جاران ئەم وێ دکەینە ژوورا مێهڤانان. ژ نوکە وێ ڤە دێ بیتە ژوورا تە، ئەز دبێژم دێ تو تێڤە یا بەختەوەر بی، یا ب دلێ تەیە مانە؟"

د وێ ژوورێ ڤە، تەختەك و بەتەنیکەکا ڕەنگ کەسك و نەخشاندی ب گولان و مێزەکا جوانیێ تێڤە بوون. پەردێن ل سەر پەنجەرکان ژی هاتبوونە بلندکرن داکو دیمەنێ ناڤ باخچەی دیار ببیت. د وێ ژوورێ ڤە چەندین چوارچووڤە ب دیواری ڤە د هەلاویستی بوون و وێنەیێ هندەك کەسان تێدابوو لێ مەریەمێ ئەو کەس نەدنیاسین. ل سەر ڕەفانکەکێ، کومەکا بووکێن داری ل دووڤ ڤەبارێ وان هاتبوونە برێزکرن.

جەلیلی دیت ئەو یا تەماشەی بووکێن لاستیکی دکەت، لەورا گوتێ: "دبێژنە وان بووکان یارییێن ماتریوشکا، من ئەو ژ بازێرێ موسکو یێن ئینایین. هەر گاڤا تە بڤێت تو دشێی یاریان دگەل بکەی، کەس مایێ خوە د تە ناکەت."

مەریەم ل سەر تەختی ڕوونشت.

جەلیلی پرسیار ژێکر: "ئەرێ تە تشتەکێ دی دڤیا؟"

مەریەمێ خوە درێژ کر و چاڤێن خوە گرتن. پشتی دەمەکێ کێم، وێ گوهلێبوو بابێ وێ هێدی دەرگەهـ گرت و چوو.

***

مەریەم د ژوورا خوە ڤە بوو ڤەت نەددەرکەفتە ژ دەرڤە، ب تنێ ئەو جار نەبن دەمێ دچوویە دەستئاڤێ ل دوماهیا هوّلا ڤاتێ دووێ. ئەو ژنا خودانا نیشانێ ژی بەردەوام

خوارن بۆ وێ دکره د فەرخەسێنیەکێ دا و دئینا ژوورا وێ. خوارنا وێ ژی کەبابێن پەزی و شۆربە بوو لێ برەکا گەلەك کێم نەبیت هەکە مەریەمێ خوارن نەدخوار.

جەلیل رۆژانە چەندین جاران دهاتە د ژوورا وێ ڤە و ل سەر تەختێ وێ دروونشت و پرسیار ژێ دکر کا ئەرێ هەموو تشت ب سەلامەتی ب رێڤە دچن.

"ئەگەر تە بڤێت، تو دشێی بهێیە خوارێ و دگەل مە خوارنێ بخوی."

وی ئەڤ چەندە دگوتە وێ بێی کو گەلەك داکۆکیێ لێ بکەت چونکی هەر زوو ئەو تێگەهشت دەمێ مەریەمێ گوتیێ کو بۆ وێ خوشترە خوارنێ ب تنێ بخوت.

د پەنجەرکێ دا، مەریەمێ ب دلەکێ شکەستی ڤە تەماشەی هندەك دیمەنان دکر کو د ژیانا خوە هەموویێ دا بەردەوام هیڤیا وێ ئەو بوو ئەو ڤان دیمەنان ببینیت وەك هاتنوچوونا جەلیلی یا رۆژانە، هاتنوچوونا خزمەتکاران یا بلەز، باخچەڤانێ بەردەوام دار دکەزاختن و ب سەروبەر دکرن و شینکاتیێن دناڤ خانیکێ شووشەی دا ئاڤ ددان.

هەردیسان ترۆمبێلێن بەردەوام ل سەر جادێ هاتنوچوون دکری و جار جارا دراوەستیاین و زەلاّمێن خودانێن ڤات و کولاڤان و ژنێن ب دەرسوك و زارۆکێن سەرێن وان ب مودیلێن جوان شانەکری ژێ دهاتنە دەرێ. هەردەمێ مەریەمێ دیتبا جەلیل یێ دچیتە دەستێ ڤان کەسێن بیانی و ل بەرامبەر هەڤژینێن وان ژی دەستێ خوە ددانا سەر سنگێ خوە و خوە بۆ خوار دکر، بۆ وێ دیاردبوو کو ئاخفتنێن نانایێ هەموو د راست بوون. ئەو سەر ب ڤێرێ ڤە نینە و دگەل وان ناگونجیت.

***"ئەرێ ئەز سەر ب چ ڤەمە؟ نوکە ئەز دێ چ کەم؟"***

***"ئەز بۆ تە هەموو تشتم د ڤێ دنیایێ دا، مەریەم، هەر دەما ئەز مریم ئێدی تە کەسێ خوە نابیت، تە چ تشت نابن و تو نابیە چ تشت."***

وەکو وی بایێ بەلگێن دار چنارا ل بەر دەرگەهێ مالا وان دهەژاندن، باهۆزێن رەشاتیەکا بەرزە دناڤ گیانێ مەریەمێ دا دهاتن و چوون.

ل رۆژا دووێ یا کو مەریەم مایە د مالا جەلیلی دا، کچکەکا بچووك هاتە د ژوورا وێ ڤە و گوتێ: "پێدڤیە ئەز تشتەکی ژ ڤێ ژوورێ ببەم."

مەریەم ل سەر تەختی ڕوونشت و پێن خوە درێژ کرن و بەتەنیك هەتا ناڤتەنگێ ل سەر خوە دانا. ئەو کچکا بچووك هەر زوو هاتە د ژوور ڤە و چوو دەرگەهەك ڤەکر و سندوقەکا گەور یا چوارگۆشە ژێ ئینا دەرێ و گوتە مەریەمێ: "ئەرێ تو دزانی ئەڤە چیە؟"

پاشی وێ سندوق ڤەکر و گوت: "دبێژنە ڤێ گرامافون، ئەو کاسێتێن موزیکی یێن تومارکری ددەتە کاری."

"ناڤێ تە نیلوڤەرە مانە و ژیێ تە هەشت سالن."

کچکا بچووك گرنژی، گرنژینا وێ ژی وەکو یا جەلیلی بوو ئەرزانکا وێ ژی یا کوور بوو.

"تو چەوا دزانی؟

مەریەمێ ملێن خوە هەژاندن بێی کو بێژیتە کچکا بچووك کو بەری هینگێ وێ ناڤێ یەك ژ بەرێن وێ بۆ خوە یاری پێ دکرن ب ناڤێ وێ ناڤکربوو.

"ئەرێ تە دڤێت گوهێ خوە بدەیە سترانەکێ؟"

جارەکا دی مەریەمێ ملێن خوە هەژاندن بێی کو بەرسڤا وێ بدە.

نیلوڤەرێ وائیرا گرامافونێ گەهاندە پلاکێ کارەبێ و کاسێتەکا بچووك ژ بن قەباغکێ سندوقێ ئینا دەرێ و دانا سەر گرامافونێ و دەرزیکا وێ دانا سەر، هۆسا موزیکێ دەستپێکر و ئەڤ سترانە هاتە گوتن:

***ئەز دێ بەرێن گولان کەمە بەربەر***
***و جوانترین نامە بۆ تە ل سەر نڤیسم***
***تو سۆلتانا دلێ منی، سۆلتانا دلێ منی***

"ئەرێ تو ڤێ سترانێ ژبەر دکەی؟"

"نەخێر."

"ئەڤ سترانە یا د فلمەکێ ئیرانی دا، من ئەو فلم جارەکێ ل سینەمایا بابێ خوە دیتبوو. ئەرێ تە دڤێت تشتەکێ دی بینی؟"

بەری مەریەم بەرسڤا وێ بدەت، نیلوڤەرێ پەحنکا دەستێن خوە و ئەنیا خوە دانانە سەر ئەردی و پێن خوە بلندکرن و ل سەر سەرێ خوە ڕاوەستیا.

پاشی وێ ب ترانە ڤە گوت: "ئەرێ تو ژی دشێی وەبکەی؟"

"نەخێر."

نیلوڤەرێ پێن خوە دانانە سەر ئەردی و کراسێ خوە ئینا خوارێ.

"باشە ئەز دشێم تەژی فێر بکەم. هەتا کەنگی دێ مینیە ل ڤێرێ؟"

"ئەز نزانم."

"دایکا من گوت تو نە خوشکا من یا ب دروستاهی، تو ژی وەدبێژی."

"نەخێر من وەنەگوتیە."

"بەلێ دایکا من گوت تە یا وەگوتی. بۆ من نەیا گرنگە. مەرەما من ئەز گرنگیێ ب هندێ نادەم کا تو خوشکا من یا ب دروستاهی یان نە، ئەڤ چەندە بۆ من نەیا گرنگە."

مەریەمێ خوە درێژ کر و گوتێ: "ئەز نوکە یا واستیایمە."

"هەروەسا دایکا من گوت ئەجنا دایکا تە یا خەندقاندی."

مەریەمێ پشتا خوە دایێ و گوتێ: "نوکە تو دشێی براوەستینی، مەرەما من وێ سترانێ براوەستینە."

وێ ڕۆژێ بیبی جان هاتە سەرەدانا مەریەمێ، دەمێ هاتیە د ژوور ڤە جلکێن وێ ژبەر بارانێ هەموو تەڕ ببوون، کەلەخێ خوە یێ مەزن دانا سەر وێ کورسیکێ یا ب ڕەخ تەختێ مەریەمێ ڤە و گازندە ژ ساخلەمیا خوە کرن.

"ڤێ بارانێ، مەریەم جان، ئەو دێ هەر من کوژیت. ئەز دێ بۆ تە بێژم، هیڤیا من ئەوە....ئوهـ. کا وەرە ڤێرێ کچا من، وەرە دەڤ دایکا خوە بیبی جانێ، نەکە گری. تو کچەکا هەژار و بەلنگازی."

وێ شەڤێ هەتا درەنگی شەڤ مەریەم نەدشیا باش بنڤیت، ئەو ل سەر تەختێ خوە یا درێژ کری بوو بەرێ وێ ل ئەسمانی بوو گوهێ خوە ددا دەنگێ پێنگاڤێن ل ڤاتێ یەکێ دهاتن، هەروەسا دەنگێ وان تەپان یێن ب دیواری دکەفتن و دەنگێ چپکێن بارانێ یێن دکەفتە سەر پەنجەرکا ژوورا وێ. دەمێ ئەو ڕابوویە ڤە، دەنگێ هندەك ڤێژیان خەو ژ

چاڤێن وێ ڤەرەڤاند، ئەو دەنگێ تیژ و تۆڕە ژ خوارێ دهات. مەریەم نەدشیا ب دروستاهی گوهـ ل وان ئاخفتنان ببیت. پاشی کەسەکی حێل دەرگەهـ ل پشت خوە گرت.

ڕۆژا دی سپێدێ، مەلا فەیزوللاهـ هاتە سەرەدانا وێ. دەمێ وێ جارەکا دی هەڤالێ خوە ل بەر دەرگەهی دیتی، ڕهێن وی یێن سپی و گرنژینا وی یا پڕی دلوڤانی و بێ ددان، جارەکا دی ڕۆندك ژ چاڤێن وێ هاتنە خوارێ.

هەر زوو وێ پێن خوە ژ سەر تەختی هاڤێتن و بلەز بەرەڤ وی ڤە و چوو و دەستێ وی ماچیکر هەروەکو کا چەوا بەری نوکە وەدکر دەمێ مەلا دهاتیە مالا وان. پاشی مەریەمێ بۆ وی کورسیکەك دانا داکو ل سەر بروونتە خوارێ. مەلای قورئانا دگەل خوە دەردئێخست و ڤەکر و دگوت: "ئەز دبێژم تە چ ئاریشە نینن هەکە ئەم وەکو هەرۆژ قورئانێ بخوینین. مانە؟"

"ئەز دبێژم تو باش دزانی کو ژ نوکە وێ ڤە ئەز نە پێدڤی ب وانەیێن تە مە، تە هەموو سوڕەت و ئایەت ل سالێن بەری نوکە یێن نیشا من داین."

مەلای پێ کرە کەنی و دەستێن خوە بلندکرن هەروەکو کو خوە تەسلیم کری، پاشی گوت: "ئەز دانپێدانێ دکەم کو ئەز ئاشکەرا بووم، لێ ئەز دشێم هزرا خوە د هێجەتەکا خراپتر دا بکەم ب تنێ دا بشێم سەرەدانا تە بکەم."

"تو نەپێدڤی ب چ هێجەتانی هەتا بشێی سەرەدانا من بکەی. تو پێدڤی نابی."

"تو ژ قەنجیێن خوە ڤێ چەندێ دبێژی، مەریەم جان."

وی قورئانا خوە داڤ مەریەمێ، هەروەکو بەری نوکە نیشا وێ دای، مەریەمێ سێ جاران ماچیکرە قورئانێ و دناڤبەرا هەر ماچیکرنەکێ دا وێ قورئان ب ئەنیا خوە ڤە دنا و پاشی قورئانا وی لێ ڤەگەڕاند.

"نوکە ڕەوشا تە یا چەوایە کچا من؟"

مەریەمێ دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت: "ئەز بەردەوام..."

ئەو ڕاوەستیا و هۆسا هەست پێدکر خوە دا بێژی بەرەك د گەوریا وێ دا ما ئاسێ.

"ئەز بەردەوام هزرێن هندێ دکەم کا دوماهیك جار وێ چ گوتبوو دەمێ من ئەو هێلای."

"نە نە نە"

مەلا فەیزوللاهی دەستێ خوە دانا سەر چوکێ خوە و گوتێ: "دایکا تە، خودا ژێ ڕازی بیت، ژنەکا دامای و نەبەختەوەر بوو. وێ تشتەکێ نەخوش ئینا سەرێ خوە، وێ ب خوە ئەڤ چەندە دگەل خوە و دگەل تە و دگەل خودای کر. خودا دێ ل وێ بوریت چونکی ئەو گەلەك یێ دلوڤانە، لێ خودا خەمگین دبیت ژبەر وی تشتێ وێ دگەل خوە کری. خودای نەڤێت کەس ژیانا خوە ب دوماهی بینیت، وی نەڤێت کەس نە ژیانا خوە یان یا کەسەکێ دی ب دوماهی بنییت چونکی وی دگوت ژیان گەلەك یا پیرۆزە، تە نوکە زانی."

پاشی مەلای کورسیکا خوە نێزیکی مەریەمێ کر و دەستێ وێ دکرە دناڤ دەستێن خوە دا و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "تو دزانی، ئەز دایکا تە دنیاسم خو دەمێ هێشتا بەری تو بهێیە سەر دنیایێ ژی دەمێ کو هێشتا ئەو کچکەکا بچووك. ئەز دبێژمە تە کو ئەو نە یا بەختەوەر بوو ئەز دبێژم ئەو ڕێکا وێ ژیانا خوە پێ ب دوماهی ئینای نە ژبەر هندێ بوو کو تە ئەو هێلابوو بەلکو دیارە ئەڤە ماوەیەکێ درێژ بوو وێ پلان بۆ دانای. مەرەما من ژ ڤێ چەندێ ئەوە کو ئەو کارێ وێ کری نە شاشیا تە بوو کچا من."

"بەلێ پا پێدڤی نەدکر ئەز وێ بهێلمە ب تنێ، پێدڤی بوو ئەز ..."

"بەس لومەی خوە بکە، ئەڤ لومەکرنە نەیا باشە مەریەم جان. تە گوهـ ل من هەیە کچا من؟ ڤان هزران نەکە چونکی دێ زیانێ گەهینە تە. ئەڤ چەندە شاشیا تە نەبوو، نەخێر یا تە نەبوو."

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند و حەزدکر باوەریێ ب گوتنێن مەلای بینیت و بۆ خوە قەناعەتێ چێکەت لێ ئەڤ چەندە پیچەکێ یا ب زەحمەت بوو.

★★★

پشتی حەفتیەکێ، ل دەمێ پشتی نیڤرو دەرگەهـ هاتە قوتان و ژنەکا بلند و دێمێ وێ سپی و سەر سۆر و تبل درێژ هاتە د ژوورا وێ ڤە و گوتێ: " ئەز ئەفسونم دایکا نیلوڤەرێ، بوچی تو ناهێی سەرێ خوە بشوی و بهێیە خوارێ دگەل مە؟"

مەریەمێ گوتێ من دڤێت ئەز بمینمە ب تنێ د ژوورا خوە ڤە.

"نەخێر، تو تێناگەهی، پێدڤیە هەر نوکە تو بهێیە خوارێ چونکی دڤێت ئەم پێکڤە باخڤین، بابەتەکێ گرنگ هەیە دێ ل سەر ئاخڤین."

# 7

جەليل و هەڤژينێن خوە ل بەرامبەر مەريەمێ ل سەر مێزەكا دارى يا ڕەنگ قەهواى يێ تارِى ڕوونشتنە خوارێ. ل سەر وێ مێزێ گولدانكەكا كريستالى هەبوو هندەك گولێن مارگريتا يێن نوو هاتينە كرن تێدابوون. هەرديسان دولكەكێ ئاڤێ يێ جوان ژى ل سەر ڕەخەكێ وى يێ داناى بوو.

ئەو ژنا سەر سۆر يا بەرى هينگێ خوە وەك دايكا نيلوڤەرێ دايە نياسين كو ناڤێ وێ ئەفسون بوو، ل لايێ چەپێ يێ جەليلى يا ڕوونشتى بوو هەردوو هەڤژينێن وى يێن دى نێرگز و خەديجا ژى ل لايێ وى يێ ڕاستێ د ڕوونشتى بوون.

هەڤژينێن وى دەرسوكێن ڕەش يێن ڕەنگ ڤەبى و تەنك كربوونێ، لێ د ڕاستى دا دەرسوك ل سەر سەرێن وان نەبوون بەلكو وان ل سەر ستۆ و ملێن خوە دا ئينابوونە خوارێ. ئەڤ چەندە نەدچوو د سەرێ مەريەمێ دا كو وان ئەڤ دەرسوكە ژبەر بەهيا نانايێ كربنە سەرێن خوە، دبيت ژنەك ژ وان يان جەليلى ب خوە ئەڤ چەندە پێشنيار كربيت ئەو دەرسوكان بكەنە سەرێن خوە بەرى كو مەريەم بۆ دەڤ وان بهێتە گازيكرن.

ئەفسونێ گلاسەكێ ئاڤێ ژ دۆلكى تێكر و دانا سەر وێ پارچا قوماشى يا بچووك و چوارگوشە ئەوا ل بەر سينگێ مەريەمێ و پاشى پرسيار ژێكر: "نوكە وەرزێ بهارێ يە و هێدى هێدى دنيا يا گەرم دبيت." دگەل گوتنا ڤان پەيڤان وێ دەستێ خوە ب ئەنيا خوە دا ئينا خوارێ.

پاشى نێرگزێ، كو خودانا دێمەكێ بچووك و پرچەكا ڕەش يا خەلەك بوو، پرسيار ژێ كر: "هيڤيا مە ئەوە تو يا بەختەوەر و ئارام بى ل دەڤ مە. ئەڤ كاودانە دبيت گەلەك ب زەحمەت بن بۆ تە، بەلێ گەلەك ب زەحمەتن."

هەردوو ژنێن دى ژى سەرێ خوە هەژاند وەك دەربڕينەك ل سەر هەڤبۆچونێن وان دگەل بۆچونا خەديجايێ. ل وى دەمى مەريەمێ تەماشەى بريێن وان دكر كو يێن تێكبرين

و نه ژ دل يێ بۆ دگرنژن. ل وی دەمی دەنگەکێ بێ لەزەت و نەخوش د سەرێ مەریەمێ دا دەنگڤەددا و گەوریا وێ دسۆت ژبەر هندێ وێ دەستێ خوە هاڤێتە گلاسی و هندەك ئاڤ ژێ ڤەخوار.

د ماوەیێ وێ پەنجەرکا ل پشت جەلیلی، مەریەم دشیا تەماشەی دارێن سێڤان بکەت ئەوێن کو ژ نوو کولیلکێن خوە داین. ل سەر دیوارێ ب رەخ پەنجەرکێ ژی ڤە قومسۆرەکا داری یا رەش لێ هەبوو. هەردیسان دەمژمێرەك و وێنەیەکێ چوارچووڤە کری ژی ب دیواری ڤە هاتبوونە هەلاویستن، ئەو وێنە یێ جەلیلی و سێ کورێن وی بوو، هۆسا دیاربوو وان ل گەریانەکێ ئەڤ وێنە گرت بوو چونکی ماسیەك د دەستێ وان دا بوو و تیرۆژکێن رۆژێ  پوولەکێن وێ دتەیساندن. جەلیلی و کورێن خوە د وێنەی دا گرنژی بوو.

"ێ باشە."

ب ڤێ پەیڤێ ئەفسونێ دەست ب ئاخفتنێ کر و چوو د ناڤ بابەتی دا.

"ب راستی ئەز، ئانکو ئەم یێ ل ڤێرێ کۆمبووین چونکی مە دەنگوباسەکێ گەلەك خوش هەیە دێ گەهینە تە."

مەریەمێ سەرێ خوە بلند و کر و تەماشەی وێ کر. وان هەرسێ ژنان بەرێ خوە دا جەلیلی داکو وی دەنگوباسی بگەهینتە مەریەمێ، لێ وی چ تشت نەگوتن بەلکو ب تنێ نمنمەك ژ کورسیکا خوە ئینا و بەرێ وی ل وی دولکێ ئاڤێ بوو یێ ل سەر مێزێ. خەدیجا، کو ژ هەردوو ژنێن وی یێن دی مەزنتربوو، تەماشەی مەریەمێ کر. ژ ڤان ئاورینێن وان هۆسا بۆ مەریەمێ خویابوو کو ئەڤ بابەتە بەری نوکە ب تێروتەسەلی یێ هاتیە گەنگەشەکرن و بەری مەریەم بهێتە گازیکرن، بریار ژی یا ل سەر هاتیەدان.

خەدیجایێ گوت: "مەریەم، خوازگینیێن تە یێن هاتین."

دلێ مەریەمێ ژ دلێ خوە چوو ژ نیشکەکێ ڤە ل بن لێڤێن خوە یێن بەنجگرتی گوت: "چ؟"

"خوازگینیێن تە یێن هاتین کو کەسەکە ب ناڤێ رەشید یەك ژ نیاسێن بابێ تەیە ل جهێ کاری و ژ هوزا بەشتونی یە و ب دروستاهی خەلکێ قەندەهارە لێ ئەو ب خوە ل باژێرێ کابول و ل دەڤەرا "دەهمازانگ" د خانیەکێ دوو قات دا دژیت."

ئەفسونێ سەرێ خوە هەژاند و گوت: "ئەو ژی وەکو مە ب زمانێ فارسی دئاخڤیت ژبەر هندێ پێدڤی ناکەت تو خوە فێری زمانێ پەشتوونی بکەی.

سینگێ مەریەمێ ژبەر گوهلێبوونا ڤێ سحبەتێ ڕەق ببوو خوە دا بێژی ها وەختە ئەو ژوور دێ سەروبنێك بیت و دێ ب سەر وێ دا هێتە خوارێ و ئەردێ ل بن پێن وێ ژی یێ دلڤلڤیت و وێ دناڤ خوە دا داعوریت.

پاشی خەدیجایێ گوت: "ئەو زەلامەکێ پێلاڤدرە، لێ نە وەکو وان پنیدوزێن ل سەر جادەیان کاردکەن بەلکو وی دکانا خوە یا تایبەت هەیە و ئەو ناڤدارترین پێلاڤدرە ل باژێرێ کابول هەموویێ چونکی ئەو ب تنێ پێلاڤێن کەسێن دیبلۆماسی و ئەندامێن خێزانا دەستهەلاتدار و کەسێن زەنگین ددوریت. هەروەکو تو دبینی وی چ ئاریشە نینن و دێ تە ب باشترین شێوە بخودان کەت."

مەریەمێ تەماشەی جەلیلی دکر و بەرێ خوە ژێ نەدگرت و دلێ وێ گەلەك بلەز خوە دقوتا دا بێژی وەختە ژ سینگێ وێ دێ هێتە دەرێ.

"ئەرێ ئەڤ چەندە ڕاستە؟ ئەو تشتێ ئەو دبێژن ڕاستە؟"

لێ جەلیلی هەر بەرسڤا وێ نەدا و بەرێ وی هێشتا ل وی دولکێ ئاڤێ بوو یێ ل سەر مێزێ هاتیە دانان.

ئەفسونێ ئاخفتنا وێ بڕی و گوتێ: "ئەو زەلام پیچەکێ ژ تە مەزنترە، لێ دبیت ژیێ وی نێزیکی چل سالان بیت یان ژی چل و پێنج سالان نەبوری بیت، ما تە وەنەدگوت نێرگز؟

"بەلێ هەما دێ ژیێ وی هند بیت لێ ئەڤ چەندە ئاریشە نینە چونکی من گەلەك کچێن نەهـ سالی یێن دیتین کو یا شوو ب هندەك کەسان کری بیست سالان ژ خوازگینێ تە مەزنترن. مە هەمووان د ژیێ تە دا یا شوکری، مانە ژیێ تە پازدە سالن؟ هەلبەت ئەڤە ژیەکێ باشە بۆ شووکرنا کچان."

ل بەر مەریەمێ یا بەرزە نەبوو کو کەسێ بەحسێ خوشکێن وێ سەعیدا و ناهیدایێ نەدکر کو ئەو ژی د هەمان ژیێ مەریەمێ دا بوون و هەردوو ژی قوتابی بوون ل قوتابخانەیا میهری ل باژێرێ هیراتی و پلانا وان ئەوبوو بچنە زانکۆیا کابول. چ پێنەڤێت ژیێ پازدە سالیێ بۆ خوشکێن وێ نە ژیەکێ گونجایە ژ بۆ شووکرنێ.

نێرگزێ گوت: "ژبلی ڤێ چەندێ، وی تشتەکێ مەزن د ژیانا خوە دا یێ ژ دەستدای کو ئەو ژی هەڤژینا وی بوو. مە هۆسا گوهلێبوویە بەری دەهـ سالان دەمێ دا زارۆکەکا خوە دانیت گیانێ خوە ژ دەستدایە. پشتی هینگێ ب سێ سالان ژی کورێ وی ژی د برکەکا ئاڤێ دا خەندقی."

"ب ڕاستی ژی ئەڤ چەندە ڕوودانەکا خەمگینە، ل ڤان سالێن دوماهیێ وی بۆ خوە ل هەڤژینەکێ دگەریا لێ هەتا نوکە وی چ هەڤژینێن گونجایی نەدیتینە."

مەریەمێ ب تۆڕەیی ڤە گوت: "من نەڤێت، ئەز شوو پێ ناکەم."

پاشی وێ بەرێ خوە دا جەلیلی و ئاخفتنا خوە دووبارە کر: "ئەز شوو ب وی زەلامی ناکەم، هوون نەشێن من ل سەر ڤێ چەندێ نەچار بکەن."

مەریەمێ ب خوە ژی حەزنەدکر هۆسا دەنگێ خوە بلند بکەت و ب تۆڕەی باخڤیت لێ چ ڕێکێن دی ل بەر سینگێ وێ نەبوون.

هەڤژینەکا دی یا جەلیلێ گوت: "دا بۆ تە بێژم مەریەم، نوکە، خوە ب ئاقل بێخە."

مەریەمێ گوهێ خوە نەدا ئاخفتنێن وان یان کا چ دبێژن بەلکو وێ بەردەوام تەماشەی جەلیلی دکر و چاڤەڕێی وی بوو دا تشتەکی بێژیت، بەلکو ڤی بابەتی ڕەت بکەت و بێژیت چ تشتێ هۆسا نینە.

"تو نەشێی ژیانا خوە هەموویێ ل ڤێ مالێ ببورینی."

"ئەرێ ما تە نەڤێت توژی ببیە خودان خێزان و تە مالا خوە یا تایبەت هەبیت."

"بەلێ، دێ تە مالا خوە یا تایبەت هەبیت، دێ تە زارۆك ژی هەبن."

"پێدڤیە تو یا بەردەوام بی ل سەر ژیانا خوە."

"یا دروستر ئەوە تو شوو ب کەسەکێ ناڤخۆیی یێ هۆزا تاژیکی بکەی لێ پا چ نینە ڕەشید زەلامەکێ دەولەمەندە و گرنگیەکا مەزن ب تە ددەت. وی مال و حالێ خوە هەیە. هەلبەت ئەڤ چەندە تشتێن گرنگن بۆ کەسەکێ ژنەکێ بینیت، مانە هۆسایە؟ هەردیسان کابول ژی باژێرەکێ جوان و بالکێشە و دبیت چ جارێن دی دەلیڤەیەکا هۆسا باش بۆ تە نەهێت."

مەریەمێ بەرێ خوە دا هەڤژینێن جەلیلی و گوتێ: "ئەز دێ دگەل مەلا فەیزوللاهی ژیم، ئەو دێ من بەتە دەڤ خوە، ئەز یا پشتڕاستم ئەو دێ وەکەت."

خەدیجایێ پێ کرە کەنی و گوتێ: "ئەڤ چەندە نەیا باشە، ئەو زەلاّمەکێ دانعەمرە و ..." ئەو ل دووڤ پەیڤەکا ڕاست و گونجایی دا دگەریا، مەریەمێ دزانی کو ئەو تشتێ وێ ب دروستاهی دڤێت بێژیت ئەوە کو مەلا فەیزوللاهـ گەلەك نێزیکی وانە. ئێدی مەریەم باش تێگەهشت کا وان چ دڤێت.

*ئێدی چ دەلیڤەیێن دی یێن هۆسا باش نە ب تنێ بۆ مەریەمێ ناهەلکەڤن، بەلکو چ دەلیڤەیێن دی بۆ هەڤژینێن جەلیلی ژی هەلناکەڤن پێ بەلاّ مەریەمێ ژ خوە ڤەکەن.*

وان هەرسێ هەڤژینان گەلەك کەرب ژ مەریەمێ ڤەدبوون ژبەر شێوازێ ژ دایکبوونا وێ. نوکە دەلیڤە بۆ وان یا هاتی نە بەس ئەڤرۆکە بەلکو بۆ هەتا هەتایێ خوە ژ وێ قورتال بکەن و بەلاّ وێ ژ خوە ڤەکەن.وان دڤیا ب ڤێ پلانێ دوماهیك شوونوارێن شاشیا هەتکبەریا زەلاّمێ خوە بڤەشێرن و نەهێلن. وان دڤیا مەریەمێ ژ خوە دووربێخن چونکی مەریەمێ بەرجەستەیا وێ شەرمێ دکر یا هەڤژینێ وان کری دەمێ ل پێشچاڤێن وان دهات و چوو.

ل دوماهیێ خەدیجایێ گوت: "مەلا فەیزوللاهـ زەلاّمەکێ پیر و دانعەمرە، تو نابێژیە من هەکە ئەو مر دێ چ کەی؟ تو دێ بیە بارگرانی بۆ خێزانا وی هەروەکو کا چەوا نوکە تو بارگرانی ل سەر ملێن مە؟"

مەریەمێ ددیت کا چەوا ئەڤ ئاخفتنێن ڕەق یێن ژ دەڤێ خەدیجایێ دهێنە دەرێ وەکو وێ هەلا هەناسەدانێ دەمێ مرۆڤ د ڕۆژەکا سارِ دا بەرددەت.

مەریەمێ دئینا پێشچاڤێن خوە ئەو یا ل باژێرێ کابولێ، ئەو باژێرێ مەزن و بیانی و قەرەبالغ. هەروەکو کا چەوا بەری نوکە جەلیلی جارەکێ گوتبوویێ کو باژێرێ کابولێ شەش سەد و پێنجی کیلومەتران بۆ لایێ ڕۆژهەلاتی ژ باژێرێ هیراتێ یێ دوورە. لێ دوورترین دووراتیا وێ بری ب تنێ دوو کیلومەتر بوون دەمێ ژ مالا خوە ل گری ب پیان هاتیە مالا جەلیلی ل باژێرێ هیراتێ.

مەریەمێ هزرا خوە دکر کا چەوا دێ ل باژێرێ کابولێ ژیت، ئەو باژێرێ ب هزرا وێ یێ ل لایێ دی یێ وەلاتی و نزانیت کا چەند یێ دوورە. وێ دئینا پێشچاڤێن خوە کا چەوا دێ د خانیەکێ بیانی دا ژیت کو ل وێرێ پێدڤیە ئەو ل بەر خزمەت و داخوازیێن وی

بڕاوەستیت، پێدڤیە ئەو خزمەتا وی زەلاّمی بکەت یێ دبێژنێ ڕەشید، خوارنێ بۆ بەرهەڤ بکەت و جلکێن وی بشوت. هەردیسان هەروەکو نانایێ بەری هینگێ گوتیێ، هندەك داخوزاییێن دی ژی هەنە زەلاّمان ژ هەڤژینێن خوە دڤێن.

هزرکرن د ڤێ پەیوەندیا تایبەت دا و وان لڤینێن پڕی ئێشان، بەس بوون ئەو هەست ب ترسێ بکەت و هەموو گیانێ وێ بلەرزیت و خوهێ بگریت.

مەریەم دووبارە ل جەلیلی زڤڕی و گوتێ: "باب بێژە من کو تو ناهێلی ئەو ڤی چەندێ دگەل من بکەن."

ئەفسونێ گوت: "ڕاستی تە بڤێت، بابێ تە ئاخفتنا خوە یا دگەل ڕەشیدی گوتی و نوکە ڕەشید یێ ل باژێرێ هیڕاتێ. ئەو ل سەر خاترا تە یێ ژ باژێرێ کابولێ هاتی و سوباهی دەهواتا هەوەیە و پشتی هینگێ تو دگەل وی دێ پشتی نیڤرو ب پاسێ زڤڕنە باژێرێ کابولێ."

مەریەمێ کرە ڤیژی: "باب تشتەکی بێژە وان."

نوکە هەموو هەڤژینێن جەلیلی بێدەنگ بوون، مەریەمێ هەستپێکر ئەو یێ تەماشەی جەلیلی دکەن و چاڤەڕێی بەرسڤا وی نە. بێدەنگیێ پەڕێن خوە ب سەر وێ ژوورێ دا دادان و هێشتا جەلیل یێ گۆستیرکا داواتا خوە د تبلا خوە دا باددەت و ئاورینەکا دامای و خەمگین ل سەر دێمێ وی بوو. ل وی دەمی ب تنێ دەنگێ چك چکا دەمژمێرا ب دیواری ڤە دهاتە گوهێن وان.

ژنەکێ ژ وان گوت: "جەلیل گیان."

جەلیلی هێدی سەرێ خوە بلند کر و چاڤێن وی ب مەریەمێ کەفتن، پاشی وی سەرێ خوە چەماند و دەڤێ خوە ڤەکر و دڤیا تشتەکی بێژیت لێ ب تنێ ئاخینکەکا پڕی حەسرەت ژ دەڤێ وی دەرکەفت.

مەریەمێ گوت: "باب، تشتەکی بێژە."

جەلیلی ب دەنگەکێ نزم گوت: "نەفرەت بیت، مەریەم ڤێ چەندێ دگەل من نەکە."

وی ئەڤ چەندە هۆسا دگوت خوە دا بێژی ئەو دێ تووشی ئاریشەیان بیت و ژیانا وی یا بهێت دێ نەخوش بیت.

پشتی گوتنا ڤێ چەندێ، مەریەمێ هەستپێکر ئەو قەرەبالغ و گەنگەشەیا د وێ ژوورێ ڤە دهاتە کرن پیچەکێ ئارامی ب خوە ڤە دیت. ل دووڤ دا هەڤژینێن جەلیلی دەست ب گەرەکا دی یا دانوستاندنێ کر. مەریەمێ سەحکرە بن مێزێ، چاڤێن وێ مانە ل سەر پێپکێن مێزێ یێن حوولی و گوشەیێن وان یێن پڕی کەندوکور و ڕوویێ وێ یێ قەهوای، وێ تیبینیا هندێ کر کو هەر جارا ئەو بێهنا خوە دهەلکێشیت و بەرددەت، ڕوویێ مێزی دبیتە هەلم و وێنێ وێ ل سەر مێزەیا بابێ وێ بەرزە دبوو.

ئەفسونێ دەستێ وێ گرت و بەرەڤ ژوورا وێ ڤە بر و دەمێ دەرگەهـ گرتی، مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ کلیلان بوو دەمێ ئەو دچووینە د قوفلا دەرگەهی ڕا و دهاتیە بادان.

# 8

ل ڕۆژا دی سپێدێ، هەڤژینێن جەلیلی کراسەکێ کەسکێ ڕەنگ تاری یێ درێژ دگەل پەنتەرۆنەکێ پەمبی یێ سپی دانەڤ مەریەمێ داکو بکەتە بەر خوە. ئەفسونێ ژی دەرسوکەکا کەسك و پێلاڤەك کو ل سەر ڕەنگێ جلکێن وێ بهێت دانەڤێ.

پاشی ئەو برە د وێ ژوورێ ڤە یا مێزەکا قەهوای یا درێژ تێڤە، سێنیەکا مەزن یا شریناهیێن ب گیزان هاتینە خەملاندن و قورئانەك و پێچەك و خۆدیکەك ل سەر وێ مێزێ هاتبوونە دانان. هەر د وێ ژوورێ ڤە دوو زەلاّم تێڤە بوون کو مەریەمێ ئەو نەدنیاسین لێ هۆسا دیارە ئەو وەك دیدەڤان یێن ل وێرێ ئامادە بووین دگەل مەلایەکی ژ بۆ برێڤەبرنا ڕێورەسمێن مەهرکرنێ.

جەلیلی ڤاتەکا ڕەنگ قەهوای یێ ڤەبی دگەل بوینباغەکا سۆر کربوونە بەر خوە و پرچا خوە ژی باش شووشت بوو. وی کورسیکەك بۆ مەریەمێ بەرهەڤ کر و بزاڤ دکر پشتەڤانیا وێ بکەت و بۆ بگرنژیت. ڤێ جارێ ئەفسون و خەدیجا ب ڕەخ مەریەمێ ڤە ڕوونشتبوونە خوارێ.

مەلای دەستێ خوە درێژ کرە پێچەیێ و نێرگزێ ژی ئەو پێچە هەلگرت و دانا سەر سەروچاڤێن مەریەمێ بەری کو ب ڕوونتە خوارێ. ل وی دەمی بەرێ مەریەمێ ب تنێ ل دەستێن وێ بوو.

جەلیلی گوتە کەسەکی: "نوکە تو دشێی گازی کەیێ بلا بهێت."

مەریەم بەری وی کەسی ببینیت، هەست ب بێهنا وی کر. بێهنا جگاران و گولاڤا وی یا تیژ کو نە وەکو بێهنا گولاڤا بابێ وێ یا خوش و سڤك بوو. دبن پێچەیێ ڤە و ب گوشەیەکا چاڤێ خوە، وێ زەلاّمەکێ درێژ و خودان کرشەکێ چوارگوشە یێ مەزن و ملەکێ فرەهـ دیت کو یێ ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیایە. قەبارێ وی یێ مەزن بێهنا مەریەمێ چك کر و ژ ترسان دا دلێ وێ خوە بلەز قووتا، ژبەر هندێ وێ بەرێ خوە ژ وی ڕادا و سەرێ خوە چەماند.

پشتی هینگێ، پێنگاڤێن خوه یێن هێدی گران هاڤێتن و هاته د ژوور ڤه تا وی ڕادەی سێنیکا شریناهیان دگەل دەنگێ پێن وێ خش خش دکر. ل دووڤ دا ل سەر کورسیکا ب ڕەخ وێ ڤه ڕوونشت و دەنگێ هەناسەیێن وی هند یێ بلند بوو مەریەمێ ب سانەهی گوهلێدبوو.

مەلای ب خێرهاتنا وی کر و گوتی: "ڕێوڕەسمێن ڤێ هەڤژینیێ نە وەکو هەڤژینێن دی یێن کلاسیکی دێ هێنە ب ڕێڤەبرن چونکی ئەز دزانم ڕەشیدی پلێتا پاسێ بۆ باژێرێ کابولێ یا بڕی و پشتی بێهنەکا دی دڤێت بگەهیتە ژڤانێ پاسێ، ژبەر هندێ ئەم دێ مفای ژ وەختی بینین و دێ بزاڤێ کەین هندەك پێنگاڤێن کلاسیکی پشتگوھ بهاڤێژین و لەزێ ل ڕێوڕەسمێن مارکرنێ بکەین."

مەلای پیرۆزباهی ل وان کر و هندەك پەیڤ ل سەر گرنگیا ژنئینانێ گوتن. پاشی مەلای پرسیار ژ جەلیلی کر کا ئەو یێ ڕازی یە ل سەر ڤێ هەڤژینیێ لێ جەلیلی سەرێ خوه هەژاند و ب بەلێ بەرسڤا وی دا. ل دووڤ دا مەلای پرسیار ژ ڕەشیدی ژی کا دڤێت ژیانا هەڤژینیێ دگەل مەریەمێ پێکبینیت، ڕەشیدی ژی گوت بەلێ ئەز یێ ڕازیمە. دەنگێ وی یێ ستوور و هشك بیرا مەریەمێ ل دەنگێ بەلگێن پایزێ یێن ڕەق ئینا دەمێ وێ پێ خوه ددانایە سەر و دپەرچڤاندین.

"تو مەریەم جان، تو یا ڕازی ل سەر ئەنجامدانا ڤێ هەڤژینیێ؟"

مەریەم بێدەنگ ما، وێ خوزیا خوه داعیرا و گەووریا خوه پاقژ کر. دەنگێ ژنەکێ ژلاییێ دی یێ مێزێ هات و گوت: "بەلێ ئەو یا ڕازی یە."

مەلای گوت: "د ڕاستی دا، پێدڤیە ئەو ب خوه بەرسڤێ بدەت و ئەو دشێت خوه بگریت هەتا جارا سیێ ژی ئەز پرسیارێ ژێ دکەم. چونکی زەلامی داخوازا هەڤژینیێ یا ژێ کری و دڤێت ئەو ڕازی بیت نەك بەروڤاژی."

مەلای دوو جاران پرسیار ژ مەریەمێ کر، دەمێ وێ بەرسڤ نەدای، بۆ جارا سیێ ژی پرسیار ژێ کر لێ ڤێ جارێ پتر خورتی لێکر داکو بەرسڤێ بدەت.

مەریەمێ هەست ب هندێ دکر کو بێهنا جەلیلی یا تەنگ بووی و ل بن مێزێ جار یێ پێن خوه لێك دئالێنیت و جار یێ ژێکڤە دکەت، دەنگێ کوخکەکا هێدی هات. ل دووڤ دا دەستەکێ سپی یێ بچووك ئەو تۆزا ل سەر مێزێ پاقژ کر.

جەلیلی ب دەنگەکێ نزم گوت: "ها کچا من مەریەم، تو یا ڕازی"

وێ ژی ب دەنگەکێ ترس و لەرز ڤە گوت: "بەلێ."

خۆدیك دانا بن پێچا وێ داکو ل دەستپێکێ تەماشەی سەروچاڤێن خوە بکەت. دوو بریێن نە درێکخستی و کڤانکری بوون، پرچێ وێ یێ سەرح و هەردوو چاڤێن وی یێن کەسك و دامایی تا ڕادەیەکی نێزیکی یەك بوون، ئەگەر کەسەکی ژ دوور ڤە ئەو دیتبا دا هزرکەت یا ویرە.

هەردیسان پیستێ سەروچاڤێن وێ ژی یێ هشك و زڤر بوو و چەندین پنی و نیشان ل سەر بوون. وێ هزر دکر ئەنیا وێ گەلەك یا فرەهە و ئەرزنکا وێ ژی گەلەك یا بچووك و تەنگە و لێڤێن وێ ژی د تەنکن. ب شێوەیەکێ گشتی ئەو خودانا دێمەکێ سێگوشە و درێژ بوو. مەریەمێ دزانی کو ئەڤ ئەندامێن لەشێ وێ یەك یەکە د جوان نینن لێ هەموویان پێکڤە دیمەنەکێ ئاسایی و نەهند کرێت یێ دایە وێ.

هەر د خۆدیکێ دا و د بن چاڤکان ڕا، مەریەمێ ب دزیکی ڤە تەماشەی ڕەشیدی دکر، ئەو خودان دێمەکێ مەزن و چوارگوشە و سۆر بوو. هەردیسان دفنەکا تیژ و دوو لامێن وەرمتی هەبوون کو سیمایەکێ بەختەوەری و خوشیێ ل دەڤ پەیداکربوو. دوو چاڤێن ڕوهن و سۆر و دەڤەکێ تژی ددان کو هەردوو ددانێن دەستپێکێ وەکو کوژیێن دیواران پێکڤە مابوون و پرچا خوە ژی هەتا سەر بریان درێژ کربوو کو چ جھ بۆ ئەنیا خوە نەهێلابوون و پرچا وی ژی یا بوش و خەلەك بوو.

د خۆدیکێ دا بۆ چەندەکێ چاڤێن وان ب یەك کەفتن و پاشی هەر زوو بەرێ خوە ژ یەك گرت. مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەرێ ئەڤە سەروچاڤێن هەڤژینیێ من یێ پاشەڕۆژێ نە؟"

وان گۆستیرکێن هەڤژینیێ کو د بەریکا ڕەشیدی دا بوون لێکگوهارتن. نینوکێن وی د زەر بوون هەروەکو سێڤێن گەنی و ڕزی، هندەك نینووکێن وی د خوار ژی بوون. دەستێن مەریەمێ دلەرزین، لەورا دەمێ گوسترك دکریە تبلا وی جەلیلی هاریکاریا وێ کر. گۆستیرکا وی پیچەکێ یا تەنگ بوو ژبەر هندێ ڕەشیدی گەلەك خورتی لێنەکر هەتا هەموویێ بکەتە تبلا وی، پاشی وی گوت: "ئەڤ چەندە بەسە."

یەك ژ هەڤژینێن جەلیلی گوت: "مەریەم، گۆستیرکا تە گەلەك یا جوان و بالکێشە."

پاشی مەلای گوت: "نوکە ب تنێ یا مای ئەم گرێبەستا هەڤژینیا هەوە ئیمزا بکەین."

مەریەمێ ناڤێ خوە ئیمزا کر، م، ە، ر، ی، ە، م. دەمێ وێ ناڤێ خوە دنڤیسایی و ئیمزا کری، بەرێ هەموو کەسێن دی یێن د وێ ژوورێ ڤە ل وێ بوو. جارەکا دی ژی و پشتی بیست و حەفت سالێن داهاتی، دێ مەریەم ناڤێ خوە ل ژێر سەرپەرشتیا مەلایەکێ دی و ل جهەکێ دی و ژ بۆ مەرەمەکا دی یا جودا ئیمزا کەتەڤە.

مەلای گوت: "نوکە هوون ژن و مێرێن یەکن، پیرۆز بیت."

★★★

ڕەشید د وێ پاسا ڕەنگاوڕەنگ دا چاڤەڕێی هاتنا مەریەمێ بوو. مەریەم کو دگەل بابێ خوە جەلیلی ل لایێ پشتا پاسێ یا ڕاوەستیای بوو، نەدشیا ڕەشیدی ببینیت، بەلکو ب تنێ دووکێلا جگارەیا وی د پەنجەرکێ ڕا دەردکەفت.

ل دورماندوری وان ژی، کەسێن دی دەستێن خوە ل هەڤدوو بلند دکرن و خاترا خوە ژ هەڤدوو دخواست. کەسەکی ل بەر دەرگەهێ پاسێ قورئانەك ب دەستێ خوە گرت بوو و ڕێڤینگ دبن وێ قورئانێ ڕا دبورین و سوواری پاسێ دبوون. زارۆکێن پێخواس ژی دناڤ ڕێڤینگان دا دهاتن و چوون لێ دێمێن وان ژبەر دووکلا جگاران و علکان بەرزە دبوون.

ل وی دەمی جەلیلی دڤیا دلەکی ل بەر دلێ مەریەمێ بدەت و بێژیتێ کو کابول باژێرەکێ خوشە و ئیمپراتۆرێ مەنگولی "بابور"ی ژی داخواز کربوو ل وی باژێری بهێتە ڤەشارتن. پشتی هینگێ مەریەمێ دزانی کو ئەو دێ بەردەوام بەحسێ باخچەیێن کابولێ و دکان و داروبار و بایێ وێ بۆ کەت. پشتی دەمەکێ دی ئەو دێ سوواری پاسێ بیت و بابێ وێ دێ ل دووڤ پاسێ کەتە غار و خاترا خوە ژێ خوازیت.

وێ گوتە بابێ خوە: "من گەلەك حەز ژ تە دکر و تا وی ڕادەی پەرستنا تە دکر."

ل دەمێ گوهلێبوونا ڤێ ئاخفتنێ، جەلیل د جهێ خوە دا ڕاوەستیا و دەستێن خوە کرنە تێکدا و پەرخاندن.

دوو هەڤژینێن هندی یێن گەنج د بەر وان ڕا بورین کو دایکێ زارۆکێ خوە یێ بچووك د هەمبێزا خوە دا هەلگرتبوو و زەلامی ژی چانتەکێ دەستی ل دووڤ خوە دخشاند.

ئەو هەڤژین دناڤبەرا وان ڕا هاتن و داخوازا لێبورینێ ژێ کر کو ئەو ژێکڤە کرین، جەلیل پێ گرنژی و گوتێ: " چ نینە."

"ل هەموو ڕۆژێن پێنج شەمبی، ئەز بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران دا ڕوونمە خوارێ و چاڤەڕێی هاتنا تە کەم، ئەز گەلەك دترسیام نەکو تو نەهییێ."

"کچا من مەریەم، گەشتا تە یا دوورە، پێدڤیە تو تشتەکی بخوی." وی گوتێ کو ئەو دێ چیت هندەك نانی و پەنیرێ پەزی بۆ کڕیت.

"من هەموو گاڤان هزرا تە دکر، من ل سەر نڤێژی دوعا بۆ تە دکرن کو ژییێ تە هەتا سەد سالان یێ درێژ بیت، لێ مخابن من نەدزانی تو شەرم ژ هەبوونا من دکەی، تو شەرم دکەی کو ئەز کچا تەمە."

جەلیلی سەرێ خوە چەماند و هەروەکو زارۆکەکێ ژ نوو مەزن بووی، پەحنیا پێلاڤا خوە ل ئاخێ ددا.

"بەلێ ڕاستە، تە شەرم دکر کو ئەز کچا تەمە."

"ئەز دێ هێمە کابولێ و دێ سەرەدانا تە کەم."

"نەخێر، نەخێر، نەهێ دەڤ من، من نەڤێت ئێدی تە ببینم. ئێدی چ جاران سەرەدانا من نەکەی. من نەڤێت ئێدی گوهـ دەنگێ تە بم بۆ هەتا هەتاییێ.

جەلیلی ب ئاورینەکا بریندار تەماشەی وێ کر.

"ل ڤێرێ هەموو تشت دناڤبەرا من و تە دا ب دوماهی هاتن، ب تنێ یا مای بێژم بخاترا تە."

وی ب دەنگەکێ نزم و ڕەزیل ڤە گوت: "کچا من، هۆسا نەچە و ب ڤی ڕەنگی خاترا خوە ژ من نەخوازە."

"تو هند یێ دلڕەق بووی، تە ئەو دەلیڤە نەدا من بچم خاترا خوە ژ مەلا فەیزوللاهی بخوازم."

پاشی مەریەمێ پشتا خوە دا وی و بەرەڤ پاسێ چوو، وێ زانی کو ئەو ژی یێ ل دووڤ وێ دهێت و دەمێ ل دەڤ دەرگەهی گەهشتیە وێ، گوتێ: "کچا من، مەریەم جان."

لێ وێ چ پووتە پێ نەکر و سوواری پاسێ بوو، وێ دزانی کو جەلیل بەردەوام یێ تەماشەی وێ دکەت و دگەل ئاڕاستێ ژ دەرڤەی پاسێ یێ دبوریت لێ وێ د پەنجەرکێ ژی دا تەماشەی وی نەکر.

مەریەمێ ڕێکا خوە گرت هەتا گەهشتیە دەڤ ڕەشیدی ل دوماهیا پاسێ کو ل سەر کوشنەکی یێ ڕوونشتی بوو و چانتێن خوە دانابوونە بەر پێن خوە. دەمێ جەلیلی دەستێن خوە دانانینە سەر پەنجەرکێ و تك تك ل پەنجەرکێ ددان ژی، ئەو هەر ل دور خوە نەزڤڕی. هەتا دەمێ پاسە ب ڕێکەفتی ژی ئەو ل پشت خوە نەزڤڕی و بۆ دوماهیك جار تەماشەی بابێ خوە نەکر دەمێ دناڤ دووکێل و تۆزێ دا بەرزە بووی.

ڕەشید ل کوشنێ ناڤەڕاستێ ل ڕێزا دوماهیێ یێ ڕوونشتی بوو و دەستێ خوە یێ گران دانا سەر دەستێ وێ و گوت: "تەماشەی وێراهە بکە، تەماشەی ژ دەرڤە بکە کچێ."

دەمێ وی ئەڤ چەندە دگوتی، بەرێ وی ل پەنجەرکێ بوو، هۆسا دیارە تشتەکێ بالکێش ژ دەرڤە سەرنجا وی ڕاکێشابوو.

# 9

دەمێ ڕۆژا دی ئەو گەهشتینە مالا ڕەشیدی، دنیا ببوو ئێڤار. ڕەشیدی گوتێ: "نوکە ئەم یێ ل دەڤەرا دەهمازانگ".

ل وی دەمی ئەو ژ دەرڤەی مال بوون و ل سەر شوستەیی د ڕاوەستیایی بوون. ڕەشیدی ب دەستەکێ خوە چانتەك هەلگرتبوو ب دەستێ ژی دەرگەهێ خانی یێ داری یێ حەوشێ ڤەکر. پاشی بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە و گوت: "ل لایێ باشوری و لایێ ڕۆژئاڤایێ باژێری، باخچەیێ گیانەوەران و زانکۆیا کابولێ لێ هەنە.

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند. بەری نوکە وێ ئەڤ چەندە دزانی. هەرچەندە مەریەم د هەموو ئاخفتنێن وی نەدگەهشت لێ یا نەچاربوو بەرێ خوە بدەتە وی و هۆسا خوە بۆ دیاربکەت کو د هەموو ئاخفتنێن وی دگەهیت دەمێ دئاخڤیت. بەری نوکە مەریەم نە ل سەر زاراڤێ فارسی، ئەوێ خەلکێ کابولێ پێ دئاخفت، و نەژی  ل سەر زاراڤێ پەشتوونی ڕانەهاتبوو کو زمانێ سەرەکی یێ خەلکێ قەندەهارێ بوو. بەروڤاژی وێ، ڕەشیدی چ ئاریشە د تێگەهشتنا زمانێ فارسی یێ باژێرێ هیراتێ دا نەبوو.

مەریەمێ هەر زوو تەماشەی وێ ڕێکا تەنگ و نەڤێرکری کر یا کو بەرەڤ مالا ڕەشیدی دچوو کر. خانییێن ل سەر ڤێ ڕێکێ هەموو ب ڕەخ یەك ڤە بوون و دیوارێن وان پێکڤە بوون، ب تنێ دیوارەکێ نزم دناڤبەرا حەوشێن وان و جادەیا سەرەکی دا بوو.

پتریا خانیان، بانێن وان د ڕاست و پەحن بوون و دیوارێن وان ژ تابۆکێن تەڤنێ یێن هشککری هاتبوونە دروستکرن. هندەك ژ تەڤنێ هاتبوونە دروستکرن کو ڕەنگێ تەڤنێ وەکو ڕەنگێ وێ ئاخا وان چیایان بوو یێن ل دەوروبەری باژێری هەین. هەردیسان هندەك جۆکێن ئاڤێ هەبوون کو شوستە ژ جادەیا سەرەکی جودا دکر و دپڕ بوون ژ ئاڤا پیس یا ژ وان مالان دەردکەفت. مەریەمێ چەندین کۆمێن گلێشی ل ڤێرێ و وێراهە ل سەر جادەیێ ددیتن.

خانییێ ڕەشیدی ژ دوو ڤاتان پێکدهێت، مەریەمێ دزانی کو بەری نوکە ڕەنگێ خانی یێ شین بوو چونکی هێشتا شوونوارێن ڤی ڕەنگی ل سەر خانی ددیاربوون. دەمێ ڕەشیدی دەرگەهێ حەوشێ ڤەکری و ئەو هەردوو چووینە د ژوور ڤە، مەریەمێ خوە دناڤ باخچەیەکێ بچووك و نەرێکوپێك دا دیت کو گیایێ زەر ل چەندین جهان شین ببوو.

هەردیسان وێ سەرشوویەك ل ڕەخێ ڕاستێ یێ باخچەی دیت و ل لایێ چەپێ ژی بیرەکا ئاڤێ هەبوو کو ب ماتۆڕەکێ دەستی کاردکر و ڕێزەکا شتلێن داران یێن هشککری ل دورماندوری وێ بوون. ل نێزیکی بیرێ کۆگەهەکا کەلوپەلێن زێدە هەبوو، پایسکلەك ژی ب ڕەخ دیوارێ وێ ڤە هاتبوو ڕاوەستاندن.

"بابێ تە گوتبوو کو تو گەلەك حەز ژ نێچیرا ماسیان دکەی."

ڕەشیدی ئەڤ ئاخفتنە گوتنە مەریەمێ دەمێ ئەو پێکڤە دناڤ باخچەیێ خانی دا دگەریاین. مەریەمێ دیت کو دناڤ وی خانی دا چ باخچە ل پشتا وی نینن.

پاشی ڕەشیدی گوتێ: "ل باکورێ باژێری هندەك گوند و ڕووبارێن پڕی ماسی لێ هەنە، دبیت ڕۆژەکێ ئەز تە ببەمە وێرێ."

ل دوماهییێ ڕەشیدی دەرگەهێ سەرەکی یێ مالێ ڤەکر و ئەو برە د ژوور ڤە. هەرچەندە خانییێ ڕەشیدی ب هەڤبەرکرن دگەل خانییێ جەلیلی گەلەك یێ بچووك بوو، لێ ب هەڤبەرکرن دگەل کولبەیێ وێ و نانایێ نە بەس یێ مەزن بوو،  بەلکو ژ پێش ڤە وەکو ڤلەیەکێ بوو.

هۆلا مێهڤانان ل ڤاتێ یەکێ بوو. هەردیسان لێنانگەهـ ژی ل هەمان ڤات بوو، ئەوی ئامان و مەنجەلەکا هەلێ و  پرێمزەکێ  گازێ نیشا وێ دان. ل ژوورا مێهڤانان ژی قەنەپەیەکا پیستی یا ڕەنگ کەسك تێڤەبوو کو لایەکێ وێ یێ دڕیای بوو و ب شێوەیەکێ بێ سەروبەر هاتبوو دروین. دیوارێن وێ هۆلێ ژی د ڤالا بوون و چ تشت پێڤە نەهاتبوونە هەلاویستن. هەردیسان مێزەك و کورسیك ل نیڤەکێ بوون و سۆپەکا ئاسنی یا ڕەنگ ڕەش ل کوژیەکێ وێ بوو.

مەریەم ل نیڤا هۆلێ ڕاوەستیا و تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر، ل دەمێ ئەو ل کولبەیێ خوە ل دەڤ نانایێ، ئەو دشیا دەستێ خوە بکەتە بانێ خانی، وێ دەمێن ڕۆژێ ب ڕێکا گوشەیا هاتنا ژوور یا تیشکا هەتاڤێ د پەنجەرکێ دا دزانین. وێ دزانی کا دەرگەهێ

ژوورێ هەتا کیرێ دێ هێتە  ڤەکرن بەری کو دەست ب چیر چیرێ بکەت، دیسان وێ هەموو ئەو شەق و پەڤێن د هەر یەك ژ سیهـ پارچەیێن تەختی یێن ژوور پێ هاتیە نخافتن دزانین.

نوکە هەموو ئەو تشتێن بەری نوکە بۆ وێ د ئاشنا، نەمان و چوون، نانا یا مری، نوکە ئەو ب تنێ یا ل ڤێرێ، یا ل باژێرەکێ بیانی کو یێ دوورە ژ وێ ژیانێ یا بەری نوکە ل گەلی و نها و چیایێن نخافتی ب بەفرێ و بیابانێن بەرفرەهـ بوراندی.

نوکە ئەو یا د خانیەکێ کەسەکێ بیانی ڤە دگەل هەموو وان ژوورێن جودا یێن بێهنا جگارەیان ژێ دهێت و دولابێن وی ژی د پڕن ژ ئامان و کەلوپەلێن سەیر و بیانی، زێدەباری پەردێن وی یێن گران و ڕەنگ کەسك و بانێ وی یێ بلند کو وێ دزانی ئەو چەند خوە بلند بکەت ژی دەستێ وێ ناگەهیتێ. ئەو ڤالاهیا د مالا وی ژی دا بێهنا مەریەمێ تەنگ دکر. نوکە دلێ وێ ئاخینکەك ڕاهێلا، ئاخینکەك بۆ نانا و مەلا فەیزوللاهی و ژیانا وێ یا بەری.

پشتی هینگێ وێ دەست ب گرییێ کر.

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە گوتێ: "ڤێجا ئەڤە چ گری یە؟"

وی د بەریکا خوە خەبتی و دەستمالەك ژێ ئینا دەرێ و کرە د دەستێ مەریەمێ دا، ل دووڤ دا جگارەیەك بەردایێ و پالا  خوە دا دیواری و بەرێ وی ل مەریەمێ بوو دەمێ ڕۆندکێن چاڤێن خوە پاقژ دکرین.

"ها تە پاقژکرن؟"

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند هەروەکو دڤیا بێژیتێ "بەلێ."

"تو یا پشتڕاستی؟"

"بەلێ."

پاشی وی دەستێ وێ گرت و بەرەڤ بەر پەنجەرا هۆلێ ڤە بر و گوتێ: "بەرێ ڤێ پەنجەرکێ دکەڤیتە باکورێ باژێری."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، وی نینوکا خوە یا شکەستی یا تبلا نیڤەکێ ل شووشەیا پەنجەرێ دا.

"ئەڤ چیایێ یەکسەر دکەڤیتە بەرامبەری مە ناڤێ وی "ئەسمایی" یە، تە دیت؟ یێ ل پشت وی ژی چیایێ "عەلی ئابادە" و زانکۆ ژی دکەڤیتە بەر سینگێ وی. ل پشت مەژی،

لایێ ڕۆژهەلاتی، چیایێ "شیر دەروازە" لێ هەیە، لێ تو نەشێی ل ڤێرێ ببینی. هەموو ڕۆژان پشتی نیڤرو، گولەکا هاونی ل وێرێ دهاڤێژن. بەس بکە گری، من گوت بەسە."

مەریەمێ ڕۆندکێن چاڤێن خوە پاقژ کرن و ڕەشیدی ژی ب ناڤچاڤگرێ ڤە گوتێ: "ئەز قەت نەشێم خوە ل بەر ڤێ چەندێ بگرم، دەنگێ گریا ژنان، ببورە من هەدار ل سەر ڤێ چەندێ نینە."

مەریەمێ گوت: "من دڤێت بچمە مال."

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە فورمەك ل جگارەیا خوە دا و دووکێلا وێ هاڤێتە سەر سەروچاڤێن مەریەمێ و گوت: "ڤێ جارێ ئەز ڤێ ئاخفتنا تە ب چ ڤە ناوەرگرم و دێ ل تە بورم."

دووبارە وی دەستێ وێ گرت و ب سەر دەرەجکان کەفتن.

ل ڤاتێ دووێ، دناڤ هۆلەکا تەنگ یا کێم ڕۆناهی دا، دوو ژوور لێ هەبوون. دەرگەهێ ژوورا مەزن یێ نیڤ ڤەکری بوو، مەریەمێ دیت کو ئەو ژوور ژی وەکو جهێن دی یە و چ تشتێ هۆسا تێڤە نینە ژبلی تەختەکێ نڤستنێ ل کوژیەکی و بەتەنیەکا ڕەنگ قەهوای و دوشەکەك و قومسۆرەکا دی یا سێ چوار ڕەفانك. دیوارێن وێ ژی د ڤالاّ بوون و چ تشت پێڤە یێ هەلاویستی نەبوو ب تنێ خۆدیکەکا ڕۆناهیێ یا بچووك نەبیت. ڕەشیدی دەرگەهێ وێ ژوورێ ب تەمامی گرت.

"ئەڤە ژوورا منە، تو ژی دشێی ل ژوورا مێهڤانان بنڤی. هیڤیا من ئەوە تە چ ڕێگری نەبیت ل هەمبەر ڤێ چەندێ چونکی ئەز یێ فێربوویم ب تنێ بنڤم."

مەریەمێ بۆ وی دیارنەکر کا ئەو ب ڤێ چەندێ چەند یا کەیفخوشە کو ئەو ل دەڤ وێ نەنڤیت. ئەو ژوورا بۆ مەریەمێ هاتیە پێشنیار کرن داکو تێڤە بنڤیت گەلەك ژ ژوورا وێ یا نڤستنێ یا ل مالا جەلیلی بچووکتربوو، تەختەك، دولابەکا کەڤن و ڕەنگ قەهوای و ڕساسی و قومسۆرەك تێڤەبوون. بەرێ پەنجەرکێ ژی دکەڤتە سەر باخچەی، ب ڕەخ ڤە ژی جادە ل بن هەبوو. ڕەشیدی چانتێ وێ دانا د کوژیێ خانی دا و مەریەم ژی ل سەر تەختی ڕوونشت.

ڕەشید کو ل بەر دەرگەهێ ژوورا وێ بوو، پالاّ خوە دابوو دەرگەهی و گوت: "تە تیبینیا هندێ نەکر."

"تەماشەی دەرازینکا پەنجەرکێ بکە، تو دزانی ئەو کیژ جورن؟ بەری ئەز بهێمە باژێرێ هیراتێ من دانابوونە وێرێ."

مەریەمێ دیت کو ڤاڤکەکێ گولێن سپی یێ ل سەر دەرازینکا پەنجەرکێ و گول ژ هەموو لایێن وێ یێن هاتینە دەرێ.

"تو حەز ژ وان گولان دکەی؟ ئەرێ ئەو دێ تە کەیفخوش کەن؟"

"بەلێ."

"باشە پا تو دشێی سوپاسیا من بکەی."

"سوپاس بۆ تە، ل من ببورە، دووبارە سوپاس"

"تو یا دلەزری، دبیت من تو ترساندبی، ئەرێ ما من تو ترساندی یە؟ تو ژ من دترسی؟"

مەریەمێ تەماشەی وی نەدکر لێ وێ دشیا هەست ب تشتەکێ ڤەشارتی و پیس ژ ڤان پرسیارێن وی دکر. هەروەکو دا بێژی کەسەکی دەرزیکەك کرە د لەشێ وێ ڕا، سەرێ خوە بلەز بەرەڤ وی زڤڕاند و زانی ئەڤە یەکەم درەوا وێ یە د ژیانا وان یا هەڤژینیێ دا.

"چەوا؟ نەخێر؟ ێ پا گەلەك باشە، ژ نوکە وێ ڤە ئەڤە مالا تەیە و دێ گەلەك حەز ژێ کەی. تو ب خوە دێ بینی. ئەرێ من گوتبوو تە کو مە کارەب ژی هەیە، پتریا ڕۆژان و هەموو شەڤان هەیە"

هۆسا دیاربوو دا ژ مال دەرکەڤیت. ئەو ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیا و فرەکا درێژ ل جگارەیا خوە دا و چاڤێن خوە گرتن. مەریەمێ هزردکر ئەو دێ تشتەکی بێژیت لێ وی چ نەگوتن.

پاشی ئەو دەرکەفت و دەرگەهـ ل دووڤ خوە ڕا پێڤەدا و مەریەم ب تنێ دگەل چانتە و گولێن وێ هێلا د ژوور ڤە.

# 10

ل ڕۆژێن دەستپێکێ ل مالا ڕەشیدی، مەریەم ب خورتی ژ ژوورا خوە ددەردکەفت. هەموو سپێدەهیان ل دووڤ دەنگێ بانگی کو ژ جهەکێ دوور دهات هشیار دبوو و ڕادبوو نڤێژا سپێدێ دکر و پاشی دووبارە دزڤڕی سەر تەختێ خوە. دەمێ ئەو ل سەر تەختی، وێ گوهـ ل دەنگێ ڕەشیدی دبوو دەمێ دچوویە سەرشوویێ و دەستنڤێژا خوە دشووشتی، هەردیسان دەمێ دهاتە ژوورا وێ و خاترا خوە ژێ دخواست بەری بچیتە سەر کاری.

د پەنجەرکێ دا، مەریەمێ چاڤدێریا ڕەشیدی دکر دەمێ دناڤ باخچێ مالێ دا و خوارنا خوە دکریە د پشتا پایسکلێ دا و پاشی دا سوواری پایسکلێ بیت و بەرەڤ ڕێکا خوە چیت. وێ بەردەوام تەماشەی وی کر هەتاکو ملێن وی یێن فرەهـ و ستوور ل پشت کوژیێ دوماهیێ یێ جادەیێ بەرزە دبوون.

پتریا دەمێ ڕۆژێ مەریەم ل سەر تەختێ خوە دما و ژ سەر جهان نەرادبوو، هەست پێدکر ئەو یا دلتەنگ  و بێکەسە. هندەك جاران ژی دا چیتە د لێنانگەهێ ڤە و دەستێن خوە ل سەر کاونتەرێ ڕا ئینیت ئەوا کو چپکێن دوهنیماینە پێڤە و ل سەر هشکبووین، وان پەردێن گولگولی یێن بێهنا خوارنا سۆتی ژێ دهاتی، هەردیسان تەماشەی چەکمەچەیا وی یا بێسەروبەر و کەفچك و کێرکێن وی یێن نەوەکهەڤ، سەفینك کوپێن چایێ و کەفچکێ داری یێ تیکڤەدانێ دکر.

ئەڤ کەلوپەلە ببوونە بەشەك ژ ژیانا وێ یا ڕۆژانە. ڤان کەلوپەلان بیرا وێ ل وێ وێرانیێ دئینا یاکو ژیانا وێ ژناڤبری و وەلێکری هزربکەت وێ چ جهـ نینن و یا بێکەس و خودانە، هەروەکو وی کەسی یێ دچیتە سەر گوهێن کەسەکێ دی.

ل مالا خوە دگەل نانایێ، وێ حەزا خوارنێ هەبوو، لێ نوکە ئاشکێ وێ ب خورتی خوارنێ داخواز دکەت. هندەك جاران سێنیکەکا برنجێ سپی و پرتەکا نانی یا بچووك دگەل خوە دبەتە د ژوورا مێهڤانان ڤە و ل بەر پەنجەرکێ درووێشت و دخوت، د بەڕا ژی تەماشەی بانێن خانیێن جیرانێن خوە یێ یەك ڤات دکەت. وێ ددیت ل سەر بانان هندەك

ژن یێن جلکان ل سەر ڕستان ڕادئێخن و د بەڕا ل زارۆکێن خوە دکەنە ڤێژی. مریشکێن وان ژی دناڤ کۆمێن پیساتییێ دا دچەرین و مەڕبێلك و قەزمە ل وارا بوون و چێلێن وان ژی ب دارەکێ ڤە د گرێدایی بوون.

وێ ب غەریبیەکا مەزن ڤە بیرا خوە ل وان شەڤان دئینا یێن ئەو و نانا ل سەر بانی دنڤستن و تەماشەی هەیڤێ دکر دەمێ ل هنداڤی گوندێ گول دامانێ ددەرکەفتی. ئەو شەڤ گەلەك د گەرم بوون تا وی ڕادەی ژبەر خوهێ جلکێن وان هۆسا دمانە ب سینگێ وان ڤە هەروەکو کا چەوا کاغەزەکا تەڕ د مینتە ب شووشەبا پەنجەرێ ڤە.

ئەو ژ پشتی نیڤروییێن زڤستانێ غەریب دبوو دەمێ وێ دگەل مەلا فەیزوللاهی قورئان دخواندی و لیلییێن بەفرێ ژ داران دکەفتینە سەر تەرمەیێ خانییێ وان و حاجی ڕەشکان ژی ل سەر بەلگێن داران یێن بەفر کەفتیە سەر ڤێژ ڤێژ دکری.

مەریەم ب تنێ ل مال بوو، شولێ وێ ئەوبوو ب تنێ ژ لێنانگەهێ دا چیتە د هۆلا مێهڤانان ڤە و پاشی ل سەر دەرەجکان سەرکەڤیت و چیتە د ژوورا خوە و جارەکا دی هێتە خوارێ، ل دوماهیێ ژی دا چیتە د ژوورا خوە ڤە و نڤێژێن خوە کەت یان ژی دا ل سەر تەختی ڕوونتە خوارێ و هزرێن دایکا خوە کەت، هندەك جاران هەست ب دلڕابوونێ دکر و هزردکر ئەڤ چەندە ژبەر هندێ یە چونکی گەلەك یا ژ مالا خوە غەریب بووی.

دەمێ دنیا دبوویە شەڤ، دوودلی و ترسا وێ پتر لێ دهات، ددانێن وێ ژ ترسان دا ڤێکدکەفتن و هزرا وێ هەموو ل سەر شەڤێ بوو کا دێ چ ڕوودەت ب تایبەت د وی دەمی یێ کو ل دوماهیێ ڕەشید بڕیارێ ددەت وێ چەندێ دگەل بکەت یا هەموو زەلاّم ب شەڤێ دگەل هەڤژینێن خوە دکەن. ل دەمێ هەڤژینێ وێ ل خوارێ شیڤ دخواری، ئەو دا خوە ل سەر تەختی درێژ کەت و دەمارێن وێ ڕەق دبوون.

هەموو گاڤان ئەو دا ل بەر دەرگەهێ ژوورا وێ ڕاوەستیت و سەرێ خوە د دەرگەهی ڕا ئینتە ژوور ڤە و بێژیت: "ئەز دزانم هێشتا تو نەنڤستیە، هێشتا دەمژمێر حەفتی ئێڤاری یە، ئەرێ تو یا نڤستی؟ بەرسڤا من بدە، نوکە بێژە."

ئەو ل سەر ڤان ئاخفتنێن خوە یێ بەردەوام بوو هەتا مەریەمێ ژ نەچاری ڤە دگوتێ: "ئەز یا ل ڤێری."

ئەو دا هێتە د ژوور ڤە و پالا  خوە دەتە دەرگەهی. دەمێ ئەو ل سەر تەختی یا درێژكری، وێ ب دزیکی ڤە تەماشە دکرە کەلەخێ وی یێ مەزن و پێن وی یێن درێژ و دوکێلا جگارێ یا دناڤ کونێن دفنا وی ڕا ددەرکەفتی و ڕۆناهیا سەرێ جگارەیا وی یا بەردەوام گەش و تاڕی دبوو.

ڕەشیدی بەحسێ ڕۆژا خوە بۆ دکر، وی جووتەکێ پێلاڤان ل دووڤ داخوازیا جیگرێ وەزیرێ دەرڤە دروستکر، وی بەردەوام پێلاڤ ژ ڕەشیدی دکڕین. هەردیسان داخوازیا دروستکرنا سەندەلان ژ دەڤ دیبلۆماسیەکێ پۆلەندی و هەڤژینا وی بۆ هاتیە. هەردیسان وی بەحسێ وان گوتگوك و ئەفسانەیان بۆ دکر یێن خەلکی ل دور پێلاڤان باوەری پێ هەی.

خەلکێ وی باژێرێ هزردکر ئەگەر ئەو ب پێلاڤ ڤە بنڤن، دێ ئەڤ چەندە بیتە ئەگەرێ مرنا کەسەکێ نێزیك د خێزانا وان دا، یان ژی هەکە بۆ یەکەم جار پێلاڤەکێ بکڕن و کتا چەپێ بکەنە پێ خوە، ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەرێ پەیدابوونا شەڕ و نەخوشیان.

پاشی وی گوت: "ئەڤ چەندە ب تنێ ل وی دەمی ڕونادەت ئەگەر بێی دەستی ل ڕۆژا ئەینی مرۆڤ وەبکەت. هەردیسان، ئەرێ تو دزانی ئەگەر کەسەك هەردوو کتێن پێلاڤا خوە پێکڤە گرێدەت و ب بزمارەکێ ڤە ب هلاویسیت، دێ بیتە ئەگەرێ هاتنا مزگینیەکا نەخوش."

ڕەشیدی ڤەت باوەری ب ڤان بیروباوەران نەبوو، چونکی ئەڤ بیروباوەرە پتر دناڤ د ژنان دا د بەربەلاڤبوون. هەردیسان ڕەشیدی بەحسێ هندەك دەنگوباسان بۆ وێ دکر یێن ل جادەیێ دهاتنە گوتن وەك، سەروکێ ئەمریکا "ڕیچار نیکسۆن"ی ژبەر هەتکبەریەکێ نەچاربوویە دەست ژ کارکێشانا خوە پێشکێش بکەت.

مەریەمێ کو چ جاران گوهـ ل ناڤێ نیکسونی نەببوو و نەدزانی کا ئەو هەتکبەری چیە یا ئەو نەچارکری دەستان ژ پۆستێ خوە بەردەت. وێ چ ئاخفتن نەگوتن بەلکو ب تنێ هیڤیا وێ ئەوبوو ڕەشید ژ ئاخفتنا خوە ب دوماهی بهێت و جگارەیا خوە بڤەمرینیت و ژ وێرێ بچیت.

پشتی هینگێ وێ گوهلێبوو ئەو ژ وێرێ چوو دەرگەهێ ژوورا خوە ڤەکر و چوو بنڤیت، ل وی دەمی ژ نوو بێهنا مەریەمی هات و هەستپێکر ئەو پرتا ئاسنی یا دناڤ سنگێ وێ دا دەرکەفت.

ل شەڤەکێ ژ شەڤان، پشتی قوپکێ جگارەیا خوە ڤەمراندی، ل شوونا بێژیتێ شەڤا تە خوش، ب تۆڕەیی ڤە گوتێ: " ئەرێ تو چ جاران وی تشتێ هە ناڤەکەی ما؟"

دگەل ڤێ گوتنێ وی بەرێ خوە دا چانتێ وێ و گوت: "من هزر دکر تو پێدڤی ب هندەك دەمی هەتا دگەل ڤێ ڕەوشا نوو د گونجی، لێ هۆسا دیارە ئەڤ چەندە تشتەکێ تەمسارە، ئەڤە حەفتیەك بووری و هێشتا چانتێ تە یێ گرتی یە و تشتێن تە یێن تێدا. باشە. ژ سپێدێ وێ ڤە، دڤێت تو وەکو هەڤژینەکێ سەرەدەریێ بکەی، تو تێگەهشتی؟"

مەریەم ترسیا و ددانێن وێ دەست ب خوە لێکدانێ کر.

"ئەز پێدڤی ب بەرسڤەکێ مە."

"بەلێ."

"باشە، تو چ هزردکەی. یا ژ تەڤە تو یا د هوتێلەکێ ڤە و ئەز ژی خزمەتکارێ هوتێلێ مە و دێ ل بەر خزمەتا تە ڕاوەستم؟ باشە، ئوهـ ئوهـ، لا اله الا الله، ئەرێ بەری نوکە من چ گوتبوو تە ل دور گریا ژنان؟ مەریەم، من چ تشت ل دوور گریا ژنان نەگوتبوونە تە؟"

***

ل ڕۆژا دی سپێدێ پشتی کو ڕەشید چوویە سەر کاری، مەریەمێ چانتێ خوە ڤەکر و جلکێن خوە ژێ ئینانە دەرێ و کرنە د قومسۆرێ دا. پاشی سەتلەکا ئاڤێ ژ بیرێ ئینا دەرێ و دەهمەنێن خوە هلدان و دەست ب شووشتنا پەنجەرێن ژوورا خوە و هۆلا مێهڤانان کر و تەڕمە و بنێ ژووران شووشت و تەڤنێن تەڤنپیرکان ب گێسکی ژ کوژیێن ژووران ڤەکرن و پاشی پەنجەرك هەموو ڤەکرن داکو بایێ پاقژ بهێتە د ژوور ڤە.

ل دووڤ دا سێ کوپێن نیسکان کرنە د قازانێ دا و دەست هاڤێتە کێرکێ و پارچەیەکا گێزەرێ و دوو پتات کەرکرن و کرنە دناڤ ئاڤێ دا. پاشی چوو ل ئاری گەریا دیت یێ ل پشت کەوانتەرا پشتێ کو ڤالکێن بهاراتان یێن پیسبووی ل سەر بوون.

وێ دەست ب كرنا هەڤیری كر ل دووڤ وێ ڕێكا بەری هینگێ نانایێ نیشا وێ دای ئەو ژی هەڤیری ب پاشیا دەستێ خوە بگریت و هەردوو لێڤێن وی یێن پەحن بكەت و پاشی بزڤڕینیت و جارەكا دی ب هەردوو دەستێن خوە فشارێ بێختە سەر، پاشی هندەك ئار ب سەر هەڤیری دا كر و هندەك ئاڤ كرە ددەستێ خوە دا و ل سەر ڕەشاند و چوو ژ دەرڤە داكو بچیتە سەر فڕنێ.

بەری هینگێ ڕەشیدی گوتبوویێ كا فڕنا نانپێژی دكەڤیتە كیرێ. ل دوماهیا جادەیێ ل دەستێ چەپێ دێ گریتە بەر و پاشی دێ بەرەڤ دەستێ ڕاستێ چیت. مەریەم ل دووڤ هندەك ژن و زارۆكان كەفت كو ئەو ژی بەرەڤ هەمان ڕێك دچوون.

مەریەمێ دیت هندەك زارۆك یێن بەری دایكێن خوە دكەنە غار و هندەكێن دی ژی دەستێ وان یێ گرتی، پەنتەرۆنێن وان یان گەلەك د مەزن و فرەهـ بوون كو ژ پێن وان دهاتە خوارێ یان ژی گەلەك د تەنگ بوون و مابوونە ب لەشێ وان ڤە، قەیتانكێن پێلاڤێن وان ژی نەدگرێدای بوون و جار جار پێلاڤێن وان ژ پێن وان دبوون و گەلەكان ژی تائیرێن لاستیكی كربوونە پێن خوە.

ئەڤ ژنە كۆم كۆمە بوون ب ڕەنگەكێ كو هندەك سێ پێكڤەبوون و هندەكێن دی چوار بوون، هندەكان بوركە ل بەر بوون و هندەك ژی د بێ بوركە بوون. مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ چیپ چیپا وان یا بلند و كەنیا وان یا بلند دبوو. دەمێ ئەو ب ڕێكێ دچوو بەرێ خوە د چەماند داكو كەس وێ نەنیاسیت لێ وێ هەر ئاگەهـ ژ سحبەتێن وان هەبوو كو بەحسێ زارۆكێن خوە یێن شیم یان هەڤژینێن خوە یێن پت پتی دكر.

*"دێ بێژی هەما خوارن ب خو دهێتە لێنان و دچیتە بەر سینگێ وان."*

*"بخودێ و ب خودێ، خو من خولەكەكێ دەم نینە بێهنا خوە ڤەدەم."*

*"وی دگوتە من، ب خودای ئەڤ چەندە ڕاستە، وی ژ ڕاستا ئەڤ تشتە یێ بۆ من گوتی."*

ڤان گەنگەشەیێن بێ دوماهی، هەرچەندە ئاوازەكا خەمگین دگەل بوو لێ دگەل هندێ ژی بەردەوام دووبارە دبوون و و دزڤڕین هەروەكو یەك ل دور بازنەیەكێ بزڤڕیت.

مەریەم گەهشتە دوماهیا جادێ و پاشی بۆ دەستێ چەپێ چوو هەتا گەهشتیە دەڤ فڕنێ، ل وێرێ ژی دیت كۆمەكا ژنان یێ گازندان ژ ڕەوشا خوە دكەن، یەك یا دبێژیت

هەڤژینێ وێ قوماری دکەت و یەکا دی یا دبێژیت هەڤژینێ وێ بەس گوهێ خوە ددەتە دایکا خوە و خو ڕوبیەکی ل وێ نامەزێخیت.

مەریەم مەندەهوش ما ئەرێ بوچی ئەڤ ژنە هەموو گازندەیان ژ بەختێ خوە یێ ڕەش دکەن، ئەرێ هەکە هۆسا بیت پا بوچی وان شووکریە یان ژی ئەڤ چەندە یاریا هەڤژینییێ یە ئەو هێشتا تێدا شارەزا نەبوویە. یان ژی ئەڤ گازندەیە ڕێوڕەسمێن ڕۆژانەنە و بەردەوام دووبارە دبن وەك لێنانا برنجێ و کرنا هەڤیری.

ل سرایا فڕنێ، مەریەمێ هەستپێکر ژنێن ل فڕنێ هەموو ل بن چاڤکان یێ تەماشەی وێ دکەن، وێ گوهـ ل پست پستا وان بوو. دەستێن وێ خوهێ گرتن و هەست ب ترسێ کر چونکی یا ژ وێ ڤە ئەڤ خەلکە هەموو دزانیت ئەو کچکەکا بیژی یە و بوویە ئەگەرێ هەتکبەریا باب و خێزانا خوە و هەموو ژی دزانن وێ خیانەت یا ل دایکا خوە کری و هێلایە ب تنێ هەتاکو خوە کوشتی. وێ ب پرتەکا دەرسوکا خوە، خوها ل سەر لێڤا خوە یا سەری پاقژ کر و بزاڤ کر پیچەکێ ئارام ببیت.

بۆ ماوەیێ چەند خولەکەکان هەموو تشت ب ئارامی بڕێڤەچوون، پاشی ژنەکێ دەستێ خوە دانا سەر ملێ وێ، دەمێ مەریەم ل پشت خوە زڤڕی، وێ ژنەکا قەلەو و دێم سپی دیت و کو وێ ژی دەرسوکەکا وەکو مەریەمێ دانابوو سەر ملێن خوە. پرچا وێ یا ڕەش و خەلەك و کورت بوو. دیمێ وێ تا ڕادەیەکی یێ گرۆڤر بوو. لێڤێن وێ ژ یێن مەریەمێ مەزنتر بوون و لێڤا بنی ژی بۆ خوارێ یا پەحن بوو و نیشانەکا ڕەش ل سەر هێلا لێڤا وێ بوو، چاڤێن وێ ژی د مەزن و کەسك بوون.

"تو هەڤژینا ڕەشیدی یا نووی، مانە هۆسایە؟"

وێ ژنێ ئەڤ پرسیارە ژ مەریەمێ کر و بۆ گرنژی و ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو.

"تو یا ژ هیراتێ هاتی، لێ تو گەلەکا بچووکی؟ مەریەم جان، مانە هۆسایە؟ ناڤێ من فەریبایە و ئەز ژی ل وێ کولانێ دژیم یا تو لێ دژی و مالا مە یا ل ڕەخێ چەپێ و خانیێ پێنجێ یە، ڕەنگێ دەرگەهێ مە یێ کەسکە، ئەڤەژی کورێ من نورە."

ئەو کورێ ب ڕەخ وێ ڤە خودان دێمەکێ گەش و پرچەکا نەرم بوو، هندەك موو ل سەر پلا گوهێ وی یێ ڕاستێ بوون و چاڤێن وێ د مەزن بوون. دەستێ خوە بلند کر و گوت: "سلاڤ بکە خالەتا مەریەم."

"ژیێ نوری دەهـ سالن، من کورەکێ دی ژی هەیە کو ژ وی مەزنترە و ناڤێ وی ئەحمەدە."

نوری گوت: "ژیێ وی سێزدە سالن."

"بەلێ سێزدە سالن لێ ڤان ڕۆژان دێ چیتە د چواردێ دا، ناڤێ هەڤژینێ من ژی حەکیمە و ئەو ماموستایە ل ڤێ دەڤەرا دەهمازانگ، پاشی ئەگەر تە ڕۆژەکێ دەرفەت هەبوو وەرە مالا مە داکو قەهوەیەکێ پێکڤە ڤەخوین."

ژ نیشکەکێ ڤە، ژنێن دی ژی هەموو ل دورماندوری وێ خڕڤەبوون و ئەو کرە د بازنەیەکێ دا و دەست ب پرسیاران کر.

"ئانکو تو هەڤژینا ڕەشیدی یا یا گەنجی."

"ئەرێ تە چەوا کابول دیت؟"

"جارەکێ ئەز یا چوویمە هیراتێ، مالا پسمامەکێ من یا ل وێرێ؟

"ئەرێ تە دڤێت زارۆکێ تە یێ یەکێ کچ بیت یان کور؟"

"منارەییێن وێ، چ پێنەڤێت ئەو باژێرەکێ گەلەك جوانە."

"مەریەم ، کچك باشترن چونکی ئەو ناڤێ خێزانێن خوە دهەلگرن."

"نەخێر کچك دێ مەزن بن و شوو کەن بەلێ کورك دێ ل دەڤ تە مینن و چاڤێ خوە دەنە تە دەمێ پیر دبی."

"هەما جێمکەکی بینە، کچەکێ و کورەکی، ل وی دەمی هەموو دێ د بەختەوەر بن."

مەریەم بەرەڤ پاشڤە زڤڕی و بێهنا وێ تەنگ بوو گوهێن وێ دەنگڤەددا و لێدانێن دلێ وێ بلەز کەفتن و بەرێ وێ ژ ژنەکێ دکەفتە یەکا دی. پاشی دووبارە بۆ پاشڤە زڤڕی لێ نەزانی دێ کیڤە چیت چونکی ئەو د نیڤەکا وان هەموویان دا بوو. فەریبایێ زانی بێهنا وێ تەنگ بوو، گوت: "وێ بهێلنە ب تنێ، خوە ژێ دوور بکەن، هەوە کچك ترساند."

مەریەمێ دەست هاڤێتە هەڤێری و دا بەر سینگێ خوە و ڕێکا خوە دناڤ وێ کوما ژنان دا کر و ژ وێرێ چوو.

"تو دێ کیڤه چی، هامشیرا*."

وێ ڕێکا خوه گرته بەر، لێ هو دیت ئەو یا ل جهەکێ ڤالاٚ و بێ مرۆڤ، پاشی کره غارێ هەتا گەهشتیه سەر جادەیا سەرەکی و نەڕاوەستیا هەتا گەهشتیه دوماهیا وێ دووریانێ یا ل بنێ جادێ لێ زانی کو ئەو یا بەرەڤ ئاڕاستەیێ شاش ڤه چووی، لەوڕا پاشڤه زڤڕی و بەرەڤ لایێ دی چوو. ب ڕێکێڤه کەفت و سەرچووکێ وێ برینداربوو، لێ دووباره ڕابووڤه و جارەکا دی دناڤ وێ کوما ژنان ڕا دەرباز بوو.

"ته خێره؟"

"خوین یا ژ سەرچووکێ ته دهێت، هامشیرا!"

جارەکا دی مەریەمێ ل دور جادەیێ زڤڕی لێ ئەڤ جاره ڕێکا وێ یا دروست بوو، لێ ژ نیشکەکێ ڤه ژ بیرا وێ چوو کا کیژ مال ل وی تاخی مالا ڕەشیدی یه.

ب چاڤێن ڕۆندك ڤه دەستێ خوه دهاڤێته دەرگەهێن حەوشێن هەموو خانیێن ل وێ کولانێ، هندەك دەرگەهـ د گرتی بوون و هندەك ژی د ڤەکری بوون. وێ ب ڕێکا باخچەیان و ڕەوینا سەیان و هاتنوچوونا مریشکان دزانی کو ژ وان خانیێن دەرگەهێن وان ڤەکری مالا ڕەشیدی نەبوون.

وێ دئینا پێشچاڤێن خوه نوکه ڕەشید بهێته مال و هۆسا وێ بینیت یا دەرگەهێن خەلکی ڤەدکەت و خوین یا ژ سەرچووکێ وێ دهێت و ل کولانێ یا بەرزەبووی. دووباره وێ دەست ب گرییێ کر و دگەل ڤەکرنا هەر دەرگەهەکی وێ سەلەوات دخواندن.

دێمێ وێ ژبەر ڕۆندکان یێ تەڕ بوو دەمێ ل دوماهیێ دەرگەهێ خانیێ ڤەکری و دەمێ چاڤێ وێ ب سەرشوویێ و برکا ئاڤێ و خانیکێ بچووك کەفتی هەست ب ئارامیێ کر. هەر زوو خوه هاڤێته د ژوور ڤه و دەرگەهـ ب کلیلێ قوفل کر و پاشی ل سەر ئەردی ڕوونشت و دلێ خوه ڕاکر و هێدی هێدی خوه گەهانده بەر دیواری و پالاٚ خوه دایێ و پێن خوه درێژ کرن، چ جاران هندی ئەڤرۆکه وێ هەست پێنەکریه کو ئەو یا ب تنێ و بێکەس بیت.

***

* هاماشیرا ئانکو "خوشکێ" د زمانێ پەشتوونی دا.

دەمێ ئێڤارێ ڕەشید زڤڕیە مال، کیسکەکێ کاغەزی یێ ڕەنگ قەهوای دگەل خوە ئینابوو. مەریەمێ هەست ب بێئومێدییێ کر دەمێ دیتی کو ڕەشیدی ئاگەهـ ژ پەنجەرکێن پاقژکری و ئەردێ ڕائێخستی و کوژیێن دیواری یێن پاقژ و بێ تەڤنپیرك نەبوو، لێ ئەو یا کەیفخوش بوو کو وێ خوارن یا بۆ وی بەرهەڤ کری و ل سەر مشەمعەکێ پاقژ ل سەر ئەردێ هۆلا بێهنڤەدانێ ڤە یا دانایی.

مەریەمێ گوت: "من بۆ تە دال* یا بەرهەڤ کری."

"گەلەك باشە، ئەز گەلەك یێ برسیمە."

مەریەمێ مەسینك تژی ئاڤ کر داکو ئەو دەستێن خوە پێ بشوت و پاشی خاولیەك داڤێ داکو دەستێن خوە هشك بکەت، ل دووڤ دا وێ سێنیەکا دالێ یا گەرم کو هەلم ژێ دچوو دگەل سێنیەکا برنجێ سپی دانا بەر سینگێ وی.

ئەڤە یەکەم خوارن بوو مەریەم بۆ وی بەرهەڤ دکەت. هیڤیا مەریەمێ ئەوبوو کو ڕەوشا وێ یا باشتر بایە دەمێ ئەڤ خوارنە بەرهەڤ دکر داکو تاما وێ خوشتر هاتبایە، چونکی ل وێ ڕۆژێ هەموویێ دەمێ خوارن بەرهەڤ دکر، ژبەر ڕوودانا فرنێ دلەرزی. هەردیسان ئەو بەردەوام ژ هندێ دترسیا نەکو دال گەلەگ تیر یان سیر بهێت، ژ ڕەنگێ وێ ژی دزانی کو گەلەك زەنجەبیل و کێم زەعفەران یا کریێ.

دەمێ ڕەشیدی کەفچکێ خوە د ئافکا دالێ یا ڕەنگ زێری دا هەلاندی، مەریەمێ پیچەکێ خوە لڤاند و هزرکر کر نەکو ب دلی نەبیت و تۆڕە بیت یان ژی سێنیکا خوە بدەتە ڕەخەکی و نەخوت. پاشی وێ گوت: "هشیاربە، گەلەك یا گەرمە."

ڕەشیدی پف کرە کەفچکی و پاشی کرە د دەڤێ خوە دا. پاشی گوت: "تاما وێ گەلەکا خوشە، هەرچەندە یا کێم خوێ یە لێ یا خوشە، گەلەك ژی یا خوشە."

بێهنا مەریەمێ فرەهـ بوو گەلەك کەیفا وێ ب ڤێ چەندێ هات، گەلەك کەیفا وێ ب پەیڤا "گەلەك ژی یا خوشە" دهات. ڤێ چەندێ پیچەکێ ڕۆژێن وێ یێن بەرێ و نەخوش ژبیرا وێ برن.

ڕەشیدی گوت: "سوباهی ڕۆژا ئەینی یە، تو چ دبێژی ئەز پیچەکێ تە بگێرینم؟"

"ل کیرێ؟ ل کابولێ؟"

---

* ئافکەکا ئەفغانی یا وەکو نیسکێ یە.

"نەخێر، ل کالکوتا."

مەریەمێ چاڤێن خوە نقاندن و ڤەکرن.

"نەخێر ئەز یاریان دکەم، ئەرێ ل کابولێ پا ل کیڤە ما."

پاشی ڕەشیدی ل وی کیسێ کاغەزی گەریا و گوتێ: "بەری ئەز بێژم کا چ د ناڤ ڤی کیسکی دایە، پێدڤیە ئەز تشتەکی بۆ تە بیژم."

دەستێ خوە هاڤێتە بورکەیێ ڕەنگ شینێ ئەسمانی و ژ کیسکی ئینا دەرێ و پاشی قوماشێ وێ ل سەر چوکێن خوە درێژ کر و بورکە بلند کر و دەست ب ئاخفتنێ کر.

"مەریەم من گەلەك بکرِ هەنە، هندەك ژ وان هەڤژینێن خوە یێن بێ دەرسوك دئینە دکانا من، هەڤژینێن وان ڕاستەخو دگەل من دئاخڤن و بێی شەرم تەماشەی چاڤێن من دکەن، مکیاژی ددانن و تەنورەیێن کورت دکەنە بەر خوە و لنگێن وان یێن ڕیس دەردکەڤن. هندەك جاران ل پێش چاڤێن هەڤژینێن خوە، پێ خوە یێ ڕاستێ دئینە بەرامبەری من داکو نمرا پێ وان بگرم و هەڤژینێن وان چ گازندەیان ژێ ناکەن.

"ئەو هزر دکەن تشتەکێ ئاسایی یە هەکە کەسەکێ بیانی دەستێ خوە بکەتە پێن ژنێن وان یێن ڕیس! ئەو هزر دکەن ئەو زەلامێن سەردەم و ڕەوشەنبیرن. ل دووڤ تێگەهشتنا وان، ئەو هزر ناکەن ب ڤێ چەندێ ناموسا خوە دهاڤێژنە بەر خەلکی."

پاشی وی سەرێ خوە هەژاند و بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "پترِیا ڤان کەسان ل تاخێن زەنگینان ل کابولێ دژین، ڕۆژەکێ ئەز دێ تە بەمە تاخێ وان داکو ڤێ چەندێ ب چاڤێن خوە ببینی، لێ هندەك زەلامێن ب ڤی ڕەنگی جیرانێن مە ژی نە. ل بنێ ڤی تاخی ماموستایەك هەیە دبێژنێ حەکیم، ئەز دبینم هەڤژینا وی فەریبا هەموو گاڤان تنێ ل جادەیێ دهێت و دچیت و یا سەرکولە. ب ڕاستی ژی کەربێن من گەلەك ڤەدبن دەمێ دبینم زەلامەك نەشێتە هەڤژینا خوە و کونترۆلێ ل سەر ناکەت."

ل دووڤ دا پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدا و گوت: "ئەز زەلامەکم یێ د ژینگەهەکا جودا دا مەزن بوویم، بۆ هەر ئاورینەکا ب تنێ یا شاش یان پەیڤەکا بێ ڕامان، خوین دێ هێتە ڕێژتن. پێدڤیە دێمێ ژنێ بۆ هەڤژینێ وێ ب تنێ بیت. دڤێت ئەڤ چەندە باش ل بیرا تەبیت، تو تێگەهشتی؟"

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند و گوتێ دروستە، لێ ب ڕاستی ژی وێ ئاگەهـ ژ ڤێ سحبەتا وی هەموویێ نەبوو چونکی ئەو بەختەوەریا ژبەر خوارنا وێ یا خوش ترس ژبیرا وێ بربوو. ب دیتنا مەریەمێ، ڤی زەلاٚمی دڤیا وەکو کەسەکێ دەستهەلاٚتدار و خۆسەپێنەر دیار بکەت هەروەکو چیایێ "سافید کوخ" ئەوێ ب هەیبەت ڤە بەرێ خوە دایە گوندێ گول دامانێ. پاشی ڕەشیدی ئەو کیسك داڤێ و گوتێ: "نوکە ئەم د هەڤدوو گەهشتین، نوکە دەستووریێ بدە من ئەز هێشتا دالێ بخوم."

# 11

بەری نوکە چ جاران مەریەمێ بورکە نەکربوو بەر خوە، لێ ڕەشیدی هاریکاریا وێ کر و نیشا دا کا دێ چەوا کەتە بەر خوە. پارچەیا سەری یا بورکێ ل سەر قەرقوردێ سەرێ وێ یێ شدیای و گران بوو. مەریەمێ هزر دکر ئەو نەشێت جیهانا ژ دەرڤە ب ڕێکا کونێن پێچەیا ل سەر سەروچاڤێن خوە ببینیت.

پشتی بورکە کریێ، چەندین جاران د ژوورا خوە ڤە هات و چوو داکو ڕاهێنانان ل سەر بکەت، لێ چەندین جاران پێ وێ دکەفتە سەر لێڤا بورکەی و دهلنگفت. وێ چ تشت نەدیتن ب تنێ دیتنەکا کێم نەبیت ئەو ژی ب ڕێکا گوشەیەکا ب تنێ دناڤ کونێن پێچەیا سەر سەروچاڤێن وێ دا نەبیت، ژبەر هندێ بێهنا وێ تەنگ بوو ڤەت حەز ژ وێ پارچەیا بادایی نەدکر یا دکەفتیە سەر دەڤێ وێ و وەخت بوو وێ بخەندقینیت.

ڕەشیدی گوتێ: ئەز یێ پشتڕاستم پشتی ماوەیەکێ دی تو دێ فێربیێ، هەردیسان ئەز شەرتانێ دکەم و تو دێ گەلەك حەز ژێ کەی ژی."

پاشی ئەو ژ مال دەرکەفتن و سوواری پاسەکێ بوون و بەرەڤ جهەکی چوون کو ڕەشیدی دگوتێ "شار-ی-ناو پارك." کو ل وێرێ زارۆکان هەڤدوو پالدا و مژوولی سوواربوونا یاریان بوون و هندەکان ژی یاریا ڤولی بولێ دکر کو تۆڕەکا کەڤن و دریایی ب قورمێن دوو داران ڤە گرێدابوو تەپە ل سەر دهاڤێت.

وان هەردووان پێکڤە پیاسە دکرن و چاڤێ وان ب هندەك زارۆکان کەفت یێن فرۆکەیێن خوە یێن کاغەزی بلند دکەن. مەریەم ب ڕەخ ڕەشیدی ڤە دچوو لێ هندەك جاران پێ وێ دکەفتە سەر بورکەی و دهلنگفت.

دەمێ بویە وەختێ فراڤینێ ژی، ڕەشیدی ئەو برە خوارنگەهەکا بچووك یا کەبابان ل نێزیکی مزگەفتەکێ دگوتنێ "مزگەفتا حەجی یەعقوب"ی، ئەردێ وێ خوارنگەهێ یێ نیسەك بوو و بایێ وێ ژی یێ پڕ بوو ژ دووکێلێ و بێهنا گوشتێ خاڤ ژی ژ دیوارێن وێ دهات، دەنگێ وێ موزیکەیا کو ڕەشیدی گوتیێ ناڤێ وێ "لوگاری" یە، گەلەك یێ بلند بوو.

ئەو کەسێن کەباب دبژارتین، دوو کورێن لاواز و بێتاقەت بوون، ب دەستەکی با ل کەبابان دکر و ب دەستەکێ دی ژی مێش ژێ ددانە پاش. مەریەم کو بەری نوکە نەچوویە د خوارنگەهان ڤە، بۆ وێ یا سەیر بوو د ژوورەکا پڕی کەسێن بیانی ڤە بڕوونتە خوارێ و بورکەیێ خوە بلند بکەت و خوارنێ بکەتە د دەڤێ خوە دا. هەمان هەستێ نەخوش ل دەڤ پەیدابوو دەمێ ل ڕۆژا چوویە سەر فڕنێ ل دەڤ پەیدابووی، لێ ئامادەبوونا ڕەشیدی ب ڕەخ وێ ڤە پیچەکێ ئەو ئارام کر.

پشتی بورینا بێهنەکێ، وێ پووتە ب چ تشتان نەکر، نە دەنگێ موزیکێ یێ بلند و نەژی دووکێلا د خوارنگەهێ ڤە و هەتا قەرەبالغا خەلکی ژی ئێدی ل دەڤ وێ ببوو تشتەکێ ئاسایی، یا ژ هەموویێ سەیرتر ئەو بوو کو ئەو بورکەیێ بەری هینگێ بۆ وێ یا نەخوش، نوکە هزردکەت تشتەکێ ئارامە و کەیفا وێ پێ هات هەروەکو پەنجەرکەکا یەك کون ب تنێ تێدا هەی. چونکی بەرێ کەسێ ل وێ نەبوو کەسێ ئاگەهـ ژ هەبوونا وێ نەبوو، ڤێ چەندێ ژی ئەو ترس ل دەڤ نەهێلا کو خەلك ب دیتنەکا ب تنێ وێ بنیاسن و هەموو ڕابردوویێ وێ یێ ڕەش بزانن.

ل سەر جادەیێ، ڕەشیدی هندەك ئاڤاهیێن فەرمی بۆ وێ دانە نیاسین، وی گوتێ ئەڤە ئاڤاهیێ بالیوزخانەیا ئەمریکایە و وێ هەژی ئاڤاهیێ وەزارەتا ناڤخۆیی یە. هەردیسان وی دەستێ خوە درێژ دکرە ترۆمبێلان و ناڤێن وان بۆ دگوتن، فولکس یا ڕۆسی و شیفرولیت یان ئەمریکی و ئۆپلێ یا ئەڵمانی.

پاشی پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تە پتر حەز ژ کیژ ترۆمبێلێ کر؟"

مەریەمێ ب دوودلی ڤە دەستێ خوە درێژ کرە ترۆمبێلەکا فولکس، ڕەشیدی ژی پێ کرە کەنی.

کابول گەلەك پتر ژ بازێرێ هیراتێ ب قەرەبالغ تر بوو، داروبار و عەرەبانەیێن ب دووڤ هەسپان ڤە دهاتنە کێشان کێمتربوون، بەروڤاژی هژمارەکا مەزن یا ترۆمبێلان و ئاڤاهیێن بلند و نیشانێن هاتنوچوونێ و ڕێکێن ڤێرکری لێ هەبوون. ل هەر جهەکی، خەلکێ وێ ب شێوەزارەکێ تایبەت یێ بازێری دئاخفتن و گوهۆڕین د گوتنا چەندین پەیڤان دا هەبوو.

ڕەشیدی ژ فرۆشیارەکێ گەرۆك ئایس کریمەك بۆ وێ کری، ئەڤە یەکەم جار بوو

مەریەم ئایس کریمەکێ بخوت، وێ قەت هزرنەدکر کو ئەڤ تام و خوشیە هەموو ژ ئایس کریما د ڤالکێ دهێت، ژبەر هندێ وێ هەموو خوار. ژبەرکو کو فستەق ب سەرڤە بوون و دندکێن برنجی یێن هوور ل بنێ وێ بوون. مەریەم گەلەك ب پێکهاتنا وێ یا سەیر و تاما وێ یا شیرین داخباربوو.

پاشی ئەو ل سەر پیاسیەیێن خوە بەردەوام بوون هەتا گەهشتینە جهەکی دگوتێ "کوچیهـ مورگا*"، بازاڕەکێ تەنگ و ب قەرەبالغ بوو، ڕەشیدی گوتێ ئەڤە زەنگینترین جادەیا کابولێ یە.

"ل ڤی جهی، دیبلۆماتکارێن بیانی و بازرگانێن دەولەمەند و ئەندامێن خێزانا دەستهەلاتدار لێ دژین، نەك کەسێن هەژار یێن وەکو من و تە."

مەریەمێ گوتێ: "بەلێ من چ مریشك ل ڤێرێ نەدیتن."

ڕەشیدی پێ کرە کەنی و گوتێ: "ئەڤە تشتێ یەکانەیە یێ تو ل جادەیا مریشکان نەبینی."

هەر ل سەر وێ جادێ، ڕێزەکا دکانان هەبوو، مێزەیێن بچووك ل بەر دەرگەهێن وان ددانایی بوون و کولاڤێن دروستکری ژ پیستێ بەرخان و قوماشێ چاپانی یێ ڕەنگین ب ڕەنگێن کەسك و سۆری دفروتن.

ڕەشید ل بەر دەرێ دکانەکێ ڕاوەستیا و تەماشەی خەنجەرەکا ڕەنگ زیڤی یا نەخشاندی کر، ل دکانەکا دی ژی تەماشەی دەبانجەکێ کر کو خودانێ دکانێ مەتحێن وێ کرن و گوتێ کو ئەو دەبانجەکا کەڤنە و د شەڕێ جیهانی یێ یەکێ دا دژی بریتانیان هاتیە بکارئینان.

ڕەشیدی ژی تەماشەی مەریەمێ کر و گرنژی و دبن لێڤکان ڕا گوت: "باشە پا ئەزی موشی دیانم ."" مەریەمێ زانی کو ئەڤ گرنژینە یا تایبەت بۆ ژ بۆ وێ، گرنژینەکا تایبەت دناڤبەرا هەڤژینان دا.

پاشی ئەو هێشتا گەریان و دبەر چەندین دکانێن فرۆشتنا مەحفیر و دەستمال و شریناهی و گول و جهێن تایبەت یێن فرۆتنا قاتێن زەلامان و کراسێن ژنان ڕا دەربازبوون،

---

* جادەیا مریشکان.

 سەرکردەیەکی لەشکەری و چالاکڤانەکێ سیاسی یێ ئیسرائیلی بوو.

ل وی جهی، مەریەمێ هندەك كچ دیتن كو مژوولی درینا كراسان و ئوتیكرنا وان بوون.

دەم بۆ دەمی ڕەشیدی سلاڤ دكره خودانێ هەر دكانەكا ئەو دبەرا چووباینه یان نیاسیبایه، هندەك جاران ب زمانێ فارسی و هندەك جاران ژی ب زاراڤێ پەشتوونی. دەمێ ئەو دچوو سەرێ هەڤالێن خوه و هەڤدوو ماچی دكر، مەریەم دا چەند پێنگاڤەكان ل دووری وان ڕاوەستیت. ڕەشیدی ئەو بۆ وان نەددا نیاسین.

پاشی ل بەر دەرگەهێ دكانەكا نەقشكرنێ دا، جەلیلی گوتێ: "ئەز خودانێ ڤێ دكانێ دنیاسیم، تو ژ دەرڤە بمینه و ئەز ژی بەس خولەكەكێ دێ چمه ژوور ڤه سلاڤ كەمێ."

مەریەم ژ دەرڤە و ل سەر جادەیا ڤەرەبالغ ما. چاڤێ وێ ب ترۆمبێلان دكەفت كا چەوا بلەز ل سەر جادەیا مریشكان ڕا دهێن و ڕێكا خوه دناڤبەرا ڤەرەبالغا فرۆشیارێن گەرۆك و خەلكێ پیادە دا دكەن و دەرباز دبن و هۆڕنان بۆ زارۆك و وان گوهدرێژێن د ڕێكێ دا لێددەن یێن نەڕادبن.

پاشی چاڤێ وێ ب بازرگانان كەفت یێن كو د دكانێن خوه یێن بچووك ڤه ڕوونشتی و جگاره دكێشان و تف دكره د تەبلێكن ئاسنی دا و جار جاره ژی سەروچاڤێن خوه دئینانه ژ دەرڤە داكو قوماش و كەلوپەلێن خوه نیشا بكڕان بدەن.

ژنێن ل سەر وێ جادەیێ دهاتن و چوون پتر سەرنجا مەریەمێ ڕادكێشان چونكی ئەو ژنێن ل ڤی جهێ كابولێ گەلەك د جوودابوون ژ ژنێن تاخێن هەژاران ب تایبەت ل وی جهێ مالا ڕەشیدی لێ كو ژنێن وی جهی ژ سەری تا بنی دنخافتی بوون، لێ ژنێن ڤێرێ د "ئـ..." ئەو چ پەیڤ بوو یا ڕەشیدی دگوتیێ؟ ئاها بیرا وێ هات ئەو ژی ژنێن سەردەم و ڕەوشەنبیرن.

بەلێ ئەو ژنێن سەردەم یێن ئەفغانی بوون و شوو ب زەلامێن ئەفغانی یێن سەردەم كربوون كو ل دەڤ وان ئاریشه نەبوو ئەگەر ژنێن وان ب تنێ بچنه بازاڕی و میكاژی بكاربینن و سەرێ وان یێ كۆل بیت و دگەل خەلكێ بیانی باخڤن.

مەریەمێ ددیت كو ئەو ژن یێ ب ئازادی ل سەر جادەیێ دبورن، هندەك ژ وان دگەل هەڤژینێن خوه بوون و هندەكێن دی ژی ب تنێ بوون یان دگەل زارۆكێن خوه بوون. زارۆكێن وان د دێم سۆر و گرۆڤر بوون و گورەیێن پاقژ ل پێن وان بوون و دەمژمێرێن پیستی یێن گرانبها ل دەستێ وان بوون و پایسكلێن تائیرێن وان بلند دهاژووتن، بەروڤاژی

زارۆکێن تاخێ دەهمازانگ کو شوونوارێن پێڤەدانا مێش و پێشیان ل سەر دێمێ وان بوون و وان هندەك تائیرەیێن کەڤن ب داران دهاژووتن.

وان ژنان چانتە ددەستی دا بوون و تەنورەیێن کورت ل بەربوون و نینوکێن وان ژی ب ڕەنگێن پیڤازی و پرتەقالی د ڕەنگکری بوون و لێڤێن وان ژی وەکو کولیلکان د سۆر بوون و قوندەرێن کەعبێ وان بلند کربوونە پێن خوە و ب خوش برێڤە دچوون دا بێژی وان کارەکێ گرنگ و بلەز یێ هەی. هەردیسان بەرچاڤکێن ڕەش ژی کربوونە بەر چاڤێن خوە و دەمێ د بەر مەریەمێ ڕا دبورین، بێهنا گولاڤێن وان یێن بهاگران ئەو دبرە جیهانەکا دی.

مەریەمێ ژنەك دیت کو د کوشنێ پشتێ یێ ترۆمبێلێ دا یا جگارەیان دکێشیت، وێ هزردکر ڤان ژنان هەموویان باوەرنامەیێن زانکۆیێ ب دەستخوەڤە ئینباینە و ل کومپانیان و ل پشت مێزەیان کاردکەن و پەیوەندییێن تێلەفونی یێن گرنگ دگەل کەسێن گرنگ و مەزن ئەنجام ددەن.

وان ژنان مەریەم مەندەهوش کربوو، وێ دزانی کا ئەو ل بەر وان چەند یا پاشکەفتی و سادەیە ژبەر هندێ وێ بەرێ خوە ژ گەلەك تشتان لادا.

ل دووڤ دا ڕەشیدی دەستێ خوە دانا سەر ملێ وێ و تشتەك کرە د دەستان دا، ئەو ژی شالەکا ڕەنگ شین و نەخشاندی بوو ب هێلێن زەر. گوتێ: "ها یا ب دلێ تەیە؟"

مەریەمێ تەماشەی ڕەشیدی کر ئەوێ کو ب کارەکێ بالکێش ڕابووی، چاڤێ خوە لێ نقاند و پاشی بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا و هزرا خوە د جەلیلی و کەنیا وی دا دکر دەمێ دیاری بۆ وێ دئینان، ئەو ئاخفتنێن نانایێ ل دور دیارییێن جەلیلی دگوتین هەموو ڕاستبوون، دیارییێن وی ژ بلی پەشیمانیەکا ب سەرڤە سەرڤە چ دی نەبوون و پتر بۆ هندێ بوون ناخێ خوە پێ ئارام بکەت نەك کەیفا مەریەمێ ژ دل بینیت. لێ ئەڤ شالا نوکە ڕەشیدی بۆ وێ ئینای ژ ڕاستا دیاریەکا ڕاستەقینە و ژ دل بوو.

مەریەمێ گوت: "بەلێ دیاریەکا گەلەك جوانە."

***

ل وێ شەڤێ، ڕەشید چوو د ژوورا وێ ڤە و ل شوونا پالێ خوە بدەتە دەرگەهی و جگارەیەکێ بکێشیت، چوو د ژوور ڤە و ب ڕەخ وێ ڤە ڕووشنتە خوارێ کو وێ خوە ل سەر تەختی دریژ کربوو. دەمێ ئەو ل سەر تەختی ڕووشنتیە خوارێ، سپرنگێن وی دەست ب

چیر چیرێ کر.

ل دەستپێکێ ئەو پیچەکێ یێ دوودل بوو، لێ پاشی دەستێ خوە دانا سەر گەردەنا وێ و تبلێن خوە ل سەر پشتا وێ ڕا ئینانە خوارێ. مەریەمێ ب دەنگەکێ نزم ڤە گوتێ : "ئەز نەشێم" لێ دگەل هندێ ژی بەرێ وێ ل دێمێ وی بوو کو ڕۆناهیا هەیڤێ د پەنجەرکێ دا ڤێدکەفت، ملێن وی یێن ستوور و سنگێ وی یێ بەرفرەهـ و موویێن سینگێ وی کو ژ قەمیسی هاتبوونە دەرێ.

دەستێ وی کەفتە سەر مەمکێ وێ یێ ڕاستێ و ب هێز گڤێشا، مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ هەناسەیا وی یا کوور دبوو. پاشی ڕەشیدی خوە هاڤێتە دبن بەتەنیکا وێ ڤە و هێدی هێدی قائیشا پەنتەرۆنێ خوە ڤەکر و ل دووڤ دا جلکێن وێ یێن خوارێ ژی ژبەر کرن و بلەز خوە هاڤێتە سەر کەلەخێ وێ.

لەشێ مەریەمێ خاڤ بوو چاڤێن خوە گرتن و ددانێن خوە بلەز دانانە سەر یەك و بهێز لەقەك ل تبلا خوە یا بەرانی دا و دەستێ خوە دانا سەر پشتا ڕەشیدی و ل سەر قەمیسێ وی ڕا دئینا و بر.

ڕەشیدی سەروچاڤێن خوە دانانە سەر بالیفکا وێ، لێ وێ ب دوو چاڤێن زیق ل بن ملێن وی ڤە تەماشەی بانێ ژوورێ دکر و لێڤێن وێ دلەرزین و هەست ب هەناسەیێن وی یێن گەرم و بلەز دکرن. ئەو بایێ بێهنا پیڤاز و گوشتێ بەرخی یێ بژارتی ژێ دهات کو بەری هینگێ وان خواربوون.

جار جارە گوهێن وی ب ڕوویێ وێ دکەفتن. وێ دزانی ژ نوو وی موویێن گوهێن خوە یێن تراشین، چونکی ڕوویێ وێ دسەلخاند. دەمێ ئەو ب دوماهی هاتی، ژ وێ دوورکەفت و پەنتەرۆنێ خوە برە سەری و دەستێ خوە دانا سەر سەرێ خوە، مەریەمێ دناڤ وێ تارڕیاتیێ دا میلێن شین یێن چرکە و خولەکێن دەمژمێرا وی ددیتن.

ئەو هەردوو بۆ ماوەیەکێ کورت ل سەر پشتێ د درێژ کریبوون بێی تەماشەی هەڤدوو بکەن، پاشی ڕەشیدی گوتێ: "چ شەرم د ڤێ چەندێ دا نینە مەریەم، هەموو هەڤژین ڤێ چەندێ دکەن، پێغەمبەرێ مە ژی ئەڤ چەندە دگەل هەڤژینێن خوە دکر، چ شەرم تێدا نینە."

پشتی بورینا چەند خولەکان، وی بەتەنی ل سەر خوە ڕاکر و ئەو ژوور بجهـ هێلا لێ

هێشتا شوونوارێن سەروچاڤێن وی ل سە بالیفکا وێ مابوون، ل وی دەمی ئەو ژی چاڤەڕێی هندێ بوو هەتا ئێشانا وێ کێم بیت. وێ د پەنجەرکێ دا تەماشەی هەیڤا بەستیگرتی ل ئەسمانی و وان عەوران دکر یێن کو کا چەوا پێچەیا بووکینیێ سەروچاڤێن وێ دنخافتی، ئاها هۆسا وان ژی دێمێ هەیڤێ ڤەشارتبوو.

# 12

ل سالا 1974ێ هەیڤا ڕەمەزانێ کەفتبوو د وەرزێ پایزێ دا. بۆ یەکەم جار بوو مەریەم د ژیانا خوە دا دبینیت کا چەوا ڕۆناهیا هەیڤێ دەما کو هێشتا یا کێفان و یەك شەڤی پەڕێن خوە ب سەر بازێرێ هەموویێ دا دادەت و ڕیتم و گێولێ وان دگوهۆڕیت.

وێ تیبینیا هندێ دکر کا چەوا د ڤێ هەیڤێ دا بێدەنگیەکا تەمبەل هەموو بازێرێ کابولێ ڤەدگریت ب ڕەنگەکی هاتنوچوون گەلەك کێم دبیت و قەرەبالغ نامینیت و هەموو دکان د ڤالاّنە و خوارنگەهـ ژی ڕۆناهیێن خوە دڤەمرینن و دەرگەهێن خوە دگرن.

مەریەمێ ئێدی چ جگارکێش ل سەر جادەیان نەددیتن و هەلا چ کوپێن چایێ ژی ل سەر لێڤێن پەنجەرکان بلند نەدبوو. ل دەمێ فتارێ پشتی هەتاڤ ل لایێ ڕۆژئاڤای ئاڤا دبوو و ل سەرێ چیایێ "شیر دەروازە" تۆپەك دهاتە هاڤێتن، خەلکی هەمووان ڕۆژیێن خوە دشکاندن. هەردیسان مەریەمێ ژی ڕۆژیا خوە ب پرتەکا نانی و چەند کتێن قەسپان دشکاند.

ئەڤە بۆ یەکەم جار بوو د ماوەیێ پازدە سالێن ژیانا وێ یێن بوری دا ئەو تام دکەتە خوشیا شریناهیا پشکداریکرنێ د سەربۆڕەکا جڤاکی دا.

ژبلی چەند ڕۆژەکێن کێم نەبیت، ڕەشیدی ڕۆژی نەدگرتن، ئەو ڕۆژێن ئەو ب ڕۆژی ژی دبوو، دەمێ دهاتە مال گێولی وی یێ نەخوش بوو، برسێ وەلێ دکر کێم باخڤیت و زوو تۆڕە بیت و بێهنا وی تەنگ ببیت.

شەڤەکێ دەمێ ئەو هاتیە مال، مەریەمێ هێشتا بەرهەڤکرنا فتارێ ب دوماهی نەئینابوو و بۆ چەند خۆلەکێن کێم فتارە گیرو دانا بەر وی، لێ وی خوە ل هیڤیێ نەگرت و تڤڕ ب نانی خوارن، هەتا پشتی هینگێ دەمێ مەریەمێ برنج و گوشتێ بەرخی و ئاڤکا بامیان ژی دانایە بەر وی، لێ وی نەئاخفت و خوارنا وێ ژی نەخوار بەلکو هەر ل سەر لەقدانا پرتێن نانی و تڤران یێ بەردەوام بوو.

تژی ناڤچاڤێن وی خوهـ و کەرب و کین ببوو. مەریەمێ بزاڤ کر دگەل باخڤیت ژی لێ وی بەری خوە دایێ بێی خو پەیڤەکێ بێژیت، بەلکو پرتەکا دی یا نانی هاڤێتە د دەڤێ خوە دا.

بێهنا مەریەمێ گەلەك فرەهـ بوو دەمێ هەیڤا ڕەمەزانێ ب دوماهی هاتی. وێ هزرا خوە د مالا خوە یا کەڤن دا دکر و بیرا خوە ل هەرسێ ڕۆژێن جەژنێ یێن پشتی هەیڤا ڕەمەزانێ دئینا، ل وی دەمی جەلیل دهاتە سەرەدانا مەریەم و نانایێ. وی قاتەکا نوو و بوینباغەکا سۆر دکرنە بەر خوە و دیارییێن جەژنێ دگەل خوە دئینان. سالەکێ، وی شاڵەکا سۆفی بۆ دگەل خوە ئینا و ئەو هەرسێ ڕووشنتە خوارێ و چا پێکڤە ڤەخوار و پاشی جەلیلی داخوازا لێبورینێ ژێ دکر.

دەمێ ئەو ژ ڕووباری دەرباز بووی، نانایێ گوت: "چ پێنەڤێت وی دڤێت زوو بچیت داکو جەژنێ دگەل خێزانا خوە ببورینیت."

هەر ل وی دەمی، مەلا فەیزوللاهـ ژی دهاتە سەرەدانا وان داکو جەژنا وان پیرۆز بکەت. وی ژی پاکیتەکا چکلێتان یا نخافتی ب پارچەکا کانزایی یا تەنك و سەڵکەکا هێکێن ڕەنگکری و کارتۆنەکا کێکان بۆ دگەل خوە دئینان. دەمێ ئەو ژ وێرێ دچوو، مەریەم دا چیتە سەر چەقەکا دار چنارێ و پاکیتا خوە یا چکلێتان دگەل خوە بەت و یەك یەکە خوت و کاغەزکێن وان ژی هاڤێتە بەر لێڤێن دارێ کو وەکو کولیلکێن زیڤی خویا دکرن.

پشتی هینگێ ژی دا کێکان خوت و ب پێنۆسێ ڕەنگ گەور وێنەیێن سەروچاڤان ل سەر هێکان دکێشان. هەرچەندە ڤان ڕوودانان تا ڕادەیەکی ئەو بەختەوەر و دلشاد دکر لێ مەریەمێ حەز ژ جەژنێ نەدکر چونکی ئەو دەمێ مێهڤانداری و گێڕانا ئاهەنگان بوو خەلکی ژی جوانترین جلوبەرگ دکرنە بەر خوە و سەرەدانا هەڤدوو دکر، لێ مەریەم ژ ڤان خوشیان یا بێبەهر بوو.

وێ هزرا خوە د سەقایێ هیڕاتێ دا کر کا چەوا خەلك ب ڕوویەکێ گەش و گیانەکێ لێبوری دچنە دەستێن هەڤدوو و جەژنێ ل هەڤدوو پیرۆز دکەن و هیڤیا ژیانەکا خوش و ساخلەم بۆ یەك دخوازن. ئێدی هەستا پشتگوهـ هاڤێتن و بتنێ بوونێ گیانێ وێ داگیر دکر هەتا جەژن ب دوماهی هاتبایە.

ئەڤێ سالێ، بۆ یەکەم جار مەریەمێ ئەو جەژن دیت یا هەر ژ زارۆکینیێ وێ هزرێن

خوە تێدا دکرین و هیڤی دخواست ڕۆژەکێ ئەڤ هزرە ببنە ڕاستی.

ئەو و ڕەشید پێکڤە دەرکەفتنە کولانێ. بەری نوکە چ جاران مەریەم دناڤ ڕەوشەکا هۆسا ب کەیف و خوش دا نەبوری بوو. خەلکی ژی بێی کو ئاگەهـ ژ سەقایێ سارِ و تەزی هەبیت، ژ مالێن خوە دەرکەفتبوون و سەرەدانا خزم و کەسوکارێن خوە دکر.

ل سەرێ کولانا وان، مەریەمێ فەریبا و کورێ وێ "نور" دیتن کو وی ژی قاتەکا نوو کربوو بەر خوە، فەریبایێ کو شالەکا سپی هاڤێتبوو سەر ملێن خوە، دگەل زەلاّمەکێ زەعیف و شەرمین و خودان بەرچاڤك ل کولانێ د ڕاوەستای بوون. هەردیسان کورێ وێ یێ مەزن ژی دگەل وان بوو، بیرا مەریەمێ هات کو فەریبایێ ل وێ ڕۆژا بۆ یەکەم جار مەریەم ل سەر فڕنێ دیتی گوتبوویێ ناڤێ وی ئەحمەدە.

ئەحمەدی وی دوو چاڤێن کوور و دیمەنەکێ بالکێش و سیمایەکێ فەرمیتر ژ برایێ خوە یێ بچووکتر هەبوو، سیمایەك کو نیشانێن زوو پێگەهشتنێ ل دەڤ د ددیاربوون، ڕستەکەك ژی ل ستوویێ وی بوو پەیڤا "الله" یا ل سەر نڤیسای بوو.

چ پێنەڤێت فەریبایێ هەر یەکسەر مەریەم نیاسی دەمێ بورکە کریە بەر خوە و دگەل ڕەشیدی ژی دچووی. فەریبایێ دەستێ خوە بلند کر و گوت: "جەژنا هەوە پیرۆز بیت."

مەریەمێ ژی دبن بورکەی ڤە سەرێ خوە لێ هەژاند، ڕەشیدی گوتێ: "هۆسا دیارە تو ژنا هە دنیاسی، هەڤژینا ماموستایی؟"

لێ مەریەمێ بۆ وی دیارکر کو ئەو وێ نانیاسیت بەلکو ب تنێ بەرسڤا پیرۆزباهیا وێ یا دای.

"بۆ تە باشترە تو خوە ژ وێ دوور بکەی، ئەو ژنەکا پڕبێژە و هەڤژینێ وێ ژی گەلەك یێ قەلس و تەماعە. هەڤژینێ وێ کو خوە ب زەلاّمەکێ خواندەڤان و ڕەوشەنبیر دهەژمێریت، لێ سەحکێ خو دێ بێژی مشکە، باش سەحکێ ما ئەو نە وەکو مشکایە؟"

ل دووڤ دا ئەو چوونە "شار-ی-ناو" کو ل وێرێ زارۆکان ب جلوبەرگێن جەژنێ یێن نوو و ڕەنگاوڕەنگ یاری دکرن و دکرنە غارێ و هندەکێن دی ژی دیارییێن خوە یێن جەژنێ دگەل یەك هەڤبەر دکرن. ژنان ژی سێنیکێن پڕی شریناهی ددانانە بەر سینگێ مێهڤانان.

مەریەمێ فانۆسکێن هەلکەفتا جەژنێ دیتن کو ب پەنجەرکێن دکانان ڤە هاتبوونە هەلاویستن و ل هندەك جهێن دی ژی دەنگێ موزیکێ بلند دبوو بەر ئەسمانی و کەسێن بیانی د بەر وان ڕا دبورین و دگوتێ جەژنا هەوە پیرۆزبیت.

ل وێ شەڤێ، ئەو چوونە جهەکی ب ناڤێ "چامان" و مەریەم ل پشت ڕەشیدی یا ڕاوەستیای بوو تەماشەی یارییێن ئاگری دکرن یێن ئەسمان ب ڕەنگێن کەسك و پیڤازی و زەری ڕوهن دکری. ئەو گەلەك ژ وان دەمان یا غەریب بووی دەمێ ب ڕەخ مەلا فەیزوللاهی ڤە دڕۆنشتیە خوارێ و ژ دوور ڤە تەماشەی یارییێن ئاگری دکرن ئەوێن بلندبوونە بەر ئەسمانێ هیڕاتێ و ڕۆناهیان وان د چاڤێن ماموستاییێ وێ یێن پڕی دلوڤانی دا ڕەنگڤەددا.

لێ ب ڕاستی ئەو پتر یا ژ نانایێ غەریب بووی. مەریەمێ هیڤی دخواست نوکە دایکا وێ یا ساخ بایە و ب چاڤێن خوە ئەڤ یارییێن ئاگری دیتبانە، داکو وێ ژی ل دوماهییێ ب چاڤێن خوە دیتبایە کو بەختەوەری و جوانی نە ژ تشتێن مەحالە، هەتا بۆ کەسێن وەکو وان ژی دەلیڤە هەیە ڤان تشتان تاقی بکەن.

★★★

ل ڕۆژا جەژنێ مێهڤان دهاتنە مالا وان ژی، ئەڤ مێهڤانە هەموو زەلام بوون و هەڤالێن ڕەشیدی بوون. دەمێ وان دەرگەهـ دقووتا، مەریەمێ دزانی یا ل سەر وێ پێدڤیە هەر یەکسەر بچیتە د ژوورا خوە ڤە و دەرگەهی بدائێخیت.

ئەو د ژوورا خوە ڤە ب تنێ دما و ڕەشیدی و هەڤالێن خوە ژی ل خوارێ پێکڤە چا ڤەدخوار و جگارە دکێشان و سحبەت دکرن. بەری هینگێ ڕەشیدی گوتبوویێ کو ب چ ڕەنگان نەهێتە خوارێ هەتا مێهڤانێن وی دچن.

مەریەمێ چ ئاریشە دگەل ڤێ چەندێ نەبوون، بەروڤاژی بۆ وێ جهێ دلخوشییێ ژی بوو. ئەو تشتی دناڤبەرا وان دا هەی ڕەشیدی ب تشتەکێ پیرۆز دزانی، ڕەشیدی پاڕاستنا نامووس و شەڕەفا وێ ب ئەرکەکێ گرنگ دزانی و ڤێ پاڕاستنێ وەل مەریەمێ دکر ئەو هەست پێبکەت کەسەکا ژ هەژی و گران و خودان قەدر و قیمەتە.

ل ڕۆژا سیێ و یا دوماهییێ ژ جەژنێ، ڕەشید ژ مال دەرکەفت داکو سەرەدانا هندەك هەڤالێن خوە بکەت. مەریەمێ ژی کو شەڤا بەرێ هینگێ عێلنجی دهاتنێ، هندەك ئاڤ کەلاند و بۆ خوە کوپەکێ چایەکا کەسك تێکر و هندەك هێل کرە سەر.

ل هۆلا بێهنڤەدانێ ڤە، مەریەم ڕابوو ب پاقژکرن و کومکرنا وی گلێشێ شەڤا بەری هینگێ مێهڤانان ل پاشخوە هێلای، کوپێن بەروڤاژی، فەلپێن توفکان یێن کەفتیە دناڤبەرا دووشەکان دا، سێنیك و ئامانێن هێشتا بەرمایکێن خوارنا وان مایە تێدا و پێڤە هشکبووی. مەریەمێ ل دەمێ پاقژکرن و ڤێ بێ سەروبەریێ د دلێ خوە دا دگوت ما ئەڤە زەلاّم چەند د تەمبەل و بێخیرەتن.

وێ ل بەر نەبوو بچیتە د ژوورا ڕەشیدی ڤە، لێ پاقژکرنێ بەرێ وێ ژ هۆلا مێهڤانان دا دەرەجکان و پاشی بۆ ناڤ هۆلا ڤاتێ دووێ و پاشی هەتا چوویە بەر دەرگەهێ ژوورا وی، ل دووڤ دا وێ زانی ئەڤە بۆ یەکەم جارە ئەو دهێتە د ژوورا وی ڤە، ل سەر تەختێ وی ڕوونشت و هەستپێکر وێ دەستدرێژیەك یا کری.

وێ تەماشەی پەردێن ژوورا وی یێن کەسك و تارِی کر، هەروەسا جووتەکێ پێلاڤێن تەیسوك ب ڕەخ دیواری ڤە بوون، دەرگەهێ قومسۆرا وی کو بۆیاغا وێ یا ڕەنگ گەور بوو، بۆیاغا وێ ل سەر ڕاببوو و دارێ ژ بن ڤە خویا دکر. پاکیتەکا جگارەیان ژی ل سەر مێزەیا نێزیکی تەختێ وی بوو.

وێ جگارەك کرە دناڤ لێڤێن خوە ڕا و ل بەرامبەری وێ خۆدیکا بچووك یا ب دیواری ڤە هەلاویستی ڕاوەستیا و پف کرە سەر و بازنەیەك ل سەر کێشا و پاشی جگارە دووبارە کرە د پاکیتێ دا ڤە. وێ نەشیا زاری ژنێن کابولی بکەت و وەکو وان جگارەیان ب شێوەیەکێ جوان بکێشیت. وێ هزردکر ب کێشانا ڤێ جگارێ ئەو دێ بیتە جهێ پێکەنینی و ترانەپێکرنێ.

هەر وەکو دا بێژی وێ تاوانەك یا کری، وێ عەلبکا سەری یا قومسۆرا جەلیلی ڤەکر، ل دەستپێکێ وێ دەمانچەك دیت کو ڕەنگێ وێ یێ ڕەش بوو دەستکەکێ داری و لیلیەکا بچووك هەبوو. مەریەمێ ئەو چەندە باش ژبەر کر کا ل بەری ئەو وێ دەمانجێ ب هەلگریت، چەوا هاتبوو دانان.

پاشی وێ هێدی هێدی دەمانجە ل سەر دەستێن خوە ڕا ئینا و بر، سەنگا وێ ژ دیمەنێ وێ گرانتر خویا دکر. وێ هەستپێکر دەستکێ وێ یێ حولی و لیلیا وێ یا تەزی یە. بۆ وێ نەخوش بوو کو ڕەشیدی تشتەکێ هۆسا د مال دا هەبیت کو ب تنێ بۆ کوشتنا مرۆڤان دهێتە بکارئینان. لێ هۆسا دیارە وی بۆ پاراستنا سەلامەتیا وان هەردووان یا

هەلگرتی، ب تایبەت سەلامەتیا وێ.

ل بن وێ دەمانجێ ڤە، هندەك گوڤارێن كوژییێن وان قورمچی هەبوون. مەریەمێ گوڤارەك ژ وان ڤەكر، تشتەك د ناخێ وێ دا هاتە خوارێ و بێی حەزا وێ، دەڤێ وێ باوشكەك ڤەدا. ل سەر هەر لاپەرەكی وێنێ هندەك ژنێن جوان هەبوو كو چ كراس و پەنتەرۆن و گورە ل بەر نەبوون، هەتا جلكێن ناڤخۆیی ژی ل بەر نەبوون، د راستی دا ئەو د ریس و چملاق بوون. ئەو ل سەر تەختان د رازای بوون و ب دوو چاڤێن نیڤ گرتی تەماشەی مەریەمێ دكرن.

د پتریا وێنەیان دا، لنگێن وان د ڤەكریبوون و مەریەمێ دەڤەرا تارێ یا دناڤبەرا وان دا ب تەمامی ددیت. د هندەك وێنەیان دا ژی، وان ژنان هۆسا خوە پالدابوو، "خودا ل سەر ڤێ چەندێ ل وان ببوریت"، دا بێژی ئەو بۆ نڤێرێ یێن چووینە سوجدێ و ل سەر ملێن خوە یێن زڤرین و ب ئاورینەكا بێ شەرم تەماشەی وێ دكەن.

مەریەمێ هەر زوو ئەو گوڤار دانانە وی جهێ ژێ راكرین، وێ هەستپێكر یا هاتیە بەنجكرن. ئەرێ ئەڤ ژنە كینە؟ ئەرێ ئەو چەوا دهێلن ب ڤی شێوەی وێنە بۆ بهێنە گرتن؟ ئەرێ شەڤێن ڕەشید نەدهاتە دەڤ وێ، وی خوە ب ڤان تشتان ڤە مژوول دكر؟ ئەرێ هەتا ڤی رادەی ئەو بۆ وی جهێ بێهیڤیبوونێ بوو؟ ئەرێ پا بوچی وی بەحسێ نامووس و شەرەفێ دكر، نەرازیبوونا وێ ل سەر داخوازیا بكرێن وی یێن ژن ئەڤێن ب تنێ پێن خوە نیشا وی ددایێن داكو پیڤەرێ پێ وان بگریت ژ بۆ دروستكرنا پێلاڤان؟

وی هەردەم دگوت كو سەروچاڤێن ژنێ ب تنێ بۆ هەڤژینێ وێ نە. چ پێنەڤێت پا ئەڤ ژنێن ل سەر ڤان گوڤاران ژی نوكە هەڤژین هەنە، هەر چ نەبیت نوكە هندەك ژ وان د شووكرینە یان ژی برا هەنە. باشە ئەگەر هۆسا بیت، بوچی ڕەشید هندە یێ رژدە كو هەڤژینا وی خوە بنخێڤیت و سەروچاڤێن خوە بڤەشێریت ل دەمەكی كو ل دەڤ وی ئاسایی یە ئەو تەماشەی جهێن تایبەت یێن ژن و خوشكێن كەسێن دی بكەت؟

مەریەم ب شەرمزاری و پۆسیدەی ڤە ل سەر تەختێ وی ڕووشنتە خوارێ و دەستێن خوە دانانە سەر سەروچاڤێن خوە و چاڤێن خوە گرتن و چەندین جاران كوور بێهنا خوە هەلكێشا هەتا پیچەكێ ئارام بووی.

هێدی هێدی شرۆڤەكرنا ڤێ چەندێ خوە ل سەرێ وێ دا. بەری هەمو تشتان ئەو

زەلاٚمەکە کو بەری مەریەم بهێتە دەڤ وی، ئەڤە چەندین سالە ب تنێ دژیت و پێدڤیێن وی نە وەکو ییێن وێ نە. سەرەڕای بورینا چەند هەیڤەکان ل سەر شەهیانا وان هێشتا ئێشانەك ل دەڤ مەریەمێ هەیە.

ژ لایەکێ دی ڤە حەزا وی یا سێکسی گەلەك یا دژوارە تا وی ڕادەی هندەك جاران دگەهیتە ئاستێ توندوتیژیێ، دەمێ وی ب گرانی خوە دهاڤێتیە سەر کەلەخێ وێ و ب هێز سنگێ وێ دگڤاشتی و پیێ و ڕانیێن خوە بلەز و ب دژواری دلڤاندین.

ئەو زەلاٚمەکە ئەڤە چەندین سالە بێ هەڤژین بوراندی، ئەرێ ما ئەم دشێین لومەی وی بکەین ل سەر وی سروشتێ خودای ئەو پێ ئافراندی.

مەریەمێ زانی کو ئەو ب چ ڕەنگان نەشێت ل سەر ڤی بابەتی گەنگەشێ دگەل ڕەشیدی بکەت، چونکی ئەڤ چەندە تشتەکێ هۆسا نینە بهێتە گوتن، لێ ئەرێ تشتەکێ هۆسایە کو ئەو خوە ل سەر بێدەنگ بکەت و لێ ببوریت؟ نوکە ب تنێ یا ل سەر وێ پێدڤیە ئەو هزرا خوە د زەلاٚمێن دی ییێن د ژیانا خوە دا بکەت. جەلیل، زەلاٚمێ سێ ژنان و بابێ نەهـ زارۆکان، د هەمان دەم دا پەیوەندیەکا نە شەرعی و ژ دەرڤەی چوارچووڤەیێ هەڤژینیێ دگەل نانایێ هەبوو.

ئەرێ کیژك خراپترە؟ گوڤارێن ڕەشیدی یان پەیوەندیا نەشەرعی یا جەلیلی؟ هەرچەوا بیت، ئەرێ ما ئەو کیە، ژنەکا گوندیك و بیژن، هەتا بشێت حەق و حسابێ دگەل وی بکەت؟

مەریەمێ عەلبکا بنی یا قومسۆرێ ڤەکر، وێنەکێ ڕەش و سپی یێ زارۆکەکی دیت، هۆسا دیارە ژیێ وی دناڤبەرا چوار بۆ پێنج سالیێ دابوو، قەمیسەکێ هێلدار و بوینباغەك ل بەربوون، زارۆکەکێ جوان بوو، دفنا وی یا بچووك بوو و پرچا وی ژی یا قەهوای بوو. هۆسا دیارە بەری وی یێ مایە ل تشەکێ بالکێش دەمێ کامیرێ بۆ وی وێنە گرتی.

ب ڕەخ وی وێنەی ڤە، مەریەمێ وێنەیەکێ دی ژی یێ ڕەش و سپی دیت، د ڤی وێنەی دا ژنەکا جوان و گەنج یا ڕوونشتێ بوو ڕەشید ل پشت وێ یێ ڕاوەستای بوو کو هێشتا ل وی دەمی یێ گەنج و بەژن زراڤ و پرچ ڕەش بوو. ئەو ژن یا جوان بوو لێ نە هندی وان ژنان ییێن د وێنەیێ دا، لێ هەرچەوا بیت یا جوان بوو. هەتا ژ مەریەمێ ژی جوانتر بوو. ئەرزانکا وێ یا بچووك و درێژ بوو و پرچا وێ ژی یا ڕەش بوو. دەمێ

مەریەمێ هزرا خوە د جوانیا وێ دا کری  پیچەك هەست ب غیرەتێ کر.

مەریەمێ ب کووری و بۆ ماوەیەکێ درێژ تەماشەی وێنەی کر، تشتەك نە ڕوهن و ئاشکەرا هەبوو ل سەر وی شێوازێ ڕەشیدی پێ وێنە دگەل هەڤژینا خوە گرتی. دەستێن وی ل سەر ملێن وێ بوون و دگرنژی. لێ دێمێ وێ ژنێ یێ ڕەق و دامایی بوو پیچەکێ خوە ئینابوو پێش خوە دا بێژی ئەو یا بزاڤێ دکەت دەستێن وی ژ سەر ملێن خوە ڕاکەت.

مەریەمێ هەموو تشت زڤڕاندنە جهێن وان.

پشتی هینگێ، دەمێ جلك دشووشتین، پەشیمان بوو کو چوویە د ژوورا وی ڤە، ئەرێ بۆ چ چوو؟ ئەرێ وێ چ ژ وی زانی؟ ئەرێ وی دەمانجەك هەیە؟ و ئەو زەلاّمەکە و پێدڤیێن خوە یێن تایبەت هەنە؟ پێدڤی نەدکر تا وی ڕادەی وێ تەماشەی وێنەیێ وی و هەڤژینا وی کربایە. وێ دیمەنەك دیت ئەڤێ بەری چەندین سالان ژ نیشکەکێ ڤە هاتیە گرتن و ژ نوو نوکە وێ دڤێت وی دیمەنی شرۆڤە بکەت.

ئەرێ ئەو تشتێ نوکە مەریەم هەست پێدکەت ئەوە کو دلێ وێ دمینتە ب ڕەشیدی ڤە، چونکی وی ژی ژیانەکا سەخت و ب زەحمەت یا بوراندی. ژیانەکا پڕی ژ دەستدان و خەمگینی و لێکزڤڕینا ڤەدەرێ.

پاشی هزرا وێ چوو سەر کورێ وی یونسی، ئەوێ کو جارەکێ بووکەکا بەفرێ دناڤ ڤی باخچەی دا دروستکری و ل سەر ڤان دەرەجکان سووار بووی. لێ مخابن دەریایێ ئەو ژ ڕەشیدی دزی و داعیرا هەروەکو کا چەوا حووتەکی پێغەمبەرەکێ ب هەمان ناڤ ئەوێ چیرۆکا وی د قورئانێ دا هاتی داعیرای. ڤێ چەندێ تا ڕادەیەکێ مەزن مەریەم ئێشاند ب تایبەت دەمێ ڕەشید دئینایە پێشچاڤێن خوە کو یێ ل سەر کنارێن دەریایێ دهێت و دچیت و دوعا ژ ئاڤێ دکەت کورێ وی بهاڤێژتە سەر هشکاتی.

و بۆ یەکەم جار وێ ب هەست نێزیکیا دگەل هەڤژینێ خوە کر و د دلێ خوە دا گوت کو ئەو هەردوو دێ بۆ هەڤدوو هەڤژینێن باش بن.

# 13

دەمێ ئەو د پاسێ دا و ژ دەڤ نوشداری زڤڕین، سەیرترین تشت د ژیانا مەریەمێ دا ڕوویدابوو. وێ تەماشەی هەر جهەکی کربایە، ڕەنگێن گەش و تەیسوك ددیتن: ل سەر شوفەیێن کونکریتی یێن ڕەنگ گەور یێ ڤەبی، ل سەر تانکێن نخافتی ب ڤەسدیری، بەر دەرگەهێ دکانێن ڤەکری، دناڤ ئاڤا تەڤناوی یا دناڤ جوکان دا دهاتە خوارێ. خوە دا بێژی کەسك و سۆر یێ دناڤ چاڤێن وێ دا حەلیایی.

ڕەشیدی ژی ب تبلێن خوە یێن دناڤ دەستگورکان دا تەپ ل زکێ وێ ددان و ستران بۆ دگوتن. هەردەمێ پاسێ ل تەسەکێ دابایە ژی، دا ڕەشید دەستێ خوە دانتە سەر زکێ مەریەمێ داکو ئەو زارۆکێ د زکێ وێ دا بپارێزیت. ڕەشیدی پرسیار ژێکر: "تو چ دبێژی ناڤێ وی بکەینە زەلەمای؟ ئەو ناڤەکێ پەشتوونی یێ خوشە."

مەریەمێ گوت: "باشە پا هەکە کچك بوو؟"

"ئەز دبێژم ئەو کورکە، بەلێ، کورکە."

دناڤ پاسێ دا ڤەرەبالغەك دروست بوو، هندەك ژ ڕێڤینگان دەستێ خوە درێژ کربوو تشتەکی ژ دەرڤە و هندەکێن دی ژی ل سەر کوشنێن خوە دڕوونشتی بوون و تەماشەی وان دکر کا ئەڤە چیە ڕوودەت.

ڕەشیدی پەنجەرکا پاسێ ڤەکر و ب گرنژین ڤە گوتە مەریەمێ: "سەحکێ، سەحکێ، ها تو دبینی؟"

مەریەمێ دیت کو خەلك هەموو یێ ل سەر جادەیان و ل دەڤ ترافیکلایتان دڕاوەستیاینە و هندەکان ژی سەرێن خوە یێن ژ جامێن ترۆمبێلان ئینداینە دەرێ و یێ تەماشەی تشتەکێ نەرم دکەن کو یێ ژ ئەسمانی دباریت. هەلبەت ئەو ژی یەکەم دندکێن بەفرێ یێن دەستپێکا وەرزێ زڤستانێ بوون.

مەریەم مەندەهوش ما، ئەو چەند دیمەنەکێ بالکێشە؟ ئەرێ ئەڤ چەندە دەلیڤەیا وێ یە بۆ دیتنا تشتەکی کو هێشتا ب ئاخێ نەکەفتیە و پێ لێ نەهاتیە دان؟ یان ژی دەلیڤا

وێ یە دەستێ خوە بگەهینتە خێروبێریا وەرزێ نوو، ب ڕاستی ژی دەستپێکەکا جوانە بەری کو بکەڤیتە بن پێن مرۆڤان و ژناڤ بچیت؟

ڕەشیدی گوتێ: "ئەگەر ئەو زارۆك کچ بوو، هەرچەندە ئەز یێ پشتڕاستم کو کچ نینە، بەلێ ئەم دێ بێژین ئەگەر کچ دەرکەفت، ل وی دەمی هەر ناڤێ تە بڤێت تو دشێی هەلبژێری."

***

ل سپێدەهیا ڕۆژا پاشتر، مەریەم ل دووڤ دەنگێ چەکوچی هشیار بوو، وێ شالا خوە ل دور خوە ئالاند و چوو دناڤ حەوشێ دا کو یا پڕ بووی ژ بەفرێ، ئەو بەفرا شەڤا بەری هینگێ ب شێوەیەکێ بۆش و گران دباری لێ نوکە یا ڕاوەستای. نوکە ب تنێ هندەك دندکێن بەفرێ یێن هوور یێ ڕوویێ وێ یێ نازك هەمبێز دکەن. چ بایێن بلەز و هرۆبا نەدهاتن لێ بێهنا سەقایێ وەکو یا ڕەژیا سۆتی بوو.

بازێرێ کابولێ یێ بێدەنگ، بەژنا خوە ب کراسەکێ سپی خەملاند بوو، ل ڤێرێ و وێراهە دووکێلا سۆپێن داران بلند دبوو.

مەریەمێ دیت ڕەشید یێ د وێ ژوورا بچووك ڤە ئەوا وەکو کۆگەهـ بۆ هەلگرتنا کەلوپەلێن زێدە دهاتە بکارئینان. ڕەشیدی بزمار د پارچەیەکا داری دقوتان و دەستێ خو گەهاندە بزمارەکا دی کو کربوو دبەر لێڤەکا خوە ڕا.

"من دڤیا بۆ تە بکەمە سۆپڕایز، زارۆکێ مە دێ پێدڤی ب تەختەکی بیت. پێدڤیە تو تەماشەی ڤی تەختی نەکەی هەتا ئەز ب دوماهی دئینم."

مەریەمێ حەزدکر ڕەشید وی کاری ئەنجام نەدەت و تا وی ڕادەی خوە ب وێ ئومێدێ ڤە گرێنەدەت کو ببیتە بابێ کورەکی. هەرچەندە دلێ وێ گەلەك ب ڤێ دووگیانیێ یێ خوش بوو لێ ئەڤ پێشبینیا ڕەشیدی بۆ وێ ببوو بارەکێ گران.

دوهی ڕەشید ژ مال دەرکەفتبوو، دەمێ زڤڕی چاکیتەکێ زڤستانێ یێ کوران دگەل خوە ئینابوو کو ژ ناڤ دا ب پیستێ بزنان هاتبوو نخافتن و هچکێن وی ب داڤێن حەریری یێن سۆر و زەر هاتبوونە نەخشاندن.

ڕەشیدی دەستێ خوە هاڤێتە پارچەکا داری یا درێژ و زراڤ و دەمێ ڤیای د نیڤەکێ ڕا بکەتە دوو پارچە، گوت: "پێپکێن تەختی دێ د بچووك و زراڤ بن، پێدڤیە ئەم تشتەکی

بکەین وەختێ ئەو مەزن دبیت و بزاڤێ دکەت ل تەختی سووار بیت. هەردیسان دڤێت کێرك و چەتەلێ و کەلوپەلێن ب مەترسی بدانینە جهەکێ هۆسا کو دەسێن وی نەگەهنێ."

"مەریەم، نابیت تا وی ڕادەی ژی ئەم ل بەر وی د ڕاوەستای بین چونکی کور د سروشتێ خوە دا بونەوەرێن سەربەردای نە."

مەریەمێ ژی دگەل گوهداریکرنا ئاخفتنێن وی، شالا ل سەر ملێن خوە دورستکر داکو وێ سار نەبیت.

***

ڕۆژا دی سپێدێ، ڕەشیدی گوت کو وی دڤێت هەڤالێن خوە بۆ شیڤێ مێهڤان کەتە مالێ داکو ب ڤێ هەلکەفتێ پێکڤە ئاهەنگەکێ بدانن. هەر ژ سپێدێ زوو مەریەم مژوولی بژارتن و شووشتنا برنجی و نیسکان بوو. ل دووڤ دا وێ باجانڕەشك ژ بۆ خوارنا "بۆرانی"ێ سپیکرن و پیڤازتەڕك و گوشتێ قیمەکری بۆ خوارنا "ئوشاك"ێ بژارتن.

ل دووڤ دا وێ مالا خوە پاقژ کر و پەردێن ژووران داقووتان. هەرچەندە دنیا گەلەك یا سار ژی بوو و بەفرەکا زێدە باری بوو، لێ وێ پەنجەر ڤەکرن داکو بایێ پاقژ بهێتە د ژوور ڤە. وێ دووشەك و بالیفك ژی هەموو دووبارە ب شێوەیەکێ جوان د هۆلا مێهڤانان ڤە ڕائێخستن و چەندین جورێن شیریناهیان و توفك و باهیڤێن قەلاندی ل سەر مێزەیا نیڤا هۆلێ دانان.

ل دەمێ ئێڤاری و هێشتا زوو، ئەو چوو بوو د ژوورا خوە ڤە بەری کو هەڤالێن هەڤژینێ وێ بگەهنە مالا وان. ئەو ل سەر تەختێ خوە یا ڕازای بوو دەمێ دەنگێ قەرەبالغ و کەنیا ب سەر خانی دکەفتی دگەهشتیە ڤاتێ دووێ. ئەو نەدشیا دەستێ خوە ژ سەر زکێ خوە ڕاکەت، وێ هزرا خوە د وی زارۆکی دا دکر یێ کو هێدی هێدی دناڤ زکێ وێ دا گەشە دکر و دبوو بەشەك ژ لەشێ وێ.

هەروەکو کا چەوا بایەکێ تەزی و بلەز دەرگەهی ڤەکەت، ئاها هۆسا بەختەوەری و کەیفخوشیێ ژی گیانێ وێ داگیر کربوو. ژ کەیفان دا چاڤێن وێ پڕی ڕۆندك بوون.

مەریەمێ هزرا خوە د وان هەر شەش سەد و پێنجی کیلومەتران دا دکر یێن وێ دگەل ڕەشیدی د پاسێ دا بڕین، گەشتا وان ژ باژێرێ هیڕات ل ڕۆژئاڤایێ وەلاتی ل نێزیکی سنورێ ئیرانێ هەتا باژێرێ کابول ل ڕۆژهەلاتێ وەلاتی ڤەکێشابوو. د وێ گەشتێ دا ئەو د

بەر چەندین باژێرێن بچووك و مەزن، هژمارەکا گوندێن بچووك یێن یەك ل دووڤ یەکی دا دکەفتنە سەر ڕێکێ بورین.

هەردیسان ڕێکا وان دناڤ چەندین چیا و بیابانێن هشك و بەرفرەهـ و ژ پارێزگەهەکێ بۆ یەکا دی دا دبوری هەتا گەهشتینە کابولێ. نوکە ژی ئەو یا ل ڤێرێ، باژێرێ کابولێ. ل سەر ڤان گژەبەر و گرێن ڕووت، د مالەکێ دا کو ئەو کابانیا وێ یە و یا خودان هەڤژینە و نوکە ئەو هێدی هێدی یا بەرەڤ قوناغا سەرەکی و دوماهیێ ڤە دچیت کو ئەو ژی قوناغا دایکاتیێ یە.

هەستەکێ چەندێ خوشە دەمێ ئەو هزرا خوە د ڤی زارۆکی دا دکەت، زارۆکێ خوە، زارۆکێ وان هەردووان. هەستەکێ چەندێ خوشە کو ئەڤینا وێ بۆ وی ژ ئەڤینا وێ بۆ هەر تشتەکێ دی مەزنترە تا وی ڕادەی کو ئێدی ئەو پێدڤی ب بەرێن بچووك نابیت بۆ خوە یاریان دگەل بکەت و هەدارا خوە پێ بینیت.

ل ڤاتێ خوارێ، دەنگێ ئامیرێ سازێ هات. پاشی کەسەکی دەست ب لێدانا دهۆلێ کر و یەکێ دی ژی کۆخی و دەست ب گوتنا ستڕانان کر و یێن دی ژی دەست دقوتان و ڕابوونە سەمایێ.

مەریەمێ دەستێ خوە ل سەر زکێ خوە یێ نەرم دئینا و بر، نوشداری گوتبوویێ نوکە ڤەبارێ وی ژ نینوکا تبلێ مەزنتر نینە. وێ د دلێ خوە دا دگوت: "ژ نوکە وێ ڤە ئەز دێ بمە دایك."

پاشی ب دەنگەکێ بلند گوت: "ژ نوکە وێ ڤە ئەز دێ بمە دایك."

دگەل گوتنا ڤێ چەندێ وێ بەردەوام دکرە کەنی و چەندین جاران ئەڤ پەیڤە دووبارە دکرن.

دەمێ مەریەمێ هزرا خوە د ڤی زارۆکی دا دکری، دلێ وێ دناڤ سینگێ وێ دا مەزن دبوو، مەزن دبوو و مەزن دبوو هەتا کو هەموو تشتێن نەخوش ژ دەستداین. و نەخوشی و ب تنێ بوون و بێبەهربوون د ژیانا وێ دا هاتنە لادان و ژبیرکرن.

دبیت ئەڤ چەندە ژی ڤەدەرا خودای بیت کا بوچی ئەو د سەر چەندین گوند و باژێران ڕا ئینایە ڤی باژێری. نوکە وێ نهێنیا ڤێ چەندێ زانی. بیرا وێ ل پارچەیەکا قورئانێ هات یا کو مەلا فەیزوللاهی نیشا وێ دای:

"وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ".

پاشی وێ جهنڤێژکا خوە ئینا و دوو ڕکاعەت کرن و دەمێ ب دوماهی هاتی، دەستێن خوە بلندکرن و دوعا ژ خودای مەزن کر ڤێ خوشی و بەختەوەریێ ژ وێ نەستینیت.

***

ئەو چەندە هزرا ڕەشیدی بوو کو بچیتە سەرشووێن ژ دەرڤەی مال. مەریەم بەری نوکە چ جاران نەچوو بوو سەرشوویێن ژ دەرڤە، لێ ڕەشیدی پشتەڤانیا وێ کر بچیت و گوتێ کو چ تشت ژ هندێ خوشتر نینە دەمێ ئەو ژ سەرشوویێ دەردکەڤیت و ب وی بایێ تەزی بێهنا خوە کوور دهەلکێشیت و هەستپێدکەت کو چ خوە و گەرماتی نەمایە ل سەر پیستێ لەشێ وێ.

دناڤ سەرشوویا ژنان دا، شێوەیێن جودا جودا دناڤ وێ هەلا دورماندوری وێ دا دهاتن و چوون، ڕانێن ژنەکێ ل ڤێرێ، ملێ ژنەکا دی ل وێراهە، ڤێژیێن کچێن گەنج و پت پتا پیرەژنێن دانعەمر و دەنگڤەدانا چپ چپا دەنگێ ئاڤێ دناڤبەرا دیوارێن سەرشوویێ دا ب تایبەت دەمێ ژنەکێ پشتا ژنەکا دی دڤەمالشت و ژنەکێ ژی شامپۆ ل پرچا یەکا دی دکر.

مەریەم ب تنێ ل کوژیەکێ سەرشوویێ ڤە ڕووشنتە خوارێ و بەرەکێ پومیکی، کو بەرەکێ سڤکە د سەرشوویان ڤە دهێتە بکارئینان، پیستێ بنێ پێن خوە پێ دڤەمالشت و پاقژ دکر. هەلەکا بۆش ئەو ژ ژنێن دی و شێوەیێن وان یێن لڤوك جوودا دکر.

ل دووڤ دا، ژ نیشکەکێ ڤە چاڤێ وێ ب هندەك خوینێ کەفت و ب دەنگەکێ بلند کرە ڤێژی. هەر زوو دەنگێ شپ شپا پێن ژنان ل سەر بەرێن تەڕ هات و چەندین ژن ل دوماندوری وێ خڕڤەبوون و دبن لێڤان ڕا دگەل هەڤدوو دئاخفتن.

پشتێ هینگێ ل وێ شەڤێ و دناڤ جهێن نڤستنێ دا، فەریبایێ گوتە هەڤژینێ خوە کو دەمێ وێ گوهـ ل دەنگێ ڤێژیەکێ بووی و هەر یەکسەر ل دووڤ وی دەنگی چووی، وێ هەڤژینا ڕەشیدی دیت کو خوە د کوژیەکێ سەرشوویێ ڤە یا تێکبری و سەرێ خوە یێ کریە دناڤ پێن خوە دا و خوین یا ژبەر پێن وێ دچیت.

"ئەو هند د ترسیا خو تو دشیای گوهـ ل دەنگێ خوەلێکدانا ددانێن وێ ببی، حەکیم، ئەو گەلەك ب دژواری دلەرزی."

***

مەریەمێ گەریانەکا دی دگەل ڕەشیدی ب پاسێ ئەنجامدا، لێ ڤێ جارێ دووبارە بەفر دباری. ڤێ جارێ بەفرێ ب دژواری لێدکر و وەکو کومێن مەزن ل سەر هەردوو لایێن ڕێکێ و ل سەر بانێن مالان خڕڤەببوو. هەردیسان ل سەر شێوێ گۆمتلاڵن ل سەر بەلگ و ڤەدێن داران ڕاوەستیابوو.

مەریەمێ تەماشەی دکانداران دکر دەمێ بەفر ژبەر دەرگەهێ دکانێن خوە ڕادمالی. کومەکا زارۆکان ڕادهێلا ب دووڤ سەیەکێ ڕەش ڤە هندەکێن دی ژی ب خوشحالی ڤە ل هیڤیا پاسێ ڕاوەستیابوون و دەستێ خوە لێ بلند دکر. وێ سەحکرە ڕەشیدی، چاڤێن وی یێن کەفتیە سەر یەك و یێ د خەوچووی و چ گڤێنان ژ خوە ناکەت.

مەریەمێ ژی سەرێ خوە وەرگێڕا و چاڤێن خوە گرتن. وێ دڤیا گورێن خوە یێن تەزی و چاکیتێ خوە یێ هرییێ یێ خوهکەوی ژبەر خوە بکەت ئەوێ بوویە ئەگەرێ خوریانا لەشێ وێ، هەردیسان وێ دڤیا ژ پاسێ بهێتە خوارێ.

دەمێ ئەو گەهشتینە مال، ڕەشیدی بەتەنیەك ل سەر لەشێ وێ دادا دەمێ کو ژبەر وەستیانا ڕێکێ خوە ل سەر قەنەبێ درێژکری، لێ پیچەك ساڕاتی و نە ژدلی د ڤێ ڕەفتارا ڕەشیدی دا یا دیاربوو.

ڕەشیدی جارەکا دی گوت: "ڤێجا ئەڤە چ جورێ بەرسڤێ یە؟ ئەڤە گوتنێن مەلایانە. تو یا چوویە دەڤ نوشداری و تە پارەیێ پلێتا وی یێ دای، ڤێجا تو پێدڤی ب بەرسڤەکا باشتر بووی ئەو بدەتە تە، نەك بێژیت ئەڤ چەندێ حەزکرنا خودای بوو."

پشتی مەریەمێ پێن خوە کێشاینە دبن بەتەنیکی ڤە د بن لیفکان ڕا گوت من دڤێت پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدەم.

دیسان وی ب تۆڕەیی ڤە گوت: "حەزکرنا خودای بوو!"

پاشی چوو د ژوور ڤە و وێ ڕۆژێ هەموویێ ب تنێ جگارە دکێشان.

مەریەم ل سەر قەنەپێ یا ڕازای بوو هەردوو دەستێن خوە ژی ئێخستبوونە دناڤبەرا چوکێن خوە دا و د پەنجەرکێ دا تەماشەی باهوزێن بەفرێ یێن ژ دەرڤە دکر. بیرا خوە ل نانایێ ئینا دەمێ جارەکێ گوتییێ کو هەر چیپکەکا بەفرێ ئاخ و ناڵینەکا ژنەکا خەمگین و تەپەسەرە ل کونجەکێ ژ کونجێن ڤێ جیهانێ، دەمێ ئاخ و ناڵینێن وان دچنە ئەسمانی، دبنە

عەر و پاشی ئەڤ عەورە دشکێن و دبنە پرتێن بچووك و ب بێدەنگی ل سەر خەلکێ دبن خوە دا دبارن.

ئەڤ چەندە ژی بیرا مە ل هندێ دئینیت کا چەوا ژنێن وەکو مە خەمگین، بەردەوام نەخوشیان دبەن و ب بێدەنگی خوە ل بەر هەموو وان  نەخوشیان دگرن یێن ب سەرێ وان دهێن.

# 14

ژ نیشکەکێ ڤە مەریەمێ هەست ب خەم و نەخوشیان کر. تشتێ یەکانەیێ ئەڤ چەندە دئینایە بیرا وێ ژی ئەو لاندکا نەتەمامکری یا د کۆگەهێ ڤە و ئەو چاکیتێ دناڤ قومسۆرا ژوورا ڕەشیدی ڤە بوون یێن وی بۆ زارۆکێ خوە ئامادە کرین.

ئەگەر زارۆك هاتبایە سەر دنیایێ، ئەو دا شێت گوهـ ل دەنگێ وی بیت، دا گوهـ ل دەنگێ گریا وی بیت دەمێ برسی دبوو، دا گوهـ ل دەنگێ غەرغەرە و گڤ گڤا وی بیت، دا هەست ب بێهنا وی کەت دەمێ دەڤێ خوە دهاڤێتە سینگێ وێ و شیر دخوار.

خەمان ئەو داگیرکربوو، پۆسیدە کربوو، سەرێ وێ کربوو دناڤ نەخوشیان دا. مەریەم یا مەندەهش بوو کو دوور نینە د ڤێ ڕەوشێ دا ئەو خوە بەرزە بکەت یاکو وێ چ جاران ئەڤ چەندە بەری نوکە ب چاڤێن خوە نەدیتی.

پشتی هینگێ چەندین ڕۆژ ب سەر مەریەمێ دا هاتن کو هێدی هێدی پۆسیدە و دلتەنگ یێ خو ژ وێ دوور دکر، لێ د وان ڕۆژان دا هەموو هزرا وێ ل سەر هندێ بوو کا چەوا دێ تەرزەکێ نوو یێ ژیانا خوە یا داهاتی ڕێسیت و ژیانا بوری ژبیرکەت. ب ڕەنگەکی ئێدی زەحمەتەکا مەزن نەبەت دەمێ ژناڤ جهێن خوە دەرکەڤیت، نڤێژێن خوە بکەت، ئامانان بشووت یان ژی خوارنێ بۆ ڕەشیدی بەرهەڤ بکەت.

ئێدێ مەریەم دترسیا بچیتە ژ دەرڤە ژی. ژ نیشکەکێ ڤە وێ دیت ئەو یا حەسیدیێ ب ژنێن جیرانێن خوە و هژمارا زارۆکێن وان دبەت، هندەکان حەفت و هندەك هەشت زارۆك هەبوون، لێ وان نەدزانی تا چ ڕادە ئەو د بەختەوەرن، تا چ ڕادە ئەو د پیرۆزن کو وان ئەو زارۆك دناڤ مالبچووکێن خوە دا هەلگرتبوون و پشتی هاتینە سەر دنیایێ ژی ددانە بەر سینگێ خوە و شیر ژ مەمکێن خوە ددایێ.

ئانکو ئەڤە ئەو زارۆکن یێن کو بەری بهێنە سەر دنیایێ، ژبەر دایکێن خوە نەچووین و بەرمایکێن وان دگەل ئاڤا پڕی کەف و سابین و پیساتیا خەلکێ بیانی تێکەل

نەبووین و چووینە د جوکا سەرشوویێ دا. ژبەر هندێ مەریەم ژ وان بێزار دبوو دەمێ وان گازندە ژ ڕەفتارێن نەباش یێن کورێن خوە و بێخیرەتیا کچێن خوە دکری.

دەنگەکی دناڤ سەرێ وێ دا دەنگڤەددا و بزاڤ دکر ب نیازەکا باش خەمێن وێ سڤك بکەت لێ ب شێوەیەکێ نەیێ دروست دلەك ل بەر دلێ وێ ددا.

*دێ تە هندەك زارۆکێن دی هەبن، ئەگەر خودای مەزن حەز بکەت، هێشتا تو یا گەنجی. چ پێنەڤێت تە بەختەکێ باش هەیە کو ببیە دایکا گەلەك زارۆکان.*

لێ خەما مەریەمێ یا بێ ئارمانج و نەدیارکری نەبوو. خەما وێ ژبەر ڤی زارۆکی بوو یێ ژبەر چووی، ڤی زارۆکێ ب تایبەتی، ئەوێ بوویە ئەگەر بۆ چەند ڕۆژەکێن کێم ببیتە کەسەکا بەختەوەر، وێ هزردکر ئەڤ زارۆکە وەکو نیعمەتەکێ بوو لێ ئەو یا ژ هەژی نەبوو ببیتە خودانا ڤێ نیعمەتێ و ئەو ژبەر وی کارێ دگەل نانایێ کری هاتە سزادان.

ئەرێ ما ئەو چەندە ڕاست نەبوو، ژبەر کارێ وێ کری، بوویە ئەگەر نانا وەریسکەکی بێختە ستوویێ خوە و دوماهیێ ب ژیانا خوە بینیت؟ کچێن خیانەتکار نابیت ببنە دایك و نوکە ئەو یا بهایێ ڤێ چەندێ ددەت، ئەو ژی کو هەرشەڤ خەونێن نەخوش دبینیت.

د خەونێ دا ئەجنەیێن نانایێ دهێنە د ژوورا وێ ڤە و نینوکێن خوە دکرنە دناڤ مالبچووکێ وێ دا و زارۆکێ وێ ژێ ددزی. د ڤان خەونێن نەخوش دا، نانایێ ژبەر خوشی و تولڤەکرنێ ب دەنگەکێ بلند پێ دکرە کەنی.

ل هندەك ڕۆژێن دی ژی، مەریەم ب تۆڕەییێ دهاتە دوورپێچکرن. ئەو تۆڕە دبوو، ژبەرکو هزردکر ژبەرچوونا زارۆکێ وێ خەتایێن ڕەشیدی بوون ئەوێ هەر زوو دەست ب گێڕانا ئاهەنگان کری و باوەریەکا زێدە ب خوە هەی کو وێ کۆرەك یێ دناڤ هناڤێن خوە دا هەلگرتی و دێ ل دووڤ دلێ خوە ناڤەکی بۆ وی دانیت. وی دڤیا مایێ خوە د حەزکرنا خودای دا بکەت.

هەردیسان خەتایێن وی بوون دەمێ ب خورتی ئەو هنارتیە شەڕشوویا ژنان، دبیت ل وێرێ هەلم، ئاڤا پیس، سابین، یان ژی هەر تشتەکێ دی یێ پیس ل وێرێ بوویە ئەگەرێ ڕوودانا ڤێ چەندێ.

نەخێر، خەتایێن ڕەشیدی نەبوون بەلکو پێڤیە ئەو گازندەیان ژ خوە بکەت چونکی ل ڤێ دوماهیێ ئەو بەردەوام یا تۆڕەبوو ب شێوەیەکێ نەیێ دروست دنڤست و خوارنێن تیژ دخوارن، یان ژی دبیت ژبەر کێم خوارنا فێقی یان زێدە ڤەخوارنا چایێ بیت.

خەتایێن خودای بوون کو هەروەکو وی دڤیای، ئەو سزا دا. خەتایێن وی بوون ژبەرکو وی ئەو تشت نەدا وێ یێ کو دایە گەلەك ژنێن دی. بەلکو ئەو تشتێ دایە وێ، ژبەرچوون و کەفتنا زارۆکێ وێ بوو بۆ بەر پێن وێ د سەرشوویێ ڤە. خودای دزانی کو ئەو دێ مەزنترین خوشی و بەختەوەری پێشکێشی وێ کەت، لێ وی ئەڤ بەختەوەریە ژ وێ ستاند بەری بدەتێ.

نەخێر، ئەڤ چەندە خەتایێن خودای نەبوون، ئەڤ خەتایە هەموو درەون، هەموو ئەڤ گوتارێن تاوانبارکرنێ یێن خوە د سەرێ وێ دا دەنگڤەددەن جورەکێ گونەهـ و پیسکرنا پیرۆزیانە. خودای مەزن نەیێ دلڕەقە کو کەرب و کینێ ژ مرۆڤان ڕاکەت و ئەو هند یێ بچووك نینە هەتا کارەکێ هۆسا بکەت. ل ڤی دەمی، ئاخفتنێن مەلا فەیزوللاهی د گوهێن وێ دا دەنگڤەددان:

"تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ"

مەریەمێ هەست ب گونەهێ دکر کو وێ ئەڤ هزرێن شاش کرین، ژبەر هندێ ئەو کەفتە سەر چووکا و دەست ب کرنا دوعایان دکر داکو خودایێ مەزن سەرا ڤان هزرێن شاش ل وێ ببوریت.

★★★

د وی ماوەیی دا، ب تایبەت ژ وێ ڕۆژا مەریەم چوویە سەرشوویێ، گوهۆڕینەکا مەزن د ڕەفتار و سەرەدەریا ڕەشیدی دا پەیدابوو. پتریا شەڤێن دهاتە مال یێ بێدەنگ بوو ب خورتی دئاخفت. وی خوارن دخوار و جگارە دکێشان و دچوو سەر جهێن خوە، هندەك جاران ژی ل نیڤا شەڤێ بۆ ماوەیەکێ کورت و ئەنجامدانا کارەکێ بلەز دا هێتە دەڤ وێ و دووبارە ڤەگەڕیتە ژوورا خوە ڤە.

د ڤی ماوەی دا، ئەو گەلەك یێ ب دەڤ گازندە و ب هێجەت بوو. وی بەردەوام گازندە ژ خوارنێن وێ و بێسەروبەریا کەلوپەلێن دناڤ حەوشێ دا دکرن، هەتا ئەگەر بچووکترین ئامان و تشێن پیس و نەشووشتی دیتبان دا خوە ژێ تۆڕە کەت.

هندەك جاران ژی، ل ڕۆژێن ئەینی ئەو دا مەریەمێ دگەل خوە بەتە ناڤ بازاڕی، لێ ل سەر شووستەی بلەز و چەند پێنگاڤەکان ل بەراهیا وێ دچوو بێی کو پەیڤەکێ باخڤیت یان ئاگەهـ ژ هندێ هەبیت کو مەریەم بەردەوام یا دکەتە غارێ هەتا بگەهیتە وی.

د ڤان گەریانێن خوە دا دگەل وێ، ئێدی وەکو بەرێ یێ کەیفخوش و دێم ڤەکری نەبوو. هەردیسان ئێدی شیرناهی و دیاری ژی بۆ وێ نەدکرین و جار جار خوە نەدڕاوەستیا داکو ناڤێن وان جهـ و دەڤەران بو بێژیت. پرسیارێن مەریەمێ ژی ئێدێ ئەو بێزار دکر و زو ب زوو بەرسڤا وێ نەددا.

شەڤەکێ، دەمێ کو ئەو د ژوورا خوە ڤە د ڕوونشتی و گوهێ خوە ددانە ڕادیوییێ، وەرزێ زڤستانێ بەرەڤ دوماهیێ چووبوو، باییێن ب هێز یێن بەری هینگێ بەفر ل سەروچاڤێن وان ددا، ئارام ببوو. گۆمتلێ و کومێن بەفرێ یێن ڕەنگ زیڤی یێن ل سەر چەق و لقێن داران ژی هێدی هێدی دحەلیان و پشتی بورینا چەند حەفتیان هندەك کولیلك ل جهێ وان شین ببوون. ڕەشیدی دگەل ئاوازا سترانا "هاماهانگ" پێن خوە ل تەبلەکێ ددان و چاڤێن وی ل پشت دووکێلا جگارەیان دچوونە سەر یەك.

مەریەمێ پرسیار ژێکر: "ئەرێ تو یێ ژ من تۆڕەی؟"

ڕەشیدی بەرسڤا وێ نەدا. ستران ب دوماهی هات و دەنگوباسان دەستپێکر. ژنەکێ دەست خواندنا ڕاپورتەکێ کر و گوت کو سەروکێ وەلاتی، داود خانی، کومەکا دی یا ڕاوێژکارێن یەکێتیا سوڤیەتێ فڕێکریە باژێرێ موسکو، دبیت ئەڤ چەندە ببیتە ئەگەرێ تۆڕەبوونا "کریملین"ی.

"ئەز یا دوودلم نەکو تو یێ ژ من تۆڕە بی."

ڕەشیدی ئاخینکەك ڕاهێلا.

"ئەرێ تو ..."

ڕەشیدی بەرێ خوە دا مەریەمێ و گوت: " بوچی دێ ژ تە تۆڕە بم؟"

"ئەز نزانم، لێ ئەڤە ئەو زارۆك ژبەر من چووی تو یێ تۆڕەی."

" ئەرێ تو هزردکەی ئەز ژ وی جورێ زەلامامە، پشتی هەموو وان تشتێن من بۆ تە کرین؟"

"نەخێر، چ پێنەڤێت نەخێر."

"باشه بەس من بێزار بکە."

"ل من ببورە، ل من ببورە ڕەشید."

ڕەشیدی قوپکێ جگارا خوە هەرشاندە د تەبلێکێ دا و دەست ب کێشانا جگارەیەکا دی کر و پاشی دەنگێ ڕادیوییێ ژی بلند کر. مەریەمێ ب دەنگەکێ بلندتر ژ دەنگێ موزیکەیا د ڕادیوییێ دا دهات و گوت: "من هزرا خوە ل وێ چەندێ کر کو ..."

ڕەشیدی دووبارە ئاخینکەك ڕاهێلا و ئەڤ جارە تۆڕەبوونەکا مەزنتر ل سەر دێمێ وێ دیاربوو، دەنگێ ڕادیوییێ پیچەکێ کێم کر و دەستێ خوە دناڤ چاڤێن خوە دا ئینا خوارێ و گوت: "باشە نوکە تە چیە؟"

"من هزر دکر ئەگەر ئەم وی زارۆکی ب شێوەیەکێ ژ هەژی بڤەشێرین، مەرەما من ڤێ چەندێ سەر خاترا زارۆکی بکەین و پاشی هندەك دوعایان بۆ بکەین، ب تنێ ئەڤێ چەندێ بکەین نەك زێدەتر."

ئەو ماوەیەك بوو مەریەمێ هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا دکر. وێ نەدڤیا ڤی زارۆکی ژبیر بکەت. وێ نەدڤیا بێ ڕێوڕەسمەکێ ژ هەژی یێ ڤەشارتنێ، بۆ هەتا هەتاییێ خاترا خوە ژ زارۆکی بخوازیت.

"ڤێجا ئەڤ چەندە بۆ چیە؟ ڤان ئاخفتنێن دینان بهێلە."

"ئەز دبێژم ئەڤە دێ بیتە ئەگەر ئەز هەست ب باشتربوونێ بکەم."

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە گوت: "باشە تە چ دڤێت بکە، من بەری نوکە کورەك یێ ڤەشارتی و من نەڤێت کورەکێ دی ژی بڤەشێرم. نوکە ژ دەستووریا تە بیت، من دڤێت گوهداریا ڕادیوییێ بکەم."

وی دووبارە دەنگێ ڕادیوییێ بلند کر و سەرێ خوە  بۆ پاشڤە بر و چاڤێن خوە نقاندن.

هەر د وێ حەفتییێ دا، ڕۆژەکا هەتاڤ و سپێدێ زوو، مەریەمێ جهەکێ باش دناڤ باخچێ مالێ دا دەستنیشانکر و چالەك لێ کولا.

"ب ناڤێ خودای مەزن دلوڤان، ب ناڤێ  پێغەمبەرێ خودای، سلاڤ ل سەر بن."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان وێ مەڕبێلك ل ئاخێ ددان، پاشی ئەو چاکیتێ بەری هینگێ ڕەشیدی بۆ زارۆکی کری، کرە دناڤ وێ چالێ دا و هێدی هێدی ئاخ هاڤێتە سەر.

"تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ"

**ل دوماهیێ ب پشتا مەڕبێلکێ سەرێ وێ چالێ ڕاست کر و کەفتە سەر چوکێن خوە و چاڤێن خوە گرتن و گوت:" یا خودای مەزن تو ڕزقێ من بدە، تو ڕزقێ من بدە."**

# 15

نیسانا 1978

ل ڕۆژا 17ی نیسانا سالا 1978ێ، ل وێ ڕۆژا کو ژیێ مەریەمێ بووینە نوزدە سال، کەلەخێ زەلاّمەکی ب ناڤێ "میر ئەکبەر خەیبەر" ب کوشتی هاتە دیتن. پشتی دوو ڕۆژان ل سەر ڤێ ڕوودانێ، خونیشاندانەکا مەزن ل کابولێ هاتەکرن. هەموو خەلك ڕژیابوونە سەر جادەیان و بەحسێ ڤێ ڕوودانێ بۆ هەڤدوو دکر.

د پەنجەرکێ دا، مەریەمێ دیت جیرانێن وێ یێن د ڕەوشەکا خراب دا و هەموو یێ ب جوش و پەرۆش دگەل هەڤدوو دئاخڤن و ڕادیوییێن ترانزستەرێ یێن دانانە بەر گوهێن خوە و گوهداریا دەنگوباسان دکەن. وێ دیت فەریبا ژی ل سەر دیوارێ مالا خوە یا دگەل ژنەکێ دئاخڤیت کو ئەو دەمەکێ کێم بوو هاتیە دەڤەرا دەهمازانگ. فەریبایێ دگرنژی و دەستێ وێ ل سەر زکێ وێ یێ ب دووگیان بوو.

ژنا دی، کو مەریەمێ ناڤێ وێ ژبیر کربوو، ژ فەریبایێ مەزنتر خویا دکر. هندەك خسلەییێن ڕەنگ مور دناڤ پرچێ وێ دابوون و دەستێ زارۆکەکێ بچووك گرتبوو، مەریەمێ زانی کو ناڤێ کورێ وێ "تارق"ە ژبەرکو وێ گوهـلێبوو دەمێ ب ناڤێ وی گازی دکریێ.

مەریەم و ڕەشید نەچوونە دەڤ جیرانێن خوە. وان گوهێ خوە ددا ڕادیویێ ل دەمەکی کو ب دەهان هزار کەس ڕژیابوونە سەر جادەیان و بەرەڤ دامودەزگەهێن حکومی یێن کابولێ ڤە دچوون. ڕەشیدی گوت کو میر ئەکبەر خەیبەر کەسەکێ شیوعی یێ دیار و ناڤدار بوو. لایەنگرێن وی تاوانا کوشتنا وی ئێخستە د ستوویێ سەروکێ حکومەتێ، داود خانی.

وی تەماشەی مەریەمێ نەدکر دەمێ ئەڤ سحبەتە بۆ وێ دکری. ل ڤان ڕۆژان، وی قەت تەماشەی وێ نەدکر، ژبەر هندێ ژی مەریەم یا پشتڕاست نەبوو کا ئەو دگەل وێ دئاخڤیت یان نە.

مەریەمێ پرسیار کر: "ڕامانا پەیڤا شیوعی چیە؟"

ڕەشیدی پرخێنەك ژ خوە ئینا و بریێن خوە بلند کرن و گوت: "ئەرێ تو نزانی کا شیوعیەت چیە؟ تشتەکێ هۆسا یێ سادە و ب سانەهی تو نزانی چیە. هەموو کەس دزانن کا شیوعەت چیە. ئەو بیرۆکەیەکا گشتی یە. تو نزانی، نە نە، پێدڤی ناکەت ئەز مەندەهوش بمینم کو هەکە تو نەزانی کا چیە."

ل دووڤ دا هەردوو پێن خوە دانانە سەر مێزێ و یەك دانا سەر یێ دی و دبن لێڤکان ڕا گوت کو شیوعی ئەو کەسن یێن لایەنگیریا کارل مارکسی دکەن."

"کارل مارکس کیە؟"

ڕەشیدی بێهنا خوە کوور هەلکێشا.

ل وی دەمی، ل سەر ڕادیویێ بێژەرەکێ دگوت کو تاڕاکی، سەروکی لقێ "خەلق" یێ حزبا PDPA کو حزبەکا شیوعی یا ئەڤغانستانێ یە، یێ ل سەر جادەیێ و گۆتارین کاریگەر پێشکێشێ خونیشاندەران دکەت.

مەریەمێ پرسیار کر: "مەرەما من ئەوبوو، ئەرێ ڤان خونیشاندەران چ دڤێت؟"

ڕەشیدی سەرێ خوە هەژاند و پێ کرە کەنی، لێ مەریەمێ ب ڕێکا وی شێوازێ وی دەستێن خوە لێکداین و چاڤێن خوە لێ وەربادایین تێ ئینادەرێ کو ئەو ژی ژ گوتنێن خوە نەیێ پشتڕاستە و هند پێزانین ل دەڤ وی نینن.

"تو چ تشتان نزانی، مانە هۆسایە؟ تو وەکو زارۆکەکا بچووکی، مەژیێ تە یێ ڤالایە و چ پێزانین تێدا نینن."

"من پرسیار کر چونکی..."

"بێدەنگ بە."

مەریەم بێدەنگ بوو ئێدی پرسیار ژێ نەکرن.

نەیا ب سانەهی بوو ئێدی مەریەم خوە ل بەر ڤان ڕەفتارێن وی یێن کرێت بگریت دەمێ ب ڤی شێوازی دگەل وێ دئاخڤیت، کەربێن خوە ژێڤە دکەت، سفکاتیێ و ترانەیان پێ

دکەت، هەتکا وێ دبەت و دبەر وێ ڕا دهێت و دچیت و چ پیتەی پێ نەکەت هەروەکو دێ بێژی ئەو نە مرۆڤەکە ب ڕەخ وی ڤە بەلکو پشیکەکا مالێ یا بێ بهایە.

پشتی چوار سالێن هەڤژینیێ، مەریەمێ ب ئاشکەرایی زانی کا هەتا چ ڕادە ژنەك دشێت خوە ل بەر نەخوشیان بگریت دەمێ ئەو دترسیت باخڤیت.

ب ڕاستی مەریەم دترسیا، ئەو ژ ڕەفتارێن وی یێن هەرۆژ ڕەنگەك و نە جهێ باوەرییێ، ژ سەرەدەریا وی یا ڕەق و دژوار دترسیا، ژ هندێ دترسیا کو وان بەحسێ بابەتەکێ چەند یێ سادە ژی کربایە دا ئەو کەتە شەڕ. هندەك جاران ڕەفتارێن وی دگەهشتنە وی ڕادەی کولم و شەق و پێنان بدانتە مەریەمێ، هەرچەندە هندەك جارێن کێم ب شێوەیەکێ سادە و هشك داخوازا لێبورینێ ژێ دکر، لێ پتریا جاران ئەڤ چەندە ژی نەدکر.

پشتی بورینا چوار سالان ل سەر ڕوودانا ڕۆژا سەرشوویێ، شەش جارێن دی ژی مەریەم ب دوگیان کەفتبوو، لێ هەموو جاران زارۆکێ وێ ژبەر دچوو و هیڤیێن وێ ژناڤ دچوون.

هەر ژ دەستدانەك، هەر تێکچوونەك، هەر سەرەدانەکا بۆ نوشداری، دبوو ئەگەر بێهیڤیەکا زێدەتر ل دەڤ مەریەمێ پەیدابببیت. دگەل هەر بێهیڤیبوونەکێ ژی، ڕەشید پتر ژ وێ دوور دکەفت و دلڕەق دبوو. پتر نەخوشی دگەهاندە وێ. ئێدی گەهشتە وی ڕادەی کو چ شولێن مەریەمێ ب دلێ وی نەبوون، هەرچەندە وێ بەردەوام مالا خوە پاقژ دکر و جلوبەرگێن وێ دشووشتن و ئەو خوارنێن ئەو گەلەك حەز ژێ دکەت بۆ دلێنان.

جارەکێ، مەریەمێ ل سەر خاترا وی مکیاژ ل سەر دێمێ خوە دا، لێ دەمێ ئەو زڤڕیە مال، وی هۆسا تەماشەی وێ کر تا وی ڕادەی مەریەم بلەز بەرەڤ سەرشوویێ ڤە چوو هەر زوو دێمێ خوە شووشت، ڕۆندکێن شەرمینیێ دگەل ئاڤا ب کەف و سۆراڤ و مسکاری ژ دێمێ وێ دبارین.

نوکە، مەریەم خو ژ دەنگێ هاتنا وی بۆ مالێ ل دەمێ ئێڤاری دترسیا. دەنگێ ڤێکەفتنا کلیلان و ڤەبوونا قفلا دەرگەهی دبوونە ئەگەر دلێ وێ ژ ترسان دا خوە بلەز بقوتیت. ل سەر جهێ خوە ژی، وێ گوهـ ل دەنگێ خش خشا پێلاڤێن وی بوو دەمێ ڕەپ ڕەپا پێن وی دهات پشتی کو پێن خوە ژ پێلاڤێ دئینانە دەرێ.

وێ ب گوهێن خوە ئاگەهـ ژێ هەبوو کا ئەو چ دکەت، دەمێ کورسیك ل سەر ئەردی ڕادکێشایە دەڤ خوە، دەنگێ قەنەپێ یێ نەخوش و بێزار دەمێ ئەو ل سەر دڕوونشتیە خوارێ، دەنگێ کەفچکی دەمێ د سێنیکێ دا دهەلاند و دەنگێ تێکرنا ئاڤێ بەری کو ڤەخوت. ل وی دەمێ کو دلێ وێ بلەز خوە دقوتا، مەژیێ وێ پرسیار دکر ئەرێ کا ئەڤ شەڤە ژی ئەو دێ چ هێجەت گریت داکو بهێت هێرشێ بکەتە سەر وێ.

هەموو گاڤان تشتەك هەبوو ببیتە ئەگەرێ تۆڕەبوونا وی خو هەکە ئەو تشت چەند یێ بچووك ژی بیت، ژبەرکو مەریەمێ چەند خوە واستاندبایە داکو وی بەختەوەر بکەت و چەند خوە ڕادەستی حەز و ئارەزوویێن ژی کربایە، لێ هەر ئەڤ چەندە بەس نەبوون و نەشیا کورێ وی بۆ بزڤڕینیت.

مەریەمێ چەندین جاران ئەو بێ ئومێد کربوو، وێ ئەو حەفت جاران بێئومێد کربوو، ژبەر هندێ نوکە وێ چ بهایێ خوە ل دەڤ وی نینە بەلکو ب تنێ بارگرانیەك نەبیت. هەلبەت وێ هەست ب ڤێ چەندێ دکر، ب ڕێکا سەرەدەریا وی یا ڕەق و ئاورینێن وی یێن هشك و پڕی کەربێن و کین. دەمێ وی تەماشەی مەریەمێ دکر، وەکو بارگرانیەکێ دهاتە پێش چاڤێن وی.

وێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ دێ چ ڕوودەت؟"

ڕەشیدی د بن چاڤکان ڕا سەحکرە وێ و بێی کو بەرسڤا وێ بدەت، ب دەنگەکێ پڕی ئاخ و نالین ڤە بێهنا خوە کوور هەلکێشا و پێن خوە ژ سەر مێزێ ئینانە خوارێ و ڕادیو ڤەمراند و دگەل خوە برە د ژوورا خوە ڤە و دەرگەهـ گرت.

***

ل ڕۆژا 27ی نیسانێ، بەرسڤا پرسیارێن مەریەمێ ب دەنگێ تەق تەقەکا ژ نیشکەکێ ڤە هاتنەدان. مەریەم بلەز و پێخاس بەرەڤ هۆلا مێهڤانان ڤە چوو، وێ دیت ڕەشید بەری وێ یێ چوویە د وێ ژوورێ ڤە و ل بەر پەنجەرێ یێ ڕاوەستیای، ب تنێ فانێلێ وی یێ حەلاقە یێ ل بەر و موویێن سینگێ وی هەموو یێن دەرکەفتین، پەحنیا دەستێ خوە ژی یا دانایە سەر پەنجەرکێ. مەریەم ژی چوو ب ڕەخ وی ڤە و ل بەر پەنجەرکێ ڕاوەستیا.

ل پشت سەرێ وی، مەریەمێ دیت فرۆکەیێن سەربازی ل ئەسمانی یێ بەرەڤ ئاڕاستەیێ باکور و ڕۆژهەلاتی ڤە دچن. دەنگێ وان یێ بلند زیان دگەهاندە گوهێن وێ. ژ

دوور ڤە، دەنگێ پەقینا بۆمبەکێ هات و هەر زوو دوکێلەکا ژ نیشکەکێ ڤە بلند بوو بەر ئەسمانی.

مەریەمێ گوت: "ئەرێ ئەڤە چیە، ڕەشید؟ ئەڤە چیە ڕوودداەت؟"

"بەس خودا دزانیت."

دگەل گوتنا ڤێ چەندێ، وی ڕادیویا خوە هەلکرێ، لێ چ تشت ژبلی بێدەنگییێ ژ ڕادیوییێ نەدەرکەفتن.

"ئەرێ پا ئەم دێ چ کەین؟"

ب بێهنفرەهی ڤە ڕەشیدی گوت: "ب تنێ دێ چاڤەڕێ بین."

★★★

پشتی هینگێ و هەر ل وێ ڕۆژێ، ڕەشید هێشتا مژوولی هلکرنا ڕادیویا خوە بوو، مەریەم ژی د لێناگەهێ ڤە مژوولی بژارتنا برنجی و کەرکرنا پرتێن سپیناغێ بوو. مەریەمێ بیرا خوە ل وی وەختی دئینا دەمێ ب دلخوشی ڤە دچوویە د لێناگەهێ ڤە و خوارن بۆ ڕەشیدی بەرهەڤ دکری.

لێ نوکە دروستکرنا خوارنێ وەکو ڕاهێنانەکا ڕۆژانە، یا بوویە کارەکێ ب زەحمەت و نیگەران. ئافکا وێ، *قورمە*، هەموو گاڤان گەلەك یا سویرە یان ژی یا بێ خوێ یە. برنجا وێ ژی گەلەك یا هەڕشی یە یان ژی یا ڕەق و بێ دوهنە و نانێ وێ ژی هێشتا هەڤیرە یان گەلەك یێ تەنك و پێتی یە.

بزاڤێن ڕەشیدی یێن بەردەوام د لێنانەگێ ڤە ژ بۆ دیرکرنا کێماسی و ئاریشییێن وێ ددروستکرنا خوارنێ دا، ببوونە جهێ نەڕەحەتی و دلتەنگ بوونا وێ، تا وی ڕادەی ئێدی وێ باوەری ب شیانێن خوە نەمابوو.

دەمێ وێ فەرخەسێنیا خوارنێ دانایە بەر ڕەشیدی، سرودا نیشتیمانی ل سەر ڕادیوییێ بوو.

مەریەمێ گوت: "من بۆ تە خوارنا "سابزی" یا بەرهەڤ کری."

"باشە بدانە وێرێ و خوە بێدەنگ بکە."

پشتی سرود ب دوماهی هاتی، دەنگێ زەلامەکی ل سەر ڕادیوییێ بلند بوو، وی خوە دانیاسین وەك عەقید "عەبدولقادر" ل هێزا ئەسمانی. وی گوت کو ل دەمێ سپێدێ زوو،

شورەشگێرێن لەشکەرێ چوار یێن هێزێن چەکدار شیاینە دەستێن خوە بدانە سەر فرۆکەخانە و ناڤەندێن گرنگ وەك ڕادیویا کابول، وەزارەتێن گەهاندن و ناڤخۆیی و ئاڤاهییێ وەزارەتا ژ دەرڤە. پاشی ب شانازی ڤە گوت: "نوکە باژێرێ کابولێ یێ د دەستێ گەلێ وێ دا."

فرۆکەیێن مە هێرش کریە سەر کوچکا سەروکایەتییێ و دەبابەیێن ل دەوروبەری وێ سۆتینە، و نوکە شەڕەکێ دژوار ل وێرێ دهێتە ئەنجامدان. چەکدارێن لایەنگرێن داود خانی ئێدی چ چارەنڤیس نەمایە و یا باشترە بۆ وان خوە ڕادەست بکەن.

پشتی بورینا چەند ڕۆژان، هێزێن شیوعی ب شێوەیەکێ بلەز دەست ب سێدارەدانا ب کومەل یا لایەنگرێن ڕژێما داود خانی کرن، پاشی گوتگوتکەك بەلاڤ بوو کو ل زیندانا "پولی چارکی" چاڤێن هندەك زیندانیان ئینانە دەرێ و ئەندامێن وان یێن سێکسی کارەب کرینە. هەردیسان مەریەمێ گوهـ ل وێ کومکوژییێ بوو یا ل کوچکا سەروکاتییێ ڤە هاتیە ئەنجامدان.

چەکداران داود خان ژی کوشت، لێ بەری هینگێ نێزیکی بیست کەسان ژ ئەندامێن خێزانا وی ژی کوشتبوون، ژ وان ژی هەڤژین و زارۆك و نەڤیێن وی. هندەك گوتگوتکان دگوت کو داود خانی ب خوە تەلقەك ل سەرێ خوە دایە و هندەکێن دی ژی دگوت کو د شەڕی دا هاتیە کوشتن و گوتگوتکەکا دی هەبوو کو چەکداران ئەو هێلایە ساخ هەتا ب چاڤێن خوە کومکوژیا خیزانا خوە ببینیت و پاشی ئەو سێدارەدایە.

ڕەشیدی دەنگێ ڕادیوییێ بلندتر لێکر و دا بەر گوهێ خوە.

***"ئەنجومەنێ شورەشگێری یێ هێزێن چەکدار هاتیە دروستکرن و ژ نوکە وێ ڤە وەلاتێ مە دێ بیتە کومارا ئەڤغانستان یا دیمۆکراتی."***

ب گوتنا ڤان پەیڤان، عەبدولقادری دەست ب خواندنا گۆتارەکێ کر

"سەردەمێ ئەڕستوکراتی، خزمایەتی، گەندەلی و نەدادپەروەرییێ ب دوماهی هات. مە دوماهی ب دەهان سالێن ڕژێما دکتاتور ئینا. نوکە دەستهەلات یا کەفتیە د دەستێ کەسێن دلسۆز و ئازادیخواز دا. سەردەمەکێ نوو یێ پڕی شکۆمەندی و سەربلندی چاڤەڕێی مللەتێ مە دکەت. ئەڤغانستانەکا نوو ژدایك بوو.

ئەی هاولاتییێن هێژا، ژ نوکە وێ ڤە چ تشت نەمایە ئەم ژێ بترسین. حکومەتا نوو دێ رێزێ ل هەموو پرەنسیپ و بنەماییێن ئاینێ ئیسلامێ و دیموکراتییێ گریت. نوکە ژی دەمێ گێرانا ئاهەنگ و خوشیانە."

رەشیدی رادیو ڤەمراند.

مەریەمێ پرسیار کر: " ئەڤە دەنگوباسەکێ باش یان یێ خراب بوو؟"

رەشیدی گوت: "دەنگوباسەکێ خراب بوو ژ بۆ زەنگینان، لێ رەنگە بۆ مە هند یێ خراب نەبیت."

نوکە مەریەمێ هزرێن خوە د جەلیلی دا دکرن، وێ د دلێ خوە دا پرسیار دکر، ئەرێ ئەگەر دەستێ شیوعیان بگەهیتە وی، دێ وی زیندان کەن؟ دێ کورێن وی ژی زیندان کەن؟ ئەرێ دێ هەموو مال و ملکێ وی ژێ ستینن؟.

رەشیدی تەماشەی برنجی کر و گوت: "ئەرێ ئەو یێ گەرمە؟"

"من نوکە یێ تێکری."

رەشید روونشت و داخواز ژێ کر سێنیکەکێ بدەتە ڤێ.

★★★

ل بنێ جادێ، دەمێ رۆناهییێن زەر و سۆر شەڤا تارى روهن دکری، فەریبایا پۆسیدە، گرانیا لەشێ خوە هەموو ئێخستبوو سەر ئەنیشکێن خوە و پرچا وێ یا ڤژ و نەرێکوپێك بوو چیپکێن خوهێ ژ سەر لێڤا وێ یا سەری دهاتنە خواری.

ب رەخ وێ ڤە داپیرکەك کو ناڤێ وێ "وەجمە"بوو، یا روونشتی بوو تەماشەی هەڤژینێ فەریبایێ و کورێن وێ دکر کو ل دورماندوری زارۆکا وێ یا نوو هاتیە سەر دنیایێ خرڤەببوون. وان ب مەندەهوشی ڤە سەحدکرە پرچا وێ یا نەرم و سڤك و لامێن وێ یێن پیڤازی و لێڤێن وێ یێن وەکو کولیلکان و چاڤێن وێ یێن کەسك کو هێشتا مژیلانکێن وێ پێکڤە مابوون و هێدی هێدی ژێکڤە دکرن.

وان ب هەڤدوو دکرە کەنی دەمێ وان بۆ یەکەم جار گوهـ ل دەنگێ گریا وێ بووی، گریەك کو وەکو میەوا پشیکان بوو، ل دووڤ دا بۆ ڤێژیەکا تەمام و ساخلەم کو خو ژ بنێ گەوریا وێ دەردکەفت.

نوری گوت کو چاڤێن وی وەکو بەرێن گرانبهانە. ئەحمەد ژی کو دیندارترین کەس بوو د خێزانا وان دا، چوو بن گوهێ خوشکا خوە یا بچووك و تێدا بانگ دا و پاشی سێ جاران پف کرە سەروچاڤێن وێ.

حەکیمی پرسیار کر : "دێ ناڤێ وێ کەینە لەیلا. ما نە خوش ناڤە؟"

فەریبایێ ژی ب گرنژین ڤە گوت: "بەلێ لەیلا ناڤەکێ خوشە. جوانیا شەڤێ، ناڤەکێ ژ هەژی یە."

★★★

ڕەشیدی ب دەستێ خوە گولچکەکا برنجی یا بچووك چێکر و کرە د دەڤێ خوە دا، لێ هەر زوو هاڤێتە د سێنیکێ دا ڤە و تف کر.

مەریەمێ پرسیار کر: "ڤێجا ئەڤە چیە؟"

وێ ژی نەزانی کا چەوا ئەڤ ئاخفتنە ژ دەڤێ وێ دەرکەفت و ب ڤی شێوازی پرسیار ژێ کر، ژبەر هندێ لێدانێن دلێ وێ زێدەبوون و لەشێ وێ ژ ترسان دا لەرزی.

ڕەشیدی زاری وێ ڤەکر و گوت: "ڤێجا ئەڤە چیە؟"

"ڤێجا ئەڤە چیە؟ ئەڤە ئەوە کو تە جارەکا دی ژی هۆسا یا چێکری؟"

"بەلێ یا من نێزیکی پێنج خولەکان پتر ژ جارێن دی یا کەلاندی."

"تە پتر کەلاندی یە؟ ئەڤە درەوە."

"ئەز سووندێ دخوم."

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە دەستێ خوە ل سێنیکێ دا و هاڤێتە ڕەخێ دی و ئەو برنج و ئافك هەموو ب سەر سفرا خوارنێ دا وەربوون. مەریەمێ بەرێ خوە ددا وی کا چەوا ب تۆڕەی ڤە ژوورا خوارنێ بجهـ هێلا و ژ مال دەرکەفت و حێل دەرگەهـ ل پشت خوە ڕا گرت.

مەریەم کەفتە سەر چوکان داکو دنکێن برنجی لێکبدەت، لێ دەستێن وێ هۆسا دلەزرین خو نەدشیا تشتەکی هەلبگریت، ژبەر هندێ نەچاربوو بڕوونتە خوارێ هەتا پیچەکێ گیانێ وێ ئارام دبیت و ترسا وێ نەمینیت. بزاڤ دکر چەندین جاران بێهنا خوە کوور ب هەلکێشیت. وێ وێنەیێ خوە دناڤ دیمەنێ ژوورا تاری دا ددیت، لێ بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا.

پاشی گوهـ ل دەنگێ دەرگەهێ حەوشێ بوو کو ڕەشیدی ڤەکر و هاتە د ژوور ڤە و گوتێ: "ڕابەڤە و وەرە ڤێرێ، ڕابەڤە."

ڕەشیدی دەستێ وێ گرت و ڤەکر و کومەکا بەران کرە ددەستێ وێ دا و گوتێ: "ها ڤان بەران بکە د دەڤێ خوە دا."

"چ؟"

"من گوت ڤان بەران بکە د دەڤێ خوە دا."

"بەسە ڕەشید، بەسە ئەز ئێدی ...."

ڕەشیدی ب دەستێن خوە یێن هێز دەڤێ مەریەمێ ڤەکر و هندەك بەرێن بچووك کرنە د دەڤێ وێ دا، مەریەمێ بزاڤ دکر ڕێکێ ل ڤی کارێ وی بگریت و دەڤێ خوە بگریت، لێ بزاڤێن وێ د بێ مفا بوون و ڕەشیدی هەر بەر کرنە د دەڤێ وێ دا.

"نوکە وان بەران بجی،"

دەڤێ مەریەمێ کو یێ پڕ بوو ژ خیز و بەرێن بچووك، ڕۆندك ژی ب چاڤێن وێ دا دهاتنە خوارێ و هیڤی ژ ڕەشیدی دکرن بەلاً خوە ژ وێ ڤەکەت. ڕەشیدی لێ کرە هەوار و دووکێلا جگارا خوە ژی دهاڤێتە سەروچاڤێن وێ و گوتێ: "یەلا، هەر نوکە د دەڤێ خوە دا بجی."

مەریەمێ دەست ب جوینێ کر، تشتەك دناڤ دەڤێ وێ شکەست.

ڕەشیدی کو ڕوویێن وی دلەرزین، گوت: "باشە، نوکە تە زانی تاما چ ژ برنجی دهێت. نوکە تەزانی کا د ڤێ ژیانا هەڤژینییێ دا تە چ دایە من. خوارنەك، نەك زێدەتر."

ل دووڤ دا ڕەشید چوو و مەریەم هێلا ب تنێ داکو بچیت وان بەران و دوو ددانێن خوە یێن شکەستی و خوینێ ژ دەڤێ خوە پاڤێژیت.

# 16

لەیلایا نەهـ سالی ژ خەو هشیاربوو، وەکو هەر جار گەلەك یا ژ دیتنا هەڤالێ خوە تارِقی غەریب بووی، لێ ئەو باش دزانیت نوکە ئەو نەشێت وی ببینیت.

"هەتا کەنگی دێ ل وێرێ مینی؟"

لەیلایێ بەری نوکە ئەڤ پرسیارە ژ تارِقی کربوو دەمێ گوتیێ دێ دگەل خێزانا خوە سەرەدانا مالا مامێ خوە ل باشورێ وەلاتی، باژێری "غەزنە" کەم.

"دێ سیهـ ڕۆژان مینمە ل وێرێ؟

"چەوا؟ سیهـ ڕۆژان؟"

"نە دەمەکێ گەلەك درێژە، تە خێرە هوسا ناڤچاڤێن تە تێکچووین، لەیلا؟"

"ناڤچاڤێن من تێکنەچووینە."

"دەمێ ئەز دچم تو ناکەیە گری، مانە؟"

"نەخێر ئەز ب چ ڕەنگان ناکەمە گری، خو هەکە هزار سالێن دی ژی نەزڤرِی، ئەز ناکەمە گری."

وێ پێهنەك دانا پێ وی یێ ڕاستەڤینە، نەك پێ وی یێ دەستکرد. وی ژی ب یاری ڤە دەستێ خوە هاڤێتە پرچا وێ و کێشا و تەپەك ل پشتا سەرێ وێ دا.

د ماوەیێ وان سێزدە ڕۆژێن دەستپێکێ یێن چوونا تارِقی کو نێزیکی دوو حەفتیان بوو، لەیلا فێری تشتەکێ گەلەك گرنگ و سەرەکی ببوو.

وەخت وەکو ئامیرێ ئەکوردیونێ یە، ئەو ئامیرێ هندەك جاران بابێ تارِقی لێ ددەت و سترانێن پەشتوونێ دگەل دبێژیت، ئەڤ وەختە ژێکدهێتە دەر و دچیتە دناڤ یەك دا، ئەڤ چەندە ژی پشت بەستنێ دکەتە سەر ئامادەبوون یان چوونا وان کەسێن لەیلا حەز ژێ دکەت، نەخاسم کەسەکێ وەکو تارِقی.

ل ڤاتێ خوارێ، جارەکا دی دایك و بابێن وێ شەڕ و گەنگەشە دکرن، لەیلا ل سەر ڕوتینیا شەڕێن وان یێن بەردەوام ڕاهاتبوو، دایکا وێ یا هار بوو ل بابێ وێ کەسەکێ

بەلنگاز و بێدەنگ بوو.

لەیلایێ دەرگەهێ ژوورا خوە گرت و جلکێن خوە دگوهۆڕین، لێ هێشتا وێ گوهـ ل دەنگێ وان دبوو، هێشتا دەنگێ ڤێژییێن دایکا وێ دهاتنە ڤاتێ دووێ.

ل دوماهییێ دەرگەهـ بلەز هاتە گرتن، دەنگێ تەپ تەپا پێیان بلند بوون. هۆسا دیارە ئەڤ جارە ژی بابێ وێ ڤورتال بوو و دەلیڤە بۆ پەیدابوو چاڤێن وی ڕۆژەکا دی ژی ببینن.

"لەیلا، لەزێ بکە دێ بۆ سەر کاری گیرووبم."

"ب تنێ خولەکەکێ."

وێ بلەز پێلاڤێن خوە کرنە پێن خوە پرچا خوە یا زەر و خەلەك و درێژ ل بەر خۆدیکێ شانە کر.

دایکا وێ بەری نوکە گوتبوویێ کو ڕەنگێ پرچا وێ ژی یێ دایە ب یێ وێ ڤە، داڤێن پرچا وێ یێن ستوور و ڕەنگێ چاڤێن وێ یێن کەسکێ فەیروزی. هەردیسان ئالەکێن وێ ژی د بلند ب غەمازە بوون. شێوێ لێڤا وێ یا بنی ژی هەروەکو یێ دایکا وێ بوو کو وێ ژی دابوو ب پیرا خوە یا مەزن ڤە، ئانکو پیرا دایکا لەیلایێ.

دایکا وێ گوت: "پیرا من گەلەك یا جوان بوو."

پاشی ب شانازی ڤە خوە زڤڕاند و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

"جوانیا وێ ببوو بەحسێ هەمی خەلکێ گوندی ل گەلیێ ئەم لێ دژیان. هەرچەندە جوانیا وێ ئێدی ل دەڤ دوو بەرەبابکێن پشتی وێ دا دیارنەبوو و بەرزەببوو، لێ ب تنێ تو نەبی لەیلا جان، جوانیا وێ دووبارە ل دەڤ تە دیاربوو."

دایکا لەیلایێ خەلکا گوندەکی ل دەڤەرا "پانجشێر" بوو کو دەڤەرەکا تاجیکیان بوو و نێزیکی سەد کیلومەتران ژ باکورێ کابولێ یێ دوور بوو و خەلکێ وێ ب زمانێ فارسی دئاخفتن.

دایك و بابێن وێ دوتمام و پسمامێن هەڤدوو بوون. ئەو هەردوو ل گەلیێ پانجشێر ژدایکببوون و پشتی هینگێ ل سالا 1960 دەمێ چووینە د هێلینا زێرین دا، مالا خوە ئینابوو باژێرێ کابولێ، ب تایبەت پشتی بابێ وێ ل زانکۆیا کابولێ هاتیە وەرگرتن.

لەیلا ژ ژوورا خوە دەرکەفت و هاتە خوارێ و هیڤیا وێ ئەوبوو دایکا وێ ژ ژوورا خوە نەدەرکەڤیت و جارەکا دی دەست ب شەڕی نەکەتەڤە. وێ دیت بابێ وێ ل پەردا ل

بەر دەرگەهێ حەوشێ ل سەر چووکان یێ ڕوونشتیە خوارێ و چاڤەڕێی وێ دکەت.

"ئەرێ تە ئەڤ چەندە دیت، لەیلا؟"

ئەو چەندین حەفتی بوو ئەو کونە د پەردا ل بەر دەرگەهێ حەوشێ دا پەیدابووی ئەوا بابێ وێ بەحس ژێ دکر. لەیلا ب ڕەخ وی ڤە ڕوونشت و گوت: "نەخێر، ئەز دبێژم ژ نوو ئەڤ کونە یا ل پەردێ پەیدابووی."

"ڕاستە، من ژی ئەڤ چەندە دگوتە فەریبایێ، لێ وێ باوەر نەدکر."

هۆسا دیارە نوکە ژی، وەکو هەرجار پشتی کو شەڕێ وان ب دوماهی دهێت، یێ دترسیت و مایە حەیری. هەلبەت هێجەتا دایکا وێ ژی ئەو بوو کو مێری د ڤێ کونێ ڕا دهێنە د ژوور ڤە.

هەموو گاڤان لەیلایێ پشتا بابێ خوە دگرت. بابێ وێ کەسەکێ ڤەبارە ناڤنجی و بێ تاقەت بوو. لەشێ وی یێ زراڤ بوو و دوو ملێن وی ژی د تەنگ بوون و دەستێن وی ژی وەکو یێن ژنان د نازك بوون.

هەردەمێ ئەو دچوو د ژوورا بابێ خوە ڤە، دا بینیت سەری وی یێ دناڤ پەرتووکەکێ دا و بەرچاڤکا وی یا کەفتیە سەر دفنا وی و مژوولی خواندنێ یە تا وی ڕادەی هندەك جاران هەست ب هاتنا لەیلایێ نەدکر.

دەمێ ئاگەهـ ژ هاتنا لەیلایێ دبووی، دا نیشانەکێ کەتە دناڤ وی لاپەڕی دا یێ لێ ڕاوەستای و پاشی تەماشەی وێ کەت و بۆ گرنژیت.

بابێ وێ هەموو بەیتێن "ڕۆمیو"ی و "حافزی" ژبەر بوون. هەردیسان دشیا بەحسێ شەڕ و هەڤڕکیان دناڤبەرا برپتانیا و ڕوسیا قەیسەری دا ل سەر وەلاتێ ئەفغانستانێ ب درێژاهی بکەت. وی باش دزانی کا جوداهی دناڤبەرا شکەستن و سەرکەفتنێ دا چیە و چ دگەهینیت. هەردیسان وی دزانی کو دووراتیا دناڤبەرا هەتاڤێ و ئەردی دا، ملیون جار و نیڤان پترە ژ دووراتیا دناڤبەرا باژێرێ کابولێ و غەزنێ دا.

سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ، دەمێ لەیلا پێدڤی ب ڤەکرنا قودیکەکا شریناهیان بایە، دا نەچار بیت چیتە دەڤ دایکا خوە ژ بۆ هاریکاریێ و ب دیتنا وێ ئەڤ چەندە ژی خیانەتەك بوو ل بابێ خوە دکر.

ئامرازێن چاککرنێ دبوونە ئەگەرێ بێزارکرنا بابێ وێ ب تایبەت دەمێ گەڕا وی ژ

بۆ ڤێ چەندێ دهات. گەهێن دناڤبەرا دەرگەهی دا دەنگەکێ نەخوش دکر و هندی وان زەیت ژی لێکربایە چ مفا تێدا نەبوو. بانێ وان ژی پشتی گرتنا دەرز و شەقان ژی، لێ هێشتا دلۆپ دکرن و گەلەك کەڤز ژی ل پشت کاونتەرێن لێنانگەهێ ڤە شین ببوو.

دایکا وێ دگوت کو کورێ وێ ئەحمەد، ئەوێ دگەل برایێ خوە نوری پەیوەندییێ ب هێزێن جیهادێ دژی یەکێتیا سوڤییەتێ ل سالا 1980ێ کری، بەری نوکە وی ئەڤ کێماسی و ئاریشە هەمی چارەسەر دکرن. پاشی وێ خوە هەژاند و گوت: "بەلێ ئەگەر و پێدڤی ب خواندنا پەرتووکەکێ ببی، حەکیم یێ ل وێرێ.

هێشتا لەیلا نەشێت خوە ژ وێ هزرکرنێ قورتال بکەت یا پشتی چوونا برایێن وێ بۆ شەڕێ دژی یەکێتیا سوڤییەتێ ل دەڤ وێ پەیدابووی. ب دیتنا دایکا وێ، دلسۆزی و حەژێکرنا بابێ وێ بۆ پەرتووکێ ژ هەمی تشتان گرنگتر و مەزنترە.

"ئەڤرۆکە ڕۆژا چەندێ یە؟"

بابێ وێ ب گرنژین ڤە ئەڤ پرسیارە ژێ کر و بەرێ خوە وەرگێڕا.

"ڕۆژا پێنجێ یە یان شەشێ ئەو چووی؟"

"بۆ من نەیا گرنگە کا ڕۆژا چەندێ بیت، ئەز ناهەژمێرم."

ب ڕاستی لەیلایێ درەو دکرن چونکی وێ رۆژ رۆژە دهەژمارتن کا ژ کەنگی وەرە تارق چووی. هەر ژبەر ڤێ چەندێ وێ گەلەك حەز ژ بابێ خوە دکر چونکی ل بیرا وی ژی بوو کا ئەڤە چەند ڕۆژە تارق چووی، بەروڤاژی دایکا وێ کو ب ئێکجاری نەزانیبوو کو تارق دگەل خێزانا خوە یێ چوویە باژێرێ غەزنێ.

"باشە، رۆناهیا گلۆپا وێ دێ ڤەمریت بەری کو تو ڤێ چەندێ بزانی."

مەرەم ژ ڤان گوتنێن بابێ وێ، ئاماژەکرنەك بوو بۆ وێ یاریا هەرشەڤ یا لەیلا و تارقی ل بەری دەمێ نڤستنێ دکری، ئەو یاریا بوویە نەریتەکێ وان یێ هەرشەڤ وەکو شووشتنا ددانان.

بابێ لەیلایێ دەستێ وێ کرە د وێ کونا پەردا دەرگەهی ڕا و گوت: "ئەگەر دەلیڤە بۆ من هەلکەفت، پاشی ئەز دێ ڤێ کونێ گرم، لێ نوکە ل سەر مە پێدڤیە ئەم بلەز بچین."

ل دووڤ دا دەنگێ خوە بلند کر و گوت: "نوکە ئەم دێ چین، فەریبا. دێ لەیلایێ گەهینمە قوتابخانێ، ژبیرنەکەی پاشی تو هەڕە بینە مال."

ژ دەرڤەی مال، دەمێ لەیلا ل پشت بابێ خوە ل سەر پایسکلا وی سووار بووی، چاڤێ وێ ب ترۆمبێلەکا مارکا بینز کەفت کو ل بەر دەرگەهێ مالا ڕەشیدی و هەڤژینا وی یا ژ خەلکی ڤەدەر مەریەمێ ڕاوەستیابوو.

ب ڕاستی ژی ئەو نە ترۆمبێلەکا ئاسایی بوو ژ بۆ تاخێن هەژاران. ڕەنگێ وێ یێ شین بوو و ب چەندین هێلێن سپی یێن ستوور هاتبوو نخافتن. لەیلایێ دوو زەلاّم د ترۆمبێلێ دا دیتن کو یەك شۆفێر بوو و یەکێ دی ژی ل کوشنێ پشتێ ڕوونشتبوو خوارێ.

وێ پرسیار کر: "ئەرێ ئەڤە کینە؟"

"مە شولەژێ نینە، خوە باش ب من ڤە بگرە و دا بچین داکو تو ل ڤوتابخانێ گیرو نەبی."

د ڤی دەمی دا شەڕەکێ دی یێ دایك و بابێن وێ هاتە بیرا وێ، ئەو ژی دەمێ دایکا وێ ل سەر سەرێ بابێ وێ ڕاوەستیای و ب دەنگەکێ بلند لێ دکرە ڤێژی و دگوتێ: "ئەڤەژی نە شولێ تەیە مانە، مانە هوسایە پسمام؟ شولێ تە ئەوە مایێ خوە د چ تشتان نەکەی. دەمێ کورێن تەژی چووینە شەڕی، من چەند هیڤی ژ تە کرن کارەکی بکەی و نەهێلی ئەو بچنە شەڕی، لێ تە سەرێ خوە کربوو دناڤ ڤان پەرتووکێن نەفرەتی دا و خوە بێدەنگ دکر، دا بێژی ئەو نە کورێن تەنە."

بابێ لەیلایێ دەست ب هاژووتنا پایسکلا خوە کر و لەیلا ژی ل پشت وی یا ڕوونشتی بوو و دەستێن خوە باش ل دور کەمەرا وی زڤڕاندبوون. دەمێ ئەو د بەر ترۆمبێلا شین ڕا بورین، چاڤێ لەیلایێ ب زەلاّمێ ل کوشنێ پشتێ کەفت: پرچا وی یا سپی بوو و ڤاتەکا ڕەنگ ڤەهوای ل بەر بوو و دەستمالەکا سێگوشە ژی ل سەر سینگێ وی بوو. بەری ئەو ژ دەڤ ترۆمبێلێ بوون، چاڤێ لەیلایێ ب تشتەکێ دی ژی کەفت، وێ دیت هژمارا وێ ترۆمبێلێ یا باژێرێ هیراتێ بوو.

پایسکلا وان ڕێکا مای ب بێدەنگی بوراند. دەمێ ئەو دگەهشتنە تەسەکێ، بابێ وێ دا بێژیتێ لەیلا خوە باش بگرە چونکی نوکە دێ لەزاتیا هاژووتنێ پیچەکێ کێم کەم.

***

ل وێ ڕۆژێ ل ڤوتابخانێ، لەیلا نەدشیا باش گوهداریا وانەیان بکەت. چوونا تارڤی و شەڕێ دایك و بابێن وێ ل سەر هزرا وێ نەدچوون. هەتا ل وی دەمێ ماموستایێ ناڤێ وێ

خواندی و پرسیار ژێ کری کا ناڤێن پایتەختێن رۆمانیا و کوبا چنە، لەیلا کوور چووبوو د هزران دا.

ناڤێ ماموستایا وێ "شانزای" بوو، لێ قوتابیان د پشت وێ ڕا، ناڤێ وێ کربوو خالەتا "ڕەنگمال" ئانکو نیگارکێش، ئەگەرێ ناڤکرنا وێ ژی ب ناڤی بۆ هندێ دزڤرِی دەمێ وێ دار ل دەستێن قوتابیان ددان، دارێ خوە ل پەحنی و پشتا دەستێن قوتابیان ب لڤینەکا بلەز لێ ددا، هەروەکو کا چەوا نیگارکێش دەمێ بۆیاغێ ل کەڤالەکی ددەت، بلەز دوو جاران فرچێ خوە ل سەر کەڤالی ڕا دئینیت و دبەت.

خالەتا ڕەنگمال، ژنەکا گەنج و خودان دوو بریێن ستوور و دێمەکێ ستوور بوو. ل یەکەم ڕۆژا دەستپێکرنا دەوامێ، وێ ب شانازی ڤە گوتبوو قوتابیان کو ئەو کچا جوتیارەکێ هەژارە ل دەڤەرا "کوست".

دەمێ ژ پێرڤە دڕاوەستیا، پرچا خوە یا ڕەش بۆ پشتێ دبر و ل سەر شێوێ بالۆلکەکێ هلددا. دەمێ ئەو ل پشت خوە زڤرِی، بۆ یەکەم جار لەیلایێ هندەك داڤێن موو یێن کورت و خەلەك ل سەر پاتکا وێ دیتن. وێ مکیاژ و زێر نەدکرنە بەر خوە، هەردیسان دەرسوك ژی نەدکرە سەرێ خوە.

خالەتا ڕەنگمالێ هەموو گاڤان دگوت کو ژن و مێر د هەموو بیاڤان دا د وەکهەڤن. مادەم زەلاّم دەرسوکێ ناکەنە سەرێن خوە، بوچی ژن د نەچارن پرچێ خوە بڤەشێرن. هەردیسان وێ دگوت کو یەکێتیا سوڤییەتێ باشترین وەلاتە ل جیهانێ هەموویێ، ب تایبەت دگەل وەلاتێ ئەڤغانستانێ.

"یەکێتیا سوڤییەتێ یا دلوڤانە دگەل کرێکارێن خوە و گەلێ وێ هەموو د وەکهەڤن. خەلکێ وێ هەموو یێ کەیفخوش و بەختەوەرە. بەروڤاژی ئەمریکا کو ڕۆژانە گەلەك تاوان لێ دهێنە ئەنجامدان و خەلك نەوێرن ژ مالێن خوە بدەرکەڤن. هەر کەسەکێ ئەڤغانی ژی ل بن دەستهەلاّتا سوڤییەتێ ڤە دێ یێ بەختەوەر بیت.

هەر ژبەر ڤێ چەندێ، ل سالا 1979ێ یەکێتیا سوڤییەتێ هاتە دناڤ وەلاتێ مە دا، داکو هاریکاریا هەڤسوویا خوە بکەت. داکو هاریکاریا مە بکەت خوە ژ وان دڕندەیان قورتال بکەین یێن بزاڤێ دکەن وەلاتێ مە بەرەڤ پاش ڤە ببەن.

گەلی قوتابیان، دڤێت هوون ژی د هاریکار بن. یا ل سەر هەوە پێدڤیە هەر تشتێ

هوون گوهلێدبن دەزگەهێن ئێمناهیێ پێ ئاگەهدار بکەن خوە هەکە ئەو کەس خێزان و مام و خالێن هەوە ژی بن، چونکی کەس هندی وەلاتێ هەوە حەز ژ هەوە ناکەت. بلا ل بیرا هەوە بیت کو وەلاتێ هەوە ل پلا یەکێ دهێت. ئەز دێ بەردەوام شانازیێ ب هەوە بەم و وەلاتێ هەوە ژی دێ شانازیێ ب هەوە بەت."

ل پشت کورسیکا خالەتا ڕەنگمال، نەخشەیەکێ وەلاتێن یەکێتیا سوڤییەتێ و ئەڤغانستانێ یێ هەلاویستی بوو، زێدەباری وێنەیەکێ دی یێ چوارچووڤەکری یێ سەروکێ شیوعی "نەجیبوللاهـ"ی کو بەری هینگێ بابێ لەیلایێ گوتبوویێ: نەجیبوللاهـ سەروکێ دەزگەهێ پولیسێن نهێنی یێن ئەڤغانی KHAD بوو. هندەك وێنەیێن دی ژی دهەولاویستی بوون کو یێن سەربازێن سوڤیەتی بوون دەمێ دچوونە دەستێن جوتیاران و شتلێن دارێن سێڤان ل سەر دابەش دکرن و هاریکاریا وان دکر دەمێ خانیێن خوە ئاڤا دکرن و هەموویان پێکڤە دگرنژی.

"ێ باشە."

خالەتا ڕەنگمال ئەڤ چەندە گوتە لەیلایێ و خوە نێزیکی وێ کر.

"ها کچکا شۆڕەشگێر، من تو ژ خەونێن تە یێن شیرین هشیار کری؟"

کچکا شۆڕەشگێر ببوو ناسناڤێ لەیلایێ، چونکی ئەو ل شەڤا پەیدابوونا شۆڕەشێ ل نیسانا سالا 1978ێ هاتبوو سەر دنیایێ.

خالەتا ڕەنگمال گەلەك تۆرە دبوو دەمێ کەسەکی ل شوونا پەیڤا شۆڕەش، پەیڤا کودەتا بۆ وێ شۆڕەشێ بکارئینابا. چونکی ب دیتنا وێ ئەڤ سەرهلدانا هاتیەکرن کودەتا نەبوو، بەلکو شۆڕەشا تەخا هەژار و کرێکاران بوو دژی زۆلم و زۆڕداریێ.

هەردیسان پەیڤا "جیهاد" ژی پەیڤەکا قەدەغەکری بوو ل دەڤ وێ. ب دیتنا وێ چ شەڕ و لێکدان ل دەڤەرێن چیای و هەرێمێن دی نەبوون، بەلکو ئەو ب تنێ کومەکا کەسێن چەکدار یێن دژی گەلێ ئەڤغانی بوون و دڤیا ئارامیا وەلاتی تێکبدەن.

یا ژ هەموویێ گرنگتر، کەس ل دەڤێ وێ نەدوێریا بەحسێ وێ گوتگوتکێ بکەت یا دناڤ خەلکی دا بەلاڤبووی، ئەو ژی کو پشتی هەشت سالێن شەڕی، ل دوماهیێ یەکێتیا سوڤییەتێ ل هەمبەر چەکدارێن ئەڤغانی دێ تووشی شکەستنێ بیت.

هەلبەت ل ڤی دەمێ نوکە ئەڤ گوتگوتگە هێدی هێدی یا دبیتە ڕاست، ئەو ژی پشتی

سەرۆکی ئەمریکا "ڕیگان"ی بڕیاردای مۆشەکێن ژ جورێ "میسایل" بدەتە چەکدارێن ئەڤغانی داکو فرۆکەیێن هەلیکوپتەر یێن سوڤییەتێ پێ بێخن.

نوکە ل سەرانسەری جیهانێ، موسڵمان یێ پشتا ئەڤغانستانێ دکرن و هاریکاریا وێ دکەن ب تایبەت مسرى و پاکستانی و دەولەمەندێن سعودیێ ئەوێن ماڵ و ملکەکێ مەزن ل پشت خوە هێلای و هاتینە ئەڤغانستانێ ب مەرەما کرنا جیهادێ.

لەیلایێ گوت: "ناڤێن پایتەخێن وان ئەڤەنە: بوخارست، هاڤانا."

"باشە ئەو هەردوو وەلات هەڤالێن مەنە؟"

بەلێ ماموستا، ئەو هەڤالێن مەنە."

خالەتا ڕەنگمالێ سەرێ خوە هەژاند.

***

دەمێ دەواما قوتابخانێ ب دوماهی هاتی، دایکا وێ نەهاتبوو د دووڤ ڕا، ژبەر هندێ لەیلا نەچاربوو دگەل دوو هەڤالێن خوە یێن د پولێ ڤە بزڤڕیتە مال کو ئەو ژی گێتی و حەسینا بوون.

گێتی کچەکا هەستیگر و ب خوە ڤە بوو، پرچا خوە ژی دکرنە دوو شاخك و ب پارچەیەکا لاستیکی گرێددا. هەموو گاڤان یا بێدەنگ و دامای بوو، دەمێ ب ڕێکێ ژی دچوی پەرتووکێن خوە وەکو مەتالەکی ددانە بەر سینگێ خوە.

ژیێ حەسینایێ ژی سێزدە سال بوون، ئانکو سێ سالان ژ لەیلا و گێتیێ مەزنتربوو. لێ ژبەرکو ئەو سالەکێ ل پولا سییێ و دوو سالان ل پولا چوارێ کەفتبوو، ژبەر هندێ گێتی و لەیلا ڤێڕا گەهشتبوون.

حەسینایێ پاشڤەمانا خوە یا سێ سالان ب زڕتەکیێ و ئەزمانێ خوە یێ خوش قەرەبوو دکر، ژبەر هندێ هەموو گاڤان گێتیێ دگوتێ کو ئەزمانێ تە وەکو ماکینا درواریێ قەت نزانیت بڕاوەستیت. هەردیسان ئەو حەسینا بوو یا ناسناڤێ خالەتا ڕەنگمال دانایە سەر ماموستایا خوە.

ئەڤرۆکە، دەمێ ئەو پێکڤە ژ قوتابخانێ دزڤڕین، حەسینایێ شیرەت ل وان دکرن کا چەوا دێ خوە ژ وان خازگینیان قورتال کەن یێن نە ب دلێ وان.

"تیورەکا پشتڕاستە و گرەنتیا خوە هەیە."

گێتیێ گوت: "بەلێ پا هێشتا ئەز گەلەك یا بچووکم هەتا خەلك بهێنە خازگینیێن من."

"نەخێر جانێ تو نەیا بچووکی."

"باشە پا بوچی هەتا نوکە کەس نەهاتیە من بخوازیت؟"

"ڤێجا کی دێ تە خوازیت و سمبێلێن تە وەکو یێن زەلاّمان هاتین!"

گێتیێ تەپەك ل پاتکا وێ دا و ب نافچاڤگرێ ڤە تەماشەی لەیلایێ ژی کر ئەوا ب ئاخفتنا حەسینایێ کریە کەنی. ژ وان هەرسێکان، گێتیێ ژ هەموویان کێمتر ترانە و یاری ب یێن دی دکرن.

"باشە هەرچەوا بیت، نوکە هەوە دڤێت بزانن کا دێ چ کەن؟"

لەیلایێ گوت: "بەلێ بۆ مە بێژە."

"دەمێ تو قەهوێ بۆ خازگینیا بەرهەڤ دکەی ، دڤێت ژ چوار کوپان کێمتر نەکەیێ. دەمێ ل ئێڤاریا زەلاّمەکێ کرێت و ددان کەفتی دهێت تە دخوازیت، دێ ڤێ قەهوێ پێشکێشی وی کەی. لێ گەلی خاتینان وەخت گەلەك یێ گرنگە، ئەڤ پیلانە هەموو پشت بەستنێ دکەتە سەر وەختی. پێدڤیە ڕۆناهیان هەموویان بڤەمرینی دەمێ قەهوێ بۆ وی دبەی."

لەیلایێ گوت: "باشە دێ ئەڤ چەندە ل بیرا من بیت."

سەرەڕای ڤێ چەندێ، لەیلا دشیا بێژیتە حەسینایێ خوە بێدەنگ بکەت و گوهداریا شیرەتێن وێ نەکەت، چونکی ئەو یا پشتڕاست بوو بابێ وێ نوکە ئنیەت نینە وێ بدەتە شوو.

بابێ لەیلایێ ل کارگەها مەزن یا دروستکرنا نانی کاردکر. دناڤ قەرەبالغ و گەرماتیا ئامیرێن کارکرنێ دا، وی بەردەوام ئاگرێ فرنێ خوش دکر و ئاشێ هێرانا گەنمی ددا شولی. ئەو ب خوە زەلاّمەکێ خواندەڤان و هەلگرێ باوەرنامەیا زانکۆیێ بو. بەری کودەتایا سالا 1978ێ ب دەمەکێ کێم، وی وەکو ماموستا ل قوتابخانەیەکا ناڤنجی کاردکر لێ پشتی هینگێ ژلایێ شیوعیان ڤە ژ سەر کارێ وی هاتە لادان.

پشتی داگیرکرنا ئەڤغانستانێ ژلایێ یەکێتیا سوڤییەتێ ب سال و نیڤان، هێشتا زوو بابێ لەیلایێ بۆ وێ دیارکر کو گرنگترین تشت د ژیانێ دا پشتی ساخلەمیێ، قوتابخانا وێ

یە.

وی گوت: "ئەز دزانم هێشتا تو یا بچووکی، لێ من دڤێت هەر ژ نوکە تو ڤی تشتی باش بزانی. هەڤژینی دشێت خوە ل هیڤیا تە بگریت لێ ڤوتابخانە ڤەت خوە ل هیڤیا تە ناگریت. تو کچەکا زیرەك و پڕشنگداری، بەلێ ژ ڕاستا تو کچەکا هۆسای. ئەز یێ پشتڕاستم دەمێ ئەڤغانستان ژ ڤی شەڕی ب دوماهی دهێت، ئەو دێ گەلەك پێدڤی ب تە بیت هەروەکو پێدڤی ب زەلاّمان دبیت، دبیت ژ وان پتر پێدڤی ب تە بیت چونکی جڤاکی چ دەلیڤەییێن سەرکەفتنێ نابن هەکە ژنێن وێ د نەخاندەڤان بن.

لەیلایێ نەگوتە حەسینایێ کو بەری هینگێ بابێ وێ ئەڤ تشتە یێن بۆ گوتین. هەلبەت ئەو گەلەك یا بەختەوەر بوو کو وێ بابەکێ هۆسا هەی. هەردیسان وێ گەلەك شانازی ب بابێ خوە دبر ئەوێ هەردەم ڕێز ل وێ دگرتی و حەز ژێ دکری و بەردەوام پشتەڤانیا وێ دکر ل سەر خواندنا خوە یا بەردەوام بیت هەروەکو کا چەوا وی خواندنا خوە ب دوماهی ئینابوو.

ل دوو سالێن بەری هینگێ، لەیلایێ دوو باوەرنامە بدەستخوەڤە ئینابوون کو ئەڤ باوەرنامە بەس بۆ وان ڤوتابیان دهاتنە دان یێن زیرەك و ل سەر پۆلێن خوە بووینە سەرکەفتییێن یەکێ. وێ چ ژ ڤان تشتان بۆ حەسینایێ نەگوتبوون. بابێ حەسینایێ شۆفێرێ تەکسیێ بوو کەسەکێ بێهن تەنگ بوو، چ پێ نەڤێت ئەو ب کێمی هەتا دوو یان سێ سالێن دی دێ وێ دەتە شوو.

حەسنایێ، دەمێ جارەکێ یا ڕژد ل سەر ئاخفتنێن خوە، گوتە لەیلایێ کو بابێ وێ بڕیار یا دای وێ بدەتە کورمامێ وێ ئەوێ نێزیکی بیست سالان ژ وێ مەزنتر ژبەرکو دکانەکا مەزن ل دەڤەرا لاهور هەیە.

"من دوو جاران ئەو یێ دیتی و هەردوو جاران ژی خوارن دخوار و دەڤێ وی یێ ڤەکری بوو."

گێتیێ گوت: "باشە گەلی کچان، چ ل ڤەهوێ هات؟"

حەسینا لێ زڤڕی.

"بلا ئەڤ چەندە باش ل بیرا هەوە، لێ پا هەکە گەنجەکێ جوان ب پیەکی هات دەرگەهێ هەوە ڤووتا و داخواز دەستێ تە کر، هەلبەت تو ڤێ چەندێ ناکەی."

ل دەمێ گوتنا ڤان ئاخفتنان، وێ نافچاڤێن خوە ب گرنژین ئێخستن بوون و دەستەکێ خوە ل بن ملێ لەیلایێ را بربوو، لێ دەمێ ب دوماهی هاتی لەیلایێ دەستێ خوە ژ دەستێ وێ ئینا دەرێ. هەلبەت ئەگەر کەسەکێ دی ئەڤ چەندە د دەرحەڤا تارقی دا گوتبایە دا لەیلا گەلەك خوە ژێ تۆرە کەت، لێ وێ خوە ژ حەسینایێ تۆرە نەکر چونکی وێ دزانی مەرەما وێ نەیا پیسە و ئەو بەردەوام ترانا دکەت ژبەر هندێ کەس ترانەیێن وێ ب رژدی ڤە وەرناگریت.

گێتیێ گوت: "نابیت تو ب ڤی رەنگی بەحسێ خەلکی بکەی."

"مەرەما تە کیژ خەلکی؟"

"ئەو کەسێن ژبەر شەرێ زیان گەهشتیێ."

گێتیێ ئەڤ چەندە ب دەنگەکێ بلند و ب رژد ڤە دگوت بێی کو ترانە و سحبەتێن حەسینایێ ل بەرچاڤ وەربگریت.

"ئەز باش دزانم یا شێخ گێتی، ما تو نزانی مە ل ڤێرێ هندەك عاشق و داخبارێن تارقی یێن هەین! بەلێ پا ئەو کەسەکێ پەسەند و خوشتڤی یە نەك ژ وان خازگینیانە یێن بهێنە رەتکرن. ما تو نزانی؟ مانە هۆسایە لەیلا؟

"نەخێر ئەز ب کەسێ یا داخبار نینم."

پشتی هینگێ لەیلا ژ وان ڤەبوو، لێ ئەو هەردوو بەردەوام بوون ل سەر سحبەت و گەنگەشەیا خوە بەرەڤ کولانەکا دی چوون چونکی مالێن وان پیچەکێ ویڤەتر بوون.

پشتی لەیلا ژ وان ڤەبووی، سێ کولانێن دی برین هەتا گەهشتیە سەرێ کولانا خوە. دەمێ گەهشتیە سەرێ کولانێ ژی دیت هێشتا ئەو ترۆمبێل یا ل بەر دەرگەهێ مالا رەشیدی وان راوەستیایە. ئەو زەلامێ دانعەمر و خودان ڤاتا قەهوای پالا  خوە یا دایە پێشیا ترۆمبێلێ و بەرێ وی یێ ل خانیێ رەشیدی وان.

"هێی تو، کچا پرچ زەر، کا ل پشت خوە بزڤرە."

لەیلا ل پشت خوە زڤری، دیت کەسەکی بەرێ دەمانجێ یێ دایە وێ!

# 17

ڕەنگێ وێ دەمانجێ یێ سۆر بوو، دەستکێ وێ ژی کەسکێ ڤەبی بوو. ئەو دەمانچە د دەستێ "خادیم"ێ دا بوو کو ب گرنژینەکا سار ڤە تەماشەی لەیلایێ دکر.

خادیم ژی وەکو تارقی د ژیێ پازدە سالیێ دا بوو. کورەکێ بەژن بلند و زراڤ و شیم و نەرەحەت بوو. بابێ وێ گوشتفرۆش بوو ل دەڤەرا دەهمازانگ، ژبەر هندێ گەلەك جاران دەمێ ئەو دچوویە دەڤ بابێ خوە ل دکانێ، پارچەیێن دل و مێلاك و ڕیڤیکان د وان ڕێڤینگان وەردکرن یێن دبەر دەرگەهێ دکانا وان ڕا دبورین.

هندەك جاران، ب تایبەت، دەمێ کو تارق یێ ئامادە نەبایە، خادیم دا خوە ل پشت کوژیەکێ دیوارێ قوتابخانەیێ ڤەشێریت و پاشی هێتە د ڕێکا لەیلایێ دا، یان ژی ژ دوور ڤە ب دوو چاڤێن زیق تەماشەی وێ دکر و هندەك جاران ژی ل پشت وێ ڕا دهات و ئاخفتن و گوتنێن ڕۆمانسی دگوتنێ وەك: تو گەلەك یا جوانی، پرچ زەرا من، من دڤێت تو شوو ب من بکەی.

ل دووڤ دا وی دەمانجا خوە یا ئاڤێ لڤاند و گوت: "نەترسە، ژ ڤێ دەمانجێ نەترسە، چ تشتان ناهاڤێژتە سەر پرچا تە"

"هشیاربی چ نەکەی، ئەز تە ئاگەهدار دکەم ئاڤێ د من وەرنەکەی."

"باشە چ ژ دەستێن تە دهێت بکە. چیە دێ وی قوپوی ب من ڕا بەردەی؟ هەی ژارو تارق. نوکە تو د دلێ خوە دا دبێژی دێ کەنگی هێ یە مال و من ژ ڤی دڕندەی قورتال کەی؟"

لەیلایێ هێدی هێدی خوە ژ وی دوور دکر و بەرەڤ پاشڤە دچوو، لێ خادیمی دەستێ خوە دانا سەر دەستکێ دەمانجێ و هندەك ئاڤ ل سەر پرچا وێ ڕەشاند، دەمێ وێ دەستێن خوە هاڤێتینە سەروچاڤێن خوە داکو ئاڤ ڤێنەکەڤیت، دەستێن وێ ژی تەڕ بوون. ل وی دەمی، زارۆکێن دی یێن تاخی ژی هاتنە دەڤ وان و هەموویان ب لەیلایێ کرە کەنی.

ئەو گوتگوتکا لەیلایێ ژ کولانێ گوهلێبووی ل دور دایکا خادیمی، هاتە بیرا وێ، ژبەر

هندێ هەر یەکسەر گوتە خادیمی، هەرچەندە ئەو د ڕامانا وێ ئاخفتنێ نەدگەهشت و پێشبینی نەدکر ژی کا ئەو چ تشتە، بەلێ پا دگەل هندێ کارتێکرنا خوە هەبوو.

وێ گوتە خادیمی: "دایکا تە دیکلان دخوت*."

خادیمی ژی ب تۆڕەیی ڤە بەرسڤا وێ دا: "هەما هەر چ نەبیت، دایکا من وەکو دایکا تە یا دین نینە. هەر چ نەبیت، بابێ من ژی وەکو بابێ تە یێ نێرەمووك و سەرژنك نینە. باشە تو بوچی بێهن ناکەیە دەستێن خوە کا چ بێهن ژێ دهێت."

زارۆکێن دی ژی هەوویان کرە هەوار: "بێهن بکە دەستێن خوە، بێهن بکە دەستێن خوە."

لەیلایێ بێهن کرە دەستێن خوە، لێ هەتا بەری بێهن بکەتێ ژی، وێ دزانی کا مەرەما وی چ بوو دەمێ گوتیێ ئەز ناهاڤێژمە سەر پرچا تە. مەریەمێ کرە گری و زارۆکێن دی ژی پتر پێ کرە کەنی.

ل دووڤ دا ژی لەیلایێ بەرێ خوە ژ وان وەرگێڕا و ب ناڤ چاڤێن گری ڤە چوو مال.

★★★

دەمێ لەیلا گەهشتیە مال، هەر یەکسەر چوو سەتلەکا ئاڤێ ژ بیرێ کێشا و چوو د سەرشوییێ ڤە و ئاڤ کرە دناڤ تەستەکێ دا و جلکێن خوە ژبەر خوە کرن و کرنە تێدا و پاشی سابین د پرچا خوە دا و پاشی ب تبلێن دەستێن خوە باش پرچا خوە پەرخاند و ب ئاڤێ شووشت، ل دووڤ دا سابین د سەروچاڤێن خوە و لەشێ خوە هەموویێ دا. وێ گەلەك جاران لیفك د سەر لەشێ خوە ڕا ئینا و بر هەتا لەشێ وێ هەموو سۆر بووی.

پشتی وێ کراس و پەنتەرۆنەکێ پاقژ کرینە بەر خوە، د دلێ خوە دا دگوت: ئەگەر نوکە تارق ل دەڤ وێ بایە ئەڤ چەندە نەدهاتە سەرێ وێ و خادیم ژی ب چ ڕەنگان نەدشیا هۆسا دگەل وێ باخڤیت. یانژی هەکە دایکا وێ هاتبایە د دووڤ وێ ڕا ل ڤوتابخانەیێ، خادیم نەدهاتە د ڕێکا وێ دا.

هندەك جاران ژی وێ پرسیار ژ خوە دکر کا بوچی دایك و بابێن وێ ئەو ئینایە سەر دنیایێ، مادەم وان حەژێکرنا خوە هەموو دایە زارۆکێ خوە یێ مەزن، ێ پا ئێدی پێدڤی ناکەت ئەو هندەك زارۆکێن دی بینە سەر دنیایێ. مەریەم ب وان خەم و کوڤانان ڤە

* ئانکو دایکا تە ڤەحبەیە.

چوو د ژوورا خوه ڤه و ل سەر جهێن خوه یێن نڤستنێ خوه درێژ کر.

پشتی بێهنەکێ ئەو دووبارە هاتیە سەر هوشێن خوە، چوو بەر دەرگەهێ ژوورا دایکا خوە دەرگەهـ قووتا. دەمێ کو هێشتا لەیلا یا بچووکتر ژ ژیێ خوە یێ نوکە، بۆ دەمەکێ درێژ دا مینتە ل بەر دەرگەهێ ژوورا دایکا خوە و دەرگەهی قوتیت و ب دەنگەکێ نزم ڤە بێژیتێ: دادێ، دادێ دادێ... لێ ل دوماهیێ هەر دایکا وێ دەرگەهـ لێ ڤەنەدکر هەر وەکو کا چەوا نوکە ژی دایکا وێ دەرگەهـ لێ ڤەنەکری، ژبەر هندێ لەیلا نەچار بوو دەستێ خوە بهاڤێژتە دەستکێ دەرگەهی و بچیتە د ژوورا وێ ڤە.

★★★

هندەك جاران دایکا وێ یا ب کەیف بوو. ب دوو چاڤێن گەش و گرنژینەکا نازك ل سەر لێڤان، دا ل سەر جهێن خوە ڕابیتە ڤە و چیتە د سەرشوویێ ڤە و پاشی هندەك جلوبەرگێن پاقژ کەتە بەر خوە و مسکاری د چاڤێن خوە دەت. هندەك جاران وێ دگوتە لەیلایێ پرچا من شانە بکە و هەلبەت کەیفا لەیلایێ ژی گەلەك ب ڤێ چەندێ دهات. ل دووڤ دا ژی دا جووتەکێ گوهارکان کەتە گوهێن خوە و ئەو و لەیلا پێکڤە دا چنە بازارێ "مەنندایێ".

لەیلایێ داخواز ژێ دکر پێکڤە یاریا ماری و دەرەجکان بکەن و دگەل یاریکرنێ ژی وان پارچەیێن چکلێتان یێن تارێ و پرێ کێکەو دخوارن کو ئەڤە یەك ژ وان تشتێن هەڤپشك بوو یێن وان گەلەك حەز ژێ دکر.

خوشترین وەختێ لەیلایێ دگەل دایکا خوە دبوراندین، ئەو  وەخت بوون دەمێ بابێ وێ ژ سەر کاری دزڤڕیە مال. وێ و دایکا خوە سەرێن خوە ل سەر یاریا ماری بلند دکر و ڕادبوونەڤە و ب ددان و لێڤێن شوونوارێن چکلێتان ماینە پێڤە دا بەرەڤ وی ڤە چن و بۆ گرنژن.

بابێ وێ ژی دا ب دیمەنێ وان هەردووان کەتە کەنی، ل وی دەمی بۆ ماوەیەکی خوشی و بەختەوەریێ پەرێن خوە ب سەر ژوورا وان دا ددادان. لەیلایێ ژی هەست ب دلوڤانی و حەژێکرنا وان دکر. ل وی دەمی ڤێ حەژێکرن و بەختەوەریێ مالا وان ئاڤەدان کربوو و دایك و بابێن وێ پتر نێزیکی هەڤدوو کربوون.

ل وان رۆژێن دلێ دایکا وێ یێ خوش، دا نانی ب تەنیرێ ڤەدەت و شیریناهیان

دروست کەت و ژنێن جیرانێن خوە بۆ ڤەخوارنا چایێ مێهڤان کەتە مال و دا دناڤ حەوشێ دا یان د ژوورا مێهڤانان ڤە ڕوونە خوارێ و سحبەتان کەن.

ل وی دەمێ دایکا وێ سێنیك و ئامانێن خوە یێن جوان و ڕەنگاوڕەنگ ل سەر پارچەکا کاغەزی ددان، لەیلا دا پەنجەرکان پاقژ کەت و ل دووڤ دا ئەو ژی دا بۆ خوە جهەکی دناڤ دیوانا وان دا بینیت و دگەل وان ڕوونتە خوارێ. دەمێ ئەو ژن مژوولی خوارنا شیریناهی و ڤەخوارنا چایێ دبوون، مەتحێن دایکا وێ دکرن ژبەر وان شیریناهیان. لەیلایێ بزاڤ دکر ئەو ژی دناڤ سحبەتێن وان دا بەشدار بیت.

هەرچەندە لەیلایێ چ ئاخفتنێن هۆسا نەبوون بۆ وان بێژیت، لێ پا وێ گەلەك حەزدکر دناڤ وان دا بڕوونتە خوارێ و گوهداریا سحبەتێن وان بکەت. وێ خوشیەکا مەزن ژ ڤان ڕوونشتیان ددیت ب تایبەت دەمێ دایکا وێ بەحسێ حەژێکرنا خوە و هەڤژینا خوە حەکیمی بۆ وان دکر و کا چەوا گەهشتنە یەك.

دایکا وێ دگوت: "حەکیم ماموستایەکێ پلە یەك بوو و قوتابیێن وی هەموویان گەلەك حەز ژێ دکر، نەك ژبەر هندێ کو وی وەکو ماموستاییێن دی ئەو ب داران نەدقوتان، بەلکو ژبەر هندێ بوو کو وی گەلەك ڕێز ل قوتابیان دگرت و قوتابیان ژی ڕێز ل وی دگرت و گەلەك پێ دداخباربوون. ب ڕاستی ژ ئەو زەلامەکێ ژێهاتی بوو."

هندەك جاران دایکا وێ دڤیا سەرهاتیا خوازگینێن خوە ژلایێ بابێ وێ ڤە بۆ وان ژنان ب ڤەگێڕیت.

"ژیێ من شازدە سال بوون و یێ وی نۆزدە سال بوون. ل نهالا پانجشێر، دیوارێن مالێن مە پێکڤە بوون. خوشکێن من، ب ڕاستی ژی من گەلەك دل ل سەر هەبوو. ئەز دا خوە د سەر دیوارێ مالا مە ڕا هاڤێژمە دناڤ باخچەیێ وان دا پێکڤە یاریان کەین. حەکیم ژ هندێ دترسیا جارەکێ بابێ من مە پێکڤە ببینیت و زلەهەکێ ل بن گوهێ وی بدەت. چونکی وی هەموو جاران دگوت بابێ تە زلەهەکا ل ڕوویێ من دای.

هندەك جاران ژی دا سل بیت و بۆ ماوەیەکێ درێژ ئاش نەدبوو، ڕۆژەکێ من گوتێ باشە پسمام ما هەتا کەنگی ئەز و تو دێ د هۆسا بین، ما تە نە ل بەرە بهێیە خوازگینیێن من؟ یان ژی تە دڤێت ئەز بهێم تە بخوازم؟ خوزی هەوە دیتبا کا چ ل سەروچاڤێن وی هات دەمێ من ئەڤ چەندە گوتیێ."

وان ژنان و لەیلایێ تیق تیق پێ دکرە کەنی، وێ ژی دەستێن خوە دکرنە تێکدا و دانانە سەر سەروچاڤێن خوە.

لەیلایێ دەمێ گوهـ ل ڤان بیرهاتنێن دایکا خوە دبووی، وێ دزانی بەری نوکە ل وەختەکی وان گەلەك پێکدکر و بێی هەڤدوو نەدقەتاند، لێ مخابن ئەڤرۆکە وەکو بەرێ نەمایە و هەر یەك ژ وان د ژوورەکا جودا دا دنڤیت. لەیلایێ خوزی بۆ وان ڕۆژان ڕادهێلان.

ڕەنگە، چیرۆکا خوازگینییێن دایکا وێ، دەستپێکەك بوو ژ بۆ ڤەکرنا بابەتەکێ دی یێ گرنگ، ئەو ژی دەمێ ئەڤغانستان ژ بن دەستێ ڕوسیا ڕزگار دبیتن، کورێن وێ دێ زڤرنە مال و ل وی دەمی دێ هێنە وەختێ ژنان. ل دووڤ دا ژنێن جیران دا دەست ب ڕێزکرنا ناڤێن وان کچێن جیرانان کەن یێن بۆ ئەحمەدی و نوری د گونجای و یێن نەگونجای ژ بۆ هەڤژینییێ.

دەمێ سوحبەت دهاتیە سەر برایێن وێ، لەیلایێ هەست پێدکر ئەو یا ژ بابەتی دوورە، دا بێژی ئەو ژن یێ بەحسێ فلمەکێ خوش و بالکێش دکەن کو هێشتا لەیلایێ نەدیتی یە. هێشتا ژییێ وێ ب تنێ دوو سال بوون دەمێ ئەحمەد و نور چووینە باکورێ وەلاتی ل پانجشێر داکو پەیوەندییێ ب هێزێن ئەحمەد شاهـ مەسعودی بکەن بۆ شەڕکرنێ دژی یەکێتیا  سوڤییەتێ.

لەیلایێ چ بیرهاتنێن وان ل دەڤ نەمابوون و تا ڕادەیەکی ژبیرکربوون. ب تنێ تشتێ ل بیرا وێ ئەو بوو کو زنجیرەکا تەیسوك ل ستوییێ ئەحمەدی بوو ناڤێ "الله" ل سەر بوو، هەروەسا نیشانەك ژی ل سەر گوهێ نوری بوو کو ئەو ژی هندەك موویێن ڕەش بوون. ژبلی ڤان هەردوو نیشانان چ تشتێ دی ل بیرا وێ نەبوو.

"ئەرێ ئازیتا یا چەوایە؟"

دایکا وێ ب مەندەهوشی ڤە گوت: "کی؟ کچا مەحفیرچنی؟ نێ هندەك سمبێل یێن پێڤە ژ یێن حەکیمی بوشترن."

"ئێ پا ئاناهیتا یا چەوایە؟ دبێژن وەختێ ل دەڤەرا زەرگوونێ، ئەو یەکەما پولا خوە بوو."

"تە ددانێن وێ نەدیتی نە؟ وەکو کێلییێن گۆڕێن مریانە و لێڤێن وێ ژی گۆڕستانە."

"پا خوشکێن وەحیدایێ؟"

"ئەو هەردوو بەژن کورت، نەخێر، نەخێر، ئەو ژ هەژی کورێن من نینن، سولتانێن من، نەخێر، کورێن من ژ هەژی هندەکێن باشترن."

ل دەمەکی کو ئەو مژوولی ڤان سحبەتێن خوە بوون، هزرا مەریەمێ دوور چووبوو، هزرا وێ وەکو هەموو گاڤان ل سەر تارقی بوو.

★★★

دایکا وێ پەردێن زەر یێن ژوورا خوە بەردابوون. دناڤ وێ تارپاتیێ دا، بێهنەکا نەخوش دهات هەروەکو بێهنا نڤستنێ، نڤینیکێن نەشووشتی، خوهێ، گورێن هلاویستی، قولانیێ و ئافکا د سینیکێ دا یا شەڤا پاشتر. لەیلا بەری کو پێنگاڤەکێ بهاڤێژیت، پیچەکێ چاڤێن وێ ژبەر وێ تارپاتیێ تارپیبوون، لێ پشتی هینگێ هێشتا وێ باش ژوور نەددیت و جار جار پێن وێ دکەفتنە سەر کەلوپەل و جلکێن بەربەلاڤ دناڤ ژوورێ دا.

لەیلایێ پەردە ڤەدان. کورسیەکا ئاسنی ب رەخ تەختێ نڤستنێ ڤەبوو، لەیلا ل سەر روونشت و بەرێ وێ ما ل وی کەلەخێ خوە ب بەتەنیکێ نخافتی کو ئەو ژی دایکا وێ بوو.

دیوارێن ژوورا دایکا وێ ب وێنەیێن ئەحمەدی و نوری هاتبوونە نەخشاندن، لەیلایێ تەماشەی هەر لایەکی کربایە، دو کەسێن بۆ وێ خەریب دا پێ کەنە کەنی.

د وێنەیەکێ دی دا، نور ل سەر پایسکلەکا سێ تائیرە بوو، د وێنەیەکێ دی دا، ئەحمەدی ب رەخ دەمژمێرەکا هەتاڤێ ڤە نڤێژ دکر کو وی و بابێ وێ ل دەمێ ژیێ وی دوازدە سال دروستکربوو، د وێنەیەکێ دی دا ژی هەردووان پێکڤە ل بن دار هرمیکا دناڤ حەوشا وان دا پشتێن خوە دابوونە یەك.

لەیلایێ ل بن تەختێ دایکا خوە یێ نڤستنێ، لێڤا سندوقا پێلاڤێن ئەحمەدی دیت. جار جارە ژی دایکا وێ ئەو رۆژنامەیێن کەڤن و ئەو نامیلکەیێن ڤۆرمچی نیشا لەیلایێ ددان یێن ئەحمەدی ژ هێزێن یاخیبووی و بنگەهێن رێکخراوێن بەرەڤانیکرنێ ل پاکستانێ بدەستخوەڤە ئینایین.

هاتە بیرا لەیلایێ کو د وێنەیەکێ سەر رۆژنامەیێ دا، زەلامەکی چاکیتەکێ درێژ ل بەر بوو و مساسکەك ددا زارۆکەکێ بچووك کو هەردوو پێن وی پێڤە نەبوون. دبن وێنەی دا نڤیسابوو: *زارۆك ئارمانجا مین و تەقەمەنیێن یەکێتیا سوڤییەتێ نە*. هەردیسان د

گوتارێ دا هاتبوو نڤیسین کو یەکێتیا سوڤییەتێ کەرەستەیێن تەقەمەنیێ دناڤ یاریێن ڕەنگاوڕەنگ یێن زارۆکان دا دڤەشێرن و ئەگەر هات و زارۆکەکی دەستێ خوە کرە یەك ژ ڤان یاریان، هەر یەکسەر دەستێن وی یان پێن وی دێ ژێ فرن. د ڤی کاودانی دا، بابێ وی دێ نەچار بیت د مال دا بمینیت و چاڤدێریا زارۆکێ خوە بکەت و نە چیە شەڕی دژی هێزێن سوڤییەتێ.

د گۆتارەکا دی یا ل سەر یەك ژ وان پارچەیێن ڕۆژنامەیێ یێن دناڤ سندوقا ئەحمەدی دا هاتبوو نڤیسین کو شەڕکەرەکێ ئەڤغانی یێ گەنج گوتیە کو هێزێن سوڤییەتێ بۆمبێن کیمایی یێن ب سەر گوندێ وان دا بەردابن و پیستێ لەشێ هژمارەکا مەزن یا خەلکی سۆتیە و هژمارەکا دی ژی یێن کورە بووین. هەردیسان گوتیە کو وی ب چاڤێن خوە، دایك و خوشکێن خوە دیتینە دەمێ بەرەڤ ڕووباری دچوون و خوین دگەل کوخکا وان ددەرکەفتی.

"دادێ"

ئەو کەلەخێ ل بن بەتەنیکێ پیچەکێ لڤلڤی و نمنمەك ژێ هات

"دادێ ڕابەڤە، دەمژمێر سێی ئێڤاری یە."

دیسان نمنمەکا دی ژێ هات و پاشی دەستەك ژ بن بەتەنیکێ دەرکەفت و کەفتە خوارێ، ڤێ جارێ کەلەخێ وی ب شێوەیەکێ باشتر و بەرچاڤتر لڤلڤی و پاشی خشخشەك ژێ هات ب تایبەت دەمێ لێڤێن بەتەنیکێ ل سەر کەلەخێ وێ ڕادبووین.

ل دووڤ دا سەروچاڤێن دایکا وێ دیاربوون، پرچەکا ڤژ و دێمەکێ ترشبووی و دوو چاڤێن نیڤ گرتی. دایکا وێ هێدی هێدی ڕابووڤە و دەستەکێ خوە هاڤێتە بەر دەڤێ خوە و باوشکەك ڤەدا. دایکا وێ بزاڤ دکر ڕابیتەڤە و سەرێ خوە بلند بکەت. چاڤێن وێ ل بەر ڕۆناهیێ تەیسین و سەرێ وێ کەفتە سەر سینگێ وی.

دبن لێڤکان ڕا گوت: "ئەرێ ئەڤرۆ قوتابخانەیا تە یا چەوابوو؟"

ب ڤی ڕەنگی پرسیارێن وێ یێن ڕۆتینی دەستپێکرن و لەیلایێ ژی ب سەرپێ بەرسڤا وێ ددا. هەردووان خورتی ل خوە دکر دا دگەل هەڤدوو باخڤن، ئاخفتنا وان وەکو یا دوو هەڤپکشێن بێی گێول و زەوق بوون.

لەیلایێ گوت: "قوتابخانەیا خوش بوو."

"باشه تو تشتەکێ نوو فێربووی؟"

"وەکوو ڕۆژانێن بوری."

"ئەرێ تە تشتەك خواری یە؟"

"بەلێ."

"گەلەك باشە."

دیسان دایکا وێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی پەنجەرێ کر. دوو سێ جارەکان چاڤێن خوە پەرخاندن. ژبەرکو ئەو ل سەر تەنشتا خوە نڤستبوو، لایێ ڕاستێ یێ سەروچاڤێن وێ سۆر بوو پرچا وێ یا کەفتیە وی لای ژی پیچەکێ یا سەرح بوو.

"سەرێ من گەلەکێ دئێشیت."

"حەبکەکا ئەسپرین بۆ تە بینم."

دایکا وێ دەستێ خوە دانا سەر هەردوو ڕەخێن ئەنیا خوە و گوت: "نەخێر، دێ پاشی خوم. ئەرێ بابێ تە زڤڕیە مال؟"

"هێشتا ژ نوو دەمژێر سێ یە."

دایکا وێ باوشکەك ڤەدا و گوت: "تو ڕاست دبێژی کچا من، تە بەری نوکە ژی گوتە من، ببورە هێشتا چاڤێن من یێن دخەون."

وێ ئەڤ چەندە ب دەنگەکێ پیچەك بلندتر ژ دەنگێ خشخشا کڕاسێ وێ ل بن بەتەنیکێ ڤە گوت.

"بەری تو بهێیە د ژوور ڤە، لێ بیرا من ناهێت، ئەرێ ئەڤ چەندە دگەل تەژی ڕوودەت؟"

"ئەو ب سەرێ هەموو کەسان دهێت دادێ."

"تشتەکێ سەیرە."

"دادێ من دڤێت بێژمە تە دەمێ کو تو یا نڤستی، کورەکی ب دەمانچا خوە یا نایلونی، میز هاڤێتە سەر سەرێ من."

" چ هاڤێتە سەر سەرێ تە؟ تە گوت چ؟ ببورە."

"میز، میز."

"ئەڤ چەندە تشتەکێ خڕابە، ئوی خودا، ل من ببورە کچا من یا خوشتڤی، سوباهی

سپێدێ دێ هێم دگەل ئاخڤم، یان ژی دبیت باشتر بیت هەکە دگەل دایکا وی باخڤم، بەلێ ئەڤ چەندە باشترە."

"بەلێ هێشتا من نەگوتیە تە کا کی بوو."

"ئوو ڕاستە، بەلێ کی بوو؟"

"بۆ خوە نەکە خەم."

"چیە تو یا تۆڕەی؟"

"بەلێ، پێدڤی بوو تو هاتبایە د دووڤ من ڕا ل قوتابخانەیێ."

وێ ب دەنگەکێ نزم وەکو یێ بەڤان گوت: "ڕاستە، پێدڤی بوو من وەکربا."

لەیلایێ نەزانی کا ئەڤ ئاخفتنا دایکا وێ پرسیار بوو یان بەرسڤ. دایکا وێ ئەو داڤێن موویان یێن ژ پرچا وێ وەریاین ژ خوە داقووتان. لەیلا یا مەندەهوش بوو کا چەوا وەریانا ڤێ هژمارا مەزن یا موویان ژ پرچێ دایکا وێ نابیتە ئەگەرێ ڕووتبوونا سەرێ وێ هەتا وەکو تیڤکلێ هێکێ لێ دهێت.

"ئێ با باشە هەڤالێ تە؟ ناڤێ وی چ بوو؟ ئاهـ ... تارِق، ئەرێ ئەو ل کیڤە بوو؟"

"ئەڤە حەفتیەکە دگەل خێزانا خوە چوویە گەشتەکێ."

دایکا وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوت: "ێ باشە، تە سەرێ خوە شووشت؟"

"بەلێ."

"ئانکو باشە نوکە تو یا پاقژی."

دایکا وێ تەماشەی پەنجەرکێ کر و ب واستیان ڤە گوت: "باشە پا نوکە تو یا پاقژی و هەموو تشت وەکو خوە نە."

لەیلا ڕابوو ڤە و گوت: "ئەز دێ نوکە چم وانەیێن خوە خوینم."

دایکا وێ ب دەنگەکێ نزم ڤە گوت: "ئەز دزانم، هەڕە وانەیێن خوە بخوینە، لێ بەری تو بچی کا وان پەردەیان بەردە."

جارەکا دی دایکا وێ بەتەنیك ل سەر خوە دادا ڤە.

لەیلایێ دەمێ پەردە بەرددابن، وێ دیت ترۆمبێلەك د کولانا وان ڕا بوری و تۆز ل پشت خوە هێلا، ئەو هەر ئەو ترۆمبێلا بێنز بوو یا ژمارا هیراتێ پێڤە. ل دوماهیێ ئەو ترۆمبێل ژ وێرێ چوو چاڤێ لەیلایێ ژی لێبوو هەتا ژ وێ کولانێ بوری.

دایکا وێ د بن جهێن خوه ڤه گوت: "سوباهی ژ بیرا من ناچیت و دێ دگەل تە هێمە قوتابخانەیێ، سوزێ ددەمە تە."

"دوهی ژی تە وەگوتبوو."

" تو نزانی، لەیلا."

لەیلا زڤڕی و تەماشەی دایکا خوه کر و گوت"چ؟ ئەز چ نزانم؟"

"ل ڤێرێ، تو نزانی کا چ ل ڤێرێ یە؟"

پاشی دووبارە بەتەنیك ل سەر چاڤێن خوە دادا ڤە.

# 18

حەفیتەك بوری و چ دەنگوباسێن تارڤی دیارنەبوون، حەفتیەکا دی ژی هات و چوو هەر چ دیارنەبوو.

داکو وەختێ وێ بچیت و خوە مژوول بکەت، لەیلایێ خوە ب چاککرنا وێ پەردێ ڤە مژوول دکر یاکو بەری هینگێ بابێ وێ گوتیێ ئەگەر من دەرفەت هەبیت ئەز دێ چاك کەم. ل دووڤ دا چوو د ژوورا بابێ خوە ڤە و هەموو پەرتووکێن وێ ژ جهێن وان ئینانە دەرێ و ئەو تۆزا ل سەر پاقژ کر و پاشی دووبارە ئەو پەرتووك هەموو ل دووڤ رێزبەندیا پیتێن ئەلیفوبێ رێکخستن.

هندەك جاران ژی دگەل حەسینا و گێتیێ و دایکا گێتیێ، نیلا، کو کارێ وێ درینا جلکێن ژنان بوو، هاریکاریا وان د کارێ درینێ دا دکر..

د وێ حەفتیێ دا بۆ لەیلایێ باش دیاربوو و گەهشتە وێ باوەریێ کو هندی کارەکێ گران و ب زەحمەت د دنیایێ دا هەیە ، نەخوشیا وان ناگەهیتە چیکەکێ ژ نەخوشیا چاڤەرێکرنا کەسەکێ خوشتڤی.

حەفتیەکا دی ژی ل سەر دیارنەبوونا تارڤی بوری.

لەیلایێ هەستپێکر ئەو یا بوویە ئێخسیرا کومەکا هزروبیرێن نەخوش و ترسناك. ئەو ترس ل دەڤ وێ دیاربوو کو تارڤ ئێدی نازڤریت و ئەو ب یەکجاری یێن ژ ڤی باژێری چووین. هۆسا دیارە بابەتێ گەشتکرنا وان بۆ باژێرێ غەزنێ ب تنێ فیلمەك بوو وێ دڤیا ب ڤێ رێکێ خوە ژ وێ دوور بکەت، یان ژی دبیت ئەو فێلەکا کەسێن مەزن بوو داکو خوە ب ڤێ رێکێ ژ خاترخاستنەکا ب خەم و نەخوشی دوور بکەن.

دوور نینە مینەکا دی ژی پێڤە پەقی بیت، هەروەکو کا چەوا ل سالا 1981ێ دەمێ کو هێشتا ژیێ وی پێنج سال و د گەشتەکێ دا چوویە باشورێ وەلاتی ل باژێرێ غەزنە، مینەك پێڤە پەقی بوو. ئەو روودان ب ماوەیەکێ کێم پشتی سێیەم سالرۆژا ژ دایکبوونا لەیلایێ بوو. وێ جارێ ئەو یێ ب بەخت بوو چونکی وی ب تنێ لنگەکێ خوە ژ دەستدابوو

و مابوو زیندی.

پشتی هینگێ، شەڤەکێ لەیلایێ تیشکا زراڤا لائێتەکا ڕۆناهییێ ل بنێ کولانێ دیت، دەنگەکێ نزم دناڤبەرا ڤیژی و هەوارکرنێ دا ژ بن لێڤێن وێ دەرکەفت. هەر زوو وێ دەست هاڤێتە وێ لائێتا دبن تەختێ خوە ڤە لێ ب مخانی ڤە کار نەدکر، لەوڕا هندی ژ وێ هاتی لائێت گرت و ل ئەردی دا و نەفرەت ل پاتریێن وێ یێن ژ کارکەفتی کرن. لێ ئەڤ چەندە بۆ وێ خەم نەبوو، چونکی وێ زانی تارِق جارەکا دی زڤڕی مال. لەیلایێ خوە ل سەر تەختێ خوە درێژ کر و هەست ب خوشی و بێهنفرەهیەکا مەزن کر، چاڤێ وێ ل لائێتا وێ بوو کا چەوا جار گەش دبوو جار د تەمڕی.

★★★

ل ڕۆژا پاشتر دەمێ لەیلا بەرەڤ مالا تارِقی وان ڤە دچووی، خادیم و هەڤالێن خوە ل سەرێ کولانێ بوون و دارەکێ پیس د دەستان دا بوو و پێ وێنەیەك ل سەر ئاخێ دکێشا، دەمێ چاڤێن وی ب لەیلایێ کەفتین، ئاخفتنەك گوت و هەموو هەڤالێن دگەل وی دەست ب کەنیێ کر، لێ لەیلایێ هەر چ پووتە پێنەکر و سەرێ خوە چەماند و چوو سەر ڕێکا خوە.

دەمێ تارِقی دەرگەهـ ڤەکری، لەیلایێ کرە هەوار: "ئوی خودا، ئەڤە تە چ کریە؟"

هەر یەکسەر هاتە بیرا لەیلایێ کو مامێ تارِقی سەرتڕاش بوو. تارِقی ژی دەستێ خوە ب سەرێ خوە یێ ڕووت دا ئینا خوارێ و کرە کەنی، ددانێن وی یێن سپی نەرِێکوپێك دیاربوون.

"ما تە حەژێنەکر؟"

"دێ بێژی دێ تە کەنە سەرباز."

"ئەگەر تە دڤێت، دەستێ خوە لێبدە."

تارِقی سەرێ خوە چەماند و سەرکێ موویێن تازە هاتین یێن زڤر ل سەر دەستێ لەیلایێ ڕا ئینان و برن. سەرێ تارِقی نە وەکو سەرێ وان کورێن دی یێن کولانێ بوو ئەوێن سەرێن وان ڤژ و بوش، بەلکو سەرێ وی یێ حلی و گرۆڤر بوو.

دەمێ وی سەرێ خوە بلند کری، لەیلایێ دیت ناڤچاڤێن وی ژبەر هەتاڤێ یێن سۆتین. لەیلایێ پرسیار ژێکر: "تو بوچی هندە گیروبووی؟"

"مامێ من یێ نەخوش بوو، وەرە ژوور ڤە، دێ بۆ تە سحبەتێ ب درێژاهی کەم."

ئەو دناڤ حەوشێ ڕا boorین و چوونە د ژوورا مێهڤانان ڤە. لەیلایێ حەز ژ هەموو تشتێن دناڤ مالا وان دا دکر، مەحفیرا ژوورا مێهڤانان یا کەڤن و پەڕتی. چوارچەڤا ل سەر قەنەپان، بێسەروبەریا ژیانا ڕۆژانە یا تاڕقی، توبێن قوماشی یێن دایکا وێ و بەکەرێن وێ یێن دەرزی، گوڤارێن کەڤن و سندوقا ئامیرێ ئەکوردیونێ ل کوژیەکێ ژوورێ کو ل هیڤیا کەسەکی بوو ڤەکەت و بژەنیت.

دایکا وی د لێنانگەهێ ڤە ب دەنگەکێ بلند گوت: "ئەو کیە؟"

تاڕقی بەرسڤا وێ دا و گوت: "لەیلایە."

تاڕقی کورسیەك بۆ دانا بەر داکو ل سەر بڕوونتە خوارێ. ژوورا وان یا ڕوونشتێ ژ ژوورێن دی ڕوهنتر بوو، چونکی دوو پەنجەرێن مەزن د دیوارێ لایێ حەوشێ دا د ڤەکری بوون. ل سەر دەرازینکێن پەنجەران ژی هندەك شووشەیێن ڤالاٚ ل سەر هاتبوونە دانان کو بڕیار بوو دایکا تاڕقی هندەك ترشی و مڕەبەیا گێزەران تێدا بهەلگریت.

بابێ تاڕقی هاتە د ژوور ڤە و ب گرنژین ڤە گوت: "مەرەما تە ئەوە کو بووکا مە یا هاتیە ڤێرێ."

بابێ وی دارتاش بوو، زەلاٚمەکێ لاواز و سەرسپی بوو و دا بێژی ژیێ وی یێ ل دەستپێکا سالێن شێستان. ددانێن وی یێن پێشیێ کرمی ببوون و چاڤێن وی د ویڕبوون، کەسەك بوو پتریا دەمێ خوە ژ دەرڤەی مالێ دبوراند.

وی دەستێن خوە ڤەکرن و لەیلا بەرەڤ وی ڤە چوو هەمبێز کر، بێهنا هویرکێ داری ژ لەشێ وی دهات و کونێن دفنێن وی د پڕبوون ژ ڤی هویرکی. وی لەیلا بلند کر و سێ ماچ دانانە ڕوویێن وێ. دایکا تاڕقی ژی هاتە دەڤ وان و گوتە بابێ تاڕقی: "هۆسا گازی کچکێ نەکە هەکە ژ نوکە وێ ڤە دێ شەرم کەت و ناهێتە مالا مە."

فەرخەسێنیەك د دەستێ دایکا وی دابوو کو سێنیەکا مەزن و چوار سێنیکێن دی یێن بچووك و کەفچکەکێ مەزن ل سەر بوون. وێ فەرخەسێنی دانا سەر مێزێ و ب هەردوو دەستێن خوە، ڕوویێن لەیلایێ گڤاشتن و گوت: "گوهێ خوە نەدە ئاخفتنێن ڤی پیرەمێری. ئەز یا خوشحالم ب دیتنا تە. وەرە ل دەڤ من بڕوونە خوارێ. من هندەك مڕەبە و دووشاڤا فێقی یا دگەل خوە ئینای."

مێزا وان یا مەزن بوو ژ دارەکێ سڤك هاتبوو دروستکرن لێ ڕوویێ وێ یێ ڕاست

نەبوو، بەری هینگێ بابێ تارڤی ئەو مێزە دروست کربوو. کورسیکێن وان ژی ب هەمان شێوە بوون. نایلونەکێ کەسك ل سەر مێزێ هاتبوو ڕائێخستن کو ب وێنەیێن کەرێ هەیڤێ و ستێران هاتبوو نەخشاندن. د ژوورا مێهڤانان ڤە، کومەکا وێنەیێن تارڤی ب دیواری ڤە د هەلاویستی بوون کو د ڤوناغێن جودا جودا یێن ژیێ خوە گرتبوون، د وێنەیێن هێشتا کو ژیێ وی یێ بچووك، هەردوو پێن وی پێڤەبوون.

لەیلایێ کەفچکێ خوە کرە وێ سێنیکا دۆشاڤێ دا یا دایکا تارڤی دانایە بەر سینگێ وێ کو مێویژ و فستەق و مژمژە تێدابوون. لەیلایێ گوت: "من زانی برایێ هەوە یێ نەخوش بوو؟"

بابێ تارڤی جگارەیەك بەردایێ و گوت: "بەلێ ڕاستە، لێ سوپاس بۆ خودای نوکە ئەو یێ ب سەلامەتە."

دایکا تارڤی دبن چاڤکان ڕا تەماشەی بابێ تارڤی کر و گوت: "ئەڤە دووەم جارە جەلتەیا دلی لێددەت."

بابێ تارڤی فرەك ل جگارێ دا و تەماشەی لەیلایێ کر. جارەکا دی هۆسا هاتە سەر هزرا لەیلایێ کو دایك و بابێن تارڤی ب سانەهی دشێن جهێ دایکو بابێن وێ بگرن.

دەمێ ژیێ دایکا تارڤی نێزیکی چل و تشتەك سالان، ژ نوو وێ تارق ئینابوو سەر دنیایێ. ل دووڤ دا دایکا وی سەرێ خوە بلند کر و پرسیار ژ لەیلایێ کر: "کچا من، ئەرێ بابێ تە یێ چەوایە؟"

لەیلایێ دزانی کو دایکا تارڤی بەردەوام باروکەك دکرە سەرێ خوە و دگەل بورینا دەمی ڕەنگێ موویێن باروکێ وێ دهاتە گوهۆڕین بۆ مورەکێ تاڕی. ئەڤرۆ وێ باروکێ خوە پتر یێ ئینایە سەر ناڤچاڤێن خوە لێ لەیلایێ هەر داڤێن سپی یێن پرچا وێ ددیتن. لێ ل دەڤ لەیلایێ دایکا تارڤی ب ڤی باروکەی ڤە جهێ ترانەپێکرنێ نەبوو، بەلکو وێ ڕۆخسارەکێ ئارام و دوو چاڤێن گەش و ڕەفتارەکا نەرم هەبوو.

لەیلایێ بەرسڤا وێ دا: "بابێ من یێ باشە، ئەو هێشتا ل سایلویێ کار دکەت."

"ئەرێ دایکا تە یا چەوایە؟"

"ئەو ژی هندەك جاران یا کەیفخوشە و هندەك جاران یا تۆڕەیە."

دایکا تارڤی دگەل نێزیکرنا کەفچکێ خوە بۆ ناڤ سێنیکا مرەبێ دا گوت: "تو بێژی

بۆ دایکەکێ چەند یا گران و نەخوش بیت دەمێ دوو کورێن وێ ژێ دوور دکەڤن."

بابێ تارڨی گوت: "لەیلا جان بۆ خوارنا نیڤرو تو مەعزووما مەی."

دایکا تارڨی گرنژی و گوت: "هەلبەت ئەو دێ ل دەڤ مە بیت، من شۆربەکا گەلەك خوش یا چێکری."

لەیلایێ ب شەرمینی ڤە گوت: "بەلێ من نەڤێت ئەز بۆ هەوە نەخوشیێ چێکەم."

دایکا تارڨی گوت: "چەوا؟ نەخوشیێ بۆ مە چێکەی؟ ئەڤە دوو حەفتیە ئەم ل ڤێرێ نەبووین و هۆسا د ڤی ماوەی دا تو ئێدی شەرم ژ مە دکەی."

ڕوییێن لەیلایێ ژ شەرمان دا سۆر بوون و ب گرنژین ڤە گوت: "بلا ئەز دێ ل ڤێرێ مینم."

"باشە، ئانکو مە ئاریشە چارەسەر کر."

هەرچەندە ل مالا خوە لەیلایێ هند حەزا خوارنێ نەبوو، لێ ل مالا تارڨی وان ئەو گەلەك یا بەختەوەر بوو حەز ژ خوارنێن دایکا وی دکر. ل وێرێ مەسەلە ئەو نەبوو کو دێ خوارنێ خوت، بەلکو یا گرنگ ئەوە کو هەموو ئەندامێن خێزانێ پێکڤە خوارنێ دخون.

لەیلایێ گەلەك حەز ژ وان گلاسێن پلاستیکی یێن مور دکر ئەوێن ئاڤ پێ ڤەدخوار، هەردیسان وێ پارچا لەیمونێ یا دناڤ دولکێ ئاڤێ دا مەلەڤانی دکرن. لەیلایێ گەلەك حەز ژ هندێ دکر دەمێ بەری خوارنێ سێنیەکا ماستی یا تەزی ددانا و بەری خوارنێ دخوار، پاشی دا پرتەکا لەیمونێ ئینن و ئافکا وێ ل سەر هەموو تشتان ڕەشینن هەتا ل سەر ماستی ژی. وان ب ڤی ڕەنگی خوارن دخوار و گەلەك یاری و ترانە ب هەڤدوو دکرن.

بەردەوام وان ل سەر سفرەیا خوارنێ سحبەتێن خوش و گەرم دکرن. هەرچەندە تارق و دایك و بابێن خوە ژ مللەتێ پەشتوونی بوون، لێ دەمێ لەیلا دچوویە مالا وان دا ب زمانێ فارسی ئاخڤن. لەیلایێ پیچەکێ زمانێ پەشتوونی دزانی و تێدگەهشت چونکی ل قوتابخانەیێ خواندبوو.

بەری هینگێ بابێ وێ گوتبووێ کو دناڤبەرا وان، کو ژ مللەتێ تاجیکی بوون، و مللەتێ پەشتوونی دا شەڕ و نەخوشی هەبوون. تاجیکی مللەتەکێ کێم بوون لێ پەشتوونی مەزنترین مللەتێ ئەڤغانستانێ بوون، ژبەر هندێ مللەتێ تاجیکی هەموو گاڤان هەست ب بچووکی و زۆڵم و زۆرداریێ دکر. نێزیکی دوو سەد و پێنجی سالان پاشایێن پەشتوونی

فەرمانڕەوایی ل وەلاتی کریە، لێ تاجیکیان ب تنێ بۆ ماوەیێ نەهـ هەیڤان ل سالا 1929ێ فەرمانڕەوابوون.

جارەکێ لەیلایێ پرسیار کربوو: "باب، ئەرێ قەت جارەکێ تە هەست ب بچووکی و تەپەسەریا خوە ل بن دەستێ پەشتوونیان کریە؟"

بابێ وێ ژی پشتی کو ب دەهمەنا کراسێ خوە، بەرچاڤکێن خوە پاقژکرین، گوتبوویێ: "ل دەڤ من ڤان تشتان چ بهایێ خوە نینە و جهێ گرنگیپێدانێ نینن، لێ ڕاستی تە بڤێت جهێ مەترسیێ ژی نە. ئەڤە هندەك ئاخفتنێن بێ ڕامانن. ئەز تاجیکم و تو پەشتوونی، ئەڤە هەزارە و یێ دی ئوزبەکە. ئەم هەموو ئەڤغانی نە و دڤێت ئەڤ تشتە ل دەڤ مە ژ هەموو تشتێن دی گرنگتر بیت. بەلێ وەختێ گرۆپەك بۆ ماوەیەکێ درێژ دەستهەلاتێ ل گرۆپێن دی دکەت، دێ ب چاڤەکێ کێم سەحکەتە وان گرۆپان و هۆسا نەخوشی و شەڕ دێ پەیدابن، ئەڤ چەندە هەموو گاڤان هەبوویە و دێ هەر هەبیت ژی."

دبیت وەکو ئاخفتنا بابێ وێ بیت، لێ لەیلایێ ل مالا تارقی وان قەت هەست ب ڤێ چەندێ نەدکر. ل وێرێ ب چ ڕەنگان بەحسێ جوداهیا دناڤبەرا ڤان مللەتان دا نەدهاتە کرن بەلکو گەلەك ب ئاسایی و بێی جوداهیا تائیفی و زمانی و ئاینی و کەلتوری و کەرب و کینێ سەرەدەری دگەل هەڤدوو دکر. ئانکو ئەو جوداهیا وێ د مالا خوە دا هەستپێدکر ل مالا وان هەست پێنەدکر.

تارقی پرسیار ژ لەیلایێ کر: "ئەرێ تو دگەل یاریا کاغەزان و فرۆکەیان یا چەوانی، تە دڤێت یاریێ بکەین؟"

ل وی دەمی، دایکا تارقی ب ناڤچاڤگرێ ڤە تەماشەی بابێ وی کر ئەوێ ژبەر فرێن خوە یێن جگارێ، ئەو ژوور هەموو کریە دوکێل. دایکا وی ب دەستێ دوکێلا جگارەیان ژ خوە دوور دکر و ب ترانە ڤە گوتە بابێ وی: "کا تو ناچیە ڤاتێ دووێ و دوکێلا جگارەیێن خوە ژ مە دوور بکەی، ئەز ژی دێ ڕابم شوربێ چێکەم."

ل نیڤا ژوورا تارقی دا، وان هەردووان ل سەر زکی خوە درێژ کر و دەست ب ئەنجامدانا یاریا پێنج پەڕکان کر، د هەمان دەم دا تارقی یاری ب پێ خوە یێ دەستکرد ژی دکرن. تارقی بەحسێ گەشتا خوە بۆ لەیلایێ دکر، بەحسێ وان شتلێن داران یێن دگەل مامێ خوە چاندین و وی مارێ دناڤ باخچەی دا گرتی بۆ دکر.

ئەڤە هەر ئەو ژوور بوو یا لەیلا و تارقی وانەیێن خوە تێڤە دخواندن. هەر د وێ ژوورێ ڤە دا یاریان ب پەرکان کەن و بۆرجەکێ بلند ژێ دروست کەن. هندەك جاران ژی دا وینەیێن هەڤدوو کێشن. دەمێ باران ژی دهات، دا چنە بەر لێڤا پەنجەرێ و شەربەتا پرتەقالان ڤەخون و تەماشەی چپکێن بارانێ یێن مەزن کەن دەمێ دهاتن ب پەنجەرکێ دکەفتن.

دگەل تێکەلکرنا پەرکان، لەیلایێ پرسیار ژ تارقی کر: "باشە دێ نوکە مەتەلەکێ ژ تە کەم، ئەرێ ئەڤ چ تشتە ل دنیایێ هەموویێ دگەریێت لێ ئەو ب خوە ل گوشەیەکێ دا یێ راوەستیایە؟"

"کا راوەستێ."

تارقی پیچەکێ خوە بلند کر و پێ خوە یێ دەستکر لڤاند و کەفتە سەر چووکان و داخواز ژ لەیلایێ کر بالیفیکەکێ بدەتە ڤێ داکو بدانتە بن پێ خوە.

بیرا لەیلایێ ل وی وەختی هات دەمێ بۆ یەکەم جار تارقی پێ خوە یێ بری نیشا وێ دای، ل وی دەمێ ب تنێ ژیێ لەیلایێ شەش سال بوون. وێ تبلا خوە ل وی پیستێ نەرم ددا یێ دکەفتیە سەر چوکێ وێ یێ چەپێ. تبلا وی کەفتە سەر هندەك بلندی و نزمیان، تارقی گوتێ کو ئەو سەرێ هەستیکێ پێ وی یە کو هندەك جاران پشتی برینێ ژی هەر دروست دبنەڤە.

لەیلایێ هینگێ پرسیار ژێکربوو کا هێشتا پێ وی دئێشیت. وی گوت: "هندەك جاران ئاخ و ئوف ژ وی دهێن ب تایبەت دەمێ سەرێ وی د وەرمیت و دگەل پێ وی یێ دروست دگەل یەك نەگونجن. هندەك جاران ژی گەلەك یێ نەرم و حلی یە ب تایبەت دەمێ گەرم دبیت، هندەك جاران کول دبیت و پەقیشك ل سەر دروست دبن لێ چ نینە دایکا من کرێمەك هەیە دەمێ ئەز تێددەم باشتر لێ دهێت."

گەوریا لەیلایێ پر بوو ژ گریێ.

"لەیلا، تو بوچی دکەیە گری؟ تە ب خوە داخواز کربوو پێ من ببینی، هەی گرینوك، ئەگەر من زانیبا تو دێ وەکەی من نیشا تە نەددا."

تارقی پەرکەك راکر و گوت: "پول."

"چ؟"

"بەرسڤا مەتەلا تە پولە ئەوا دئێخنە پۆستان، پشتی نیڤرۆ دێ چینە باخچێ گیانەوەران."

"تە بەرسڤا وێ مەتەلێ زانی؟"

"نەخێر، من نەزانیە."

"هەی فێلباز."

"تو ژی یا حەسیدی."

"ئەز دێ بوچی یا حەسید بم؟"

" ژبەر زیرەکیا من و زەلاّمینیا من."

"ژبەر زیرەکی و زەلاّمینیا تە؟ باشە کا بێژە من هەر جار وەختێ ئەم یاریا شەترەنجێ دکەین کی ب سەر دکەڤیت؟"

"ئەگەر ئەز ب بابەتێ بیرکاریێ نەکەفتبامە، نوکە ئەز دا دوو سالان ل بەری تە بم."

"بەلێ وەکو من زانی تو ب جوگرافیێ ژی کەفتبووی؟"

"تو ژ کیڤە دزانی؟ باشە ژبیر بکە. نوکە ئەم بچینە باخچێ گیانەوەران یان نەچین؟"

لەیلایێ پێ کرە کەنی و گوت: "بەلێ دێ چین."

"باشە."

"ئەرێ تە هزرێن من دکرن؟"

بۆ چەند خولەکان ئەو بێدەنگ مان، باشی تارقی گوت: "لەیلا، بێژە من چ ل تە هاتیە؟"

لەیلایێ د دلێ خوە دا دگوت کو گەلەك جاران وێ و حەسینا و گێتیێ ئەڤ ئاخفتنە دگوتە هەڤدوو، ئەو ژی پشتی کو هەکە بۆ ماوەیێ سێ چوار ڕۆژەکان هەڤدوو نەدیتبایە. تە هزرێن من دکرن، حەسینا، ئانە.

دەمێ تارقی ب ترانە ڤە ناڤ چاڤێن خوە موچ کرین، لەیلایێ زانی کو د ڤێ چەندێ دا کور نە وەکو کچانە، کور حەژێکرنا خوە بۆ هەڤدوو دیارناکەن و ئەو هەست پێدکەن کو وان پێدڤی ب ڤان جورە ئاخفتنان نینە.

لەیلایێ هزرکر نەکو برایێن وێ ژی د هۆسابن و ئەو ژبیر کربیت. ژبەر هندێ وێ هۆسا ددیت کو کور هۆسا سەرەدەریێ دگەل هەڤدوو دکەن هەروەکو کا چەوا دگەل هەتاڤێ دکەن، هەبوونا هەتاڤێ تشتەکێ پشتڕاست و حاشا هەلنەگرە، لێ هۆسا باشترە تو مفای ژ تیرۆژکێن ڕۆژێ ببینی نەك ل بەر گەرماتیا وێ بسۆژی.

لەیلایێ گوت: "من دڤیا تە تاقی بکەم و بێهنا تە تەنگ بکەم."

تارقی دبن چاڤکان ڕا تەماشەی وێ کر و گوت: "بەلێ، تو ب سەرکەفتی و تە ئەو کر یا تە دڤیای."

لەیلایێ هەستپێکر گڕنژنیا ل سەر لێڤێن وی نەما و ڕوییێن وی یێن سۆتی ژی ل پێشچاڤێن وێ باشتر لێ هاتن.

***

لەیلایێ نەدڤیا ئەو چەندا هاتیە سەرێ وێ بێژیتە تارقی. لەیلا د وێ باوەرێ دا بوو کو نەگوتنا ڤی بابەتی باشترە چونکی ئەگەر تارق بزانیت نەشێتە خوە و دێ چیت خادیمی قوتیت و زیانێ گەهینتێ. لێ پشتی هینگێ دەمێ ئەو چووینە ژ دەرڤە و ل سەر ڕێکا پاسەیان، جارەکا دی وان خادیم دیت کو پالاٚ خوە دابوو دیوارەکی و هەڤالێن وی ژی ل دورماندوری وی خڕڤەببوون. تبلێن خوە کربوونە دناڤ قائیشتا پەنتەرۆنێ خوە دا و ب دوو چاڤێن حیز و کەنیەکا تەمسار تەماشەی لەیلایێ دکر.

پاشی ژ نیشکەکێ ڤە بێی کو بشێتە دەڤێ خوە، سەرهاتیا خوە دگەل خادیمی هەموو بۆ ڤەگێڕا.

"تە گوت وی چ کر؟"

لەیلا دووبارە سەرهاتیا خوە و خادیمی هەموو بۆ وی ڤەگێڕا.

تارقی دەستێ خوە بۆ خادیمی درێژ کر و گوت: "سەحکێ ئەڤەیە؟ ئەوە ئەو ب خوەیە؟ تو یا پشتڕاستی کو ئەڤەبوو مانە ؟"

"بەلێ ئەز یا پشتڕاستم."

تارقی ددانێن خوە تیژ کرن و دبن لێڤکان ڤە تشتەك ب زمانێ پەشتوونی گوت لێ لەیلا تێنەگەهشت، پاشی ب زمانی فارسی گوتێ: "تو ل ڤێرێ بمینە و چاڤەڕێی من بە هەتا دزڤڕم."

"نەخێر تارِق، بزڤرە."

لێ ڤان پەیڤێن وێ چ مفا تێدا نەبوو چونکی تارِق ژ جادەیێ دەرباز ژی ببوو.

دەمێ خادیمی ل دەستپێکێ دیتی ئەو بەرەڤ وی ڤە یێ دهێت، کەنیا خوە یا تەمسارِ ڕاوەستاند و پشتا خوە ژ دیواری ڤەکر و پاشی دەستێن خوە ژی ژ بن ڤائیشا خوە ئینانە دەرێ و ڕێك ڕاوەستیا و خوە بۆ هەر هێرشەکێ ئامادە دکر، هەڤالێن وی ژی ب حێبەتی ڤە تەماشەی وان هەردووان دکر کا دێ چ ڕوودەت.

لەیلایێ هیڤی دخواست وێ چ تشت بۆ تارِقی نەگوتبانە. تو بێژی ئەگەر ئەو هەموو پێوەر بهێن دێ چ لێ کەن؟ هژمارا وان چەندە؟ دەهـ؟ یازدە؟ دوازدە؟ ئو پا هەکە وان زیان گەهاندە وی؟

تارِق ل دووراتیا چەند پێنگاڤەکان ل دووری خادیمی و هەڤالێن وی ڕاوەستیا و بۆ چەند چرکەیەکان وان هەردووان ڕك و ڕك تەماشەی چاڤێن هەڤدوو کر. پیچەکێ کەیفا لەیلایێ هات و د دلێ خوە دا گوت بەلکو وی بۆچونا خوە گوهارِت بیت. دەمێ تارِقی خوە چەماندی، یا ژ لەیلایێ ڤە تارِقی هۆسا دڤێت خوە نیشان بدەت کو ڤەیتانێن پێلاڤا وی یێن سست بووین و پشتی ئەو دشدینیت دێ جارەکا دی زڤرِیتە دەڤ لەیلایێ ڤە، لێ د ڕاستی دا دەستێن وی مژوولی تشتەکێ دی بوون و هەر یەکسەر لەیلایێ زانی کا ئەو دێ چ کەت.

دەمێ تارِق ڕابوویە ژ پێرڤە، کەسێن دی زانی کا وی ل بەرە چ بکەت. تارِقی ژ ڤلکی خوە گەهاندە خادیمی و پێ خوە یێ دەستکرد دانا ملێن وی هەروەکو دا بێژی یێ ب شیرەکی شەرِی دکەت.

هەر یەکسەر هەڤالێن خادیمی هەموویان خوە دا پاش و مەیدان بۆ وان ب تنێ هێلا، ئێدی شەرِێ وان ژی دژوارتر لێ هات و دەنگێ شەق و کولم و پێهن و ڤێژیان بلند بوو.

پشتی وێ ڕۆژێ، ئێدی چ جاران خادیم نەدوێریا خوە نێزیکی لەیلایێ بکەت یان زیانێ بگەهینتێ.

***

وەکو هەرشەڤ، وێ شەڤێ ژی لەیلایێ مێزا خوارنێ ب تنێ بۆ دوو کەسان ئامادە کر. دایکا وێ گوتی ئەز یا برسی نینم. د وان شەڤان دا هندەك جاران هەتا بەری هاتنا بابێ وێ ژی، دایکا وێ دا هندەك خوارنێ بۆ خوە ب تنێ بەتە د ژوورا خوە ڤە. دەمێ لەیلا و بابێ

خوە پێکڤە ل سەر مێزێ د ڕووشنتە خوارێ ژی، ل وی دەمی دایکا وێ یان  یا نڤستی بوو یان ژی دناڤ جهێن خوە دا یا ڕازای بوو.

ل وێ شەڤێ پشتی بابێ وێ ژ سەر کاری زڤڕی، چوو د سەرشوویێ ڤە پرچا خوە یا نەرم باش شووشت و شانە کر.

"کچا من تە چ شیڤ بۆ مە ئامادە کریە؟"

" هندەك شۆربە یا مای."

"گەلەك باشە، ئەرێ ئەڤ شەڤە ئەم چ بکەین؟ کومکرنا ژمارەیێن کەرت نیشا تە بدەم؟"

"نەخێر، ئەم یێن گەهشتینە گوهۆڕینا ژمارەیێن  کەرتی بۆ دەهی."

"ئاها، ڕاست دبێژی."

هەرشەڤ، بابێ لەیلایێ هاریکاریا وێ دکر دەمێ وانەیێن خوە دخواندن و هندەك جاران سحبەت ژی دبەرا بۆ دکرن داکو لەیلا هەمو گاڤان ژ قوتابیێن زیرەك و پێشەنگ بیت لێ ئەڤ چەندە نە ژبەر هندێ بوو کو ئەو بابەتێن لەیلایێ ل قوتابخانەیێ دخواندن جهێ ڕەزامەندیا وی نەبوون، بەروڤاژی، هەوا فێرکرنێ یا بەردەوام بوو. ب بۆچونا بابێ وێ تاکە تشتێ باش یێ شوعیان کربیت یا د بوارێ خواندن و فێرکرنێ دا کری ب تایبەت خواندنا ژنان، ئانکو هەر وی بوارێ بەری هینگێ وی تێدا کاردکری و پاشی ژێ هاتیە دەرێخستن.

ل وی سەردەمی، حکومەتێ خواندنگەهێن تایبەت ژ بۆ نەهێلانا نەخوێندەواریێ بۆ هەمور ژنان ڤەکربوون، نێزیکی دوو ل سەر سێی قوتابیێن زانکۆیا کابولێ ژی هەر ژن بوون و ژنان ل هەموو کولیژان دخواند وەك یاسا و پزیشکی و ئەندازیاری.

بابێ وێ دگوت: "کچا من لەیلا، ژنێن ڤی وەلاتی د کاودانێن گەلەك نەخوش و دژوار دا یێن ژیاین. بەلێ دبیت ل ژێر سیبەرا ڤێ ڕژێما شیوعی، ژن ژ هەموو سەردەمێن دی د ئازادتر بن و مافێن وان د پاراستی بن."

بابێ وێ هەموو گاڤان ئەڤ سحبەتە ب دەنگەکێ نزم دکرن چونکی وی دزانی دایکا لەیلایێ هەدارێ ل سەر هندێ ناکێشیت دەمێ گوهـ ل ناڤێ شوعیان دبیت.

بابێ وێ یێ بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە: "ئەڤ سەردەمە سەردەمەکێ باشە بۆ

ژنێ ل ئەڤغانستانێ. چ پێنەڤێت توژی دشێی مفای ژ ڤێ دەلیڤێ وەربگری، دڤێت باش بزانی ژی کو ئازادیا ژنێ یەکە ژوان ئەگەرپان یێن نوکە هندەك کەسێن ژ دەرڤە چەك هەلگرتی و دژایەتیا ڤێ رژێمێ و ئازادیا ژنان دکەن."

مەرەما وی ژ کەسێن ژ دەرڤە باژێرێ کابولێ نەبوو، چونکی ل وی دەمی کابول د ئاستەکێ بلند یێ ئازادی و پێشکەفتنێ دا بوو. ل کابولێ ژن ل زانکۆیان دخوینن و قوتابخانەیان برێڤە دبەن و دناڤ حکومەتێ دا کاردکەن. مەرەما وی خەلکێ دەڤەرێن عەشیرەتکانی بوو ب تایبەت دەڤەرێن پەشتوونی ل باشور و رۆژهەلاتی ل نێزیکی سنورێ پاکستانێ کو گەلەك ب زەحمەت ژن دەرکەفتبانە ژ دەرڤە و هەکە دەرکەفتبانە ژی پێدڤی بوو بورکە ل بەر بایە و زەلامەك دگەل دا بایە.

مەرەما بابێ وێ ئەو دەڤەر بوون یێن ل دووڤ یاسا و رێسایێن عەشیرەتکانێ دژی شیوعی و بنەمایێن ئازادکرنا ژنێ شەڕ دکر. ژبەرکو ئەڤ بنەمایە دژی هندێ بوون کچ د ژیەکێ بچووك دا شوو بکەت بەلکو ب کێمی دڤێت ژیێ وێ ژ شازدە سالان بوری بیت. بابێ وێ بەردەوام دگوت کو ل ڤان دەڤەران، زەلام هزر دکەن ئەڤ بنەمایە سفکاتیێ ب عادەت و تەڤالیدێن باب و باپیرێن وان دکەت.

وان هزردکر ئەڤ بنەمایە ژلایێ حکومەتێ ڤە هاتینە سەپاندن، ئەو حکومەتا کافر یا دڤێت ڤان بنەمایان ب خورتی ل سەر وان بسەپینیت داکو ئێدی کچ ژی بشێن ژ مال بدەرکەڤن و بهێن و بچن و بخوینن و مل ب ملێ زەلامان ڤە کاربکەن.

بابێ وێ ب تڕانە ڤە گوت: "ان شاو الله نەگەهیتە وێ رۆژێ یا ڤان کەسێن پاشکەفتی دڤێت. لەیلا، کچا من یا خوشتڤی، ب تنێ دوژمنەك یێ هەی کو ئەڤغانستان نەشێتێ، ئەو ژی ئەڤغانستان ب خوەیە."

پاشی بابێ وێ ل سەر کورسیکێ روونشت و نانەك هوور هوور کر و کرە دناڤ شورپێ دا.

لەیلایێ ل سەر سفرا خوارنێ و بەری دەست ب خواندنێ بکەت، دڤیا بێژیتە بابێ خوە کا تارڤی چ ل خادیمی کر، لێ دەلیڤە بۆ وێ هەلنەکەفت ڤێ چەندێ بۆ بڤەگێڕیت. چونکی دەمێ وێ خوە بەرهەڤ کری ڤێ چەندێ بۆ بێژیت، کەسەکی ل دەرگەهی دا، کەسەکێ بیانی هندەك دەنگوباس بۆ ئینان.

# 19

دەمێ لەیلا چووی دەرگەهی ڤەکەت، کەسەکێ بیانی ل بەر دەرگەهی یێ ڕاوەستیای بوو و گوتێ: "خاتینا بچووك، من دڤێت دگەل دایك و بابێن تە باخڤم."

ئەو کەس زەلامەکێ کورت و سەروچاڤ مەزن بوو و دێمەکێ دامای و خەمگین هەبوو، چاکیتەکێ ڕەنگ ئاخی و کولاڤەکێ پاکول یێ ڕەنگ قەهوای ل بەر بوون.

"باشە ئەز دشێم بێژمێ کا کی هاتیە؟"

ل وی دەمی بابێ وێ دەستێ خوە دانا سەر ملێ وێ و هێدی ژبەر دەرگەهێ کێشا د ژوور ڤە و گوتێ: "لەیلا تو بوچی ناچیە د ژوورا خوە ڤە ل ڤاتێ دووێ؟"

دەمێ لەیلا ب سەر دەرەجکان سەردکەفتی، وێ گوهـ لێبوو کو وی زەلامی دگوتە بابێ وێ ئەو یێ ژ پانجشێرێ هاتی و هندەك دەنگوباس یێن دگەل خوە ئینایین. ل وی دەمی دایکا وێ ژی هاتبوو د ژوورا مێهڤانان ڤە و دەستەکێ وێ ل سەر دەڤێ وێ بوو دهات و چوو بەرێ وێ ل هەڤژینێ وێ و وی زەلامێ کولاڤ ل سەری بوو.

لەیلایێ ب دزیکی ڤە ل سەرێ دەرەجکان پیچەکێ خوە نزم کر و تەماشەی ژوورا مێهڤانان کر، وێ دیت زەلامەکێ بیانی ل دەڤ دایك و بابێن وێ یێ ڕوونشتیە. سەرێ خوە ل بەرامبەری وان چەماند و هندەك پەیڤ ب بێدەنگی گوتن. پاشی ڕوویێ بابێ وێ هێدی هێدی پێتی بوو دایکا وێ ژی دەست ب ڤێژیان کر و پرچا خوە کێشا و گەڤزاند.

***

ل ڕۆژا دی سپێدێ، بەهی هاتە دانان. کومەکا ژنێن جیرانێن وان هاتنە مالا وان و کاروبارێ بەهیێ دکر و فراڤین بۆ مێهڤانان پشتی ب دوماهی هاتنا ڕێورەسمێن ڤەشارتنا مری ئامادە دکر. ل وێ ڕۆژێ هەموویێ دایکا وێ ل سەر ڤەنەپێ یا ڕوونشتی بوو. دەستمالەك د دەستێ وێ دابوو سەروچاڤێن وێ ژبەر گریێ وەرمتبوون.

دوو ژنان کو ب مری دگوت، گەلەك ب ئارامی و نەرمی دەستێ دایکا وێ دگرت و دپەرخاند هەروەکو دا بێژی نوکە دایکا وێ نازکترین بووکا شووشەیە ل جیهانێ. لێ دایکا وێ ئاگەهـ ژ چ تشتان نەمابوو، ڕەنگە هەر هەست ب هەبوونا وان ژنان ژی نەکربیت.

لەیلا ل بەر سینگێ دایکا خوە کەفتە سەر چوکان و گوت: "دادێ، تە خێرە؟"

دایکا وێ چاڤێن خوە گرتن و دانانە سەر یەك. یەك ژوان ژنان کو سیمایەك ڕژد ل دەڤ هەبوو، گوتە لەیلایێ: "لەیلا جان، تو خەمان نەخو، دێ چاڤێ مە لێ بیت."

لەیلایێ بەری نوکەژی ڕێوڕەسمێن گێڕانا بەهیان و گەلەك ژنێن وەکو ڤێ ژنێ دیتبوون ئەوێن گرنگیەکا تایبەت ددەنە هەموو وان تشتان یێن پەیوەندی ب مرنێ ڤە هەی، هەلبەت ئەڤە ئەو ژن بوون یێن ب کارێ بەهیێ ڕادبووین و ب مری دگوت و نەدهێلا کەس مایێ خوە د کارێن وان دا بکەت.

"کچا من دێ چاڤێ مە ل دایکا تە بیت، تو هەرە شولەکی بکە و بەلا خوە ژ دایکا خوە ڤەکە."

دەمێ وان ژنان لەیلا ژ وێرێ دوورئێخستی، وێ هەست پێکر ئەو یا بێ مفایە. ژ ژوورەکێ دچوو د ژوورەکا دی ڤە و دڤیا خوە د لێنانگەهێ ڤە ب کارەکی ڤە مژوول بکەت.

بەروڤاژی هەر جار، حەسینا ب خەمگینی و ناڤ چاڤێن گری ڤە دگەل دایکا خوە هاتنە مالا وان. هەردیسان گێتی و دایکا خوە ژی ب هەمان شێوە هاتنە مالا وان. دەمێ گێتیێ لەیلا دیتی، ب چاڤێن ڕۆندك ڤە بەرەڤ وێ ڤە هات و ژ نیڤا دلێ خوە و ب دەستێن خوە یێن نازك و زراڤ ئەو هەمبێز کر.

"ئەز گەلەك یا خەمگینم ژبەر تە لەیلا."

لەیلایێ سوپاسیا وێ کر. پاشی هەر سێ کچ ل ناڤ حەوشێ ڕوونشت هەتا ژنەك هاتیە دەڤ وان و داخواز ژێ کری بچن پەرداغان ژ بەر ژنان ڕاکەن و بشون.

بابێ وێ ژی، بێی کو بزانیت کا ئەو ب خوە ژی چ دکەت، بەردەوام دچوو ژ دەرڤە و دهاتە د ژوور ڤە، خو دا بێژی وی کارەکێ بلەز یێ هەی و دڤێت ئەنجام بدەت.

"ژ من دوور بێخن."

ئەڤە ئەو گوتنا ب تنێ بوو یا ژ سپێدێ وەرە ژ دەڤێ بابێ وێ دەرکەفتی. ل دوماهیێ ژی بابێ وێ ل سەر کورسیکەکێ ڕوونشت. وەکو کەسەکێ بێهنتەنگ و دامای خویا دکر.

ل دووڤ دا ژنەکێ گوتێ کو ئەو یێ د ڕێکێ دا ڕوونشتی، ژبەر هندێ وی داخوازا لێبورینێ کر و بەرەڤ ژوورا پەرتووکێن خوە ڤە چوو.

★★★

بۆ دەمێ پشتی نیڤرو، زەلاّم چوونە هۆلا "کارتی سیە" ئەوا بابێ وێ ژ بۆ بەهیا زەلاّمان ب کرێ گرتی. بەهیا ژنان ژی ل مال هاتبوو دانان و لەیلا ب ڕەخ دایکا خوە ڤە ل بەر دەرگەهێ ژوورا مێهڤانان ڕوونشتبوو، چونکی ل دووڤ دابونەریتان پێدڤی بوو کەسێن مری ل وی جهی ب ڕوونە خوارێ.

مێهڤان ژی دا پێلاڤێن خوە ل بەر دەرگەهی دانن و دهاتنە د ژوور ڤە و سلاڤ دکرە کەسوکار و نیاسێن خوە و پاشی دا ل سەر وان کورسیکێن ڤالاّ ڕوونە خوارێ یێن ل بەر دیواری هاتینە برێزکرن. لەیلایێ وەجمە دیت کو ئەو ژن بوو یا بوویە داپیرکا وێ ل ڕۆژا ئەو هاتیە سەر دنیایێ. هەردیسان دایکا تارڤی ژی دیت کو دەرسوکەکا ڕەش ل سەر پرچا خوە یا باروك دانابوو و ب گرنژینەکا سادە ڤە تەماشەی لەیلایێ کر.

د ئامێرێ تومارکەرێ دا، دەنگێ زەلاّمەکی دهات کو قورئانا پیرۆز دخواند. دناڤبەرا هەر ئایەتەکێ بۆ یەکا دی دا، وان ژنان جهێ خوە دگوهۆڕی یان ژی دەست ب ئاخ و ئوف و گرییێ دکر. جار جار ژی دەنگێ نم نما هندەك ژنان دهات یێن دبن لێڤکان ڕا دئاخفتی و هندەك جاران ژی دەنگەك بلند بوو و ئاخینك ب مری دگوتن.

مەریەما ژنا ڕەشیدی ژی هاتە د ژوور ڤە، جوبەیەکێ ڕەش کربوو بەر خوە و هندەك داڤێن پرچا وێ دبن دەرسوکا وێ ڤە دەرکەفتبوون. ب ڕەخ دیواری ڤە ل بەرامبەری لەیلایێ ل سەر کورسیکەکێ ڕوونشت.

ب ڕەخ لەیلایێ ڤە، وەکو جولانکەکا زارۆکان، دایکا وێ خوە بۆ پێشڤە و پاشڤە دلڤلڤاند. لەیلایێ دەستێ وێ گرت و کرە د کوشا خوە دا و ب پاشی ب هەردوو دەستێن خوە ب هێز گڤاشت، لێ خو دا بێژی دایکا وێ ئاگەهـ ژ چ تشتان نینە و هەست پێناکەت.

لەیلا چوو بن گوهێ دایکا خوە و گوتێ: "دادێ بۆ تە هندەك ئاڤێ بینم؟ تو یا تێهنی نینی؟"

لێ دایکا وێ چ بەرسڤ نەدان، ب تنێ خوە دلڤلڤاند و دکرە گری و چاڤێن وێ ل مەحفیرێ بوون. دەمێ لەیلا یا ب رەخ دایکا خوە ڤە روونشتی و ئەو هەموو گری و خەم و دیمەنێن ل دەوروبەری خوە دیتین، ژ نوو زانی کا ڤەبارێ وێ ئاریشێ چەندە یا ب سەرێ خێزانا وان هاتی. هەموو هیڤی و ئارمانج ژناڤ چووبوون.

لێ ئەڤ هەستە ل دەڤ لەیلایێ هەتا هەتایێ یێ بەردەوام نەبوو. ل دەمەکێ کو هەستەکێ گەلەك گران و نەخوش بوو ژ بۆ دایکا وێ، هەستا ژ دەستدانا جهگەرا وێ. لێ بۆ لەیلایێ، خەم خوارن بۆ گیانێ هندەك کەسان کو هەر ل دەستپێکێ ل دەڤ وێ د زیندی نەبوون، تشتەکێ گران وب زەحمەت بوو. ل دەڤ وێ ئەحمەد و نور هەموو گاڤان وەکو دوو کەسێن ئەفسانەیی بوون، وەکو ڤارەمانێن دناڤ چیرۆکێن خەیالی دا بوون، وەك پاشاییێن دناڤ پەرتووکێن دیرۆکێ دا بوون.

ل دەڤ لەیلایێ، تارڤی هەبوونەکا زیندی هەبوو. ب گوشت و خوینا خوە ڤە کەسەکێ زیندی بوو و وێ هەموو گاڤان ب چاڤێن خوە ددیت، ئەو تارڤێ پەیڤێن کرێت یێن زمانێ پەشتوونی نیشا وێ ددان. ئەوێ حەز ژ پەرکێن بەرسیمی یێن ب سیر دکری و نم نمەکا نزم ژ دەڤێ خوە دئینا دەمێ د دەڤێ خوە دا دجوی. ئەو کەس بوو یێ نیشانەکا زکماکی یا رەنگ پیڤازی یا سادە ل سەر شێوێ ماندولینەکا بەروڤاژی ل سەر رەخێ چەپێ یێ حەفکا وی بوو.

ژبەر هندێ، لەیلا ژی ب رەخ دایکا خوە روونشت و وەك ئەرکەکێ ل سەر ملێن وێ، خەم بۆ ئەحمەدی و نوری خوارن. لێ د دلێ خوە دا هەر هزر دکر برایێن وی یێن راستەڤینە د ساخن و نەمرینە.

# 20

**ئەو خەم و نەخوشی یێن دایکا وێ هەتا مرنێ ژبەر دنالین، هێدی هێدی ل دەڤ دیارکرن، وەك ئێشانا سینگی و سەری و پێیان و کومەکا نەساخیێن دی ب تایبەت خوهدانا ب شەڤێ و ئێشانەکا ب هێز د گوهێن وێ دا و ئەو گرانیا ژبلی وێ، کەسێ دی هەست پێنەدکر.**

**بابێ وێ دایکا وێ برە نەخوشخانێ، نوشداری پشکنینێن خوینێ و میزێ بۆ کرن و تیشکەك بۆ سینگێ وێ گرت، لێ چ نەخوشییێن جەستەیی ل دەڤ دیارنەبوون.**

**دایکا وێ پترپا جاران دناڤ جهێن خوە دا یا درێژ کری بوو و جلکێن ڕەش ل بەر بوون و پرچا وێ یا ڤژ بوو و لەق ددانانە نیشانا بن لێڤا خوە یا بنی. دەمێ یا هشیار ژی، لەیلایێ ددیت ئەو یا دناڤ مال دا دهێت و دچیت و ل دوماهیێ د ژوورا لەیلایێ ڤە دڕووشنتە خوارێ.**

**وێ هزر دکر چ دوور یان نێزیك دێ کورێن خوە بینتە ڤە ئەگەر بەردەوام دناڤ مالێ دا بهێت و بچیت یاکو هێشتا هەست ب بێهنا وان یا ناڤمالێ دا دکر. ئەو دچوو جهێن وان یێن نڤستنێ هەمبێز دکرن، ئەو جهێ وان ب بالفیکان شەڕ دکری لێ دەمێ د چوویە وێرێ کەس ل وێرێ نەددیت.**

**ئەرێ پا لەیلا چیە. مانە ئەو ژی هەر کچا وێ یە. لەیلایێ هزردکر کو وێ چ گرنگی ل دەڤ دایکا خوە نینە.**

**تشتێ یەکانە یێ ژ بیرا دایکا وێ نەدچووی، هەر پێنج نڤێژێن وێ یێن فەرز بوون. پشتی ب دوماهی ژی دهات، دا دەستێن خوە هەتا ئاستێ سەروچاڤێن خوە بلند کەت و دوعایان ژ خودای مەزن کەت کو چەکدارێن ئەڤغانی ب سەر بێخیت.**

**ئەگەر چاڤێ لەیلایێ ل مالێ نەبایە، دا جلوبەرگ و پێلاڤ و کیسکێن ڤەکری یێن برنجی و قودیکێن فاسولی و سێنیکین پیس و نەشووشتی ل هەموو کوژییێن مالا وان دا بەلاڤ بن. وێ بەردەوام جلکێن دایکا خوە دشووشتن و نڤینکێن وێ دگوهارتن و دا ب زمانەکێ**

**خوش و نەرم گازی کەتێ و دەستێ وێ گریت و ژ سەر جهان ڕاکەت و بەرەڤ سەرشوویێ ڤە بەت و خوارنێ دەتێ. هەر وێ ب خوە جلکێن بابێ خوە د شووشتن و ئوتی دکرن و هێدی هێدی بۆ زادلێنەرا مالێ ژی.**

**هندەك جاران، پشتی کاروبارێن مالێ ب دوماهی دئینایین، لەیلا دا چیتە ب ب ڕەخ دایکا خوە ڤە و ل سەر تەختێ وێ خوە درێژ کەت و دا وێ هەمبێز کەت و دەستێ خوە کەتە دناڤ دەستێن وێ دا و سەرێ خوە ژی دکرە دناڤ پرچا وێ دا. دایکا وێ ژی دا وێ هەمبێز کەت و هندەك سحبەتان بۆ کەت، پتریا جاران سحبەتێن وێ ژی سەرهاتیێن کورێن وێ بوون.**

**ڕۆژەکێ دەمێ ئەو ب وی شێوەی دڕازای، دایکا وێ گوت: "ئەحمەد دا بیتە فەرماندە، ب ڕاستی وی ئەو شیان هەبوون. ئەو کەسێن سێ ژیێن وی هەین ب ڕێزگرتن ڤە گوهداریا ئاخفتن و شیرەتێن وی دکر، خوزی تە دیتبایە. ژ خو نور، ئەرێ نورێ دایکا خوە، بەردەوام مژوولی کێشانا نەخشەیێ ئاڤاهی و پران بوو، وی دڤیا ببیتە ئەندازیارێ شارستانی، وی دڤیا ب نەخشەیێن خوە شێوەیێ بازێرێ کابولێ بگوهۆڕیت. لێ نوکە هەردوو یێن شەهید بووین. کورێن من یێن خوشتڤی."**

**لەیلا کو ب ڕەخ دایکا خوە ڤە یا ڕازای بوو و گوهداریا سحبەتێن وێ دکر، د دلێ خوە دا هیڤی دخوست کو جارەکێ ب تنێ دایکا وێ هزرا خوە د وێ ژی دا بکەت و تەماشەی وێ بکەت، سەحکەتێ ئەو شەهید نەبوویە و هێشتا یا زیندی یە و ب ڕەخ وێ ڤە یا پاڵدایە و نوکە ئەو هەموو ئومێد و پاشەڕۆژا وێ یە.**

**لێ لەیلایێ باش دزانی کو پاشەڕۆژا وێ ب چ ڕەنگان ناگەهیتە ڕابردوییێ برایێن وێ. سیبەرا گرانا وان ژیانا دایکا وێ یا نخافتی، مەرگێ وان یێ بوویە ئەگەرێ لادانا وێ. دایکا وێ یا بوویە چاڤدێرا موزەخانەیا بیرهاتنێن وان و لەیلا ژی کەسا یەکانە بوو یا سەرەدانا ڤێ موزەخانەیێ دکر، لەیلا گەنجینەیەك بوو ژ بۆ هزر و خەیالێن وان، بۆ ئەفسانەیێن وان، وەکو لاپەرەکی یە دایکا وێ چیرۆك و بیرهاتنێن کورێن خوە ل سەر دنڤیسیت.**

**دایکا وێ گوت: "ئەو کەسێ دەنگوباس بۆ مە ئینایین گوت: دەمێ تەرمێن کورێن وێ بەرەڤ گۆڕستانێ برین، ئەحمەد شاه مەسعود ب خوە ئامادەی ڕێوڕەسمێن ڤەشارتنا وان ببوو. وی ب خوە دوعاییێن عەفوکرن و ژێبرنا گونەهان بۆ کرن. کچا من لەیلا، برایێن تە**

هند د زیرەك و چاڤنەترس بوون تا وی ڕادەی شێرێ پانجشێرێ، فەرماندە مەسعود شاهـ، ب خوە هات و چاڤدێریا ڕێوڕەسمێن ڤەشارتنا وان کر."

دایکا وێ کەفتە سەر پشتێ و لەیلایێ ژی سەرێ خوە دانا سەر سینگێ وێ، دایکێ ب دەنگەکێ گران دگوت: "هندەك جاران ئەز گوهێ خوە ددەمە چك چکا میلێ دەمژمێرێ، ئەز هزرا خوە د هەموو وان چرکە، خولەك، دەمژمێر، ڕۆژ، حەفتی و سالان دا دکەم یێن د ژیانا من دا ماین. دەمێ ئەز دزانم ئەڤی ماوەیێ هەموویێ بێی وان دێ بورینم، یەکسەر بێهنا من تەنگ دبیت خو دێ بێژی کەسەك یێ پێن خوە ددانتە سەر سینگێ من. لەیلا، ئەز هەست ب لاوازیەکا مەزن دکەم، گەلەك یا مەزن."

لەیلایێ ژ نیڤا دلێ خوە گوت: "خوزی دادێ ئەز شیابام تشتەکی بۆ تە بکەم."

لەیلایێ ئەڤ ئاخفتنە ب دەنگەکێ نزم و تونەکا سارِ ڤە گوت، هۆسا ب شێوەیەکێ سادە بوو هەروەکو کا چەوا کەسەکێ بیانی دلەکی ل بەر دلێ وێ بدەت. دایکا وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوت: "تو کچەکا گەلەك باشی، بەس مخابن ئەز دایکەکا باش نەبووم بۆ تە."

"وەنەبێژە دادێ."

"بەلێ وەیە، ئەز ڤێ چەندێ باش دزانم و داخوازا لێبورینێ ژ تە دکەم خوشتڤیا من."

"دادێ."

"مممم.."

لەیلا ڕوونشت و سەحکرە دایکا خوە، چەندین داڤێن سپی یێن کەفتینە دناڤ پرچا وێ دا. لەیلا ترسیا ژبەرکو دایکا وێ گەلەك یا لاواز و بێتاقەت بووی. ئەو هەموو گاڤان ژنەکا بەرکەفتی و ب خوە ڤە بوو، لێ نوکە لامێن وێ یێن تێکچووین و لەشێ وێ یێ لاواز بووی و سەنگا وێ یا هاتیە خوارێ و ئەو بلوزێ ل بەر وێ ژی نوکە یێ ب سەر ملێن وێ دا هاتیە خوارێ و ڤالاهیەکا مەزن دناڤبەرا مل و حەفکا وێ دا یا دیاربووی. چەندین جاران وێ ب چاڤێن خوە دیت دەمێ گۆستیرکا وێ ژ تبلا وێ دبووی.

" من دڤێت پرسیارا تشتەکی ژ تە بکەم."

"چ تشت؟"

لەیلایێ گوت: " خو تە ل بەر نینە..."

بەری هینگێ لەیلایێ ئەڤ بابەتە دگەل حەسینایێ ڤەکربوو، ل دووڤ ڕاسپاردەیێن حەسینایێ، وێ ڤالکا حەبکێن ئەسپرین ڤالاڤ کربوو و کێرك و کەنجالێن د لێنانگەهێ ڤە و شووشکێن بژارتنێ یێن تیژ ل بن قەنەپێ ڤەشارتبوون.

حەسینایێ وەریسکەك ژی دناڤ باخچەیێ وان دا دیتبوو لەوڕا هەر یەکسەر چوو ڤەشارت. دەمێ بابێ لەیلایێ دەفکێن خوە یێن ڕیهتراشینێ نەدیتین، لەیلایێ بەحسێ مەترسیا وان بۆ کر. بابێ وێ ل سەر لێڤەکا قەنەپێ ڕوونشت و دەستێن خوە دانانە سەر چوکێن خوە. لەیلایێ هزردکر بابێ وێ دێ دلەکی ل بەر دلێ وێ دەت، لێ بابێ وێ چ پەیڤ نەگوتن ژ بلی ئاورینەکا ب ترس و خەمگین.

"تە ل بەر نینە چ تشتان ل خوە بکەی، مانە دادێ، ئەز گەلەك یا دترسم."

دایکا وێ گوت: "کچا من، تە ڕاستی بڤێت ئەو شەڤا ئەو دەنگوباسێ نەخوش گەهشتیە من، من هزرا هندێ کر، ما دێ بوچی ل تە ڤەشێرم. پشتی هینگێ ژی من دوو سێ جارەکان هزر تێدا کر. لێ نەخێر ئەز ڤێ چەندێ ناکەم، دلگران نەبە. لەیلا من دڤێت وێ ڕۆژێ ب چاڤێن خوە ببینم یاکو خەونا کوڕێن من تێدا بجه دهێت. ئەو ڕۆژا سوڤییەتی ب شەرمزاری ڤە ژ ڤێرێ دڕەڤن، ئەو ڕۆژا چەکدار ب سەرکەفتی ڤە دهێنە دناڤ کابولێ دا. من دڤێت ب چاڤێن خوە وێ ڕۆژێ ببینم. ئەو ڕۆژا ئەڤغانستان ئازاد دبیت، وێ ڕۆژێ کوڕێن من ژی ب ڕێکا چاڤێن من دێ ڤێ سەرکەفتنێ بینن."

دەمەکێ کێم پێڤە چوو دایکا وێ د خەو چوو. لەیلا دگەل دوو هەستێن هەڤدژ هێلا هشیار. پشت ڕاستبوو کو دایکا وێ یا ڕژدە بمینتە ساخ و هزرا خوە کوشتنێ نەکەت، لێ یا خەمگین ژی بوو کو دایکا وێ نە ژبەر وێ دێ ل سەر ژیانا خوە یا بەردەوام بیت. وێ دزانی کو وێ چ جاران ئەو جهـ دناڤ دلێ دایکا خوە دا نابیت یێ برایێن وێ هەی، دلێ دایکا وێ وەکو کنارێ دەریایەکێ خیزی یێ شل و خاڤ بوو، ب ڕەنگەکی شوون پێن لەیلایێ ل سەر نەمایە ژبەرکو خەم و نەخوشییێن کوڕێن وێ وەکو شەپولەکێ بەردەوام دهاتنە سەر ڤی کناری و هەمموو تشت ژێدبرن.

# 21

شۆفێرێ تەکسیێ ترۆمبێلا خوە دا لایەکێ جادێ داکو رێکێ ل هەمبەر کاروانێ درێژ یێ ترۆمبێلێن جیپ و زرییپوشێن لەشکەرێ سوڤییەتێ ڤەکەت. تارق ل کوشنێ دەستپێکێ یێ رۆونشتی بوو، خوە د جامەیا شۆفێری دا ئینا دەرێ و دەستێ خوە بلند کر و  گوت: "پاژالمیا، پاژالامتا"

یەك ژ ترۆمبێلێن جیپ هۆرنەك لێدا و تارقی ژی ب کەیفخوشی فیتکەك بۆ ڤەدا و ب دێمەکێ ڤەکری و گەش گوت: "هەوە ئەڤ هەموو چەکێن جوان هەنە، ئەو ترۆمبێلێن جیپ یێن بالکێش و گرانبها، ئەڤ لەشکەرێ ب هێز، مانە مخابنە هوون ل بەرامبەر کومەکا جوتیارێن چەکدار یێن ب تنێ تڤەنگ د دەستان دا، بشکێن و برەڤن."

پشتی ئەو کاروانێ ترۆمبێلێن لەشکەری بوری، دووبارە شۆفێری خوە دا سەر جادەیێ و ل سەر چوونا خوە بەردەوام بوو.

لەیلایێ پرسیار کر: "ئەرێ هێشتا گەلەك مایە ئەم بگەهینە بنەجهێ؟"

شۆفێری بەسڤ دا: "نێزیکی دەمژمێرەکێ یا مای لێ ب مەرجەکی هەکە جارەکا دی چ کاروانێن ترۆمبێلێن لەشکەری نەهێنە د رێکا مەدا و مە گیرو نەکەن."

لەیلا و بابێ خوە و تارق بەرەڤ گەشتەکا یەك رۆژی دچوون، هەرچەندە حەسینایێ ژی گەلەك حەز دکر دگەل وان بچیت لێ بابێ وێ دەستووری نەدابوویێ. ئەڤ گەشتان وان ژ لایێ بابێ لەیلایێ ڤە هاتبوو پێشنیارکرن، سەرەرای کو مووچێ وی یێ کێم بوو و ب خورتی تێرا خەرجیێن مالا وی دکر، لێ بۆ وێ رۆژێ وی تەکسیەك ب کرێ گرتبوو. بەری هینگێ وی نەگوتبوو لەیلایێ ژی کا مەرەم ژ ئەنجامدانا ڤێ گەشتێ چیە ب تنێ ئەو نەبیت کو پەیوەندی ب خواندنا وێ ڤە هەیە.

وان دەمژمێر پێنجی سپێدێ دابوو رێ. ب رێکێ ڤە لەیلایێ د پەنجەرکێ دا تەماشەی دیمەنێن ژ دەرڤە دکر، ئەو دیمەنێن کو بەردەوام دهاتنە گوهۆرین، هەر ژ

گوپیتکێن بەفرێ ل سەرێ چیایان بۆ بیابانێن هشك و پاشی بۆ گەلی و دولێ و نهالێ و کەڤرێن بەران یێن ل بەر هەتاڤێ سۆتین.

ب درێژاهیا رێکێ و ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی، وێ چەندین خانییێن تەقنێ یێن سەربانێن ب پیشی هاتینە نخافتن و بیستانێن گەنمی ددیتن. هەردیسان لەیلایێ خیڤەتێن کوچەران و پەیکەرێن دەبابەیێن سوڤییەتی یێت سۆتی و فرۆکەیێن هەلیکوپتەر یێن تێکچووی ل چەندین دەڤەران دیتن. لەیلایێ د دلێ خوە دا دگوت ئەرێ ئەڤە ئەو ئەڤغانستانە یا ئەحمەد و نوری خوە بۆ دایە کوشتن. ئەڤە ئەو دەڤەر بوون یێن شەڕ تێدا دهاتیە کرن نەك ل کابولێ چونکی باژێرێ کابول ب تەمامی یێ ئارام بوو.

ل کابولێ، ئەگەر هندەك جاران دەنگێ تەلقەیان نەهاتبا گوهلێبوون و سەربازێن سوڤییەتێ ل سەر جادەیان ب ئازادی پیاسە نەکربان و جگارە نەکێشابان و بەردەوام ترۆمبێلێن خوە یێن جێپ دناڤ باژێری دا نەئینابانە و بربان و هۆڕن لێنەڤەدابان، ل وی دەمی کەسێ باوەر نەدکر ژ دەرڤەی باژێرێ شەڕ دهێتە کرن و ئەگەر کەسەکی وەگوتبایە ژی خەلك دا هزرکەن ئەو یێ گوتگوتکان بەلاڤ دکەت.

دەم نێزیکی نیڤرو بوو، پشتی ئەو ژ دوو خالێن دی یێن پشکنینێ دەربازبووین، گەهشتنە گەلیەکی. لەیلایێ خوە ل سەر کوشنی خوار کر و تەماشەی بابێ خوە دکر ئەوێ دەستێ خوە بۆ زنجیرەکا دیوارێن دوور درێژ دکر کو هندەك شوونوارێن دێرین بوون، ژبەر تیشکا رۆژێ یا دژوار، ژ دوور ڤە ب رەنگێ سۆر خویا دکرن.

شۆفێرێ ترۆمبێلێ گوت: "دبێژنە ڤی باژێرێ سۆر، باژێرێ زوحاکی. بەری نوکە کەلهەکا مەزن بوو بەری پتر ژ نەهـ سەد سالان بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ ڤی گەلی و دژی هێرشێن داگیرکەران هاتبوو دروستکرن. ل سەدێ سێزدێ زاینی نەڤیێ جەنگیزخانی هێرشەك ئینابوو سەر ڤێ کەلهێ لێ هێرشا وی بسەرنەکەفت و ئەو هاتە کوشتن، لێ پشتی هینگێ ئەڤ کەلهە ژ لایێ جەنگیزخانی ب خوە ڤە هاتە وێرانکرن."

شۆفێری دوماهیك فرێ ل جگارەیا خوە دا و قوپکێ وێ د پەنجەرکا ترۆمبێلێ ڕا هاڤێت و ل سەر سحبەتا خوە بەردەم بوو: "هەڤالێن من یێن هێژا، ئاها ئەڤ چەندە سەرهاتیا وەلاتێ مەیە. داگیرکەر ل دووڤ داگیرکەری یێن هاتینە ڤی وەلاتی، هەر بگرە ژ مەقدونی و ساسانی و عەرەب و مەغول و نوکە ژی سوڤییەت. لێ ئەم وەکو ڤان دیوارایینە،

ڕاسته ئەو یێن وێران بووین و چ تشتێ جوان تێدا نەمایه لێ هەتا نوکه ب سەربلندی دڕاوەستیاینه. مانه هۆسایه گەلی برادەران."

بابێ لەیلایێ گوت: "بەلێ ڕاسته، تو ڕاست دبێژی."

***

پشتی بورینا نیف دەمژمێرێ ترۆمبێل ڕاوەستیا.

بابێ لەیلایێ گوت: "نوکه وەرنه ژ دەرڤه، هوون هەردوو وەرنه ژ دەرڤه و تەماشەی ڤان دیمەنان بکەن."

ل دووڤ دا بابێ وێ دەستێ خوه درێژ کره جهەکی و گوتێ تەماشەی وێرێ بکەن.

دەڤێ تارڤی و لەیلایێ ژ کەیفان دا بەش بوو، وان زانی ئەگەر بۆ ماوەیێ سەد سالێن دی ژی بژین، ئەو تشتەکێ هۆسا یێ سەیر نابینن. وان دوو پەیکەرێن هەره مەزن یێن بودای دیتن کو گەلەك بلندتربوون ژ وان هەموو پەیکەرێن بەری نوکه وان د وێنەیان دا دیتین یان قەبارەیێ وان دئینایه پێشچاڤێن خوه. ئەڤ هەردوو پەیکەره ل سەر کەڤرەکێ مەزن و ل بەر هەتافێ هاتبوونه نکراندن* و بەرێ وان ل لەیلایێ وان بوو.

لەیلایێ دئینا پێشچاڤێن خوه کو بەری دوو هزار سالان ژی ئەڤ پەیکەره هەر ل ڤێرێ بوون و بەرێ وان ل وان کاروانیان بوو یێن د "ڕێکا حەریری" دناڤ ڤی گەلی ڕا دبورین. ل هەردوو لایێن پەیکەران ژی ب هزارەها شکەفت هاتبوونه کولین.

تارڤی گوت: "ل بەرامبەری ڤان پەیکەران، ئەز گەلەك بچووك خویا دکەم." بابێ لەیلایێ پێ کره و گوتێ: "هوون حەز دکەن بچینه سەرێ پەیکەران؟" لەیلایێ ب مەندەهوشی ڤه گوت: "چەوا؟ بۆ سەرێن پەیکەران؟ ئەم دشێن بچین؟"

بابێ وێ ب کەنی ڤه دەستێ وان گرت و گوت: "بەلێ دا بچین."

***

سەرکەفتنا چیایان بۆ تارڤی گەلەك یا ب زەحمەت بوو، ژبەر هندێ وی دەستەکێ لەیلایێ و دەستەکێ بابێ وێ گرتبوون و پێکڤه ل سەر هندەك دەرەجکێن خواروڤیچ و زراڤ ڕا سەردکەفتن. ب درێژاهیا ڕێکێ وان گەلەك شکەفتێن تاڕی و تونێل دیتن کو ژ هەموو لایان ڤه ل دەوروبەری پەیکەران بوون.

---

* حەفرکرن

بابێ لەیلایێ گوت: "وەختێ هوون پێن خوە ددانە سەر ئەردی، بلا هەوە ئاگەهـ ژ خوە هەبیت، چونکی ئەڤ ئەردە نە جهێ باوەرییێ یە."

هەر یەکسەر ڤێ ئاخفتنا دناڤ وی جهێ تارِی دا دەنگ ڤەدا. ل هندەك جهان، پێسترك بەرەڤ ڤالاهیێن پەیکەرێن بودای دا درێژ دبوون.

"گەلی زارۆکان دەمێ هوون ل سەر پێسترکێ رِا دبورن تەماشەی خوارێ نەکەن، بلا بەرێ هەوە ل پێشیا هەوە ب تنێ بیت."

دەمێ ئەو ب سەر چیای دکەفتین، بابێ لەیلایێ گوت: "ل سەردەمەکی، دەڤەرا "بامیان" جهێ پەرستنا دوکەفتییێن بودای بوو، جهەکێ پێشکەفتی و ڤەرەبالغ بوو هەتا ل چەرخێ نەهێ زاینی ژ لایێ عەرەبان ڤە هاتیە داگیرکرن. ئەڤ ژێهەلی و کەڤرێن خیزی ل سەر دەمەکی جهێ ڤەحەویانا رِەبەنێن بودی بوون کو وەکو شکەفتان لێکربوون و بۆ نڤستنا خوە و بێهنڤەدانا وان مێهڤانان بکاردئینان یێن ڤەستا ڤی جهی دکری. ل سەر دەمەکی، نێزیکی پێنج هزار رِەبەنێن دیندار دناڤ ڤان شکەفتان دا دژیان."

دەمێ ئەو گەهشتینە سەری، بێهنا تارِڤی چك بوو، هەردیسان بێهنا بابێ لەیلایێ ژی تەنگ بوو، لێ چاڤێن وان ژبەر دیتنا هندەك دیمەنێن بالکێش حێبەتی مان. بابێ وێ ب دەستمالەکێ خوها ل ناڤچاڤێن خوە پاقژکر و گوت: "نوکە ئەم گەهشتینە سەرێ وی، ل وێرێ جهەك هەیە ئەم دشێن هەموو دیمەنێ گەلی ببینین."

ئەو هەرسێ بەرەڤ وی جهی چوون، هەرسێ ب رِەخ یەك ڤە رِاوەستیان و بابێ لەیلایێ ل ناڤەرِاستێ بوو پێکڤە تەماشەیی دیمەنێن بالکێش و جوان یێن وی گەلی دکر.

لەیلایێ گوت: "سەحکەنە وێراهە، چەندا جوانە."

بابێ وێ پێ کرە کەنی.

ل خوارێ، رِەز و بیستانان وەکو فەرشەکێ کەسك گەلیێ بامیان نخافتبوو، بابێ وێ گوت ئەڤە هەموو ئەو گەنمێ زڤستانێ و فلفلك و پتاتن. ل دەوروبەری وان رِەزان ژی دارێن سپینداران هەبوون و ل هەردوو لایێن وان ژی جوکێن ئاڤێ هەبوون یێن دچوونە دناڤ رِەزان دا و بۆ ئاڤدانێ دهاتنە بکارئینان. ل سەر وان جوکان، هندەك جهێن پەحن هەبوون کو د تایبەت بوون ژ بۆ ژنان داکو بالاڤێن خوە ل سەر بکەن و جلوبەرگان ل سەر بشون. ل

دووڤ دا بابێ لەیلایێ دەستێ خوە بۆ زەڤیێن برنجی و جەهی درێژ کر یێ ل وان یێن هاتینە چاندن.

ئەو دەمێ سالێ، وەرزێ پایزێ بوو، لەیلایێ دیت کو خەلك ل جلکێن ڕەنگاوڕەنگ ڤە ل سەر بانێن مالێن خوە مژوولی هشککرن و بەلاڤکرنا وان بەرهەمان بوون یێن وان بەری هینگێ چنین داکو ل بەر هەتاڤێ هشك ببن.

ل هەردوو لایێن جادەیا سەرەکی ژی دا، کو دناڤ کولان و ئاڤاهیێن بلند ڕا دەرباز دبوو، دارێن سپینداران هاتبوونە چاندن. و ل لایەکێ جادێ ژی کومەکا دکان و چایخانە و سەرتڕاش هەبوون. ل پشت گوندی ژی، و ل پشت ڕوویبار و جوکێن ئاڤێ، لەیلایێ هندەك گرکێن نرم و ڕەنگ قەهوای یێ تاڕی دیتن. ل پشت ڤان دیمەنان هەموویان ژی، هەروەکو ل پشت هەموو تشتێن دی یێن ئەڤغانستانێ، وێ گوپیتکا چیایێن "هیند و کوش" دیتن کو ب بەفرێ هاتبوونە نخافتن. ئەسمانێ ل هنداڤی وان ژی یێ شین و ساهی و بێ عەور بوو.

لەیلایێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوت: "ئەڤ جهە گەلەك یێ بێدەنگە."

وێ ئەڤ ئاخفتنە گوت، چونکی وێ ژ دوور ڤە گەلەك هەسپ و کەرێن پەزی ددیتن، لێ گوهـ ل دەنگێ حرڕێن و بەع بەعا وان نەبوو.

بابێ وێ گوت: "ئەڤ تشتەیە یێ هەموو گاڤان ڤی جهی دئینتە بیرا من، ئەو ژی بێدەنگیا ڤی جهی یە. زێدەباری وێ ئارامیا ئەڤ بێدەنگیە ددەتە مە. من دڤیا هوون ژی د ڤێ ئەزمونێ دا ببورن، هەردیسان من دڤیا شوونوارێن دێرین یێن وەلاتێ مە ژی نیشا هەوە بدەم داکو هوون ل سەر ڕابردوویێ وی یێ زەنگین د ئاگەهدار بن و شانازیێ پێ ببەن. گەلی زارۆکان، هندەك تشت هەنە هوون دشێن ژ من فێرببن و هندەکێن دی ژی ل دەمێ خواندنا پەرتووکان دێ فێربن، لێ گەلەك تشت هەنە ژی پێدڤیە هوون ب چاڤێن خوە ببینن و هەست پێ بکەن وەکو ڤان شوونواران."

تارڤی گوت: "سەحکەنێ."

وی بازەك دیت دەمێ ل سەر ئەسمانێ بلندێ گوندی ڕا دفڕی.

پاشی لەیلایێ پرسیار کر: "باب، ئەرێ تە جارەکێ دایکا من ژی ئینایە ڤێرێ؟"

"ئوهـ، بەلێ چ پێنەڤێت، گەلەك جاران من ئەو یا ئینایە ڤێرێ. بەری هەردوو کورێن من بهێنە سەر دنیایێ و پشتی هینگێ ژی گەلەك جاران من یا ئینایە ڤێرێ. ل وی

دەمی ئەو بەختەوەرترین کەس بوو من د ژیانا خوە دا دیتی و پتر ژ هەموویان حەز ژ ژیانێ دکر."

پاشی تشتەك هاتە بیرا وی و کەنیا وی ئینا، گوت: "دایکا تە گەلەك جوان دکرە کەنی، ئەز بۆ تە سووند دخوم کو ژبەر پێکەنینا وێ یا شیرین من ئەو بۆ خوە خواست. پێکەنینا وێ خو ژ نیڤا دلێ وێ دەردکەفت و کەسێ بەرامبەر نەدشیا وێ ڕابگریت."

ل وی دەمی، پێلەکا دلوڤانی و ڤیانێ ب سەر گیانێ لەیلایێ دا هات. ئێدی ژ وێ ڕۆژێ و وێ ڤە هەموو گاڤان دێ ب ڤی شێوەی بیریا بابێ خوە کەت: بیرهاتنێن وی دگەل دایکا وێ، چوکێن خوە دانابوونە سەر بەرەکی و هەردوو دەستێن خوە ژی دانابوونە بن ئەرزنکا خوە، پرچا وی دگەل بای بلند دفری و مژیلانکێن وی ژبەر هەتاڤێ زوو دکەفتنە سەر یەك.

تارڤی گوت: "ئەز دێ چم سەحکەمە هندەك ژ ڤان شکەفتان."

بابێ لەیلایێ گوت: "بلا هەرە بەس هشیاری خوە بی."

"باشە کاکە جان ئەز دێ یێ هشیاربم."

دەنگێ ڤان گوتنێن تارڤی ژی ل وی جهی دەنگڤەدا.

ل خوارێ، چاڤێ لەیلایێ ب سێ زەلامان کەفت کو یێ گەل هەڤدوو دئاخفن و چێلەك ژی یا ب ڕەخ وان ڤە و یا ب پەرچانی ڤە گرێدایە. ل دەروبەری وان ژی کومەکا داران هەبوون کو ڕەنگێ بەلگێن وان هێدی هێدی دهاتە گوهۆڕین بۆ ڕەنگێن زەر و پرتەقالی و سۆری.

بابێ وێ گوت: "ئەز گەلەك یێ ژ کورێن خوە ژی خەریب بوویم، تو ڤێ چەندێ باش دزانی."

دگەل گوتنا ڤان پەیڤان، چاڤێن بابێ وی تژی رۆندك بوون و ئەرزنکا وی لڤلڤی.

"ڕەنگە ئەز نە... لێ دایکا تە، خوشی و نەخوشیێن وێ گەهشتینە دوماهیك توخیب و نەشێت خوە یەك ژ ڤان هەستان بڤەشێریت، قەت نەشێت وەبکەت. لێ ئەز باوەرم پیچەکێ ئەز ژ وێ یێ جودامە، من بزاڤ دکر باشتر بم لێ ژدەستدانا هەردوو کوران ئەز ب یەکجاری ژناڤبرم. چ ڕۆژ نینن ئەز بیریا وان نەکەم. لەیلا گەلەك یا ب زەحمەتە، گەلەك یا ب زەحمەتە وان ژبیر بکەم."

پاشی وی ب تبلێن دەستێن خوە، چاڤێن خوە پەرخاندن و دەمێ دڤیای دووبارە باخڤیت، دەنگێ وی کەفت و نەشیا باخڤیت. ئەزمانێ وی ما ل سەر ددانێن وی، پیچەکێ خوە گرت و پاشی بێهنەکا کوور هەلکێشا و دووبارە تەماشەی لەیلایێ کر و گوت: "سەرەڕای ڤان نەخوشیان هەموویان، ئەز یێ کەیفخوشم کو من تو یا هەی، هەرۆژ ئەز سوپاسیا خودای دکەم کو تو دایە من، هەموو ڕۆژان. هندەك جاران دەمێ دایکا تە یا بێهن تەنگ و د دژوارترین ڕۆژێن خوە دا دژیت، ئەز هەست پێدکەم من تو ب تنێ یا هەی."

لەیلا پتر نێزیکی وی بوو سەرێ خوە ب سینگێ وی ڤە نا. ب ڕاستی هەستەکێ خوش و سەیر بوو، بەروڤاژی وی هەستی دەمێ سەرێ خوە ددانا سەر سینگێ دایکا خوە چونکی بابێ وێ کێم جاران هەست و سوزێن خوە بۆ وێ دیارکربوون ژبەر هندێ ڤێ جارێ بۆ وێ یا سەیر بوو. بابێ وێ ژی ماچی کرە ب سەرێ وێ ڤە و ژ نیڤا دلێ خوە هەمبێز کر. ئەو بۆ ماوەیەکێ درێژ ب ڤی شێوەی مان و تەماشەی گەلیێ بامیان دکر.

پاشی بابێ وێ گوت: "هەرچەندە ئەز گەلەك حەز ژ ڤی وەلاتی دکەم، لێ هندەك جاران هزرا خوە د هندێ دا دکەم بجهـ بهێلم."

"دێ چیە کیڤە؟"

"هەر جهەکێ کو ب سانەهی مرۆڤ خوە لێ ژبیرڤە ببەت. ئەز دبێژم ل دەستپێکێ بچینە پاکستانێ و سالەکێ یان دوو سالان ل وێرێ بمینین هەتا کو کاغەزێن مە بەرهەڤ دبن و سەفەرێ بکەین."

"باشە و پشتی هینگێ؟"

"پشتی هینگێ؟ کچا من ئەردێ خودای گەلەك یێ مەزن و بەرفرەهە. دبیت بچینە ئەمریکا یان ژی جهەکێ نێزیکی ئاڤێ وەکو کالیفورنیا."

بابێ وێ بۆ دیارکر کو ئەمریکی گەلەك د مەرد و دەستڤەکری نە، بۆ ماوەیەکی دێ جهێ ڤەحەویانێ و خوارنێ بۆ دابین کەن هەتا دشێن بۆ خوە کارەکی ببینن و دکەڤنە سەر پێن خوە.

"کچا من پاشی دێ بۆ خوە شولەکی بینم و د ماوەیێ چەند سالەکان دا دێ پارەیەکێ باش هەلگرم و ل دووڤ دا دێ خوارنگەهەکا خوارنێن ئەڤغانی یا بچووك ڤەکەم. خوارنگەهەکا هند مەزن نە، بەلکو جهەکێ بچووك و دێ هندەك کورسیك و فەرشەیان تێدا

دانین و هندەك وێنەیێن كابولێ ژی ب دیوارێن وێ ڤە هەلاویسین داكو ئەمریكی بهێن و تام بكەنە خوارنێن ئەڤغانی، ژ خوە هەكە دایكا تە ژی هاریكاریا مە بكەت و ئەو خوارنان بەرهەڤ بكەت، ب درێژاهیا وێ جاددێ خەلك دێ ب ڕێز سرایێ گرن."

لەیلایێ ب هویری گوهداریا ڤان سحبەتێن خوش یێن بابێ خوە دكر، بابێ وێ هێشتا ل سەر ئاخفتنا خوە یێ بەردەوام بوو:

"چ پێنەڤێت، دڤێت تو ژی بچیە ڤوتابخانەیێ. تو دزانی كا ئەز چەوا هزرا خوە د پاشەڕۆژا تە دا كەم. دڤێت بەری هەموو تشتان تو ل سەر خواندنا خوە یا بەردەوام بی و بچیە ڤوتابخانا ئامادەیی و پاشی بچیە زانكۆیێ. ئەو ڕۆژێن تە چ وانە یان ئەركێن مال نەبن، ئەگەر تە ڤیا تو دشییێ بهێیە دەڤ من و هاریكاریا مە بكەی، تو دشێی بچیە دەڤ مێهڤانان و بزانی كا ئەو كیژ خوارنێ داخواز دكەن، دولكێن ئاڤێ پڕ بكەی یان هەر كارەكێ دی یێ ب ڤی شێوەی."

بابێ وێ دیسان گوت: "ئەو دشێن ل خوارنگەها خوە ئاهەنگێن جەژنێن ژ دایكبوونان و جەژنا سەرێ سالێ ژی ساز بكەن، تا وی ڕادەی ببیتە جهێ خڕڤەبوونا ئەڤغانیان، وان كەسێن وەكو مە ژبەر شەڕی و نەخوشیان وەلات بجهـ هێلای و قەستا وێرێ كری. ل دوماهیێ ژی پشتی كو خەلك هەموو دچنە مال و ئەو وێرێ پاقژ دكەن، ئەم هەرسێ ب تنێ ل سەر مێزەیەكێ دێ ڕوونە خوارێ و چایێ ڤەخوین، خو هەكە د واستیایی ژی بین، دێ سوپاسیا خودای مەزن كەین كو وی بەختێ مە سپی كری."

بابێ وێ ئاخفتنا خوە ب دوماهی ئینا و بێدەنگ بوو، ئەو هەردوو بێدەنگ بوون چونكی وان دزانی دایكا وان یا ئامادە نینە دگەل وان بچیتە چ جهان. هندی ئەحمەد و نور د ساخ بوون، وێ ب چ ڕەنگان ئەڤغانستان نەدهێلا، نوكە ژی كو ئەو هەردوو یێن شەهید بووین، ڕەڤین ژ ئەڤغانستانێ شەرم و خیانەتەكا مەزنە و ڤوربانیدانا كورێن وان ژی بۆ وەلاتی دێ دبەر ئاڤێ دا چیت.

دەنگێ دایكا وێ د گوهێن وێ دا ڤەددا دەمێ دگوتیە هەڤژینێ خوە: "تو چەوا هزرا خوە د تشتەكێ هۆسا دا دكەی؟ هۆسا دیارە مرنا وان چ ڕامانا خوە ل دەڤ تە نینە. پسمام؟ تشتێ یەكانە یێ نوكە سەبرا من پێ دهێت ئەوە كو ئەز ل سەر وێ ئاخێ بهێم و بچم یا دگەل خوینا كورێن من تێكەل بووی. نەخێر ب چ ڕەنگان ئەز ڤی وەلاتی بجهـ ناهێلم."

لەیلایێ دزانی بابێ وێ ب چ ڕەنگان بێی وێ ژ وەلاتی نادەرکەڤیت، چونکی ئێدی دایکا لەیلایێ نە بۆ وی هەڤژین بوو نە بۆ لەیلایێ دایك بوو. بابێ وێ ژی ل سەر خاترا وێ دێ ڤان هزروبیران ژ سەرێ خوە ئینتە دەرێ هەروەکو کا چەوا ئەو وی هوورکێ ئاری ژ سەر جلکێن خوە لاددەت دەمێ ژ سەر کاری دزڤڕیتە مال. ب ڤی ڕەنگی، پێدڤی بوو ئەو دناڤ وەلاتی دا بمینن، هەتا دوماهیا شەڕی ژی دڤێت هەر بمینن و پشتی شەڕ ب دوماهی ژی دهێت هەر دێ مینە ل وەلاتێ خوە و هزرا دەرکەفتنێ ناکەن.

بیرا لەیلایێ دهێت دەمێ جارەکێ دایکا وێ گوتیە بابێ وێ کو وێ یا شوو ب زەلاَمەکی کری بیروبارەوەێن وی هەمموو گاڤان وەکو یەك نینن و د جێگیر نینن. دایکا وێ تێنەدگەهشت کا بوچی هەتا نوکە وێ هەست ب هندێ نەکریە ئەگەر جارەکێ ئەو تەماشەی خۆدیکێ بکەت دێ زانیت کو تشتێ یەکانە و پشتڕاست و نەگوهارتنی د ژیانا وی دا ئەوە کو هەمموو گاڤان یێ ل پشت وێ.

***

پشتی وان بۆ خوارنا نیڤرۆ نان و هێکێن کەلاندی و پتات خوارین، تارق چوو بن سیبەرا دارەکا ل سەر ڕووباری چونکی خەوا وی دهات و دڤیا پیچەکێ خوە درێژ بکەت. تارقی چاکیتێ خوە کرە بالیفك و دانا بن سەرێ خوە و هەردوو دەستێن خوە ژی دانانە سەر سینگێ خوە و نڤست. شۆفێرێ تەکسیێ ژی چووبوو ناڤ گوندی داکو هندەك فستەڤان بکڕیت.

بابێ لەیلایێ ل بن دارەکێ ڕوونشت و کتێبەك ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و دەست ب خواندنا وێ کر. لەیلایێ دزانی کا ئەو کتێب ل سەر کیژ بابەتی یە چونکی بەری هینگێ بابێ وێ هندەك بۆ خواند بوو، وێ ڕۆمانێ بەحسێ چیرۆکا پیرەمێرەکی دکر کو ناڤێ وی "سانتیاگو" بوو. کارێ وی نێچیرکرنا ماسیان بوو وی بۆ خوە ماسیەکا مەزن نێچیرکربوو، لێ هەتا گەهشتیە کنارێ ئاڤێ، ماسیێن قرش هێرش کرە سەر و گوشتێ ماسیا وی یا مەزن هەمموو خوار و ب تنێ هەستیکێن وێ بۆ وی هێلان.

لەیلا ل سەر لێڤا ڕووباری ڕوونشت و پێن خوە کرنە دناڤ ئاڤا تەزی دا و مێشوموران ل سەر سەرێ وێ گڤ گڤ دکر و گولێن ئاڤی ل سەر ڕووێ ئاڤێ سەما دکر و مێشێن هنگڤینی ژی ل دورماندوری وان دفڕین. لەیلایێ تەماشەی پەڕێن وان دکر دەمێ ژ

سەر گولەکێ دفڕینە سەر یەکا دی و تیشکا ڕۆژێ ل سەر دتەیسی. پەڕێن وان د ڕەنگاوڕەنگ بوون.

ل لایێ دی یێ ڕووباری، کومەکا زارۆکێن هەزارەیان ڕیخا چێلان یا هشکبووی ل سەر ئەردی دهەلگرت و دکرە د هندەك کیسکان دا و ددانا سەر پشتێن خوە. ل جهەکێ دی گوهدرێژەك زڕی و دەنگێ خوە یێ نەخوش ب سەر واران دا بەردا.

جارەکا دی لەیلایێ هزرا خوە د خەونا بابێ خوە یا بچووك دا کر. جهەکێ نێزیکی دەریایێ.

دەمێ ئەو ل سەرێ پەیکەرێ بودای. لەیلایێ تشتەك نەگوتبوو بابێ خوە. ژ لایەکی ڤە بۆ لەیلایێ خوش بوو کو ئەو نەشێن باژێرێ کابولێ بجهـ بهێلن و بچنە ژ دەرڤەی وەلاتی. ئەگەر ئەو ژ وەلاتی دەرکەفتبان، دا بەردەوام هزرا خوە د گێتییێ و سەروچاڤێن وی یێن ڕژد دا کەت، هەردیسان دا هزرێن حەسینایێ و تڕانە و سحبەتێن وێ ژی کەت.

لێ یا ژ هەموویێ نەخوشتر هزرا خوە د وان هەر چوار حەفتیان دا دکر دەمێ تارِق چوویە باژێرێ غەزنێ و ئەو مایە ب تنێ. بیرا وێ دهێت کا وەخت چەند یێ درێژ بوو نەدچوو دەمێ تارِق ل دەڤ وێ نەی، کا چەوا هەڤسەنگیا وێ تێك چووبوو بێهنا وێ ل چ جهان نەدهات، ڤێجا پا هەکە ب یەکجاری ژ وێ دوور بکەڤیت دێ چ ڕوودەت.

ڕەنگە تشتەکێ بێ ڕامان بیت کو کەسەکێ دوو برایێن وێ شەهید ببن و خوە گوری ئاخا وەلاتی کربیت، ژ نوو وێ بڤێت ل سەر خاترا کەسەکێ دی بمینتە دناڤ وەلاتی دا. بەلێ دەمێ لەیلایێ ئەو چەندە دئینایە پێشچاڤێن خوە کا چەوا تارِقی ب پێ خوە یێ دەستکر خادیم قووتا، ئێدی چ تشت د ڤێ دنیایێ دا ژ تارِقی بۆ وێ گرنگتر نەبوون.

***

پشتی بورینا شەش هەیڤان و ل نیسانا سالا 1988ێ، ڕۆژەکێ بابێ لەیلایێ ب دەنگوباسەکێ گرنگ ڤە هاتە مال.

بابێ وێ گوت: "ڕێکەفتنامەیەك ل باژێرێ جنێف یا هاتیە ئیمزاکرن، بابەتەکێ فەرمی یە. ل دوماهیێ ئەو دێ ژ وەلاتێ مە بارکەن. د ماوەیێ نەهـ هەیڤێن داهاتی دا، هێزێن سوڤییەتێ ب یەکجاری دێ ئەڤغانستانێ بجهـ هێلن."

ل وی دەمی دایکا وێ ل سەر تەختی یا درێژکری بوو و ملێن خوە د پەرخاندن. دایکا وێ گوت: "خو هەکە ئەو بچن ژی، ڕژێما شیوعی دێ مینیت، نەجیبوللاهـ سەروکێ دەستنیشانکری یە ژ لایێ یەکێتیا سوڤییەتێ ڤە و ئەو ناچیتە چ جهان، ژبەر هندێ شەڕ هەر دێ بەردەوام بیت و ئەڤ چەندە ب دوماهی ناهێت."

بابێ لەیلایێ گوت: " نەجیبووللاهـ هەتا هەتایێ نامینتە ساخ."

"دادێ ئەو دێ ژڤێرێ چن، بەلێ ب ڕاستی ئەو دێ چن."

"ئەگەر هەوە دڤێت ب ڤێ هەلکەفتێ ئاهەنگان بگێرن، هوون د ئازادن، لێ هەتا چەکدار ل کابولێ دەنگوباسێ سەرکەفتنێ نەڕاگەهینن ئەز ئارام نابم و چ هەلکەفتنان ناکەم."

پشتی ڤان گوتنان، جارەکا دی کەفتە سەر جهێن خوە و بەتەنیک کێشا سەر خوە.

# 22

کانوونا دووێ 1989

ل ڕۆژەکا باراناوی ل هەیڤا کانوونا دوێ یا سالا 1989ێ، ئانکو سێ هەیڤان بەری ژیێ لەیلایێ ببیتە یازدە سال، لەیلا دگەل دایك و بابێن خوە و حەسینایێ چوونە سەر جادەیێ ژ بۆ دیتنا دوماهیك کاروانێ سەربازێن یەکێتیا سوڤییەتێ دەمێ وەلاتێ ئەڤغانستانێ بجهـ دهێلن.

خەلکەکێ زێدە ل سەر هەردوو لایێن جادەیا سەرەکی بەرامبەر ئاڤاهیێ یانەیا لەشکەری یا وەزیر ئەکبەر خانی خڕڤەببوون و تەماشەی چوونا سەربازێن سوڤییەتێ دکر. خەلك ل سەر بەفرێ ڕاوەستیان و زێرەڤانیا هێلا دەبابە و لورییێن زرێپوش و ترۆمبێلێن جێپ دکر، هەر ل وی دەمی کو بەفرەکا کێم دباری، ڕۆناهییێن ترۆمبێلێن وان یێن کز ب خورتی دیار دکر.

هندەك جاران دەنگێ تڕانە و ئاخفتنێن کرێت یێن خەلکی بلند دبوون دەمێ دگوتنە سەربازێن سوڤییەتێ، لێ سەربازێن ئەڤغانی نەدهێلا خەلك بڕێژنە سەر جادەیان و تشتان د ترۆمبێلان وەرکەن، جار جار ژی وان هندەك تەلقێن ترساندن و هشیارکرنێ ل سەر سەرێ خەلکی ڕا دهاڤێتن.

دایکا لەیلایێ وێنەیەکێ ئەحمەد و نوری بلند دکر، ئەڤە هەر ئەو وێنەبوو یێ وان ل بن دارا هرمیکا دناڤ مالا خوە دا کێشایی و پشتێن خوە پێکڤە نابوون. گەلەك ژنێن دی ژی وەکو وێ وێنەیێن هەڤژین، کور یان برایێن خوە یێن شەهید ب دەستێن خوە هەلگرتبوون و بلند دکرن.

کەسەکی دەستێن خوە دانانە سەر ملێن لەیلا و حەسینایێ، دەمێ ئەو ل پشت خوە زڤڕی دیت ئەو کەس تارقە. حەسینایێ پرسیار ژێکر: "تە ئەڤ تشتە ژ کیڤە ئینایە؟"

تارِقی گوت: "بۆ ڤێ هەلکەفتێ، من بڕیاردا ئەز جلکەکێ جوان بکەمە بەر خوە."
تارِقی کولاڤەکێ ڕۆسی کربوو سەرێ خوە کو هەردوو گوهێن وی ژی ڤەشارتبوون.
"ئەرێ ئەڤ کولاڤە ژ من دهێت؟"
لەیلایێ ب کەنی ڤە گوت: "ب ڕاستی تو جهێ پێکەنینێی."
"نێ مەرەما من ژی هەر ژبەر هندێ بوو."
"ئەرێ دایك و بابێن تە ژی هاتینە ڤێرە؟"
"نەخێر، ئەو یێن ماینە ل مال."
ل پائیزا بووری، مامێ تارِقی ئەوێ ل باژێرێ غەزنێ، جەڵتەیەکا دلی لێدابوو و ببوو ئەگەرێ مرنا وی، پشتی چەند حەفتیان جەڵتێ ل بابێ وی ژی دا لێ خوشبەختانە نەببوو ئەگەرێ مرنا وی، لێ گەلەك لاواز و بێتاقەت کربوو، بەردەوام یێ دڵتەنگ و خەمگین بوو بۆ چەندین حەفتیان نەدشیا ژ سەر جهێن خوە ڕاببیت.
نوکە کەیفا لەیلایێ گەلەك یا هاتی دەمێ وێ دیتی جارەکا دی تارِق یێ کەیفخوشە، چونکی دەمێ بابێ وی یێ نەساخ، هەتا چەند حەفتیان پشتی هینگێ ژی تارِق هەر یێ خەمگین بوو و بێهنا وی ل چ جهان نەدهات.
ل وی دەمی دایك و بابێن لەیلایێ مژوولی تەماشەکرنا کاروانێ سەربازان بوون، وان هەرسێکا خوە ژێ ڤەدزی و ژ وی جهی دوورکەفتن. تارِق چوو دەڤ دکانەکا باقلك فرۆشان و سێ ماعونێن گەرم یێن باقلکان کڕین و گەلەك ساس پێوەرکر و بۆ وان ئینان، پاشی هەر سێ چوونە بن سیڤاندوکا دکانەکا مەحفیران کو ل وی دەمی یا گرتی بوو، ڕوونشت و دەست ب خوارنا باقلکان کر. ل دووڤ دا حەسینا چوو ل دایك و بابێن لەیلایێ بگەڕیت.
دەمێ ئەو د پاسێ دا و بەرەڤ مال دزڤڕین، تارِق و لەیلا ل پشت دایك و بابێن لەیلایێ ڕوونشتبوون. دایکا وێ ل بەر پەنجەرکێ ڕوونشتبوو تەماشەی دیمەنێن ژ دەرڤە دکر و وێنەیێ کورێن خوە ژی ل بەر سینگێ خوە ڤە نابوو. بابێ وێ ژی ب بێدەنگی ڤە ب ڕەخ وێ ڤە بوو و گوهداریا زەلامەکێ دی د پاسێ دکر دەمێ دگوتی: ڕاستە سوڤییەتێ ڤێرە بجهـ هێلا، لێ ئەو دێ بەردەوام چەکی بۆ نەجیبوللاهی فڕیکەنە کابولێ داکو شەڕ هەر یێ بەردەوام بیت.

"نەجیبوللاھ وەکو بووکەکا لاستیکی یە دناڤ دەستێن وان دا، ئەز شەرتانێ دکەم کو ئەو هەر دێ ب رێکا وی بەردەوامیێ دەنە شەری."

کەسەکی ژ ناڤ رێڤینگێن دناڤ پاسێ دا ب دەنگەکێ بلند دەستخوشی لێکر و گوتێ ئاخفتنا تە راستە.

دایکا وێ بەردەوام دوعا دکرن هەتا دوماهیێ بێهنا وێ تەنگ بووی و ئێدی پەیڤێن دوعایان ب خورتی ژ دەڤێ وێ دهاتنە دەرێ.

***

هەر د وێ رۆژێ دا، پشتی هینگێ لەیلا و تارق چوونە سینەمایێ و تەماشەی فلمەکێ سوڤییەتی یێ کومێدی کر کو ژ بۆ زمانێ فارسی هاتبوو دوبلاژ کرن.

روودانێن فلمی دناڤ پاپۆرەکا بازرگانی دابوون. هاریکارێ کاپتنێ پاپۆرێ ئەڤینداری کچا کاپتنی بوو کو ناڤێ وێ "ئەلیونا" بوو. د دیمەنەکێ فلمی دا، دنیا دبیتە هرۆبا و پێلێن بلند یێن دەریای پاپۆرێ ب کەیفا خوە دئینن و دبەن. یەك ژ دەریاڤانان دکەتە هەوار و دبێژیت: هەوارە، د هەوارا من وەرن. لێ ل دەمێ دوبلاژێ، ل سەر زمانێ کەسەکێ ئەفغانی یێ نەرم و ئارام دبێژیت: "هێژاییێ من، زەحمەت نەبیت دێ شێی وی بەندکی بۆ من هاڤێژی."

تارقی دەمێ ئەڤ دیمەنە دیتی، یەکسەر دەست ب کەنیێ کر، پشتی دەمەکی وان هەردووان کرە کەنی و دەنگێ کەنیا وان ل سەر هۆلێ کەفت. دەمێ یەك ژ وان دواستیا و بێدەنگ دبوو، یێ دی دا دەست ب کەنیێ کەت. کابرایەك کو ل کورسیکا بەری وان یێ روونشتی بوو، ل پشت خوە زڤری و گوتێ خوە بێدەنگ بکەن.

دوماهیا فلمی دیمەنەکێ بالکێش یێ هەڤژینیێ تێدا بوو، دلێ کاپتنی نەرم بوو و رازی بوو کچا خوە ئەلیونایێ بدەتە هاریکارێ خوە، بیك و زاڤایان ب گرنژین ڤە تەماشەی هەڤدوو کر و هەردووان گلاسێن خوە یێن ڤودکایێ لێکدان و ڤەخوارن.

تارقی ب دەنگەکێ نزم گوت: "ئەز قەت ژنێ نائینم."

لەیلایێ ژی گوت: "پا ئەز ژی چ جاران شووناکەم."

لەیلایێ ئەڤ چەندە گوت، لێ بەری کو دوودل و تۆرە ببیت، ژ هندێ دترسیا نەکو ژ خەمێن بێ ئومێدیا خوە ژ ئاخفتنا تارقی، دەنگێ وێ بلند ببیت و خەلکێ دی ئاگەهـ ژێ هەبیت، ژبەر هندێ ئاخفتنا خوە دووبارە کر و گوت: "چ جاران."

"هەڤژینی تشتەکێ بێ رامانە."

"بەلێ، هەموو دەرد و نەخوشی یە."

"هەلبەت هۆسایە، ئەڤ مەزاختنە ب هەروە دهێتە کرن."

"بوچی؟"

"مەزاختنەکا مەزن دێ ل کرینا هندەك جلکان کەی کو بۆ جارەکێ ب تنێ دێ کەیە بەر خوە و ئێدی هەتا هەتایێ بکارنائینی."

"بەلێ راستە."

پاشی تارقی گوت: "ئەگەر هات و من ژن ئینا، دێ بێژمێ ل شوونا جهێ بووك و زاڤای، جهێ سێ کەسان ئامادە بکەن ئەو ژی بۆ من و بووکێ و کەسەکێ دی کو لیلیا تڤەنگا وی ل سەر سەرێ من بیت."

ئەو کابرایێ ل پێشیا وان دووبارە لێ زڤڕی و ناڤچاڤێن خوە لێ کرنە گرێ وەك هێمایەك بۆ خوە بێدەنگکرنێ.

ل سەر شاشەیا هۆلا سینەمایێ، ئەلیونایێ و هەڤژینێ خوە، لێڤێن خوە پێکڤەنان. دەمێ لەیلایێ ئەڤ دیمەنە دیتی، دلێ وێ بلەز خوە قووتا و هەست ب هندێ کر کو خوین بلەز بەرەڤ گوهێن وێ ڤە دچیت. وێ گوهـ ل تارقی بوو کو ئەو ژی بێدەنگ یێ راوەستیایی.

دیمەنێ ماچێ درێژ بوو، لەیلایێ زانی کو نابیت ئەو چ لڤینان یان دەنگان ژ خوە بینیت چونکی وێ هەستپێکر تارق ژی یێ چاڤدێریا وێ دکەت، بەرێ چاڤەکێ وی ل شاشێ بوو چاڤێ دی ل لەیلایێ بوو. لەیلایێ ب هەمان شێوە تەماشەی وی دکر.

لەیلایێ د دلێ خوە دا گوت: "تو بێژی تارقی گوهـ ل وی دەنگێ بای بیت یێ دناڤ کونێن دفنێن من دا بلەز دهێت و دچیت". وێ ب هووری چاڤەرێی هندێ دکر کو لڤینەك ژ تارقی بهێت و نهێنیا وی ئاشکەرا بیت.

ئەرێ ئەو هەستە دێ یا چەوا بیت ئەگەر لەیلا وی ماچی بکەت و هەست ب موویێن سەر لێڤا وی یا سەری بکەت دەمێ ب لێڤێن وێ دکەڤن؟

پاشی تارڤی خوە ل سەر کورسیکا خوە لڤاند و جهێ خوە خوشکر و ب دەنگەکێ نزم گوت: "ئەرێ تو دزانی ل سیبیریا، ئەگەر تو تف بکەی، بەری تفا تە بکەڤیتە سەر ئەردی دێ بیتە بەستی."

هەردووان کرە کەنی، لێ ڤێ جارێ کەنیا وان یا کورت بوو. دەمێ فیلم ب دوماهی هاتی و هەردوو ژ هۆلا سینەمایێ چووینە ژ دەرڤە، کەیفا لەیلایێ گەلەك هات کو دنیا یا بوویە تارِی، چونکی پشتی وێ دیمەنێ ماچیکرنێ، نەدڤیا ل بەر ڕۆناهیێ تەماشەی چاڤێن تارڤی بکەت.

# 23

نیسانا 1992ێ

**سێ سال بورین.**

**د وی ماوەیی دا چەندین جارێن دی جەلْتێ ل بابێ تارِقی دابوو، ئێدی نەدشیا دەستێ خوە یێ چەپێ بلڤلڤینیت و ئاخفتنا وی ژی یا بێ سەروبەر بوو و نەدشیا زوو ب زوو باخڤیت. دەمێ نەخوشیەك بۆ چێبایە ژی گەلەك تۆرِە دبوو. گەلەك جاران ئەڤ چەندە ل دەڤ وی دووبارە دبوو ئێدی کەس د ئاخفتنا وی ژی نەدگەهشت.**

**پێ تارِقی یێ دەستکرد لاواز بوو و نەدشیا باش خزمەتا وی بکەت، ژبەر هندێ چوو رێکخراوا خاچا سۆر یا نیڤدەولەتی و داخوازا پێیەکێ دەستکر یێ نوو کر، لێ ل سەر وی یا پێدڤی بوو بۆ ماوەیی شەش هەیڤان چاڤەرِێی بیت هەتا ئەڤ داخوازیا وی دهێتە بجه ئینان.**

**هەروەکو بەری هینگێ پێشبینی بۆ دکری و ژێ دترِسیای، بابێ حەسینایێ ئەو بەرەڤ باژێرێ "لاهور" بر داکو شوو ب پسمامێ خوە ئەوێ بیست سالان ژ وێ مەزنتر بکەت، ئەو پسمامێ وێ یێ پێشانگەهەکا کرین و فرۆتنا ترِۆمبێلان هەی. ئەو رِۆژا دا سەفەرێ کەن، سپێدێ زوو لەیلا و گێتی چوونە مالا وان داکو بۆ دوماهیك جار خاترا خوە ژێ بخوازن.**

**حەسینایێ گوتە هەڤالێن خوە کو هەر ژ نوکە پسمامێ وێ یا گوتی ئەو دێ چنە ئەلْمانیا چونکی برایێن وی ژی ل وێرێ دژین. رەنگە کاروبارێن وان یێن چوونێ د ماوەیێ سالەکێ دا تەمام ببن و بچنە باژێرێ فرِانکفورت.**

**هەرسێ هەڤالان ژ دل هەڤدوو هەمبێز کر و دەست ب گرییێ کر، ب تایبەت گێتیێ کو قەت رِۆندك ژ چاڤێن وێ زووها نەدبوون. دوماهیك جار لەیلایێ حەسینا دیتی ئەو**

وەخت بوو دەمێ بابێ وێ ب خورتی جهێ وێ کری د کوشنێ دوماهیێ یێ تەکسیێ دا چونکی گەلەك نەفەر تێدابوون.

یەکێتیا  سوڤییەتێ د ماوەیەکێ کێم دا ژناڤچوو و ژێکڤەبوو. بابێ لەیلایێ هەر چەند حەفتیان جارەکێ دا هێتە مال و دەنگوباسێ سەربەخوویا کومارەکا نوو دگەل خوە دئینا: لیتوانیا، ئەستونیا، ئوکراین، ئالایێ سوڤییەتێ ل سەر کریملین ژی هاتە خوارێ و کومارا ڕوسیا ژ دایکبوو.

ل باژێرێ کابولێ ژی، نەجیبوللاهی تەکنیك و بیروباوەرێن خوە گوهۆڕین و دڤیا خوە وەکو کەسەکێ موسڵمان  یێ دلسۆز بدەتە دیارکرن. بابێ لەیلایێ گوت: "ئەو گەلەك گیروبوو، ژ نوو مفایێ وی ناکەت، نابیت تو ڕۆژەکێ سەروکێ دەزگەهێ هەوالگیری KHAD بی ل ڕۆژا پاشتر بچیە مزگەفتێ و نڤێژێ دگەل هندەك کەسان بکەی کو تە کەسوکارێن وان ئەشکەنجەدابن و کوشت بن."

دەمێ نەجیبوللاهی هەستپێکری ئێدی ژ هەموو لایان ڤە ئەو یێ هاتیە دوورپێچکرن و چ د دەستان دا نەمایە، بزاڤ کر ڕێکەفتنێ دگەل چەکدارێن ئەفغانی بکەت، لێ ئەو ب ڤێ چەندێ ڕازی نەبوون.

دایکا لەیلایێ دناڤ جهێن خوە دا یا درێژ کری بوو، گوت: "یا خودای مەزن، چ تشتێ باشە تو وێ بۆ چەکداران بکەی."

هەرشەڤ دایکا وێ دوعایێن خێری و باشیێ بۆ ڤان چەکداران دکرن و چاڤەڕێی سەرکەفتنا وان بوو، هەردیسان چاڤەڕێی وێ ڕۆژێ بوو یا دوژمنێن کورێن وێ ژناڤ دچن.

★★★

و ل دوماهیێ ئەو ڕۆژ یا دایکا لەیلایێ چاڤەڕێی وێ دکر. ل هەیڤا نیسانا سالا 1992، ل وێ سالا کو ژیێ لەیلایێ بووینە چواردە سال، نەجیبوولاهی خوە ڕادەستی بارەگایێ نەتەوەییێن یەکگرتی ل نێزیکی کوچکا دارولامان کر و وەك پەنابەرەکێ سیاسی هاتە وەرگرتن.

ل دوماهیێ شەڕ و پێکدادانان ب دوماهی هات. ئەو ڕژێمێن شیوعی یێن هەر ژ شەڤا ژ دایکبوونا لەیلایێ دەستهەلات ل ئەفغانستانێ دکری، شکەستن ئینا و ژناڤچوون. هەڤال و برادەرێن ئەحمەد و نوری یێن دگەل وان شەڕ دکری ب سەرکەفتن. وان چەکداران پشتی

پتر ژ دەھ سالێن قوربانیدان و دوورکەفتن ژ مال و زارۆك و خێزانێن خوە و ژیانا وان یا سەخت دناڤ چیا و خەبات و شەڕکرن ژ پێخەمەت سەربەخوویا ئەڤغانستانێ، ل دوماهیێ ب گوشت و خوین و هەستیکێن خوە یێن ماندی ڤە ڤەگەریانە کابولێ.

دایکا لەیلایێ ناڤێ هەموو وان چەکداران دزانی.

ناڤێ یەك ژ وان "دۆستەم"بوو، فەرماندەیا ئوزبەکی یێ چەلەنگ و ڕێبەرێ تەڤگەڕا "جونبیش- ی- میللی" بوو یێ ب هندێ ناڤدار بوو کو ل سەر چ بۆچونێن جێگیر نەبوو بەلکو بەردەوام بۆچونێن خوە د گوهارتن.

کەسێ ژ وی دژوارتر ژی دگوتنێ "گولبودین حەکمەتیار" کو ئەو ژی ڕێبەرێ کومەلا "حیزب-ی- ئیسلامی" بوو. ئەو ب خوە کەسەکێ پەشتوونی بوو و کولیژا ئەندازیاری ب دوماهی ئینابوو بەری هینگێ ژی قوتابیەکێ "ماوی" کوشتبوو.

کەسەکێ دی ژی ب ناڤێ "ڕەبانی" یێ تاجیکی، ڕێبەرێ تەڤگەڕا "جەماعەت-ی- ئیسلامی"بوو کو ل سەردەمێ پاشایەتیێ ل زانکۆیا کابولێ، ئاینێ ئیسلامێ خواندبوو. "سەیاف" ژی کەسەکێ پەشتوونی یێ دەڤەرا "پاغمان"ێ بوو پەیوەندیەکا باش دگەل عەرەبان هەبوو، ئەو ژی موسلْمان ەکێ چاڤنەترس و ڕێبەرێ تەڤگەڕا "ئیتیحاد-ی- ئیسلامی"بوو.

هەردیسان "عەبدولعەلی مەزاری" ژی ڕێبەرێ تەڤگەڕا "حیزب-ی وەحدەت" بوو، دناڤ هەزاریان دا ب بابێ هەزاری دهاتە نیاسین و ئەو ب خوە کەسەکێ شیعە بوو و پەیوەندیێن باش دگەل ئیرانێ هەبوون.

چ پێنەڤێت، قارەمانێ سەرەکی یێ دایکا لەیلایێ، هەڤپەیمانێ ڕەبانی و فەرماندەیێ تایجیکی یێ زیرەك و چەلەنگ، ئەحمەد شاھ مەسعود" شێرێ پانجشێری" بوو. دایکا وێ وێنەیەکێ وی ب دیوارێ ژوورا خوە ڤە هەلاویستبوو.

مەسعود کەسەکێ بەرکەفتی و جوان بوو، دێمێ وێ یێ گەش و بریێن وی یێن بلند و کولاڤێ وی یێ پاکولی، ئەو دناڤ ئەڤغانیان دا جهێ ڕێزگرتنێ بوو. وێنیەیێن وی ل سەر تابلۆ دیوار و جامخانە و ئالایێن بچووك یێن ب ترۆمبێلان ڤە هاتبوو هەلاویستن.

ل دەڤ دایکا لەیلایێ، ئەڤە ئەو ڕۆژ بوو یا چەندین سالە خەون پێڤە ددیتین و بۆ ماوەیەکێ درێژ چاڤەڕێی هاتنا وێ دکر، ئێدی وێ دوماهی ب خەم و نەخوشییێن خوە ئینا پشتی کو گیانێ کورێن وێ ئارام بووی.

★★★

وێ ڕۆژا نەجیبوللاهی خوە ڕادەستکری، دایکا لەیلایێ ژناڤ جهێن خوە دەرکەفت، خو دابێژی ئەڤە ژنەکا دی یە. بۆ یەکەم جار پشتی پێنج سالان ژ سەر شەهیدبوونا کورێن وێ ئەحمەد و نوری، جلکێن ڕەش ژبەر خوە کرن و کڕاسەکێ کتانی یێ شین کرە بەر خوە کو ب خالێن سپی یێ نەخشاندی بوو.

ل دووڤ دا پەنجەرکێن مالا خوە هەموو ڤەکرن و پاقژ کرن داکو بایێ دناڤ ژووران دا بهێتە گوهۆڕین. پاشی هەموو مال شووشت و پاقژ کر و ل دوماهیێ چوو د سەرشوویێ ڤە و سەرێ خوە شووشت و دەنگێ خوشی و سترانێن وێ بلند دبوو.

"پێدڤیە ئەم ئاهەنگەکا مەزن بدانین."

پاشی وێ لەیلا فڕیکرە مالێن جیرانێن خوە دا بێژیتێ بۆ سوباهی نیڤرو دێ مەعزوماتەکا مەزن دانن و هوون ژی د داخواز کرینە.

دایکا وێ دەمێ چوویە د لێنانگەهێ ڤە، دەستێ خوە هاڤێتە کەمەرا خوە و باش تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر و ب لومەیی ڤە گوت: "کچێ لەیلا ئەڤە تە چ ل لێنانگەهـا من کریە؟ خو تشتەك ل جهێ خوە نەمایە."

دووبارە دەست ب ڕێکخستنا کەلوپەل و ئامانێن دناڤ لێنانگەهێ دا کر هەروەکو دا بێژی ڤێ ژنێ دڤێت جهەکی داگیر بکەت و سەر و ژ نوو ببیتە کابانا بەر مالێ و نوکە دووبارە یا زڤڕیە دناڤ لێنانگەهێ ڤە. لەیلایێ خوە ژ ڕێکا وێ لادا. کەیفخوشی و بەختەوەریا دایکا وێ، هەروەکو تۆڕەبوونا وێ بوو کەس نەدشیا خوە ل بەر بگریت.

دایکا وێ ب کەیفەکا مەزن ڤە دەست ب بەرهەڤکرنا خوارنێ کر: شوڕبا کلاوی، فاسولی دگەل گیاییێن بێهندار، کفتە، مانتو یێن کەلاندی کرنە دناڤ ماستێ نوو دا و نەعناع ب سەر وەرکر. دایکا وێ دەمێ دەستێ خوە هاڤێتیە فەردەیەکێ برنجی داکو ڤەکەت و هندەکێ ژێ بینتە دەرێ، چاڤێ وێ ب لەیلایێ کەفت.

"ها تە بریێن خوە چێکرینە؟"

"پیچەك."

دایکا وێ هندەك برنج کرە دناڤ قازانەکا ڕەش یا مەزن و پڕی ئاڤ دا و ئاگر ل بن هەلکر و دەست ب تێکڤەدانا برنجی کر.

"باشە تارق یێ چەوایە؟"

"بابێ وی یێ نەساخە."

"ما نوکە ژیێ وی بوویە چەند سال؟"

"نزانم، بەس دبیت ژ شێست سالیێ بوری بیت."

"نەخێر، مەرەما من تارق."

"ئاها، ژییٚ‌وی شازدە سالن؟"

"ئەو کورەکێ باشە. مانە؟"

لەیلایێ ملێ خوە هەژاند و گڕنژی.

"هەرچەندە نابیت ئەم نوکە بێژینە وی کور، مانە هۆسایە؟ مادەم ژیێ وی شازدە سالن، ڕامانا وێ ئەوە یێ بوویە زەلاّم، مانە؟"

"دادێ، تە دڤێت چ بێژی؟"

دایکا وێ ب دلەکێ یاقژ کرە کەنی و گوت: "چنە چنە، نێ من دڤیا کو تو ... باشترە هەما ئەز چ نەبێژم."

لەیلایێ زانی دایکا وێ یا ئاخفتنەکێ دئینیت و دبەت بەس نەڤێت یەکسەر بێژیت، ژبەر هندێ لەیلایێ گوت: "دادێ، ئەز دزانم تە دڤێت تشتەکی بێژی، مانە؟"

"باشە."

دایکا لەیلایێ قەپاغکا قازانێ دانا سەر. ژ شێوازێ گوتنا پەیڤا "باشە"، لەیلایێ هەستپێکر بەری هینگێ دایکا وێ یا خوە بۆ گوتنا ئاخفتنەکا تایبەت بەرهەڤ کری، ژبەر هندێ وێ پیچەکێ هەست ب ترسێ کر کا دێ دایکا وێ چ بێژیت.

"دەمێ هێشتا هوون زارۆك و هەوە یاری پێکڤە دکرن، چ ئاریشە تێدا نەبوو، بەروڤاژی تشتەکێ جوان و خوش بوو، لێ نوکە ئەز یا دبینم تو ستیانا (زەخمە) دکەیە بەر خوە."

لەیلا ژ ڤێ گوتنا دایکا خوە مەندەهوش ما.

"تو دشیای بێژیە من کو تو ستیانا دکەیە بەر خوە، من ئەڤ چەندە نەدزانی و نوکە ئەز یا دامای مە ژبەرکو تە نەگوتیە من."

دایکا وێ هەست ب کاریگەریا ئاخفتنێن خوە ل سەر لەیلایێ کر، پاشی بەردەوام بوو و گوت: "هەرچەوا بیت، ڤی بابەتی پەیوەندی ب من و ب ستیانی ڤە نینە، بەلکو بابەتی پەیوەندی ب تە و تارڤی ڤە هەیە. ئەو کورە، هەروەکو تو دزانی، کور گرنگیێ نادەیە سومعەتا خوە؟ لێ پا تو کچی، سومعەتا کچێ نە وەکو یا کوری یە ب تایبەت کچەکا جوان یا وەکو تە، سومعەتا وێ گەلەك یا نازك و هەستیارە، وەکو باڵندەیێ "مینا"یە، هەر گاڤا ژ دەستێن تە فڕی، ئێدی ناڤەگەڕیت."

لەیلا یا کەیفخوش بوو کو جارەکا دی دایکا وێ ساخلەم بوویە ڤە و ڕابوویە سەر پێن خوە، لێ وەك بەرەڤانیکرن ژ خوە گوت: "ئەرێ پا تو و بابێ من وەختێ هوون د ژیێ مەدا، هوون بەردەوام پێکڤە بوون و سوواری دارێن بلند دبوون و دناڤ بیستانی دا پیاسە دکرن."

"ئەم دوتمام و پسمام بووین و پاشی مە داواتا خوە کر، ئەرێ ما ڤی کوری دەستێ تە خواستیە؟"

"بەلێ پا ئەو ژی هەڤالێ منە و چ تشت دناڤبەرا مە دا نینن."

هەرچەندە وێ ب خوە ژی قەناعەت ب ئاخفتنا خوە نەبوو دڤیا ب تنێ بەرەڤانیێ ژ خوە بکەت، لێ داکو پتر گومانێ ل دەڤ دایکا خوە نەهێلیت، گوت: "ئەو وەکو برایێ منە."

لێ بەری سیبەرەك ل سەر ڕوویێ دایکا وێ دروست ببیت و ڕوخسارێ وێ تاڕی ببیت، وێ هەستپێکر کا وێ چ شاشی کریە.

دایکا وێ ب تۆڕەیی ڤە گوت: "ئەو قەت نابیتە برایێ تە. چەوا تو کورێ دارتاشی یێ ب لنگەکی دئینیە ڕێزا برایێن خوە؟ ل ڤێ جیهانێ کەس نابیتە برایێن تە و کەس ناهێتە ڕێزا وان."

"بەلێ من نەگوتیە کو ئەو ل ڕێزا برایێن منە، مەرەما من ئەو نەبوو."

دایکا وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و ددانێن خوە ل سەر یەك تیژ کرن.

"هەرچەوا بیت، من دڤێت بێژمە تە کو ئەگەر تە ئاگەهـ ژ خوە نەبیت، خەلك دێ ئاخفتنا ب دووڤ هەوەڤە نن."

لەیلایێ دڤیا تشتەکی بێژیت، وێ دزانی کو ئاخفتنێن دایکا وێ د بێ بنەما نینن، وێ دزانی کو ئێدی ڕۆژێن یاری و تڕانە و خوشیێ دگەل تارڤی ل سەر جادە و ناڤ کولانێ ب دوماهی هاتن. ل ڤان ڕۆژێن دوماهیێ دەمێ ئەو پێکڤە د بەر خەلکی ڕا دهاتن و چوون، هەستەکێ سەیر ل دەڤ لەیلایێ پەیدابببوو، وێ دزانی خەلك یێ تەماشەی وان دکەن و بەحسێ وان دکەن.

بەری نوکە خەلکی تەماشەی وان نەدکر، ڤێجا چ پێنەڤێت نوکە تشتەك یێ هەی لەوڕا خەلك ب حێبەتی ڤە تەماشەی وان دکەن. ب ڕاستی ژی وێ ژ نیڤا دلێ خوە حەز ژ تارڤی دکر ژبەر هندێ وێ چ چارەییێن دی نەبوون و خوە ل بەر وان هەستێن دلداریێ ب کەسەکا لاواز ددیت.

نوکە نە وەکو بەرێ یە، ژبەرکو دەمێ نوکە ئەو ل دەڤ تارڤی دڕوونتە خوارێ، کومەکا هەستێن سێکسی ل دەڤ وێ پەیدادبن. لەشێ تارڤی یێ ڕیس دهاتە پێش چاڤێن وێ دەمێ تێکەلی لەشێ وێ دبووی. یان ژی دەمێ ب شەڤێ ل سەر تەختێ خوە دنڤستی، تارڤ دهاتە پێشچاڤێن وێ دەمێ ماچی دکریە سینگێ وێ، یان ژی دەمێ لێڤێن خوە ددانتە سەر لێڤێن وێ و دەستێ خوە دکەتە مل و پشت و ڕانێن وێ.

دەمێ لەیلایێ هزرا خوە د ڤان هەستان دا دکری، وێ هەست ب گونەهێ دکر و گەرماتیەکێ هەموو لەشێ وێ دگرت و ژ زکێ وێ دەردکەفت هەتا دگەهشتیە سەروچاڤێن وێ و دێمێ وێ سۆر دبوو. لەیلایێ د دلێ خوە دا دگوت: "نە، دایکا من ڕاست دبێژیت."

د ڕاستی دا، لەیلایێ پێشبینیا هندێ دکر کو هندەك جیرانێن وان، ئەگەر پتریا وان نەبن، بەحسێ وێ و تارڤی ب خڕابی دکر و گوتگوتك ب دووڤە دنان.

لەیلایێ دزانی دەمێ ئەو و تارڨ دگەل یەك، جیرانێن وان پێ دکەنە کەنی و دبن لێڤکان ڕا بەحسێ وان دکر. بۆ نموونە دوهی دەمێ ئەو و تارڨ بەرەڤ سەرێ جادەیا سەرەکی ڤە دچووین، ڕەشیدێ پنیدوز و ژنا وی یا ڕاپێچای، ئانکو مەریەم، ب ڕەخ وانڤە بورین، ڕەشیدی گوت: "تو بێژی ئەڤە لەیل و مەجنوون نەبن!" مەرەما وی ئەو هەردوو عاشقێن بەختڕەش بوون یێن شاعرێ ناڤداری چەرخێ دوازدێ زاینی، نیزامی، داستانەکا عەشقێ ب زمانێ فارسی ل سەر وان نڤیسی کو وەکو کوپیا داستانا ڕۆمیو جولیێتا

شکسپیرێ بوو. لێ بەری هینگێ بابێ وێ گوتبوویێ کو نیزامی ب چوار سەدەیان بەری شکسپیری یا خوە نڤیسابوو.

تشتێ لەیلا پۆسیدە کری ئەو بوو کو وێ هزر دکر دایکا وێ ئەو ماف نینە ڤان ئاخفتنان بێژیتە وێ، ئەگەر بابێ وێ ئەڤ ئاخفتنە گوتبان ل دەڤ وێ دا تشتەکێ ئاسایی بیت، لێ دایکا وێ نابیت ڤێ چەندێ بێژیتە وێ، ژبەرکو ئەو چەند سال بوو دایکا وێ خو د چ تشتان نەدگەهاند بەلکو ب تنێ خوە دناڤ کوژیەکێ مالێ دا شرِ کربوو، قەت هزرا هندێ نەدکر کا لەیلا چ دکەت و چ ناکەت، کێ دبینیت و تێکەلیا کێ دکەت و چەوا هزر دکر.

لەیلایێ هەستپێکر چ جوداهی دناڤبەرا وێ و وان ئامان و قازانکان دا نینە یێن دهێنە پشتگوهـ هاڤێتن و هەردەمێ شول پێ هەبوو ژ نوو بینە دەرێ و خوارنێ تێدا دروست بکەن.

لێ ئەو رِۆژ رِۆژەکا مەزن بوو، بۆ هەموو کەسان رِۆژەکا دیرۆکی و بەختەوەر بوو ژبەر هندێ لەیلایێ نەدڤیا دلێ دایکا خوە بهێلیت و خوە ژێ تۆرِە بکەت ژبەر هندێ گوت: "باشە دادێ ئەز د مەرەما تە گەهشتم."

دایکا وێ گوت: "باشە، ئانکو ئاریشا مە چارەسەر بوو، ئەرێ حەکیم ل کیڤەیە؟ ئاخ بۆ ڤی هەڤژینێ من یێ نازدار."

***

ئەو رِۆژ، رِۆژەکا خوش و هەتاڤ بوون ب راستی ژی رِۆژەکا خوش بوو ژ بۆ گێرِانا ئاهەنگان. زەلاّم دناڤ حەوشێ دا ل سەر کورسیکان رِوونشتبوونە خوارێ و چا ڤەدخوار و ب دەنگەکێ بلند بەحسێ پلانێن چەکداران دکر.

لەیلایێ کورتیا سحبەتێن وان ژ بابێ خوە گوهـ لێبوون: ئەڤغانستان یا بوویە دەولەتا ئیسلامی یا ئەڤغانستانێ کو ژ لایێ تەڤگەرێن جودا جودا یێن چەکداران ل "بیشاور" هاتبوو پێکئینان و شورِایەکا جیهادی یا ئیسلامی دروست کربوو. ئەڤ شورِایە ب سەروکاتیا "سەبغەتوللاهـ موجادیدی" کو کارێ وی چاڤدێریا کاودانێن ئەڤغانستانێ بوو ژ بۆ ماوەیێ دوو هەیڤان.

پشتی وێ شورِایێ، رِێبەریا وەلاتی کەفتە د دەستێ "رەبان"ی دا کو ماوەیێ وی ژی چوار هەیڤ بوون، برِیار بوو د ماوەیێ ڤان هەر شەش هەیڤان دا شورِایەکا بلند یا ب

ڕێڤەبرنێ ب ناڤێ "لویا جیرگا" ژ لایێ ڕیھسپی و شێخان بھێتە پێکئینان و دەولەتەکا دەمکی بۆ ماوەیێ دوو سالان بهێتە پێکئینان هەتاکو زەمینەسازیەکا گونجای دهێتە کرن ژ بۆ هەلبژارتنێن دیموکراتی.

زەلاّمەکی با ل شووشکێن گوشتی یێن ل سەر مەنقەلێ دکر. بابێ لەیلایێ و بابێ تارقی ژی ل بن دارا هرمیکێ ڕوونشتبوون و یاریا شەترەنجێ دکر و هزرا وان هەموو ل سەر ڤێ یاریێ بوو. تارق ژی ب ڕەخ وان ڤە یێ ڕوونشتی بوو تەماشەی یاریا وان دکر و ژلایەکێ دی ڤە گوهێ خوە ددا سحبەتێن سیاسی یێن زەلاّمێن دی.

ژن ژی ل ژوورا مێهڤانان و لێنانگەهێ ڤە خڕڤەببوون، هندەکا زارۆکێن وان یێن ساڤا ل بەر سینگێ وان بوون، هندەك زارۆکێن دی ژی دناڤ دەست و پێن وان دا دکرنە غارێ و یاری دکرن. ل لایەکێ دی یێ وێ ژوورێ، دەنگێ سترانەکا ئەڤینیێ یا هونەرمەند "سەڕاهەنگ"ی ل سەر ڕیکوردەرێ دهات.

لەیلا و گێتی د لێنانگەهێ ڤەبوون و ئاڤاماست دکرە گلاّسان. گێتی وەکو بەری یا شەرمین و ڕژد نەبوو، ئەو چەند هەیڤ بوو ناڤچاڤێن وێ یێن گرێ نەمابوون، ل ڤان ڕۆژان وێ ژی بەردەوام دکرە کەنی و نوکتە و ئاخفتنێن خوش و ب کەنی دگوتن.

لەیلا مابوو گوهشی دەمێ دیتی وێ موویێن سەروچاڤێن خوە یێن حەفاف کرین و پرچا خوە یا مێش کری، ل دوماهیێ لەیلایێ زانی کو وێ ئەڤ چەندە هەموو ژبەر کورەکێ هەژدە سالی یا کری کو عاشقێ گێتیێ بوو ناڤێ وی "سابر" بوو، و دگەل تیما تەپا پێ یا برایێ وێ یێ مەزن گولچی بوو.

گێتیێ گوتبوو لەیلایێ: "ئەو گەلەك جوان دکەتە کەنی، پرچا وی ژی یا ڕەشە."

چ پێنەڤێت کەسێ ب ڤێ پەیوەندیا وان یا دلداریێ نەدزانی. گێتیێ دوو جاران ئەو ب دزیکی ڤە دیتبوو. هەردوو پێکڤە د چایخانەیەکا دووری تاخێن وان بۆ ماوەیێ چارێکەکێ پێکڤە ڕوونشتبوونە خوارێ و چا ڤەخواربوو.

"لەیلا، وی دڤێت ل دەستپێکا وەرزێ هاڤینێ بهێتە خوازگینیێن من. تو باوەر دکەی؟ ئەز بۆ تە سووند دخوم کو ئەز بەردەوام هزرێن وی دکەم."

لەیلایێ پرسیار ژێکر: "ئەرێ دێ چ ل قوتابخانەیێ کەی؟"

گێتیێ سەرێ خوە هەژاند و تەماشەی لەیلایێ کر، هەروەکو وێ دڤیا بێژیتی کو ئەو بەرژەوەندیا خوە دێ باشتر زانیت پشتی دچنە د هێلینا زێرین دا.

حەسینایێ هەموو گاڤان دگوتی دەمێ ژیێ من و گێتیێ دبیتە بیست سال، هەر یەك ژ مە چوار پێنج زاڕۆك دێ هەبن، بەلێ تو لەیلا، تو دێ بۆ مە ڤان هەردوو بێ ئاقلان بیە جهێ شانازیێ. ئەز یا پشتڕاستم تو دێ هەر بیە تشتەك. ڕۆژەك دێ هێت دەمێ لاپەڕێن ڕۆژنەمەیان ڤەددەم، دێ وێنێ تە ل سەر لاپەرێ یەکێ بینم.

گێتی کو ب ڕەخ لەیلایێ ڤە بوو دێمێ وێ یێ پڕی گڕنژین بوو و چوو بوو دناڤ جیهانەکا هزرێن خوش دا و د بەڕا ژی خیار هوور دکرن.

دایکا لەیلایێ ژی ب کڕاسێ خوە یێ هاڤینێ یێ جوان ل جهەکێ نێزیکی وان بوو دگەل وەجمەیا داپیرك و دایکا تاڕقی دا مژوولی سپیکرنا هێکێن کەلاندی بوون. دایکا وێ گوت: "من دڤێت وێنەیەکێ ئەحمەد و نوری بدەمە فەرماندە مەسعودی."

وەجمەیێ سەرێ خوە بلند کر و هۆسا خوە دیارکر کو ب دلەکێ شاد ڤە یا گوهداریا ئاخفتنێن وێ دکەت.

"ئەو ب کەسایەتیا خوە ڤە ل ڕێوڕەسمێن ڤەشارتنا وان ئامادەبوو ل سەر گۆڕێ وان نڤێژ کر. ئەڤ چەندە دێ بیتە نیشانەك ژ بۆ سوپاسیکرنا وی."

دایکا وێ دگەل سپیکرنا هێکەکا دی یا کەلاندی گوت: "من یا زانی ئەو زەلامەکێ خودان ڕێز و ب بهایە و گەلەك ب هووری هزرا خوە د تشتان دا دکەت."

ژن بەردەوام دهاتنە د لێنانگەهێ ڤە و دچوون و سێنیکێن "قورما "و "ماسیاوا" و نان دبر و ل سەر سفرا خوارنێ ل ژوورا مێهڤانان ڤە ددانان.

تاڕقی ژی جار جارە دهاتە د لێنانگەهێ ڤە و دەستێ خوە دکرە ڤی تشتی و تشتێ هە.

گێتیێ گوت: "نابیت زەلام بهێنە د لێنانگەهێ ڤە."

وەجمەیێ ژی گوت: "هەرە ژ دەرڤە، دەرکەڤە ژ دەرڤە."

تاڕقی ب وێ دەرێخستنا ژنان دکرە کەنی و خوشی ژ وێ چەندێ ددیت دەمێ کو ب خێرهاتنا وی نەدکر و دکرە دەرێ، ژبەر هندێ وی ژی ب ڕەفتارێن خوە یێن زەلامینیێ سحبەت و دیوانا وان یان ژنان تێکددا.

لەیلایێ دڤیا ب چ رەنگان تەماشەی تارقی نەکەت داکو دەلیڤە بۆ ژنێن دی چێنەبیت دگەل تارقی بکەڤنە سحبەتێ، ژبەر هندێ سەرێ خوە نزم کربوو نەدئاخفت. لێ ئەو خەون هاتە بیرا وێ دەمێ بەری چەند شەڤەکان ل بن دەرسوکەکا کەسك دا و ل بەرامبەر خۆدیکەکێ سەروچاڤێن خوە تارێ تێدا دیتین، دندکێن برنجی ژ ناڤ پرچا تارقی دکەفتە سەر خۆدیکێ و دەنگ ژێ دهات.

تارقی دەستێ خوە درێژ کر داکو پارچەیەکا گوشتی ببەت کو ب پتاتان هاتبوو قەلاندن. گێتیێ گازی کرێ و گوتێ: "هێی کورو دێ چ کەی؟" لێ وی دەستێ خوە ل گوشتی دا و رەڤی و کرە کەنی.

نوکە بەژنا تارقی گەلەك ژ یا لەیلایێ درێژتربوو، وی سمبێلێن خوە ژی تراشیبوون و دێمێ وی زراڤتر و نازکتر دهاتە پێشچاڤ. ملێن وی ژی د فرەهـ ببوون و حەز ژ وان پەنتەرۆنان دکر یێن دەلنگێن وان تەنگ، و پێلاڤێن رەش و لەماع و فانێلەیێن هچك کورت داکو زەڤلەکێن دەستێن وی دیاربکەن کو ژ ئەنجامێ وان راهێنانێن وەرزشی پەیدابببوون یێن رۆژانە ب وان ئاسنێن ژەنگاوی یێن دناڤ حەوشا مالا خوە دا دکرین.

ل ڤێ دوماهیێ، سەروچاڤێن وی وەکو یێن کەسەکێ ناڤچاڤگرێ و جەمباز خویا دکرن، دەمێ د ئاخفتی ژی سەرێ خوە بلند دکر و بۆ رەخەکی خوار دکر و دەمێ دکریە کەنی ژی بریەکا خوە دبرە سەری و وەکو کڤانان لێدکر. پرچا خوە ژی بەردابوو ناڤچاڤکێن خوە بۆ پشتێ دبرن.

بۆ دوماهیك جار دەمێ تارق ژ لێنانگەهێ هاتیە دەرێخستن، چاڤێ دایکا تارقی ل وێ بوو دەمێ ب دزیکی ڤە و دبن چاڤکان را سەحدکرە تارقی، ژبەر هندێ دلێ وێ بلەز خوە قوتا هەروەکو دا بێژی وێ گونەهەك یان تاوانەك کربیت. چاڤێن خوە دانانە سەر یەك و خوە ب تشتەکی ڤە مژوول کر و خیارێن هوورکری کرنە دناڤ ئاڤا ماستێ دا، لێ وێ هەستپێکر کو دایکا تارقی یا چاڤدێریا وێ دکەت و بۆ دگرنژیت.

زەلامان ژی سێنیکێن خوە تژی کرن و خوارنا خوە برنە دناڤ باخچەی دا، دەمێ زەلامان بەهرا خوە بری، ژ نوو ژن و زارۆك ل سەر سفرا مای روونشت و دەست ب خوارنێ کر.

پشتی هەموویان خوارن خواری و ئامان هاتینە ڕاکرن، ڤێجا گەڕا چایێ هات، کا کی دێ چایا زەر ڤەخوت و کی دێ چایا ڕەش ڤەخوت. ل وی دەمی تارق ڕابووڤە و چوو ژ دەرڤە.

لەیلا ژی پشتی پێنج خولەکان د دووڤ وی ڕا چوو ژ دەرڤە.

لەیلایێ تارق ل بەر دیوارێ سێ مالێن دبن مالا خوە دا دیت، کو پالاٚ خوە دابوو دیوارێ کولانەکا زراڤ و تەنگ دناڤبەرا دوو خانیان دا و ژ دەڤ خوە سترانەکا پەشتوونی یا کەڤن دگوت کو یا ئوستاد "ئاوال میر"ی بوو:

*ئەڤە وەلاتێ مە یێ جوانە*

*ئەڤە وەلاتێ مە یێ خوشتڤی یە*

تارقی جگارەك دكێشا، ئەڤە کارەکێ دی یێ نوو بوو ل دەڤ وی پەیدابووی. لەیلایێ دزانی ئەو یێ ژوان کوران فێری جگارەکێشانێ بووی ئەوێن ڤان ڕۆژان دگەهیتە وان. لەیلا نەدشیا هەدارا خوە ل سەر ڤان هەڤالێن نوو یێن تارقی بکێشیت. هەموویان جلکێن وەکو یەك دکرنە بەر خوە: پەنتەرۆنێن تەنگ، قەمیسێن تەنگ کو ل سەر سینگ و دەستێن وان دشدیان و گەلەك گولاڤ ل خوە دکر و جگارە دکێشان.

خوە دکرنە گرۆپ و ل بەر دیواران خرڤە دبوون و یاری و ترانە ب هەڤدوو دکرن و دەنگێ کەنیا وان بلند دبوو. هندەك جاران ژی ب ل بەر دەرگەهێن قوتابخانەیان دڕاوەستیان و ب دووڤ کچکان دکەفتن. هەڤالەکێ تارقی گەلەك خولکێ "سیلڤستەر ستالون"ی ددا و یێ ڕژد بوو ل سەر هندێ کو هەموو هەڤال ب ناڤێ "ڕامبو" گازی بکەنێ.

بەری کو تارق بچیتە د وێ کولانکا تەنگ دا، لەیلایێ گوتێ: "دایکا تە دێ تە کوژیت هەکە بزانیت تو جگارەیان دکێشی."

پیچەکێ خوە دا ڕەخەکی داکو ڕێکا لەیلایێ بکەت، پاشی گوت: "بەلێ پا ئەو نزانیت."

"مانێ هەر دێ زانیت"

"ڤێجا ما کی دێ بێژیتێ؟ تو؟"

لەیلایێ پێهنەك ل ئەردی دا و گوت: "نهێنیا خوە بۆ بای بێژە لێ لومەیان نەکە وەختێ تو ل دەڤ داران دبێژی."

تارقی بریا خوە بلند کر و کرە گەنی.

"ڤێجا کێ ئەڤ چەندە گوتیە؟"

"جوبران خەلیل جوبرانی."

"تو شانازیێ ب خوە دبەی."

سەرێ خوە هەژاند و ب نەخێر بەرسڤا وی دا، پاشی گوتێ: "کا جگارەکێ بدەڤ من."

تارقی داخوازیا وێ بجهـ نەئینا.

پشتا وی ل دیواری بوو دەستێن وی دناڤ یەکدابوو جگارە ژی د بەر ڕەخەکێ لێڤا وی ڕابوو پێ خوە یێ دروست ژی دابوو دیواری، هەلبەت ئەڤە ژی یەك بوو ژ ڕەفتارێن وی یێن نوو.

"ڤێجا بوچی تو نادەیەڤ من؟"

"چونکی بۆ تە خڕابە."

"دیارە بۆ تە یا خڕاب نینە؟"

"نێ ئەز ل سەر خاترا کچکا دکێشم."

"کیژ کچکا؟"

تارقی کرە کەنی و گوت: "کچك دبێژن جگارە تشتەکێ بالکێشە."

"نەخێر، هۆسا نینە."

"نەخێر ؟"

"بەلێ پشتڕاستبە."

"ئانکو ئەز یێ بالکێش نینم؟"

"نەخێر، تو وەکو مرۆڤێن دین و هاری."

"ئەڤە تشتە جهێ شەرمزاریێ یە."

"باشە تە بەحسێ کیژ کچکان بوو؟"

"چیە تو غیرەتێ ژ وان دهەلگری؟"

"ب تنێ من دڤیا بزانم، هەکە نە تشتەکێ گرنگە."

"نەخێر، ئەڤ هەردوو تشتە پێکڤە نابن."

وی قورمەك ل جگارێ دا و پاشی دووکێل ژ دەڤێ خوە دەرێخست و گوت: "ئەز شەرمانێ دکەم کو نوکە ئەو دێ بەحسێ مە کەن."

دەنگێ دایکا وێ دناڤ گوهێن وێ دەنگڤەدا و ئەو ئاخفتنە هاتە بیرا وێ (هەروەکو باڵندەیێ مینایە دناڤ دەستێن تەدا، هەر گاڤا فڕی، نازڤڕیتەڤە)

لەیلایێ هەست ب گونەهێ کر، پاشی لەیلایێ ئەو ئاخفتنا دایکا خوە ژ بیرا خوە بر و هزرا خو د پەیڤا "مە" دا کر ئەڤا بەری نوکە ژ دەڤێ تارقی دەرکەفتی. گوهلێبوونا وێ پەیڤێ ژ دەڤێ وی گەلەك یا کاریگەر بوو. بێهنا وێ فرەهکر دەمێ ژ نیشکەکێ ڤە و ب شێوەیەکێ سروشتی ژ دەڤێ وی دەرکەفتی. ئەڤ پەیڤە دانپێدانەکا ڕاستەقینە بوو ل دور پەیوەندیا وان یا دلداری.

"ڤێجا ئەو دێ چ بێژن؟"

"ئەم یێ دناڤ ڕووبارێ گونەهان دا مەلەڤانیان دکەین و ژ دارا فێقی یا حەرامکری دخوین."

لەیلایێ بۆ تەمام کر: "و سوواری عەرەبانەیا خرابیێ بووین."

"ئافکا قورما یا شکاندنا پیرۆزیان چێدکەین."

هەردووان دەست ب کەنیێ کر، پاشی تارقی گوتە لەیلایێ پرچا تە یا درێژ بووی و ل دووڤ دا گوت: "کا ڤی بابەتی بگوهۆڕە."

"بابەتێ چ؟"

"وان کچێن مەژیێ وان ڤالا، یێن هزر دکەن تو یێ بالکێشی."

"تو ب خوە دزانی."

"ئەز چ دزانم؟"

"ب تنێ دلێ من یێ ل سەر تە، نەك کەسێ دی."

لەیلا دناڤ خوە دا ژ هوش چوو، وێ دڤیا چاڤێن وی بخوینیت لێ وێ ئاگەهـ ژ خوە نەبوو. تارقی قوپکێ جگارەیا خوە دانا بن کەعبێ پێلاڤا پێ خوە یێ دروست و گوت: "باشە، بوچوونا تە ل سەر ڤێ چەندێ چیە؟"

"ئاهەنگێ؟"

"باشه پا نوکه کی یێ دین و هاره؟ کچێ دینێ لەیلا، مەرەما من ئەو چەکدارن یێن هاتینە د کابولێ دا."

"ئاها..."

لەیلایێ ئەو سحبەت بۆ وی ڤەگێڕان یێن بەری هینگێ بابێ وێ بۆ گوتین ل دور ئاریشەیێن ژنئینانی و شووکرنا ب خورتی و چەکی. ل وی دەمی دەنگێ هندەك ڤێژی و حەواریان هاتە گوهێن وان کو ژ مالا وان دهاتن.

لەیلایێ دوو پێن دی ئینانە هاری پێن خوە و بلەز کرە غار و چوو مال، تارقی ژی ب ڕیڤەچوونا ژ ڤلکی دا ب دووڤ وێ ڤە.

شەڕەك دناڤ حەوشا مالا وان دا ڕوودابوو، دناڤ وێ کوما خەلکی دا دوو زەلاّمان خوە د هەڤدوو وەرکربوو کەفتبوونە سەر ئەردی و شەق و پێن ددانانە هەڤدوو و کێرکەك ژی دناڤبەرا وان دا بوو. دەمێ لەیلایێ تەماشەی وان کری، زانی یەك ژ وان ئەو زەلاّم بوو یێ ل سەر مێزێ و سحبەتێن سیاسی دکرین و یێ دی ژی ئەو زەلاّم بوو یێ با ل شووشکێن کەبابان یێن ل سەر مەنقەلێ دکری. زەلاّمەکێ دی ژی دڤیا وان ژێکڤەکەت.

بابێ وێ ل دەڤ وان نەبوو بەلکو ب ڕەخ دیواری ڤە و دوور ژ وان یێ ڕاوەستای بوو، بابێ تارقی ژی ب ڕەخ ڤە بوو هەردووان دکرە گری.

لەیلایێ ژ ئاخفتنێن کەسێن دەوروبەر تا ڕادەیەکی زانی کا شەڕێ وان سەرا چیە. ئەو کەسێ ل پشت مێزێ ڕوونشتی، کەسەکێ پەشتوونی بوو گوتبوو ئەحمەد شاە مەسعود کەسەکێ خائینە، چونکی ل سالێن هەشتێیان پەیوەندی دگەل ڕوسیان هەبوون. ئەوێ با ل گوشتی ژی دکری کەسەکێ تاجیکی بوو و کەربێن وی ژبەر ئاخفتنێن زەلاّمێ دی ڤەبوون، لەوڕا داخواز ژێ کر ژ گوتنێن خوە لێڤە بیت لێ ئەو زەلاّم یێ ئامادە نەبوو ژ ئاخفتنێن خوە لێڤەبیت.

ژبەر هندێ زەلاّمێ دی گوتبوویێ ئەگەر ژبەر خەباتا مەسعودی نەبایە، نوکە دا خوشکا تە پیاسەیان دگەل سەربازێن سوڤییەتی کەت. پشتی ڤێ چەندێ شەڕی دەستپێکر تا بوکس و کولم د هەڤدوو وەرکرن و پاشی کەسەکی کێرکەك ل یێ دی ڕاکر، لێ پاشی دیارنەبوو کا ئەو کیژ زەلاّم بوو یێ کێرك ئینایە دەرێ و هەر یەکی تشتەك دگوت.

دەمێ لەیلایێ دیتی تارِق یێ چوویە دناڤ شەڕی دا، گەلەك ترِسیا. هەردیسان وێ دیت هندەك بەرەڤان ژی یێن چووینە دناڤ شەڕی دا. هۆسا هاتە بەر چاڤێن وێ کو یا کێرکەکا دی ژی دبینیت.

ل ئێڤاریا هەمان رِۆژ، لەیلایێ هزرا خوە دکر کا چەوا ئەو شەڕ ب دوماهی هات. ئەو زەلاّم هەموو کەفتبوونە سەر کەلەخێن هەڤدوو و دەنگێ ڤێژی و بوکس و کولمان بلند و نزم دبوو. دناڤبەینەکێ دا، تارِق ب ترانە و پرچا خوە یا ڤژوڤژ و پێ خوە یێ دەستکرد بزاڤ دکر خوە ژ ناڤ وان بینتە دەرێ.

★★★

ب راستی تشتەکێ ب سەرگێژی بوو کا چەوا ئەو تشت هەموو هۆسا بلەز ئاشکەرا بوون

شوراِیا رِێبەریێ، بەری وەختێ خوە یێ دەستنشانکری هاتە پێکئینان، ڤێ شوراِیێ رەبانی وەك رِێبەرێ خوە هەلبژارت. لایەنێن دی هەموویان خوە نەرازیکر و گوت کو ئەڤ چەندە ب خزمانی و مرۆڤکانییێ هاتیە کرن. مەسعودی داخواز ژ هەموو لایەنان کر بێهنا خوە فرەهـ بکەن.

حیکمەتیار، کو هاتبوو پشتگوهـ هاڤێتن، گەلەك تۆرِەبوو. هەزاری ژی کو ب درێژاهیا دیرۆکا ئەفغانستانێ د تەپەسەر و بێ دەستهەلاّت بوون، دناڤ خوە دا خوێ دخوار و ئاڤ ب سەردا دکر.

هەموویان سڤکاتی ب هەڤدوو کر و هەڤدوو تاوانبار دکر. کۆمبوونێن خوە ب تۆرِەیی ڤە ئەنجام ددان و دەرگەهـ ل ناڤ چاڤێن هەڤدوو ددان. هەناسەیێن باژێری تەنگ بوون و ل چیایان ژی تڤەنگێن کلاشینکوف ژ فیشەکان هاتنە پرِکرن و چەکدار رِابوونە سەر خوە و ژ سەری هەتا بنی چەك ب خوە ڤە کرن. نوکە وان چ دوژمنێن هەڤپشك نینن بەلکو ئەو ب خوە بوونە دوژمنێن هەڤدوو.

ل دوماهیێ رِۆژا لێپرسینێ ل کابولێ هات.

دەمێ کابول هاتیە تۆپ بارانکرن، خەلکێ وێ ل دووڤ جهەکێ ئارام دگەریان. دایکا لەیلایێ ژی دووبارە جلکێن رِەش کرنە بەر خوە و چوو د ژوورا خوە ڤە و پەردە بەردان و ل سەر تەختی خوە درێژ کر و بەتەنیك رِاکێشا سەر خوە.

# 24

دیسان دەنگێ لێدانا زەنگێ هاتەڤە.

لەیلایێ گوتە تارقی: "من گەلەك كەرب ژ دەنگێ لێدانا زەنگێ ڤەدبن، پتر ژ هەر تشتەكێ دی."

تارقی سەرێ خوە هەژاند وەك نیشانەك ل سەر هەڤبوچوونا وی دگەل وێ. پشتی هینگێ لەیلایێ زانی كو ئەو زەنگ نینە وێ نەخوشیێ بۆ وێ پەیدا دكەت بەلكو ئەو ماوەیێ كورتە یێ دناڤبەرا دەنگێ زەنگێ و پەقینێ دا كو دبیتە ئەگەر ئەو چاڤەرێی بمینیت، ئەو ماوەیێ كو نزانیت چ تێدا ڕوودەت. چاڤەرێیەكا هۆسایە هەروەكو كا چەوا تاوانبار ل چاڤەرێی گوهلێبوونا سزایێ خوە یێ دوماهیێ دمینیت دەمێ ژلایێ دادوەری ڤە دهێتە خواندن.

پتریا جاران ئەڤ دەنگە ل دەمێ شیڤێ دهات ب تایبەت دەمێ ئەو و بابێ خوە ل سەر مێزا خوارنێ و مژوولی خوارنا شیڤێ دبووین. دەمێ زەنگا ئاگەهدارکرنێ دهاتە لێدان، وان سەرێن خوە بلند دكرن و كەفچك دناڤ دەستێن وان دا دمانە ل هەوا و خوارنا وان ژی ب نیڤەڕو دما دناڤ دەڤێ وان دا و گوهێن وان دمانە ل دەنگێ زەنگێ.

لەیلایێ سەروچاڤێن خوە یێن نیڤ ڕوهن ل سەرشووشەیا پەنجەركێ ددیتن ئەوا ب قوماشەكێ ڕەش هاتیە نخافتن. سیبەرا وان ل سەر دیواری دیار دكر. زەنگ هەر دهاتە لێدان و پشتی ماوەیەكێ كورت پەقینەك ڕوودا لێ خوشبەختانە ئەڤ جارە ئەڤ پەقینە ل جهەكێ دوور بوو.

ل دووڤ دا، بێهنا وان فرەهـ بوو دەمێ زانی ئەڤ جارە ئەو ب سەلامەتن و چ ب سەرێ وان نەهات، لێ ل جهەكێ دی دەنگێ ڤیژیان دهات و دووكێلەكا ڕەش بلند بوو بەر ئەسمانی. كەلەخ كەفتنە سەر یەك و خەلك بۆ ڤەدیتنا پاشماوەیێن كەلەخێن خوشك، برا یان نەڤیەكێ خوە دناڤ بەرمایكێن خانییێن خوە یێن هەرفتی دا دگەریان.

لێ ل لایێ دی، کەسێنماینە ساخ ئەو پرسیارا ب ئێش و نەخوش دکر کا ئەرێ چ کەسێ وان بوویە قوربانی. پشتی پەڤینا هەر موشەکەکێ، لەیلایێ دەست ب کرنا دوعایان دکر. پاشی دا بەرەڤ کولانێ چیت داکو پشتڕاست بیت کا ئەڤ جارە تارق یێ ب سەلامەتە یان ئەو ژی مایە دبن خانییێ خوە یێ هەرفتی ڤە.

هەرشەڤ لەیلا ژ ترسان دا دا خوە درێژ کەت و تەماشەی وان بریسی یێن سپی و ژ نیشکەکێ ڤە کەت یێن دناڤ شووشەیا پەنجەرا وێ دا ڕەنگڤەددادین. گوهێ خوە ب نەچاری ددا دەنگێ گوللە و مۆشەکان یێن سەر بانێ وان ڕا دهاتن و چووین و پاشی دیوارێن مالا وان دلەرزین و هندەك تەپ و تۆز ژێ دباری.

ڕۆناهیا وان مۆشەکان هند یا گەش بوو ئەو دشیا پەرتووکەکێ ل بەر بخوینیت، یان خەوا وێ بڤەڕەڤینیت. خو ئەگەر هندەك جاران خەوا وێ ژی هاتبایە، دا هندەك کابوسێن نەخوش هێنە د خەونا وێ دا، کابوسێن ژێڤەبوون و فڕینا دەست و پێن مرۆڤان.

ل سپێدەهیان ژی خەلك یێ ئارام نەبوو. دەنگێ بانگی بلند دبوو چەکدار دا چەکێن هەوە دانن و ڤەستا نڤێژا سپێدێ ل مزگەفتان کەن. پاشی دووبارە دا چەکێن خوە تژی فیشەك کەن و ل چیای دا تەلقەیان د بازێرێ کابولێ وەرکەن و دناڤ بازێرێ کابولێ ژی دا تەلقە د وان دهاتنە وەرکرن. ئێدی دناڤبەرا ڤان هەردوو تەلقەکەران دا، لەیلا و گشت خەلکێ بازێری دا ب خەمگینی ڤە تەماشەی وان کەن هەروەکو کا چەوا سانتیاگویێ پیر تەماشەی ماسییێن قرش دکر دەمێ لەشێ ماسیا وی یا مەزن پرت پرت دکری و دخواری.

لەیلا چوو با کیڤە، دا زەلامێن مەسعودی بینیت. ئەو دناڤ جادەیێن بازێری دا دبەلاڤەبوون و هەر سەد مەترەکان ترۆمبێلا وان دا هێتە ڕاوەستاندن و لێپرسین دگەل هێتە کرن. هندەك ژی ب جلکێن سەربازی ل سەر دەبابەیان دڕوونشتی بوون و جگارە دکێشان. هندەکێن دی ژی ل دەڤ دووریانا دناڤ بازێرێ دا بوون و هندەك ژی ل پشت گینیکێن تژی ئاخی یێن وەك چەپەر دهاتنە بکارئینان، د ڕاوەستیایی بوون و چاڤدێریا ڕێڤینگان دکر.

★★★

ئێدی لەیلا زوو ب زوو نەدچوو ژ دەرڤە، هەکە چووبایە ژی دا تارِق دگەل چیت. هەلبەت ئەڤ کارێ باش بۆ وێ جهێ دلخوشیێ بوو. رِۆژەکێ دەمێ ئەو دناڤ باخچەیێ مالا لەیلایێ وان دا و ل بن دارا هرمیکێ درِوونشتی، تارِقی گوت: "من دەمانجەك یا کری."

پاشی وی دەمانچە نیشا لەیلایێ دا و گوتێ: "ئەو دەمانجەیەکا بیریتا یا نیڤ ئوتوماتیکی یە."

ل دەڤ لەیلایێ، دەمانجە ژبلی تشتەکێ رِەش و کوژەك، چ رِامانێن دی نەبوون. لەیلایێ گوت: "کا ببە وێرڤە، ئەز حەز ژ چەکی ناکەم چونکی من دترِسینیت."

تارِقی عەمبارا وێ یا فیشەکان ڤالا کر و هەموو کرنە ددەستێ خوە دا.

"ل حەفتیا بوری ل "کارتیە سیە"، کەلەخێ سێ کەسان ب کوشتی دناڤ مالەکێ دا هاتە دیتن. گوهێ تە لێبوو؟ سێ خوشك بوون. هندەکان دەستدرێژیا سێکسی کربوو سەر هەرسێ کەسان و پاشی کوشتبوون. گەوریێن وان ژی هاتبوونە برِین، هەتاکو گۆستیرکێن تبلێن وان ژی دزیبوون و شوونتبلێن لەڤێن وان ل سەر تبلێن وان مابوون."

"من نەڤێت گوهێ خوە بدەمە سحبەتێن هۆسا."

"من نەڤێت تە بترِسینم، بەلێ ب تنێ دەمێ ئەز ڤێ دهەلگرم، ئەز هەست پێدکەم ئەز ئارامترم."

تارِق وەکو پرەکێ لێهاتبوو کو وێ ب رِوودانێن ژ دەرڤە گرێدەت. ئەو ئاخفتنێن ل کولانێ و ل سەر جادەیێ دهاتینە گوتن و وی گوهلێدبووین، دا هێت و بۆ لەیلایێ ڤەگێرِیت. بۆ نموونە دا بێژیتێ کو میلیشیاتێن ل سەر چیایان رِاهێنانێن توند بۆ شیانێن خوە یێن ستێرکگرتنێ ب گولەیان دکرن، دا شەرِتانێ ل سەر هندێ کەن کا کیژ ژوان دێ شێت کەسەکی دناڤ بازێری دا کوژیت ڤێجا چ ژن، زەلام یان زارۆك بایە.

هەردیسان گوتە وێ کو ئەو مۆشەکان د ترِۆمبێلان وەردکەن، لێ نزا ژبەر چ ئەگەر ئەوا مۆشەکان د ترِۆمبێلێن ڤەگوهاستنێ وەرناکەن، بۆ لەیلایێ دیاربوو کا بوچی هەر زوو خەلك رِابووینە ب بۆیاغکرنا ترِۆمبێلێن خوە ب رِەنگێ زەر.

تارِقی بەحسێ وان جهان ژی کر یێن دناڤ کابولێ دا د ئارام نینن و بەردەوام دهێنە گوهورین. بۆ نموونە بەحسێ وێ رِێکێ دکر یاکو هەتا دوماهیا دووەم دارا ئەکاسیایێ ژ لایێ چەپێ ڤە کو نوکە یا ل بن دەستێ سەرکردەیەکێ سەربازی. هەر چوار ئاڤاهیێن بلند یێن

ئاكنجیبوونێ یێن ل دووڤ دا ژی یا کو ب دەرمانخانەیەکا هەرفتی ب دوماهی دهێن یێن ل بن دەستێ سەرکردەیەکێ دی. ئەگەر تو هەر ل سەر وێ جادەیێ یا بەردەوام بی و نێزیکی نیڤ میلێ دی بچی، دێ خوە دناڤ دەڤەرا سەرکردەیەکێ دی دا بینی. ئەڤ دەڤەرە جهێن باشن بو چەکدار و تەقەکەران.

قارەمانێن دایکا لەیلایێ یێن وێ شانازی پێ دبر، نوکە دبێژنێ سەرکردەیێن سەربازی، هندەکێن دی ژی دبێژنێ چەکدار، هندەك دی ژی هێشتا دبێژنێ موجاهدین.

تارقی دووبارە فیشەك کرنە بەر دەمانجا خوە، لەیلایێ پرسیار ژێکر: "ئەرێ تە وێرەکی هەیە؟"

"وێرەکی بۆ چ تشتی؟"

"تو ڤێ دەمانجێ بکاربینی ژ بۆ کوشتنا کەسەکی."

تارقی دەمانجە کرە دبەر کەمەرا خوە ڕا و پاشی ب دەنگەکێ نەرم و د هەمان دەم دا ب ترس ڤە گوت: "ل سەر خاترا تە دشێم ڤێ چەندێ بکەم، لەیلا."

لەیلا پتر نێزیکی تارقی بوو بۆ ماوەیەکێ کێم دەستێن وان کەفتنە سەر یەك. دەمێ تبلێن تارقی کەفتینە سەر تبلێن لەیلایێ، لەیلایێ دەستێ خوە ژ وی دوور نەکر، دەمێ ژ نیشکەکێ ڤە تارقی خوە هاڤێتیە سەر کەلەخێ وێ و لێڤێن وێ ماچیکرین، دیسان لەیلایێ چ ڕەنگڤەدانێن نەرێنی نەبوون و هۆسا خوە دیارکر کو ئەو یا ڕازی یە ل سەر ڤێ چەندێ داکو تارق دووبارە بکەتەڤە.

ل وی دەمی، هەموو ئاخفتنێن دایکا وێ ل دوور نامووسێ و باڵندەیێ مینا ل دەڤ وێ چ گرنگیا خوە نەبوو و ژ بیرا خوە دبرن، بەلکو هزردکر ئاخفتنێن وێ د بێ ڕامانن ژی. دناڤ هەموو شەڕ و کوشتن و کرێتیێ دا، وان ئاگەهـ ژ چ تشتان نەما، بەلکو ل بن دارەکێ ڕوونشت و هەڤدوو د ڕاموسی. کارەکێ بچووك بوو دەلیڤەیا گونەهە ژێبرن و لێبورینێ هەبوو، ژبەر هندێ وێ دەلیڤە ددا تارقی ب دلێ خوە وێ ماچی بکەت.

دەمێ تارق پیچەکێ چوویە وێڤەتر، لەیلایێ ئەو پاڵدا سەر ئەردی و دووبارە لێڤێن وی ماچیکرن، دەنگێ لێدانێن دلێ وێ خوە ژ گەوریا وێ دەردکەفتن و ڕوویێ وێ سۆر بوو ئاگرەك دناڤ هناڤێن وێ دا هەلبوویێ.

★★★

ل خزیرانا سالا 1992ێ، ل ڕۆژئاڤایێ باژێرێ کابولێ شەڕەکێ دژوار دناڤبەرا هێزێن پەشتوونی ب سەروکاتیا سەیافی و هەزارییێن تەڤگەڕا وەحدە دا ڕوویدا. تۆپبارانکرنێن وان بوونە ئەگەر هەموو ستوونێن کارەبێ بهێنە وێرانکرن و گشت شەقام و جهێن ئاکنجیبوونێ ب سەر یەك دا بهێنە خوار.

لەیلایێ گوهلێبوو کو میلیشیاییێن پەشتوونی هێرش دکرە سەر مالێن هەزاری یێن دناڤ کابولێ دا و دەرگەهێن وان دشکاندن و ئەندامێن خێزانێن وان ب کوم گولەباران دکرن. بەرامبەر ڤێ چەندێ، هەزارییان خەلکێ مەدەنی یێن پەشتوونی دڕەڤاندن و دەستدرێژی دکرە سەر کچێن وان و کولانێن پەشتوونیان تۆپباران دکرن بێی کو بزانن ئەڤە زارۆکە، گەنجە، پیرە، هەمو پێکڤە ددانە بەر.

ڕۆژانە چەندین کەلەخێن پەشتوونیان دهاتنە دیتن کو ب داران ڤە هاتبوونە گرێدان یان سێدارەدان. هندەك جاران تا وی ڕادەی لەشێ وان دسۆت، کەسێ ئەو نەدنیاسین. پتریا ئەو کەسێن هاتینە کوشتن ژی، فیشەك ل سەرێن وان دابوون، یان چاڤێن وان ئینابوونە دەرێ و ئەزمانێن وان بڕیبوون.

بابێ لەیلایێ دووبارە دگەل دایکا وێ ئاخفت و بزاڤ دکر باوەریێ بۆ چێکەت داکو کابولێ بجهـ بهێلن. دایکا وێ گوت: "ئەڤ شەڕە دێ ب دوماهی هێت، چونکی شەڕەکێ بەروەختە، ئەو ب خوە دێ دگەل هەڤدوو ڕوونە خوارێ و دانوستاندنێ کەن."

بابێ وێ گوت: "فەریبا، ئەڤ جورە کەسە بەس تشتەکی دزانن، ئەو ژی شەڕکرنە. ئەڤە هۆسا یێن فێربووین کو شووشەیەکا شیری د دەستەکێ وان دا بیت و ب دەستێ دی ژی تڤەنگێ ب هەلگرن."

دایکا وی ب تۆڕەی ڤە گوت: "باشە تو کی هەتا تو ڤان ئاخفتنان بێژی؟ ئەرێ تو ب خوە چوویە شەڕی دگەل چەکداران؟ تە دەست ژ هەموو تشتان بەردایە و ژیانا خوە ئێخستیە د مەترسیێ دا؟ ئەگەر چەکدار نەبانە، نوکە ئەم دا خولامێن بەر دەستێ ڕوسییان بین، نوکە ژی تە دڤێت خیانەتێ ل ڤان چەکداران بکەی؟"

"فەریبا، ئەو ئەم نینین یێن خیانەتێ دکەین."

"باشە مادەم هۆسایە، تو ب تنێ هەرە، کچا خوە دگەل خوە ببە و هەرە و ل وێرێ نامەیان ب پۆستێ بۆ من فرێکە. ئەز دزانم ئاشتی و تەناهی یا ب رێکێ ڤە و ئەز یەك ژ وان کەسانم یێن چاڤەرێی ئاشتیێ دکەن."

جادەیێن باژێری ژ لایێ ئێمناهیێ ڤە تا وی رادەی کەفتبوونە د مەترسیێ دا، بابێ لەیلایێ کارەکێ چاڤەرێنەکری کر، ئەو ژی نەهێلا ئێدی لەیلا ژ مال بدەرکەڤیت و بچیتە قوتابخانەیێ.

ئێدی وی ب خوە وەکو ماموستایەکی وانە نیشا لەیلایێ ددان. هەرۆژ پشتی رۆژ ئاڤا دبووی، لەیلا دا چیتە د ژوورا پەرتووکێن بابێ خوە و دگەل رووتە خوارێ. ل وی دەمێ کو حەکمەتیاری ل باشورێ باژێری مۆشەك د مەسعودی وەردکرین، وێ و بابێ خوە گەنگەشە ل سەر هوزانێن حافزی و هوزانێن شاعرێ ناڤدار و خوشتڤی یێ ئەڤغانستانێ "خەلیلوللاهـ خەلیلی" دکر. بابێ وێ نیشا ددا کا چەوا دێ کۆلکێن هاوبەش یێن هاوکێشەیێن دووجایی دیار کەت و چەوا دێ فێری کێشانا کڤانێن پارامیتریکی بیت.

دەمێ بابێ وێ وانە نیشا وێ ددان، وەکو کەسەکێ دی دهاتە پێشچاڤێن لەیلایێ. دەمێ ئەو د ژوورا خوە ڤە و دناڤ پەرتووکێن خوە دا، بەژن و بالاَ وی بلندتر خویا دکر و دەنگێ وی ژی ب شێوەیەکێ ئارامتر ژ گەوریا وی دەردکەفت و گەلەك کێم چاڤێن خوە د دانانە سەر یەك.

لەیلایێ هزرێن خوە دکرن دەمێ کو رۆژەکێ ژ رۆژان بابێ وێ ب دەستێ خوە تەختەرەش پاقژ دکر و ب گیانەکێ بابینیێ ڤە تەماشەی قوتابیێن خوە دکر. لەیلایێ هەموو گاڤان ئاگەهـ ژ وانەیان نەبوو یێن بابێ وێ نیشا وێ ددان، بەلکو هندەك جاران هزرێن وێ دوور دچوون.

بابێ وێ پرسیار ژێکر: "لەیلا، دێ چەوا رووبەرێ هەرەمەکێ دیار کەی؟"

لەیلایێ ئاگەهـ ژ پرسیارا بابێ خوە نەبوو، بەلکو هزرا وێ ل سەر لێڤێن تارقی و هەناسەیێن وی یێن گەرم بوو، هزرا وێ ل سەر هندێ بوو دەمێ دیمەنێ خوە دناڤ چاڤێن وی دا ددیتن. پشتی وێ جارا ل بن دارا هرمیکێ، دوو جارێن دی ژی تارقی ئەو ماچیکربوو، لێ ژ جارا یەکێ درێژتر و خوشتر و شارەزاتر.

هەردوو جاران ب دزیکی ڤە چووبوونە دناڤ وێ کولانکا تەنگ و تارِی دا یا کو ل رِۆژا ئاهەنگا ل مالا وان، وێ تارق ل سەرێ وێ کولانکێ دیتی دەمێ جگارە دکێشا. ل جارا دووێ تارِقی ژبلی گرتنا لێڤان، دەستێ خوە دکرە سینگێ وێ ژی.

"لەیلا؟"

"بەلێ باب."

"رِوبەرێ هەرِەمێ، تو هەتا کیڤە چووی؟"

"ببورە باب، بەس خولەکەکێ، هەرِەم، هەرِەم... سێیەکا رِوبەرێ بنکێ وێ لێکدانی بلنداهیا وێ."

بابێ وێ ب لێبورین ڤە سەرێ خوە هەژاند و بەرێ خوە ژ وێ ڤەنەکر. لەیلا هەر ل سەر هزرێن خوە یا بەردەوام بوو و د ئینا پێشچاڤێن خوە دەمێ تارِقی ب دەستێ خوە سینگێ وێ دگڤاشتی و هێدی هێدی ل سەر مورکێن پشتا وێ دئینایە خوارێ و ماچ ل لێڤێن وێ ددان.

***

رِۆژەکێ ژ رِۆژێن هەر وێ هەیڤا خزیرانێ، دەمێ گێتی دگەل دوو هەڤالێن خوە یێن پولێ بەرەڤ مال دزڤرِین، سێ جادە مابوون گێتی بگەهیتە مال، لێ ژ نیشکەکێ ڤە مۆشەکەك کەفتە بەر سینگێ وان و پەقی.

ل دوماهیا وێ رِۆژێ لەیلایێ ژ نوو زانی کو نیلا، دایکا گێتیێ، وەکو دینان بەرەڤ وێ جادەیێ چووبوو یا کچا وێ لێ هاتیە کوشتن، وێ ب ڤێژی و حەواری ڤە پارچەیێن لەشێ کچا خوە کرنە د کوشا خوە دا. پێ وێ یێ رِاستێ کو گورەکا نایلونی یا بچووك و کتەکا پێلاڤێ یا رِەنگ مور ل پیا بوو، پشتی هینگێ ب دوو حەفتیان ل سەر بانێ مالەکێ هاتبوو دیتن.

ل بەهیا گێتیێ کو رِۆژەکێ پشتی کوشتنا وێ هاتبوو گێرِان، لەیلایێ د ژوورەکا پرِی ژن ڤە یێن کو دکرە گری، هوشێن خوە ژدەستدابوون. ئەڤە یەکەم جار بوو کەسەك بمریت کو گەلەك نێزیکی لەیلایێ بیت و گەلەك حەز ژێ کربیت. هندی دهاتێ نەدشیا باوەر ژ چاڤێن خوە بکەت کو ئەڤ چەندە رِاستە، ئێدی گێتی یا مری و نەمایە د ژیانێ دا.

ئەو گێتیا د پولێ ڤە دگەل لەیلایێ و سحبەتێن خوە یێن تایبەت بۆ هەڤدوو دکرن، بۆیاغ د نینوکێن وێ ددا، موویێن زێدە یێن بری و ئەرزینکا وێ دهەلکێشان، ئەو گێتیا کو بڕیار بوو دگەل سابرێ گولچی دا ژیانا هەڤژینیێ پێکبینیت، ئێدی یا مری بوو، لەشێ وێ پارچە پارچە ببوو.

لەیلایێ ژ نیڤا دلێ خوە بۆ هەڤالا خوە یا خوشتڤی کرە گری، ئەو ڕۆندکێن نەشیای د بەهیا برایێن خوە دا بینتە خوارێ، د بەهیا گێتیێ دا باراندن.

# 25

لەیلا گەلەك ب زەحمەت دشیا ڕابیتەڤە یان بهێت و بچیت خوە دا بێژی تژی ناڤ هەستیك و گەهێن لەشێ وێ یا چیمەنتو کری. گەنگەشەك دهاتە کرن و لەیلا لایەك بوو ژ وێ گەنگەشێ، لێ خوە دا بێژی ئەو ل وێرێ نینە و ئاگەهـ ژ چ تشتان نینە. دەمێ تاڕقی دئاخفتی، ژیانا لەیلایێ وەکو وەریسکەکێ ها وەختە دێ ڤەتیێت، دهاتە پێشچاڤێن وێ.

ئەڤ چەندە ل ڕۆژەکا هاڤینێ یا گەرم ل دەمێ پشتی نیڤرو ل هەیڤا تەباخێ ل سالا 1992ێ بوو. ئەو هەردوو ل ژوورا ڕوونشتنێ یا مالا لەیلایێ وان بوون. ل وێ ڕۆژێ، دایکا لەیلایێ هەست ب ئێشانەکا مەزن د گەدەیێ خوە دا کر. پشتی هینگێ ب چەند خولەکەکان، هەرچەندە چەکدارێن حیکمەیاری بەردەوام ل باشورێ باژێری مۆشەك د کابولێ وەردکرن، لێ بابێ وێ دایکا برە نەخوشخانێ.

تاڕق ژی هاتبوو دەڤ لەیلایێ و ل سەر قەنەپێ ڕوونشتبوو خوارێ و دەستێن وی ل سەر چووکێن وی بوون و چاڤێن وی ژی ل ئەردی بوون. تاڕقی گوتبوو لەیلایی کو ئەو دێ ژ وێرێ بارکەت. نەك ژ وی تاخی ب تنێ دێ بارکەت بەلکو دێ ئەڤغانستانێ ب یەکجاری هێلیت و دەرکەڤیت. ژ خەمان دا، چاڤێن لەیلایێ تاڕی ببوون و چ تشت ل بەر چاڤێن خوە نەدیتن.

"دێ چیە کیڤە؟ دێ چیە کیژ وەلاتی؟"

"ل دەستپێکێ دێ چینە پاکستانێ، باژێرێ پێشاوەر، ل دووڤ دا ژی یا دیار نینە کا دێ کیڤە چین، دبیت بۆ هندستانێ یان ژی ئیرانێ."

"ئەڤە ژ کەنگی وەرە؟"

"نزانم."

"مەرەما من ئەڤە ژ کەنگی وەرە تو ڤی بابەتی دزانی؟"

"ئەڤە چەند ڕۆژەکە، لەیلا، باوەربکە من دڤیا بێژمە تە لێ من دل نەددا، من دزانی تو دێ گەلەك خەمگین بی."

"کەنگی دێ چن؟"

"سوباهی."

"سوباهی؟"

"لەیلا، گوهێ خوە بدە من."

"سوباهی!"

"ئەز دێ ل سەر خاترا بابێ خوە چم، بابێ من هەدارا ڤان هەموو کوشتن و شەڕان نەمایە."

لەیلایێ دەستێن خوە دانانە سەر سەروچاڤێن خوە، ترسەك ب سەر گیانێ وێ دا هات، وێ د دلێ خوە دا گوت کو پێدڤی بوو وێ چاڤەڕێی ڕۆژەکا هۆسا کربایە چونکی پتریا وان کەسێن لەیلایێ دنیاسین، کەلوپەلێن خوە لێکدابوون و ژ وەلاتی بارکربوو. ل تاخێ وان، کەسێ نیاس تێدا نەمابوو. نوکە کو نێزیکی چوار هەیڤان ل سەر شەڕێ دناڤبەرا چەکداران دا بورینە، لەیلایێ ب زەحمەت کەسەکێ ل وان کولانان نیاسیبایە.

مالا حەسینایێ وان ل هەیڤا گولانێ چووبوونە وەلاتێ ئیرانێ و وەجمە و بنەمالا خوە هەموو چووبوونە ئیسلام ئاباد. دایك و بابێن گێتیێ ژی دگەل زارۆکێن خوە یێن دی ب ماوەیەکێ کێم پشتی کوشتنا کچا وان ل هەیڤا تیرمەهێ وەلات بجھ هێلابوو لێ لەیلایێ نەزانیبوو کا ئەو چووینە کیڤە، لێ هندەکان دگوت یێن چووینە باژێرێ "مەشهەد" ل ئیرانێ.

ئەو کەسێن وەلات بجھ دهێلای، هەتا چەند ڕۆژەکان مالێن وان ڤالا دمان. پشتی هینگێ میلیشیاتێن چەکدار دا خانیێن وان داگیرکەن و چنە تێڤە یان ژی کەسێن بیانی یێن بێ خانی دا چن تێڤە ژین. هێدی هێدی خەلکی هەموویان بار دکر، نوکە دەم هات تارق ژی دێ بارکەت. ل دووڤ دا تارقی گوت: "لەیلا، دایکا من ژی ئەو ژنا گەنج یا بەرێ نینە، ئێدی ب شەڤ و ڕۆژ ژ ترسان دا دلەرزیت. لەیلا، خوە د من بگەهینە."

"بەلێ پێدڤیبوو بەری نوکە تە گوتبا من."

"هیڤی دکەم خوە د من بگەهینە."

ئاخینکەك ژ دلێ وێ دەرکەفت و پاشی دەست ب گرییێ کر. تارڤی دڤیا ب تبلێن خوە ڕۆندکێن ل سەر دێمێ وێ پاقژ بکەت لێ لەیلایێ دەستێ وی لادا ڕەخەکی و ژ خوە دوور کر، ئەڤ چەندە تشتەکێ خوپەرست و دینانە بوو، لێ ژبەر بارکرنا وی، ئەو یا دگەل تۆڕە و ڕەق بوو.

تاڕق، تەمامکەرێ ژیانا وێ بوو، ئەو کەس بوو یێ سیبەرا خوە دانایە سەر هەموو بیرەوەرییێن وێ. چەوا نوکە ب سانەهی دشێت وێ بهێلیت و باربکەت؟ وێ زللەهەك ل ڕوویێ تارڤی دا، پاشی یەکا دی و یەکا دی، ل دووڤ دا پرچا وی کێشا، هەتا ل دوماهیێ ئەو نەچاربووی زەندکێن وێ بگریت و هندەك ئاخفتنان د گوهێ وی دا بێژیت کو لەیلا تێنەدگەهشت.

تارڤی ب نەرمی و هێدی دگەل دئاخفت، ئێدی وی ژی نەزانی کا چەوا ناڤچاڤێن وی کەفتنە بەرامبەر ناڤچاڤێن وێ و دفنا وی ما ب دفنا وێ ڤە و هەتا ل دوماهیێ لێڤێن وان ژی کەفتینە سەر یەك.

دەمێ خوە درێژ کر، وێ ژی دگەل وی خوە درێژ کر.

***

ل ڕۆژ و حەفتیێن پشتی هینگێ دا، لەیلایێ وەکو دینان بزاڤ دکر هەر تشتەکێ دناڤبەرا وێ و تارڤی دا ڕوودای، دناڤ بیردانکا خوە دا تومار بکەت، هەروەکو وی هونەردوستێ د موزەخانەیێ ڤە دەمێ ئاگر بەردبیتە مەزەخانێ کا دەستێ وی دگەهیتە چ تشت دێ وی ڕزگار کەت، هەر ئاورینەك، چاڤنقاندنەك یان پەیڤەك وێ دئینانە پێشچاڤێن خوە داکو ژناڤچوون و ژبیرکرنێ قورتال بکەت، بەلێ ل ڤێرێ وەخت گەلەك ژ ئاگری ژی دلڕەقترە، ژبەر هندێ ئەو نەشیا هەموو بیرهاتنێن خوە دگەل وی ڕزگار بکەت.

سەرەڕای ڤێ چەندێ، لێ وێ ئەڤ بیرهاتنە ل دەڤ خوە هێلابوون: ل دەستپێکێ ئێشانەکا مەزن ژ بنێ گوهێ وێ دهات، تیشکێن ڕۆژێ دکەفتە سەر مەحفیرکێ، بنێ پێ وێ ژی دگەهشتە پێ وی یێ دستکر و هەست ب تەزاتیا وی دکر ئەوێ ژ پێ خوە ڤەکری و دانایە ڕەخەکی.

هەردوو دەستێن وی ل بن ئەنیشکێن وێ ڤە بوون و هێدی هێدی بەرەڤ ملێن وێ دچوون، خالا ل سەر ملێ وی کو وەکو ئامیرێ سازێ یێ بەروڤاژی بوو، سۆر ببوو.

سەروچاڤێن وی کەفتبوونە سەر سەروچاڤێن وێ، موویێن پرچا وی یا ڕەش دکەفتنە سەر لێڤێن وێ و ئەرزنکا وێ.

ل وی دەمی ترسا وان ب تنێ ئەو بوو نەکو کەسەك بهێتە د ژوور ڤە و وان هۆسا بینیت. وێرەکی و کەیفخوشیا وان یا بێ وێنە دگەل ئێشانێ تێکەل بوون. ئاورینێن وی، هزارەها ئاورینێن وی، ئاورینێن پڕی شەپرزەیی و واستیان و نازکی و داخوزا لێوبورینێ، لێ ئاورینا ژ هەموویا مەزنتر ئاورینا برساتییێ بوو.

***

پشتی هینگێ دەمێ دیناتییێ هات. هەر زوو وێ قومچکێن کراسێ خوە گرتن و وی ژی قائیشا پەنتەڕۆنێ خوە گرت و ب دەستی پرچێن خوە دروستکرن. پاشی ب ڕەخ هەڤدوو ڤە ڕوونشت و سەروچاڤێن وان سۆر ببوون. هەردوو گەلەك د ماندی و گێژ بوون ژبەر وی تشتێ ڕوودای، ژ وی تشتێ وان کری.

لەیلایێ سێ چپکێن خوینێ ل سەر مەحفیرێ دیتن، هەر یەکسەر دایك و بابێن وێ هاتنە پێشچاڤان دەمێ بێی کو ئاگەهـ ژ گونەها وێ هەبیت ئەڤا نوکە ئەنجامدای، ل سەر قەنەپێ دڕوونە خوارێ. ل دووڤ دا گەڕا شەرم و گونەهێ هات. ل ڤاتێ سەری ژی، دەنگێ چك چکا دەمژمێرێ دهات و د گوهێن لەیلایێ دا دەنگڤەددا، خوە دا بێژی چەکوچێ دادوەری یە یەك یەکە یێ ل سەر مێزا بەرامبەری وێ ددەت و وێ تاوانبار دکەت.

تارقی گوتێ: "دگەل مە وەرە."

بۆ ماوەیەکێ کێم، پیچەك مابوو ئەو بیرۆکە بچیتە د مەژییێ وێ دا، ئەو و تارق و دایکوبابێن وی پێکڤە بچن، چانتێن خوە لێکبدەن و سوواری پاسەکێ بن و ژ وان هەموو شەڕ و پێکدانان و توندوتیژییێ دوور بکەڤن. ئەو ڤێرێ بجهـ بهێلن و ئێدی یان خوشی یان نەخوشی بهێنە ڕێکا وان، ئەو هەموو پێکڤە دێ ل هەمبەر ڕاوەستن، ئێدی خاترخاستنەکا پڕی خەم و هێلان چاڤەڕێی وێ ناکەت. ئەو دشێت بچیت و ئەو دشێت دگەل وان بیت.

ل وی دەمی، گەلەك پشتی نیڤروویێن دی وەکو ڤێ پشتی نیڤروویێ ئەو دێ دگەل یەك بن.

"من دڤێت تو شوو ب من بکەی لەیلا."

پشتی ئەو ل سەر مەحفیرێ ڕابووینە ڤە، ژ نوو چاڤێن وێ ب چاڤێن تارڕقی کەفتن. وێ باش تەماشەی سەروچاڤێن وی کر، ئەو جارە وی یاری نەدکرن بەلکو ئاورینێن وی د ڕاستگوو و باوەرپێکری بوون.

"تارڕق."

"لەیلا، دا تە ماربکەم، ئەڤرۆکە دێ هەموو تشتان بڕێڤەبەین."

تارڕق ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو و بەحسێ هندێ کر ئەو دشێن نوکە بچنە مزگەفتەکێ مەلایەکی و دوو دیدەڤانان ببینن داکو وان ل هەڤدوو ماربکەت. لێ لەیلا ژ دایکا خوە دترسیا، سەر ڕەڤیا وێ ژ یا چەکداران مەزنتربوو، ل هەر چوار لایێن وێ پڕی کەرب و کین و بێ ئومێدی بوو. هەردیسان هزرا بابێ خوە کر ئەوێ ئەڤە دەمەکە خوە ڕادەستی قەدەرێ کری و گەنگەشە و هەڤرکیێن وی دگەل دایکا وێ جهێ دلپێڤەمانێ بوون.

"هندەك جاران ئەز هەست پێدکەم من ب تنێ تو یا هەی لەیلا."

ئەڤە کاودانێن ژیانێ بوون، ئەو کاودان و ڕاستییێن ب چ ڕەنگان ئەو نەدشیا خوە ژێ ڤەدزن.

"ئەز دێ تە ژ کاکێ حەکیم خوازم، ئەز یێ پشتڕاستم دێ ڕازی بیت و پیرۆزیا خوە ل سەر مە بارینیت، ئەز دزانم ئەو دێ ڕازی بیت."

تارڕقی ڕاست دگوت، بابێ وێ دێ ڕازی بیت لێ ئەڤ ڕازیبوونە دێ وی ب خوە ژی تێکشکێنیت. تارڕقی هەر دئاخفت، ل دەستپێکێ ب دەنگەکێ نزم و پاشی ب دەنگەکێ بلند و پاشی ب هیڤی خواستن و پاشی ب ئینانا هێجەتان. جار بۆ جارێ سەروچاڤێن وی پڕدبوون ژ هیڤی و ئومێدان و پاشی ژ ترسێ.

لەیلایێ گوتی: "ئەز نەشێم."

"وەنەبێژە، ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم."

"داخوازا لێبورینێ دکەم."

"ئەز حەز ژ تە دکەم."

ئەو ژ مێژە بوو لەیلا ل هیڤیێ ئەڤ پەیڤە ژ دەڤێ وی بهێنە دەرێ؟ چەندین جاران وێ خەون ب هندێ ڤە ددیتن؟ ها ل دوماهیێ ئەڤ پەیڤە ژ دەڤێ وی دەرکەفتن، لێ ڕەوشا

گوتنا وان یا بوویە ئەگەرێ تێکشکاندنا وێ. لەیلایێ گوتی: "ئەز ژبەر بابێ خوە ناهێم، تشتێ یەکانە نوکە وی هەی ئەزم، ژبەر هندێ ئەو خوە ل بەر دوورکەفتنا من ناگریت."

تارِقی ئەڤ چەندە باش دزانی، وی دزانی کو لەیلا نەشێت زێدەتر پابەندییێن ژیانا خوە بهاڤێتە بن پێن خوە. بەلێ پێداگیریا وی و نەرِازیبوونا لەیلایێ، پێشنیارا وی بۆ خواستنا لەیلایێ و رِەتکرنا داخوازا وی ژ لایێ لەیلایێ ڤە، رِوندك و گریا لەیلایێ، ئەڤ تشتە هەموو د بەردەوام بوون.

ل دوماهییێ لەیلایێ ئەو نەچار کر ژ وێرێ بچیت.

ل بەر دەرگەهی، لەیلایێ سوز ژێ وەرگرت کو بێی خاترخواستن ژ دەڤ وێ بارکەت و پاشی دەرگەهـ لێ گرت و پشتا خوە ب دەرگەهی ڤەنا. وی ل لایێ دی مست ل دەرگەهی ددان و ل ڤی لایی ژی لەیلایێ دەستەك دانابوو سەر زکێ خوە و دەستەك دانابوو سەر دەڤێ خوە. ل لایێ دی تارِقی دئاخفت و دگوتێ کو سوز بیت ئەز هەر ل سەر خاترا تە ب ڤەگەرم. لەیلا هند ما ل بەر دەرگەهی هەتا تارِق واستیای و نەچار بووی ژ وێرێ بچیت و گوهێ خوە دا پێنگاڤێن پێن وی دەمێ ژ مالا وان دوور دکەفتی. دەنگێ هەموو تشتان کپ و بێدەنگ بوو ب تنێ دەنگێ تۆپان نەبیت کو بەردەوام دەنگڤەددان، زێدەباری دەنگێ دلێ وێ یێ کو خوە بلەز دقووتای دناڤ هناڤێن وێ، چاڤێن وێ و هەستیکێن وێ دا.

# 26

ئەو ڕۆژ، گەرمترین ڕۆژ بوو د وێ سالێ دا، چیایان گەرماتیەکا مەزن دناڤ خوە دا هەمبێز کربوو. باژێرێ کابولێ دناڤ تۆز و دووکێلێ دا نقووم ببوو. ئەو چەند ڕۆژ بوو کارەب ژی هاتبوو برین. ل سەرانسەری کابولێ هەموویێ پانکەکا بای یا ب تنێ ژی کار نەدکر. ڕەوشا باژێرێ گەلەك ئالۆز بووو.

لەیلایێ خوە ل سەر قەنەپەکێ د ژوورا مێهڤانان ڤە درێژ کربوو و دبن جلکێن وێ ڤە، لەشێ وێ خر ببوو خوهـ. هەر جارەکا وێ بێهنا خوە دهەلکێشا، کونێن دفنا وێ ژ گەرمان دا دسۆتن. وێ دزانی و گوهـ لێ هەبوو کو دایك و بابێن وێ یێن چووینە د ژوورا دایکا وێ ڤە و یێ ل سەر بابەتەکی دئاخڤن.

شەڤا بەری هینگێ ژی ل دووڤ دەنگێ وان هشیار ببوو دەمێ ل نیڤا شەڤێ قەرقەشا وان ب سەر ڤاتێ دوێ دکەفتی. هەڕۆژ ئێدی ڕەوشا وان ئەڤە بوو ب تایبەت پشتی وێ ڕۆژا گوللەیەك ب دەرگەهێ وان کەفتی و کون کری. ژ دەرڤەی مالێ، ژ دوور ڤە دەنگێ تۆپان دهاتە گوهێن وان و ژ نێزیك ژی دەنگێ گوللەیێن یەك ل دووڤ یەکێ.

ژبلی شەڕێ چەکداران، د ناخێ لەیلایێ ژی دا شەڕەکی سەرهلدابوو، ژ لایەکی ڤە وێ هزردکر ئەو کارێ وێ و تارقی کری جهێ شەرم و گونەهەکا مەزنە، ژلایەکێ دی ژی هزرکر تشتەکێ ئاسایی یە و چ گونەهـ تێدا نینە، بەلکو تشتەکێ سروشتی یە و دشێت ب سانەهی ژبیربکەت. هەردیسان کارەکێ خوش و جوان بوو ب تایبەت پشتی کو زانی ئێدی ئەو وی نابینتەڤە.

لەیلایێ ل سەر قەنەپێ پیچەکێ خوە لڤاند و کەفتە سەر لایەکی و بزاڤ دکر تشتەکی بینتە بیرا خوە: وێ ئینا بیرا خوە دەمێ ئەو هەردوو ل سەر ئەردی ڕازاین و بۆ ماوەیەکی تارقی سەروچاڤێن خوە نێزیکی یێن وێ کرن و پاشی چوو بن گوهێ وێ و تشتەك گوتێ، ئەز دترسم تە ب ئێشینم؟ یان ئەڤ تشتە دێ تە ئێشینیت؟

بیرا لەیلایێ باش ناهێت کا کیژ ژ ڤان هەردوو ئاخفتنان گوتبوویێ.

*ئەز دترسم تە ب ئێشینم؟*

*ئەڤ تشتە دێ تە ئێشینیت؟*

**ب تنێ دوو حەفتی بورین ل سەر چوونا تارڤی دەمێ هێدی هێدی لەیلایێ ئەو ژ بیر دکری. ب تنێ بورینا دەمی دێ شێت لێڤێن ڤان بیرهاتنێن تیژ بتراشیت، مەژیێ لەیلایێ تێکچوو، ئەرێ ئەڤە وێ چ دگوت؟ لێ هۆسا دیارە ڤێ چەندێ ژ دل یا دەستپێکری و ژ نیشکەکێ ڤە ب خوە حەسیا کو ئەو یا تارڤی ژبیر دکەت.**

**لەیلایێ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك.**

**دگەل بورینا دەمی، هێدی هێدی ئەو دێ ژ ڤێ ڕاهێنانێ واستییێت، ئێدی دێ بۆ وێ یا ب زەحمەت و گران بیت بیرا خوە ل هەموو تشتان بینیت، بیرئینان و زیندیکرنا وان تشتێن ماوەیەکە گیانێ خوە ژدەستدای، کارەکێ ب زەحمەتە.**

**د ڕاستی ژی دا، پشتی چەندین سالێن دی، ئێدی ئەو خەمان ژ بۆ ژدەستدانا تارڤی ناخوت. یان ژی هەر چ نەبیت وەکو نوکە بۆ چوونا وی ب خەم ناکەڤیت. ڕۆژەك دێ هێت ب تەمامی دێ ناڤچاڤێن وی ژبیر بکەت، ڕەنگە ئەگەر ئەو ل سەر جادەیێ ژنەکێ ببینیت دەمێ گازی کورێ خوە بکەت کو ناڤێ وی تارڤ بیت، دەڤ وێ تشتەکێ ئاسایی بیت یان هەر چ نەبیت وەکو نوکە دلێ وێ ب خەم نەکەڤیت هەر گاڤا ناڤێ وی دهێتە گوهێن وێ.**

**ئێدی چ جاران ئەو ژبەر چوونا وی دلتەنگ نابیت هەروەکو کا چەوا ئەڤرۆکە ئەو گەلەك یا دلتەنگ و نەخوش، خو دێ بێژی چوونا وی وەکو ئێشانا ژێڤەکرنا ئەندامەکێ لەشێ وێ یە یێ کو قەت تەنا نەبیت.**

**ب تنێ هندەك جارێن کێم نەبن دەمێ لەیلا دبیتە ژنەکا بالق و پێگەهشتی، دەمێ مژوولی ئووتیکرنا جلکێن خوە یان لڤاندنا جولانکا زارۆکێ خوە بیت، یان ژی مژوولی هەر کارەکێ دی یێ ناڤمالی بیت و تارڤی بینتە بیرا وێ، وەك گەرماتیا مەحفیرکا ل بن پێن وێ ل ڕۆژەکا هاڤینێ، دیتنا داڤێن خەلەك یێن پرچا کەسەکێ بیانی دەمێ دهێنە ناڤچاڤێن وی، ڕەنگە ئەڤ ڕوودانە بیرهاتنێن وێ ڕووداناا پشتی نیڤروویێ بینە بیرا وێ، وێگاڤی هەموو تشت دێ هێنە بیرا وێ، هەموو ئەو تشتێن بووینە پاڵدەر، داخباربوونا وان ب هەڤدوو، هەمبێزکرنا هەڤدوو، ئێشانا وی کاری، پشتی هینگێ تاما وێ یا خوش و ل دوماهیێ خەم و نەخوشیێن پشتی هینگێ.**

ڤان هزرانن ئەو وەکو کەسەکا پۆسیدە و بێ تاقەت لێکربوو.

ئەو چرکەیێن خوش بورین و ئەو ب تنێ دناڤ خەمان دا هێلا، ئێدی ئەو یا وەلێ هاتی هەست ب چ تشتان ناکەت ب تنێ واستیان و پۆسیدەیەکا بێ وێنە.

ل دوماهیێ ئەو پرسیار هاتە بیرا لەیلایێ، بەلێ هاتە بیرا وێ کو تارقی گوتبوویێ ئەز دترسم تە بئێشینم. بەلێ ژ ڕاستا وی وەگوتبوو! کەیفا لەیلایێ گەلەك هات کو ئەڤ چەندە هاتیە بیرا وێ.

ژ نیشکەکێ ڤە دەنگێ بابێ وێ هاتە گوهێن وێ: "ڕازی بوو. ئەم دێ چین لەیلا، دایکا تە ڕازیبوو. ئەم هەرسێ دێ پێکڤە چین. دێ کابولێ بجه هێلین."

★★★

ئەو هەرسێ ل ژوورا دایکا وێ و ل سەر تەختێ وێ یێ نڤستنێ ڕوونشت. ژ دەرڤە ژی بەردەوام دەنگێ مۆشەکێن هێزێن حیکمەتیار و مەسعودی دهاتن دەمێ د هەڤدوو دوەرکرین. لەیلا یا پشتڕاست بوو نوکە ئەو مۆشەك ب جهەکی کەفتینە و بووینە ئەگەرێ کوشتنا خەلکەکێ بێگونەهـ.

دووکێلەکا ڕەش ژ سەر ئاڤاهیەکی بلند دبوو کو ل سەر یەك دا هەرفتبوو و ببوو کاڤلێ و گرەکێ داروبەران. کومەکا کەلەخان کەفتبوونە واران و ڕەنگە سوبەهی ژ نوو پارچەیێن وان هەموو بهێنە کومکرن. چ پێنەڤێت هندەك پارچە دێ هێنە کومکرن و هندەك ژی ناهێنە دیتن. پشتی هینگێ ژی سەیێن کابولێ کو دەڤێ وان تامکریە گوشتێ مرۆڤان، دێ دەست ب گێرانا ئاهەنگان کەن چونکی خوارنەکا باش بۆ وان پەیدابوویە.

بابێ وێ گوت کو ل دەستپێکێ دێ چنە پاکستانێ داکو داخوازا ڤیزەیێ بکەن. پاکستان ئەو جهـ بوو یێ تارق ژی چوویێ، لەیلایێ ب تبلێن دەستێن خوە هژمارت کو ئەڤە هەڤدە ڕۆژە تارق ژ کابولێ چووی. مخابن هەکە دایکا وێ بەری هەڤدە ڕۆژان ڕازیبایە، ئەو هەموو دا پێکڤە چن، چ پێنەڤێت نوکە ئەو دا دگەل تارقی بیت. لێ چ نینە و هێشتا چ ژێ نەچوویە مادەم ئەو هەرسێ پێکڤە دێ چنە پێشاوەرێ و ل وێرێ دێ تارقی و دایکوبابێن وی بینیت و پشتی هینگێ ئەو دێ پێکڤە بەلگەنامەیێن خوە تەمام کەن و پاشی خودا ب تنێ دزانیت کا ئەو دێ کیڤە چن. بۆ ئەوڕۆپا ؟ ئەمریکا؟ یان ژی هەروەکو بابێ وێ گوتی، بەلکی بچنە جهەکێ نێزیکی ئاڤێ.

دایکا لەیلایێ ل سەر تەختێ خوە یا درێژکری بوو چاڤێن وێ وەرمتبوون و داڤێن پرچێ یێن وەریایی ژ ناڤ پرچا خوە دئینانە دەرێ.

سێ ڕۆژان بەری هینگێ، لەیلا بۆ گوهۆڕینا بابێ خوە چووبوو ژ دەرڤە و ل بەر دەرگەهێ حەوشێ ڕاوەستیا بوو و پالاێ خوە دابوو دەرگەهی، ژ نیشکەکێ ڤە دەنگێ تەقەکرنەکا بلند هات و تشتەك دبەر گوهێ وێ یێ ڕاستێ ڕا بوری و پاشی بەرەڤ ئاسمانی بلند بوو.

پشتی کوشتنا گێتییێ و هزارەها خەلکێ دی یێ سڤیل و شەڕێن بەردەوام و سەدان مۆشەکێن ڕۆژانە ب کابولێ دکەفتن، زێدەباری دیتنا وێ کونا گرۆڤر یا ل سەر دەرگەهێ وان پەیدابووی کو سێ تبلان ب تنێ ژ سەرێ لەیلایێ یا دووربوو دەمێ تەلقە ب دەرگەهی کەفتی، ئێدی دایکا وێ ژ خەوا خوە یا گران هشیاربوو و هشێن وێ هاتنە سەرێ وێ، ڤێ ڕوودانێ وەلێکر هزرا خوە د هندێ دا بکەت کا هەتا نوکە شەڕی چ مالا وێ وێران کریە، شەڕی دوو زارۆکێن وێ ژێ ستاندن و ئەگەر یێ بەردەوام بیت دوور نینە زارۆکێ سییێ ژی ژێ بستینیت.

ل سەر دیوارێ مالا وان، ئەحمەد و نوری ب گرنژین ڤە تەماشەی خوارێ دکر. لەیلایێ دیت کو دایکا وێ گەلەك ب خەمگینی یا وێنەیێن کورێن خوە ڤەددەت و هەست ب گونەهێ دکەت خوە دا بێژی ئەو یا ل هیڤیا ڕازیبوونا وان، یان هیڤیان ژێ دکەت هەتا دەستووریێ بدەنێ دا ژ باژێری دەرکەڤن و یا داخوازێ ژێ دکەت ل وێ ببورە.

بابێ وێ گوت: "ئێدی ل ڤێرێ مە چ تشت نەماینە، هەردوو کورێن مە ژ دەستێ مە چوون، لێ هێشتا مە لەیلا یا مای، هێشتا مە هەڤدوو یا مایی، فەریبا، ئەم دشێین دەست ب ژیانەکا نوو بکەین."

بابێ وێ خوە گەهاندە نێزیکی دایکا وێ و دەستێ وێ گرت و گڤاشت، دایکا وێ دەستێ خوە ژ دەستێ وی نەئینا دەرێ، هۆسا دیارە نیشانێن ڕازیبوونێ ل سەر دێمێ وێ دیاربوون. وان هێدی دەستێن هەڤدوو گرتن و ب ئارامی هەڤدوو هەمبێز کر. دایکا وێ سەروچاڤێن خوە دانانە سەر ملێن بابێ وێ و ب هەردوو دەستێن خوە ئەو گرت.

ل وێ شەڤێ، ژ کەیفان دا خەو نەچوو چاڤێن لەیلایێ. ل سەر جهێن خوە ڕازا و تەماشەی ئاسویا هەلاتنا ڕۆژێ دکر کا چەوا ب ڕۆناهیەکا پرتەقالی و زەر هێدی هێدی

ئەسمانی ڕوهن دکەت. پشتی هینگێ، سەرەڕای وێ خوشیا دەروونی و دەنگێ تۆپبارانا ژ دەرڤە، ل دوماهیێ خەو کەتە چاڤێن لەیلایێ.

د خەونێ دا وێ دیت ئەو و تارق یێن ل سەر لێڤین دەریایەکێ و ل سەر دووشەکەکێ ڕوونشتینە. هەرچەندە دنیا ڕۆژە و سەقایێ یێ سار بوو، لێ ڕوونشتا وێ ب ڕەخ تارقی ڤە و ل بن وی پاتەیێ ل سەر خوە دادایی، هەست ب گەرماتیێ دکر. ل وێرێ چاڤێ وێ ب کومەکا ترۆمبێلان کەفت کو یێن ل پشت دیوارەکێ نزم و ڕەنگ سپی و ل پشت ڕێزەکا دارێن خورمێ یێن با دئینیت و دبەت، یێن ڕاوەستیاین.

ژبەر وی بایێ ب هێز، چاڤێن وێ تژی ڕۆندك بوون و پێلاڤا وێ چوو دناڤ خیزی ڕا، هندەك پرتێن داروباری یێن مری ژبەر بای یێن ژ جهەکی دچنە جهەکێ دی. ژ دوور ڤە ژی هندەك پاپۆر دیتن کو ژبەر پێلێن ئاڤێ یێ بلند و نزم دبن. ل دورماندوری وان، باڵندەیێن نەورەس ژ بەر بای یێ ڤێژ ڤێژێ دکەن و دلەزرن.

ڤی بای دندکێن خیزی یێن سڤك بلند کرنە بەر ئەسمانی و بەرەڤ جهەکێ دی دبرن. دەنگەك دهاتە گوهێن وێ کو وەکو دەنگێ سترانان بوو، وێ بەحسێ وێ سترانا ب ئاخێ هاتیە گوتن بۆ تارقی دکر یا بەری چەند سالان بابێ وێ نیشا وێ دایی.

هەر دناڤ وێ خەونێ دا، تارقی دەستێن خوە نێزیکی برییێن وێ دکر و دندکێن خیزی ژێڤە دکرن. حەلاڤا تبلا تارقی ژی یا دتەیسیت و هەر وەکو حەلاڤا ل دەستێ وی یا زێری یە و نەخشەیەکێ خواروڤیچ یێ ل سەر.

وێ دگوتە تارقی ئەڤ چەندە ڕاستە، دەڤ دەنگە ژ ئەنجامێ ڤێکەفتنا دندکێن خیزی پەیدا دبیت. گوهێ خوە بدێ، تارقی ژی گوهێ خوە ددایێ. ڕوییێن وی خاڤ بوون. دووبارە وان گوهێ خوە ددا وی دەنگی، دەنگەکێ وەکو ڕاهێلانا ئاخینکان بوو دەمێ با ڕادبیت و دەمێ ب هێز دکەڤیت.

***

بابێ وێ گوت کو ب تنێ دێ وان تشتان دگەل خوە بەین یێت گەلەك د گرنگ و یێن مای ژی دێ فروشین.

"ئەڤ پارە دێ هاریکاریا مە کەن خوە ل پێشاوەرێ پێ ب خودان بکەین هەتا ل وێرێ کارەکی دبینم."

ل هەردوو ڕۆژێن ل دووڤ دا، ئەو تشتێن وان ل بەربوو بفرۆشن، هەموو کومکرن و دانانە سەر یەك.

لەیلایێ د ژوورا خوە ڤە، جلکێن خوە یێن کەڤن و پێلاڤێن کەڤن و کتێب و یاریێن خوە دانانە لایەکی. پاشی سەحکرە بن تەختێ خوە، چێلەکا بچووك یا ڕەنگ زەر و ژ شووشەی دروستکری دیت کو جارەکێ حەسینایێ ل بێهنڤەدانا پۆلا پێنجێ سەرەتایی بۆ وێ کربوو دیاری.

هەردیسان وێ مەدالیەك ژی دیت کو تەپەکا بچووك بوو و جارەکێ گێتیێ دابوویێ وەك دیاری. پاشی زیبرایەکێ داری یێ ل سەر چوار تائیرەیان دچوویی دیت و ل دووڤ دا ژی زەلاّمەکێ جلکێن ئەسمانی ل بەر کەفتە بەر چاڤێن وێ کو ژ سیرامیکی هاتبوو دروستکرن و ڕۆژەکێ وێ و تارڤی دناڤ جوکێ دا دیتبوو دەمێ هێشتا ژیێ وێ شەش سال و یێ تارڤی هەشت سال. لەیلایێ هزرێن خوە کرن کا وێ ڕۆژێ وێ و تارڤی چەند جرۆبرِ کر سەرا هندێ کا کیژ ژ وان ل دەستپێکێ ئەو یاریکە دیتبوو.

دایکا وێ د ژوورا خوە ڤە کەلوپەلێن خوە کومدکرن، لێ گەلەك نە ژ دل. ئامانێن خوەیێن نوو باش و چوارچەڤ و زێرێن خوە و حەلاڤا خوە یا هەڤژینیێ و پترِیا جلکێن خوە یێن کەڤن دانانە ڕەخەکی.

"ئەرێ ما تو دێ ڤی ژی فرۆشی."

لەیلایێ کراسێ دایکا خوە یێ بوکینیێ بلند کر و دا بەر سینگێ خوە. دەستێ خوە هاڤێتە هچکێن وی و وان شەرِیتێن ل دورماندوری حەفکا وی و وان لولومەرجانێن ب دەستی پێڤە کرین.

دایکا وێ ملێن خوە هەژاندن و کراس ژ دەستان ئینا دەرێ. پاشی کراس حێل هاڤێتە سەر کوما جلکێن خوە یێن دی هەروەکو کا چەوا دەمێ کەسەك ب هێز پلاستەرێ ژ سەر برینا کەسەکی ڕادکەت.

لێ ڕەوشا بابێ وان ژ یا هەموویان نەخوشتر بوو.

لەیلایێ دیت بابێ وێ یێ د ژوورا پەرتووکێن خوە ڤە و ب هووری تەماشەی ڕەفانکێن وان دکەت و خەمێن ڤێ دنیایێ هەموویێ دناڤ چاڤێن وی دا ددیارن. تیشێرتەکێ

کەڤن ل بەر بابێ وێ بوو کو وێنەیێ پرا سۆر یا سان فراسیسکو ل سەر بوو و پێلێن دژوار یێن ئاڤێ بلند ببوون.

بابێ وێ گوت: "ئەرێ ئەو گوتن ل بیرا تەیە دەمێ دبێژیت ئەگەر تو ل گزیرتەکا ڤەدەر بووی و ب تنێ تە ماف هەبیت پێنج پەرتووکان دگەل خوە ببەی، دێ کیژ پەرتووکان هەلبژێری؟ چ جاران من هزرا هندێ نەدکر دێ ڕۆژەکا هۆسا ب سەرێ من ژی هێت."

"خەمان نەخو باب، دێ پەرتووکێن نوو بۆ تە ل وێرێ دابین کەین."

گرنژینەکا خەمگین ل سەر لێڤێن بابێ وێ خوە نەخشاند، بابێ وێ گوت: "ئم، هندی ئەز دهێمە خوە ئەز باوەرناکەم کو دێ کابولێ بجهـ هێلم، ئەز ل ڤی باژێری یێ چوویمە قوتابخانەیێ و یەکەم کارێ من ژی هەر ل ڤێرێ بوو. هەر ل ڤی باژێری بوو ئەز بوویمە باب، هەستەکێ سەیر ل دەڤ من پەیدادبیت دەمێ بیرا من ل هندێ دهێت کو دێ ژ ڤی باژێری چم و ل بن ئەسمانێ باژێرەکێ دی نڤم."

"بۆ من ژی یا سەیرە."

"ئەڤە سپێدێ وەرە ئەڤ هوزانە د مەژیێ من دا دەنگڤەددەت کو ژلایێ "سائیبێ تەبرێزی" ل چەرخێ حەفتێ زاینی ل سەر کابولێ هاتیە نڤیسین. ل سەردەمەکی من ئەو هوزان هەموو ژبەر بوو لێ نوکە ب تنێ دوو دێرێن وێ ل بیرا من ماینە."

***کەس نەشێت وان ستێران بهەژمێریت یێن ل ئەسمانێ وێ دبرسقن***

***یان هزار ڕۆژێن گەش یێن خوە ل پشت چیایێن وێ دڤەشێرن****

لەیلایێ سەرێ خوە بلند کر دیت بابێ وێ یێ دکەتە گری، دەستێ خوە هاڤێتە ناڤتەنگا خوە و گوت: "باب، ئەم دێ هەر زڤرینەڤە، دەمێ شەڕ ب دوماهی دهێت، ب ئانەهیا خودای مەزن دووبارە دێ زڤرینەڤە کابولێ. تو ب خوە دێ ڤێ چەندێ بینی."

***

* دەقێ هوزانێ یێ ڕەسەن:

حساب مه جبینان لب بامش که میداند

دو صد خوشیدرو افتاده در هر پای دیوارش

ل سپێدەهیا ڕۆژا سیێ، لەیلایێ ئەو کەلوپەلێن خوە یێن دانانینە سەر یەك هەموو برنە دناڤ حەوشێ و ل بەر دەرگەهی دانان و پاشی بابێ خوە بەرهەڤ دکر داکو بچیت ترۆمبێلەکێ ب کرێ بگریت داکو وان کەلوپەلان ببەنە بازاڕێ تشتێن کەڤن و بفروشن.

لەیلا بەردەوام دناڤبەرا ژوورێن مالێ و حەوشێ دا دهات و چوو و جلك و ئامان و کارتۆنێن پەرتووکێن بابێ خوە دبرنە ناڤ حەوشێ. ل دەمێ نیڤرۆ، ئەو کەلوپەلێن دناڤ حەوشێ دا هند بوونە گەلەك کو هەتا کەمەرا لەیلایێ بلند بوون. ڕاستە لەیلا گەلەك د واستیا، لێ وێ دزانی دگەل هاتنوچوونەکێ ئەو پتر یا نێزیکی تارقی دبیت، ژبەر هندێ وێ پێنگاڤێن خوە بلەزتر دهاڤێتن و واستیانا خوە ژ بیردکر.

لەیلایێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی دایکا خوە کر کو یا ل ڤاتێ دووێ و د ژوورا خوە یا نڤستنێ ڤە تەماشەی لەیلایێ دکەت. دایکا وێ د پەنجەرکێ دا ڕوونشتبوو و ئەنیشکا خوە دانابوو سەر لێڤا پەنجەرێ و هەتاڤەکا گەرم و ڕوهن ل پرچێ وێ ددا و سەروچاڤێن وێ یێن لاواز دتەیسین.

دایکا وێ هەمان ئەو کراسێ شین کربوو بەر خوە یێ کو بەری چوار هەیڤان ل ڕۆژا ئاهەنگێ کریە بەر خوە. هەرچەندە ئەو کراس یێ ژنێن گەنج بوو، لێ ل وێ ڕۆژێ دایکا وێ وەکو ژنەکا دانعەمر و پیرەژنەکا بێچارە دهاتە پێشچاڤێن وێ، دوو چاڤێن وێ تاری ببون و چەندین پنییێن ڕەش ل دورماندوری چاڤێن وێ پەیدابوون، ژنەك بوو تەمام هاتبوو گوهۆڕین ژ وێ ژنا دێم گەش و گرۆڤر یا دناڤ وێنەیێن وێ یێن ڕۆژا بووکینیێ ل کابولێ گرتین.

لەیلایێ گوت: "ئەڤ کەلوپەلە پێدڤی ب دوو ترۆمبێلێن مەزنن."

لەیلایێ دیت بابێ وێ ژی یێ ل ژوورا مێهڤانان ڤە مژوولی ڕێکخستن و دانانا کارتۆنێن پەرتووکێن خومیە.

دایکا وێ گوت: "ئەگەر تو ب دوماهی هاتی، وەرە سەری داکو پێکڤە فراڤینێ بخوین، من هێکێن کەلاندی و لوبیکێن ڤەلاندی یێن بەرهەڤ کرین."

"ممم، ئەو خوارنن یێن ئەز حەز ژێ دکەم."

ژ نیشکەکێ ڤە، خەونا وێ هاتە بیرێ، ئەو تارق و دوشەك و ئوقیانوس و بایێ ب هێز و ڕابوونا خیزی.

نوکه هزرا خوه دکر کا فرینا خیزی کیژ ئاواز هەبوو؟

لەیلا ڕاوەستیا، چاڤێ وێ ب مارگیسکەکێ ڕەنگ گەور کەفت کو ژ کونەکێ دناڤ ئەردی دا دەرکەفت و بلەز سەرێ خوە بۆ ڤی لایی و لایێ دی دلڤاند و پاشی بلەز خوە هاڤێتە دبن بەرەکی ڤە.

لەیلایێ دووبارە سەر لێڤێن ئاڤێ ئینانە بیرا خوە، ڤێ جارێ ئاوازا دەنگێ خیزی ژی د گوهێن وێ دا دەنگڤەددا و جار بۆ جارێ بلندتر لێ دهات هەتاکو هەموو تشتێن دەوروبەر دناڤ خوە دا نقووم کرین. نوکە باڵندەیێن نەورەس ب بێدەنگی دفڕن و دمێن خوە دگرن و ڤەدکەن و پێل ژی بلەز یێ بەرەڤ کناری دهێن لێ چ دەنگ ژێ ناهێن. دندکێن خیزی ئاواز هەبوون لێ نوکە ئەو ئاواز بوونە ڤێژی.

لەیلایێ پەرتووکێن خوە هاڤێتنە سەر سینگێ خوە، تەماشەی ئەسمانی کر و ب دەستەکی چاڤێن خوە گرتن. پاشی گۆڕمێنەك کو وەکو گرمێنا عەوران بوو هاتە گوهێن وێ و ل پشت سەرێ وێ تیشکەکا سپی دیاربوو و ئەردێ ل بن پێن وێ هەژیا.

تشتەکێ گەرم و ب هێز ب پشتا وێ کەفت و بوو ئەگەر سەندەلێن وێ ژ پێن وێ ببن و ئەو بلندکرە بەر ئەسمانی، نوکە ئەو یا دفڕیت، دناڤ بای دا یا دزڤڕیت و خوار دبیت، وێ خوە دناڤ ئەسمانی و پاشی ل سەر ئەردی دیت، جارەکا دی ل ناڤ ئەسمانی و ل سەر ئەردی. دگەل وێ پارچەکا داری یا سۆتی و هزاران پرتێن شووشەی یێن دگەل وێ دفڕن. لەیلایێ هزر کر ئەو یا هەموو وان پارچەیان یەك یەکە دبینیت یێن ل دوماندوری وێ دزڤڕن و دگەل وێ بلند دبن و تیشکێن ڕۆژێ یێن دناڤ دا گەش دکەن و کەسکوسۆر یێ ژناڤ دەردکەڤیت.

ل دوماهیێ ئەو ب دیواری کەفت و کەفتە سەر ئەردی، تۆز و هوورکێن بەری و پرتێن شووشەی ل سەر سەرێ وێ بارین، پاشی وێ وێ دیت تشتەك کەفتە ب ڕەخ وێ ڤە. پارچەیەکا خویناوی یا تشتەکی بوو، پارچەیەکا لەشی یا سۆر و نخافتی بوو ب مژێ.

***

تشت ل پێشچاڤێن وێ دهاتن و چوون، ڕۆناهیەکا گەش ل سەر سەرێ وێ دپەشی، دێمێ ژنەکێ ل پێشچاڤێن وێ دیاربوو،

سەروچاڤێن کەسەکێ دی، ئەڤ جارە سەروچاڤێن زەلاّمەکی بوون، هۆسا دیاربوو کو دێمێ وی یێ فرەهـ و خەمگین بوو، لێڤێن وی دلڤلڤین لێ چ دەنگ ژێ نەدهاتن. تشتێ یەکانە یێ لەیلایێ گوهلێدبووی دەنگڤەدانەك بوو نەك زێدەتر.

وی زەلاّمی دەستێ خوە درێژ کرە لەیلایێ و سەر و ژ نوو لێڤێن وێ لڤلڤین و ئاخفت. یا دئێشیت، بێهنا وێ ژی ب خورتی یا دهێت و دچیت، هەموو لەشێ وێ یێ دئێشیت، گلاّسەکا ئاڤێ بۆ بینن، حەبکەکا پیڤازی.

★★★

دیسان ئەو ژنا دێمەکێ درێژ و دوو چاڤێن نێزیکی یەك هەین یا تشتەکی دبێژیت، لەیلایێ ژ بلی گڤگڤەکێ، گوهـ ل چ تشتێن دی نینە. لێ ئەو یا پەیڤێن وان دبینیت کو چەوا وەکو ئاڤەکا تیر و ڕەش ژ دەڤێ وێ ژنێ دەرکەفت.

سینگێ وێ یێ دئێشیت، دەست و پێن وێ یێن دئێشن

گەلەك دیمەنێن جودا جودا ل دەوروبەری وێ دهاتن و چوون

تارق کانێ یە؟

بوچی ل ڤێرێ نینە؟

تارپاتی، ستێر.

★★★

ئەو و بابێ خوە یێ ل سەر بلنداهیەکێ ڕوونشتین، بابێ وێ دەستێ خوە درێژ کرە زەڤیەکا جەهی و ماتۆڕەکێ کارەبێ شول کر

ئەو ژنا سەروچاڤ درێژ ل سەر سەرێ وێ یا ڕاوەستیایی و یا تەماشەی وێ دکەت

بێهنا وێ یا تەنگ بووی

ل سەر جهێن وێ، دەنگێ ئوکوردیونەکێ دهات

سوپاس بۆ خودای، حەبکا پیڤازی، پشتی هینگی بێدەنگیەکا کپ پەڕێن خوە ب سەر هەموو تشتان دادان.

# 27

**مەریەم**

**"ئەرێ تو دزانی ئەز کیمە؟"**

**کچکێ مژیلانکێن خوە ل سەر یەك ڕاکرن.**

**"ئەرێ تو دزانی ئەز کیمە؟"**

**لێڤێن کچکێ لەرزین، جارەکا دی چاڤێن خوە نقاندن و تفا دەڤێ خوە داعیرا و دەستێن خوە ب سەروچاڤێن خوە دا ئینانە خوارێ و ژ دەڤ خوە تشتەك دگوت.**

**مەریەمێ زێدەتر خوە نێزیکی وێ کچکێ کر و سەرێ وێ دانا سەر پێ خوە، کچکێ گوت: "ئەڤ گوهێ من چ لێ هاتیە؟ من گوهـ ل چ تشتان نینە."**

***

**ل حەفتیا یەکێ، ئەو کچك ژبەر کاریگەریا حەبکێن پیڤازی یێن ڕەشیدی ژ نەخوشخانەیێ بۆ دکرین، ب تنێ دنڤست. هندەك جاران ژبەر خەو دئاخفت و جاران ژی دکرە هەوار و ناڤێ هندەك کەسان دئینا کو مەریەمێ نەدنیاسین.**

**هندەك جارێن دی ژی ژبەر خەو دکرە گری و ئاگەهـ ژ خوە نەدما، یان ژی دا ژ نیشکەکێ ڤە بەتەنیکێ ل سەر خوە هاڤێژیت و کەتە ڤێژی، ژبەر هندێ مەریەم یا نەچار بوو بەردەوام چاڤدێریا وێ بکەت. هندەك جاران دا دلێ وێ ڕابیت و هەر تشتەکێ بەری هینگێ مەریەمێ دایێ دا هەموویێ ڕاکەت.**

**ئەو جارێن دهاتە سەر هشێن خوە و ئاگەهـ ژ خوە دبوو، ب دوو چاڤێن خەمگین و تژی ڕۆندك دا تەماشەی مەریەم و ڕەشیدی کەت و بەرسڤەکا کورت و پرت پرت بەرسڤا پرسیارێن وان دەت.**

**دەمێ ڕەشیدی و مەریەمێ ڤیابایە خوارنێ بدەنێ، دا وەکو زارۆکان دەست ب گریێ کەت و خوە دەتە لایەکێ دی، ژبەر هندێ مەریەمێ کەفچك هەلدگرت و ب خورتی خوارن**

ددایێ، لێ وێ وەکو تەختەکی خوە ڕەق دکر و دڤێ خوە ڤەنەدکر، پاشی دا ئارام بیت و دەڤێ خوە ڤەکەت و خوارنێ خوت، لێ دگەل هندێ ژی یەکسەر دا دووبارە دەست ب گرییێ کەت.

ڕەشیدی گوتبوو مەریەمێ کو ملحەمێ ئەنتیبایوتیکان ل برینێن ناڤچاڤێن وێ و مل و دەست و پێ و چوکێن وێ بدەت. مەریەمێ برینێن وێ ب پارچەیێن لفافەیێن پاقژ برینێن وێ دپێچان. دەمێ دلێ وێ ژی ڕادبووی، دا مەریەم پرچا وێ ڕاکەت و بەتە پشتێ و سەرێ وێ بلند کەت.

مەریەمێ پرسیار ژ ڕەشیدی کر: "ئەرێ هەتا کەنگی ئەڤە دێ مینتە ل ڤێرێ؟"

"هەتا باشتر لێ دهێت، سەحکێ، کچکا هەژار نوکە گەلەك یا دامای و نەخوشە و نەشێت بچیتە چ جهان."

***

ئەو ڕەشید بوو یێ کو لەیلایی دناڤ خانییێ وان یێ هەرفتی دا دیتی و ئینایە دەرێ.

ڕەشید ل سەر کورسیکەکا ب ڕەخ تەختێ مەریەمێ یێ نفستنێ ڤە یێ ڕوونشتی بوو، گوتە کچکێ: "باش بوو وی دەمی ئەز ل مال بووم. مەرەما من ئەوە تو یا ب بەخت بووی، من تو ب دەستێن خوە دناڤ داروبەرێن هەرفتی دا ئینایە دەرێ. پارچەیەکا ئاسنی کو هندی تبلا دەستێ من بوو، چووبوو دناڤ ملێ تە یێ ڕاستێ ڕا. من ژبیرکر پلایسی بکاربینم داکو بینمە دەرێ، لێ سوپاس بۆ خودای نوکە تو یا باشی و ل دەمەکێ نێزیك دێ وەکو بەرێ ڕابیەڤە سەر خوە."

ڕەشیدی هندەك پەرتووکێن حەکیمێ بابێ لەیلایێ ژی ڕزگارکربوون.

"پتریا وان یێن بووینە خولی، یێن دی ژی یێن هەلوەریاین."

ل هەفتیا یەکێ، ڕەشیدی ژی هاری مەریەمێ چاڤدێریا وێ کچێ دکر، ڕۆژەکێ دەمێ ژ کاری زڤڕیە مال، پەرتووکەك و بالیفکەکا نوو بۆ دگەل خوە ئینابوون، ڕۆژەکا دی ژی شووشوکا حەبکان بۆ ئینابوو.

ڕەشیدی گوت: "ئەو ڤیتامینن."

ڕەشیدی گوتە لەیلایێ کو خانییێ تارقێ هەڤالێ وێ یێ هاتیە داگیرکرن.

"ئەو خانی یێ ژ لایێ فەرماندەیەکێ سەیافی ڤە هاتیە داگیرکرن و وی ژی یێ کریە دیاری بۆ زەلاٚمێن خوە. هاهاها."

د ڕاستی دا ئەو هەرسێ زەلاٚم، سێ کورە جحێل بوون و دێمێن وان وەکو یێن زارۆکان بوون، لێ ل بەر هەتاڤێ سۆتبوون. دەمێ لەیلا د بەر مالا تارڤی وان ڕا دبوری، وێ دیت سێ زەلاٚم ب جلکێن سەربازی ڤە بەردەوام یێ ل بەر دەرگەهێ حەوشا تارڤی وان و جگارەیان دکێشن و یاریا پەرکانێ دکەن و کلاشینکوفێن وان ژی ب ڕەخ دیواری ڤە ددانانە.

کەسەك ژ وان ژ یێن دی ب خوەڤەتر بوو، کەسەکێ ڕەش ئەسمەر و ژ خوە ڕازی بوو و ب دفنبلندی سەرەدەری دگەل هەردووکێن دی دکر، دبیت ئەو فەرماندێ وان بیت.

ئەو کەسێ ژ هەردووکێن دی گەنجتر ژی، کەسەکێ ئارام و بێدەنگ بوو. حەز نەدکر هەڤالێن وی خوە ل سەر زالێ بکەن یان فەرمانان لێ بکەن. هەردەمێ مەریەم دبەر وی ڕا بوریبایە، ئەو دا گڕنژیت و سەرێ خوە هەژینیت وەك هێمایەك بۆ سلاڤکرنێ. دەمێ وی ئەڤ چەندە دکر ددیت کو ڕەڤاتی و دوژمناتیا ل دەڤ وێ دهێتە خوارێ و هێشتا هندەك گیانێ مرۆڤایەتیێ یێ ل دەڤ مای.

پشتی هینگێ ل دەمێ سپێدێ هندەك مۆشەك ب خانیێ وان کەفتن، هندەك گوتگوتك بەلاڤبوون کو هەزارەییێن حزبا وەحدەت ئەو مۆشەك د خانیێ وان وەرکربوون. پشتی ماوەیەکی، جیرانان پارچەیێن لەشێن وان هەر سێ گونجان ژناڤ خانیێ هەرفتی و داروبەران ئینا دەرێ.

ڕەشیدی گوت: "وان ئەڤ چەندە ئینا سەرێ خوە."

★★★

مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت کو ئەڤ کچە یا ب بەخت بوو. هەرچەندە مۆشەکان مالا وان یا کریە گرەکێ ئاخ و تۆز و داروبەران، لێ دگەل هندێ ئەو ڕزگار بوو. برینێن وێ د سڤکن و هێدی هێدی دێ ساخلەم بیتەڤە وەکو بەرێ. نوکە باشتر خوارنێ دخوت و دلێ خوە ناڕاکەت، هەردیسان ئەو ب خوە سەرێ خوە شانە دکەت و سەرێ خوە دشووت و دگەل مەریەم و ڕەشیدی ل ڤاتێ خوارێ خوارنێ دخوت.

لێ هندەك جاران بیرهانێن نەخوش لێ دزڤڕین، بیرهاتنێن نەداخواز کری، هندەك جاران ژی بێدەنگیەکا ڕەق وەکو بەری و چرکەیێن نەخوش خوە ب سەر گیانێ وێ دا ددادا،

خەموكی و هەرفتنا دەروونی و پێتیبوون و دیتنا كابوسان و ترس دبوونە مێهڤانێن وێ، هندەك جاران ژی دا دلێ وێ ڕابیت و پەشیمانی خوە ل سەرێ وێ دەت.

ڕۆژەكێ لەیلایێ گوت: "نابیت ئێدی ئەز بمینە ل ڤێرێ."

دەمێ وێ ئەڤ چەندە گوتی، مەریەمێ چوارچەڤێن دووشەكان دگوهۆڕین، لەیلایێ ژی تەماشەی وێ دكر كو چوكێن خوە كێشابوونە بن خوە و گوت: "بابێ من دڤیا ئەو ب دەستێ خو كارتوونێن پەرتووكێن خوە بینتە دناڤ حەوشێ دا، وی دگوتە من دگرانن تو نەهەلگرە، لێ من نەهێلا ئەو بینیت، من كارتوون ژ دەستێن وی ئینانە دەرێ و ب كەیف و گێولەكێ خوش ڤە دئینا ناڤ حەوشێ. ل وی دەمێ مۆشەك ب مالا مە كەفتی، پێدڤی بوو ئەز ژی دگەل وان بامە د ژوور ڤە و دگەل وان هاتبامە كوشتن."

مەریەمێ چوارچەڤەكا پاڤژ داقووتا و دانا سەر تەختێ خەوێ و تەماشەی لەیلایێ كر، تەماشەی پەرچەمێن وی یێن زەر و گەردەنا وێ یا نازك و چاڤێن وێ یێن كەسك، هەستیكێن لامێن وی یێن بلند و لێڤێن وێ یێن تژی كر. ئەو دەم هاتە بیرێ وەختێ هێشتا لەیلا یا زارۆك و دایكا وێ دچوویە سەر تەنورێ و د دووڤ دایكا خوە ڕا دكریە گری، دەمێ برایێ وێ ئەوێ پنیەكا موویان ل سەر گوهێ وی، ئەو دكریە ملێن خوە، هەردیسان دەمێ وێ یاریا تەبەلانێ دگەل كورێ جیرانێ خوە دكر.

كچكێ تەماشەی مەریەمێ كر و چاڤەڕێی بوو ئاخفتنەكا باش بۆ بێژیت و دلەكی ل بەر دلێ وێ بدەت. لێ ما دێ مەریەما بەلەنگاز چ بۆ ئاخڤیت؟ ئەو ب خوە یا ئامادەبوو دەمێ نانا ڤەشارتی و ل دەمی وی هندی مەلا فەیزوللاهی ژی بۆ دئاخفت لێ چ تشتان دلێ وێ تەنا نەدكر خو دەمێ هندەك ئایەتێن قورئانێ ژی بۆ خواندین:

(تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ)

یان ژی دەمێ گوتیێ كو هەست ب گونەهێ دكەت ژبەر دایكا خوە، مەلایی گوتبوویێ هزرێن هۆسا نەكەت چونكی د باش نینن و دێ وێ خەمگین و وێران كەن، چونكی خەتایێن وێ نەبوون دایكا وێ خوە ب خەندقینیت.

ئێدی ل بەر وێ ژی یا بەرزەبوو، نەدزانی كا دێ چ ئاخفتن بۆ لەیلایێ بێژیت و دلەكێ ل بەر دلێ وێ دەت و خەمێن وێ سڤك كەت. لێ پێدڤی نەدكر مەریەم چ تشتان بۆ

بێژیت چونکی ل وی دەمی سەروچاڤێن وێ ڕەق بوون و کەفتە سەر دەستێن خوە و گوت ها دێ دلێ من ڕابیت.

"چاڤەڕێ بە و خوە بگرە هەتا دچم لەگەنەکێ دئینم، دلێ خوە نەڕێژە سەر ئەردی، نوکە من یێ پاقژ کری. ئوی خودا ئەڤە چیە."

***

پشتی هینگی، ڕۆژەکێ کو ئەو نێزیکی هەیڤەکێ بوو ل سەر ڕوودانا پەقینا مۆشەکەکێ ب مالا وان ڤە و ببوو ئەگەرێ کوشتنا دایك و بابێن وێ. زەلامەکی دەرگەهێ حەوشێ قووتا. مەریەم چوو دەرگەهـ ڤەکر، ئەوی زەلامی گوتێ کو دڤێت لەیلایێ ببینیت.

مەریەم هاتە ژوور و گوت: "زەلامەك یێ ل بەر دەرگەهی و دڤێت تە ببینیت."

کچکێ سەرێ خوە ل سەر دووشەکێ ڕاکر و ڕابووڤە.

"یێ دبێژیت ناڤێ من عەبدولشەریفە."

"بەلێ ئەز کەسێ نانیاسیم کو ناڤێ وی عەبدولشەریف بیت."

"باشە، بەلێ پا ئەو یێ ل بەر دەرگەهی ڕاوەستای و دڤێت تە ببینیت، پێدڤیە تو بهێیە خوارێ و وی ببینی."

# 28

## لەيلا

لەيلا ل بەرامبەری عەبدولشەریفی د ژوورا مێهڤانان ڤە ڕوونشتبوو خوارێ. ئەو زەلاٚمەکێ قەلەو بوو، سەرەکێ بچووك و دفنەکا درێژ هەبوو. هندەك پنی ژی ل سەر سەروچاڤێن وی هەبوون و پرچا وی یا کورت و ڕەنگ قەهوای وەکو دەرزیکان سەرێ وی نخافتبوو.

دەستمالەك ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و خوها ل سەر ئەنیا خوە پاقژ کر و یاخەیا قەمیسێ خوە دروست کر و گوت: "دڤێت تو ل من ببووری خوشکا من، هێشتا پێنج ڕۆژێن من یێن ماین کو وان حەبکان بخوم، ناڤێت وان چنە، حەبکێن سولفانە چنە."

لەیلا ل سەر کورسیکی یا ڕوونشتی بوو و گوهێ خوە یێ ڕاستێ، ئانکو ئەو گوهێ باشتر پێ گوهـ ل تشتان دبوو، نێزیکی وی کر.

"ئەرێ تو هەڤالەکێ دایك و بابێن منی؟"

عەبدولشەریفی یەکسەر گوتێ: "نە، نە، ل من ببورن."

تبلا خوە بلند کر و پاشی فرەك ل وێ گلاٚسا ئاڤێ دا یا مەریەمێ دانایە بەر سینگێ وی. دەستێن خوە ب سەر لێڤێن خوە دا ئینان و برن و دووبارە ب دەستمالێ ئەنیا خوە پاقژ کر و گوت: "ئەز دبێژم یا باشترە ئەز ل بەراهیێ دەست پێبکەم، ئەز زەلاٚمەکێ خودان کارم و من دکانێن جلوبەرگان هەنە و پتریا وان ژی یێن زەلاٚمانە، وەك چاپان و کولاڤ و بەدلە و ڕیباتێن حەفکێ، هەر تشتێ تە بڤێت لێ هەیە. دوو دکان یێ ل ڤێرێ، ل کابولێ، ل تیمانی و "شار-ی-ناو"، من ل ڤێ دوماهیێ هەردوو یێن فروتین، دوو دکانێن دی ژی ل پاکستانێ ل بازێرێ پێشاوەر کو کۆگەها سەرەکی یا جلوبەرگان ل وێرێ یە ژبەر هندێ ئەز گەلەك هاتنوچوونێ دناڤبەرا پاکستان و ئەڤغانستانێ دا دکەم."

پاشی سەرێ خوە هەژارند و گرنژی و ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو: "ببوورە، ئەڤە ب خوە سەرهاتیەك بوو. ل ڤێ دوماهییێ ئەز ب سەرەدانەکێ چوومە پێشاوەرێ و پاشی چوومە دکانێن خوە دا بزانم کا پێدڤی ب چ هەیە دا بوو ببەم. ل دووڤ دا من تەماشەی لیستەیێن خوە یێن کاری و پارەیێ وان و بابەتێن دی یێن پەیوەندیدار ڤە کر، پشتی هینگێ ئەز چوومە مالا خوە و من سەرەدانا خێزانا خوە کر، سوپاس بۆ خودای من سێ کچ هەینە، پشتی چەکداران دەست ب کوشتنا هەڤدوو کری، من هەرسێ دگەل دیکا وان فرێکرنە پێشاوەرێ. من نەدڤیا ناڤێن وان دناڤ لیستا شەهیدان دا ببینم. ب ڕاستی بیت من نەڤێت ناڤێ خوە ژی دناڤ دا ببینم ژبەر هندێ هەکە خودا حەزبکەت ڤان ڕۆژان ئەز ژی دێ ب یەکجاری چمە وێرێ."

پیچەکێ عەبدولشەریفی ئاخفتنا خوە ڕاوەستاند و بێهنا خوە ڤەدا، پاشی دووبارە بەردەوامی دا ئاخفتنێ و گوت: "هەرچەوا بیت، بڕیار ئەو بوو چوارشەمبا بوری ئەز زڤڕیبامە کابولێ، لێ هۆسا دیارە بەختێ من یێ باش نەبوو ئەز نەخوش بووم. من نەڤێت بۆ تە نەخوشییێ ژ ڤان ئاخفتنا چێکەم، ب تنێ من دڤێت بێژم دەمێ کو ئەز چوویم دا کارێ خوە ئەنجام بدەم، من هەستپێکر ئەز یێ ل سەر پارچەیێن شووشەی بڕێڤە دچم، ب ڕاستی گەلەك یا ب ئێش بوو هەتا من نەڤێت ئەڤ چەندە ب سەرێ حیکمەتیاری بهێت. هەڤژینا من نادیا خانێ، خودا ژ وێ ڕازی بیت، داخواز ژ من کر بچمە دەڤ نوشداری، لێ من گوهێ خوە نەدایێ چونکی یا ژمن ڤە هەما دێ ب ئەسپرین و گەلەك ئاڤێ چارەسەر کەم، لێ نادیایێ گەلەك خورتی ل من کر و ئەز برمە دەڤ نوشداری. گوتنەکا هەی دبێژیت (کەرێ ڕکو پێدڤی ب شۆفێرەکێ ڕکو هەیە)، ئەز دترسم نەکو ئەو کەرێ ب سەرکەفتی، ئەز ب خوە بم."

ئەو ئاڤا مایە د گلاسی ژی ڤەخوار و گلاس داڤ مەریەمێ و گوتێ: "ئەگەر زەحمەت نەبیت یەکا دی ژی بۆ من بینە."

مەریەمێ گلاس ژێ وەرگرت و چوو د لێنانگەهێ ڤە داکو بۆ پڕ بکەت.

"پێدڤی ناکەت بێژم ژی، لێ پێدڤی بوو من گوهداریا وێ کربایە، خودا ژیێ وێ درێژ بکەت، کەسەکا ب کێرهاتی و ژیر بوو. دەمێ ب نەچاری ئەز بریمە نەخوشخانەیێ، تایەکا دژوار ل من بوو هەموو لەشێ من گەرم ببوو ئەز دلەرزیم لێ ئەز دشیام خوە ل سەر پێن

خوە بگرم. نوشداری گوت کو خوینا تە یا ژەهراوی بووی و ئەگەر سێ چوار ڕۆژ ب سەرڤە چووبانە و من قەستا نوشداری نەکربایە، هەڤژینا من دا بیتە بیژن. پاشی ئەز برمە قاییشەکا تایبەت، ئەز دبێژم ئەو قائیش یا نەخوشیێن تایبەت بوو، سوپاس بۆ خودای مەزن."

پاشی گلاّسا ئاڤێ ژ مەریەمێ وەرگرت و حەبکەکا سپی ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و گوت: "سەحکێ چەند حەبکەکا مەزنە."

دەمێ وی ئەو حەبك داعیرای، لەیلایێ دیت هەناسەیێن وی بلەزتر لێهاتن و پێن وی ڕەق بوون خو دا بێژی ئاسن یێ پێڤە گرێدای. لەیلایێ د دلێ خوە دا گوتی دیارە ئەو ئێشا هاتیێ هێشتا ژێ نەچوویە. هۆسا دیارە هێشتا وی چ نەگوتیە. لەیلایێ حەزدکر ژ وی جهی ڕابیت و بچیت بەری کو ئەو جارەکا دەست ب سحبەتێن خوە یێن بێ ڕامان بکەت و هندەك تشتان بێژیت یێن وێ نەڤێت گوهـ لێ بیت.

"ئێدی ل وێرێ من هەڤالێ تە دیت، موحەمەد تارِق وەلیزای."

دلێ لەیلایێ خوە بلەز قووتا، تارق ل نەخوشخانێ یە؟ ل بەشێ تایبەت؟ بۆ نەخوشیێن تایبەت؟"

لەیلایێ تڤا هشك یا دناڤ دەڤێ خوە دا داعیرا و ل سەر کورسیکا خوە لڤلڤی، ژبەر هندێ نەچاربوو خوە باش بگریت چونکی گیانێ وێ هەموو ژ ترسان دا دلەرزی. ل نەخوشخانێ و بەشێ تایبەت هزرا وێ چوو سەر هندێ دەمێ بەری چەند سالەکان ئەو هەردوو پێکڤە چووینە خولەکا زڤستانێ یا زمانێ فارسی کو هێشتا وێ گوهـ ل ناڤێ سیانی یێ تارقی نەبببوو. پشتی لێدانا زەنگێ، ماموستای ناڤێ سێیانی یێ تارقی خاند، موحەمەد تارق وەلیزای، ل وی دەمێ کو ب وی شێوێ فەرمی گوهـ ل ناڤێ وی بووی، دەست ب کەنیێ کر.

عەبدولشەریفی مستەك ل سینگێ خوە دا ژبەرکو هزردکر حەبك ب ڤی ڕەنگێ دێ زووتر چیتە خوارێ. پاشی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "ژ پەرستارەکێ من زانی کا چ ب سەرێ وی هاتیە. ژبەرکو من گەلەك سەرەدانا پێشاوەرێ یا کری، ئەز باش فێری زمانێ ئوردووی بوویمە. هەرچەوا بیت ، ئەز هۆسا تێگەهشتم کو هەڤالێ تە دناڤ لوریەکا تژی پەنابەران دا بوو. هژمارا وێ بیست و سێ کەس بوون و هەموویان دڤیا بچنە

پێشاوەرێ، لێ ل سەر سنوری کەفتنە بەر هێرشێن دناڤبەرا هەردوو لایەنێن شەڕکەر دا و مۆشەکەك ب لوریا وان کەفت، دبیت مۆشەکەکا ب شاشی ڤە بیت.

دبیت تو باوەر نەکەی ژی، لێ ب تنێ شەش کەس ژێ مانە ساخ و هەموو ژی ئینابوونە وی بەشێ نەخوشخانێ. د ماوەیێ بیست و چوار دەمژمێرێن دەستپێکێ دا، سێ کەسێن دی ژی ژ وان گیانێ خوە ژ دەست دا، ئەڤێن ماین ژی دوو خوشکێن یەکن و یێن ژ وی بەشی دەرکەفتین، یێ دی ژی هەڤالێ تەبوو، ئەو نێزیکی سێ حەفتیان بوو ل وێرێ دەمێ ئەز چوویمە وێرێ."

لەیلا وەکو دینان لێهات، د دلێ خوە دا گوت: دیارە پا ئەو هێشتا یێ ساخە، بەلێ نوکە لەشێ وی گەلەك دئێشیت و ئەو نەخوشیان دەبت؟ دیارە ڕەوشا وی تا وی ڕادەی خراپ بوویە هەتا بریە وی بەشی.

لەیلایێ هەستپێکر هەموو گیانێ وێ خوهێ دا و سەروچاڤێن وێ ژ گەرمان دا سۆتن. وێ بزاڤ دکر هزرا خوە د تشتەکێ دی دا بکەت، وەك گەشتا وان یا بامیانێ ژ بۆ دیتنا پەیکەرێ بودای دگەل تارقی و بابێ خوە، لێ ل شوونا ڤێ چەندێ وێ دیمەنێ بابێ تارقی و دایکا وی یا دووڕپێچکری دناڤ لوریەکا کەفتیە سەر پشتێ دکر دەمێ دناڤ دووکێلێ دا گازی تارقی دکری و دەست و سینگێ وێ دناڤ ئاگری و پرچا وێ یا باروك ل سەر سەرێ وێ د حەلیا.

لەیلایێ سێ چوار جارەکان کوور بێهنا خوە هەلکێشا.

"تەختێ وی ب ڕەخ تەختێ من ڤە بوو، چ دیوار دناڤبەرا مەدا نەبوون بەلکو ب تنێ پەردەیەکا ڕوهن دناڤبەرا مەدابوو ژبەر هندێ من ئەو ب باشی ددیت."

پاشی ژ نیشکەکێ ڤە، عەبدولشەریفی دەستێ خوە هاڤێتە حەلاقەیا ل تبلا خوە و پیچەکێ پێڤە مژوول بوو ئاخفتنا وی ژی کێم بوو هێدی دئاخفت.

"هەڤالێ تە تارق، ڕەوشا وی یا باش نەبوو، بەلکو گەلەك ژی یا خراب بوو. ل دەستپێکێ سووندە بۆ هەموو لەشێ وی دانابوون. ل دەستپێکێ من هزرکر هەردوو پێن خوە د ڤێ ڕوودانێ دا یێن ژدەستدایین، لێ پەرستاری گوت نەخێر ب تنێ پێ ڕاستێ د ڤێ ڕوودانێ دا یێ ژدەستدای، چونکی وی بەری نوکە پێ خوە یێ دی یێ ژدەستدای. هناڤێن وی ژی بریندار ببوون و سێ نشتەگەری بۆ هاتبوونە ئەنجامدان و پارچەیەك ژ ڕیڤیکێن

وی ژێڤە کربوو، بیرا من ناهێت کا چ تشتێ دی لێ هاتبوو لێ یا ژ من ڤە هندەك پارچەیێن لەشێ وی سۆتبوون ژی. ئەڤە هەمموو چیرۆك بوو. خوشکا من، ئەز دزانم تە ژی گەلەك نەخوشی یێن دیتین لەورا من نەڤێت ئەڤ نەخوشیە ژی بهێتە سەر."

نوکە تارق یێ بێ پێ یە. لەشەکێ بێ پێ، وەکو قەدەکێ مرۆڤی. لەیلایێ هەستپێکر ها وەختە دێ هوشێن خوە ژدەستدەت. هەرچەوا بیت، بزاڤ کر هەستێن خوە و خەیالێن خوە فڕیکەتە ژ دەرڤەی ژوورێ، ژ دەرڤەی پەنجەرێ و دوور ژ وی زەلامی، بۆ سەر جادەیان، بۆ سەر باژێری هەممووییێ، ل سەر بانێن مالان و بازاڕی بفڕیت، د کولانێن تەنگ دا بکەتە غار هەتا دبیتە کەلهەکا خیزی.

"پتریا جاران ئەو دلەرزی و دەرمانێن ئێشکوژ و مسەکەن ددانێ، لێ هندەك جاران وان دەرمانان ژی چ کارتێکرنا خوە نەبوو و دهاتە سەر هوشێن خوە و هەست ب ئێشانێ دکر. هزرا وی ل سەر بوو و ئاگەهـ ژ خوە هەبوو، ئەز ل سەر تەختێ خوە بووم و من دگەل ئاخفت و گوتێ کا ئەز کیمە و خەلکێ کیڤەمە. کەیفا وی ژی ب ڤێ چەندێ هات و یێ خوشحال بوو کو هەڤوەلاتیەکێ وەلاتێ وی ل دەڤ وی بوو.

من پتر سحبەت دکرن چونکی ئاخفتن بۆ وی یا گران بوو، دەنگێ وی ئاسێ دبوو. من هەستپێدکر دەمێ ئەو دەڤێ خوە ژی دلڤلڤینیت هەست ب ئێشانێ دکەت. من بەحسێ خێزان و کچێن خوە بۆ کر، هەردیسان من گوتێ کو ل باژێرێ پێشاوەر من خانیەك هەیە و ئەز و برایێ هەڤژینا خوە ژی مژوولی دروستکرنا بالکونەکێ نە ل ڕەخێ پشتێ.

هەردیسان من گوتێ کو من دکانێن خوە یێن ل کابولێ یێن فروشتین و دێ چمە وێرێ ڤە داکو کاغەزێن خوە یێن دەرکەفتنێ تەمام بکەم. پشتی هینگێ من گەلەك نەئاخفت، لێ یا ژ من ڤە ڤان ئاخفتنان ئەو مژوول کر یان ژی ڕەنگە من هەست ب هندێ کربیت.

هندەك جاران وی ژی دئاخفت، لێ پتریا ئاخفتنێن وی ئەز تێنەدگەهشتم. لێ ب گشتی ئەز د مەرەما وی دگەهشتم، من زانی کا ئەو ل کیڤە دژیا، بەحسێ مامێ خوە یێ ل غەزنێ دکر، بەحسێ خوارنێن دایکا خوە و دارتاشیا بابێ خوە و ئامیرێ وی یێ ئوکوردیونێ دکر.

لێ پتریا جاران بەحسێ تە بۆ من دکر. گوتی کو تو ...، نزا ب دروستاهی بیرا من ناهێت کا چ دگوت. ئاها هاتە بیرا من، گوت کو تو تاکەکەسی دناڤ بیردانکا وی دا مابی. ئەز دبێژم وەدگوت. خوشکا من دڤێت وێ چەندێ بێژمە تە کو هزرا وی هەموو ل سەر تە بوو،ئەڤ چەندە ب ئاشکەرای ل دەڤ وی یا دیار بوو، لێ دگەل هندێ ژی دگوت باش بوو کو تو دگەل وی نە داکو تە ئەو د وێ ڕەوشێ دا نەدیتبا."

دیسان لەیلایێ هەستپێکر پێن وێ ڕەق بوون، خوە دا بێژی یێن ب ئەردی ڤە نسیاین، یان ژی هندی خوینا د لەشێ وێ هەیە یا چوویە خوارێ بۆ ناڤ پێن وێ. ئەو ل دەڤ وی یا ڕوونشتی بوو لێ هزرا وێ گەلەك دوور چووبوو. هزرا وێ بلەز وەکو لەزاتیا مۆشەکان بەرەڤ پشتا کابولێ دچوو، ب سەر چیا و گرکێن کەڤری یێن ڕەنگ قەهوای دکەفت، ل سەر بیابانێن خواروڤیچ و خودان بەرێن سۆر ڕا دچوو، ل سەر چیایێن نخافتی ب بەفرێ دا دچوو.

"دەمێ من گوتیێ ئەز دێ زڤرمەڤە کابولێ، داخواز ژ من کر تە ببینم و بێژمە تە کو ئەو گەلەك هزرێن تە دکەت و یێ ژ تە خەریب بووی. من ژی سوز دایێ ڤێ چەندێ بکەم. ب ڕاستی ژی من گەلەك حەز ژێ کر چونکی دیارە ئەو کورەکێ باشە."

عەبدولشەریفی جارەکا دی ئەنیا خوە ب دەستمالێ پاقژ کر. جارەکا دی دەستێ خوە کرە حەلاڤا د تبلا خوە و لڤلڤاند و گوت: "شەڤەکێ ئەز ژ خەو هشیاربووم، ئەز دبێژم ئەو وەخت شەڤ بوو، ب ڕاستی د وی جهی ڤە گەلەك یا ب زەحمەتە مرۆڤ بزانیت کا چ دەمێ ڕۆژێ یە، چونکی هەموو لایێن وێ دگرتینە و چ پەنجەر پێڤە نینن، ژبەر هندێ مرۆڤ نزانیت کا کەنگی ڕۆژ دهەلیت و کەنگ ئاڤا دبیت. ئەز ژ خەو هشیاربووم، من دیت قەرەبالغەك یا ژ دورماندوری تەختێ ب ڕەخ من ڤە دهێت، بۆ زانینا تە پتریا دەمان ئەز یێ بەنجکری بووم و من ئاگەهـ ژ خوە نەدبوو، لێ وێ شەڤێ ئەز هشیاربووم، من نەدزانی کا ڕاستی یە یان خەونە. لێ تشتێ دهێتە بیرا من ئەوبوو کو نوشدار ل دور تەختی خرڤەبوون و گازی ڤی و یێ هە دکر و ڕۆناهیا هۆشداریێ هەلبوو و دەرزیك ل سەر ئەردی بوون."

"ل ڕۆژا پاشتر، تەختێ وی یێ ڤالا بوو، دەمێ من پرسیار ژ پەرستارێ کری گوت: وی گەلەك ب قارەمانانە خوە ل بەر نەخوشیێ گرت."

لەیلایێ ئاگەھ، ژ خوە نەبوو، سەرێ خوە بۆ سحبەتا زەلاّمی دلڤلڤاند. وێ دزانێ، بەلێ چ پێنەڤێت وێ دزانی. هەر یەکەم چڕکا ئەو ل بەرامبەر ڤی زەلاّمی ڕوونشتیە خوارێ، وێ دزانی کا چ دەنگوباس بۆ دگەل خوە ئینایە.

پاشی زەلاّمی گوت: "تو دزانی، ل دەستپێکێ من هزرنەدکر کو تو یا هەی، من هزردکر ئەو هزروبیرە ژ بەر مورفینێ هاتینە د سەرێ من دا، ڕەنگە ئەز ب خوە ژی یێ ب هیڤی بووم کو چ ڕاستی بۆ هەبوونا تە نەبن، چونکی من نەدڤیا دەنگوباسەکێ نەخوش بگەهینمە کەسەکی. لێ من سوز دابوویێ ئەز ل تە بگەرم و دەنگوباسێ وی بگەهینمە تە. هەر ژبەر هندێ ل سەر خاترا تە ئەز هاتمە ڤێرێ، من پرسیارا هندەك جیرانان کر و وان ژی ئەڤ مالە نیشا من دا. هەر وان ب خوە گوتە من کا چ ل دایك و بابێن تە هاتیە، دەمێ من ئەڤ چەندە گوهلێبووی، من بەرێ خوە وەرگێڕا و نەدڤیا ڤی دەنگوباسی بگەهینمە تە، من گوت ب ڕاستی چ ب سەرێ وێ نەهاتیە هەتا بچم ڤی دەنگوباسی ژی بگەهینمە وێ."

ئێدی لەیلایێ گوهداریا ئاخفتنێن وی نەکر، ئەو ڕۆژ هاتە بیرێ دەمێ زەلاّمەك ژ پەنجشیرێ هاتی و دەنگوباسێ شەهیدبوونا ئەحمەد و نوری گەهاندییێ. بابێ وێ هاتە بیرێ کا چەوا خولکێ وی کەفت و نەشیا خوە ل سەر ڤەنەپێ بگریت، دایکا وێ ژی دەمێ گوهـ ل دەنگوباسی بووی، دەستێ خوە ب دەڤێ خوە ڤە نا.

لەیلایێ ئەو ڕۆژ ب چاڤێن خوە دیتبوو کا دایکا وێ تووشی چ ڕەوش و نەخوشی ببوو، ژبەر هندێ لەیلا دترسیا، لێ خەمگینیا لەیلایێ یا ڕاستەقینە نەبوو، ئەو ژ وان هەستۆزێن ترسناك یێن دایکا وێ ژ بۆ ژدەستدانا کورێن خوە تێنەدگەهشت. نوکە کەسەکێ دی یێ بیانی یێ هاتی و دەنگوباسێ مرنا کەسەکێ دی دگەل خوە یێ ئینای. نوکە ئەو یا ل سەر کورسیکا خوە هشکبووی، ئەرێ ئەڤە سزایێ وێ یە؟ سزایێ هندێ کو ئەو د دایکا خوە نەدگەهشت و وەکو وێ ب خەم نەدکەفت؟

دایکا لەیلایێ هاتە پێشچاڤێن وێ کا چەوا کەفتە سەر ئەردی و دکرە ڤێژی و پرچا خوە دکێشا، لێ لەیلا نەدشیا وەبکەت، ئەو هێز نەبوو خوە ل سەر کورسیکێ ژی بلڤلڤینیت، هەتا نەدشیا دەستێن خوە ژی باش بلند بکەت. ژبەر هندێ ئەو ل سەر کورسیکێ ما و دەستێن وێ خاڤبوون و کەفتنە سەر چوکێن وێ. چاڤێن وێ ژی مابوونە ڤەکری و هزر و خەیالێن وێ ژی ژ سەرێ وێ چووبوون و فڕین و ل جهەکێ گونجای دگەریان، جهەکێ ئارام

و پڕ ژ زەڤیێن جەهێ کەسك و ئاڤەکا پاقژ د بەرا بچیت و ب هزاران تۆڤێن پەمپی دناڤ بای دا بلەیزن.

ل وی جهێ بابێ وێ ل بن دارەکا ئەکاسیا دا یێ ڕوونشتی و پەرتووکەك دخواند و تاڕقی ژی هەردوو دەستێن خوە دانابوونە سەر سینگێ خوە و پخێنا وی و خەوێ بوو، وێ ژی پێن خوە کربوونە دناڤ ئاڤێ دا و ل بن ئاورینێن خوداوەندێن کەڤن و بەرێن ب تاڤا ڕۆژێ سۆربووین خەون ددیتن، خەونێن خوش و خەمرەڤین.

## 29

### مەریەم

- "ل من ببورە"

ڕەشیدی ئەڤ پەیڤە گوتنە لەیلایێ پشتی کو وی سێنیکا "ماسیاوا"یێ و سێنیکا گوشتی ژ مەریەمێ وەرگرتین بێی تەماشەی چاڤێن وێ بکەت. پاشی گوت: "بۆ من گەلەك نەخوش بوو کو ئەڤ چەندە ب سەرێ وی هاتی، ئەز دزانم هوون هەردوو گەلەك هەڤالێن هەڤدوو بوون و هەر ژ بچووکاتییێ وەرە هوون پێکڤەبوون، ب ڕاستی ڕوودانەکا زێدە نەخوش بوو. گەلەك گەنجێن ئەڤغانی ب ڤێ ڕێکێ گیانێ خوە ژدەستدایە."

ل دووڤ دا، ڕەشید بێی کو چاڤێن خوە ژ لەیلایێ ڤەکەت، ب دەستی ئاماژە دا مەریەمێ داکو بچیت دەستمالەکێ بۆ ژ بۆ لەیلایێ بینیت و ڕووندکێن خوە پێ پاقژ بکەت.

ئەو چەند سال بوون مەریەمێ باش دزانی کا ڕەشید چەوا خوارنێ دخوت. دەمێ پاریەکی دهاڤێژتە د دەڤێ خوە دا، زەڤلەکێن شەپیلکێن خوە گەلەك دلڤلڤینیت. ب دەستەکی گولمچکێن بچووك یێن برنجی چێدکەت و ب دەستێ دی دوهنی و دندکێن برنجی یێن زێدە ئەڤێن دمانە دبەر ددانێن وی ڕا پاقژ دکرن.

ئەو چەند بوو ل دەمێ خوارنێ چ پەیڤ ژ دەڤی نە ددەرکەفتن و سەرێ خوە بلند نەدکر، بێدەنگیا وی تا وی ڕادەی بۆ مەریەمێ یا نەخوش بوو دا بێژی ئەو یێ پلانا ئەنجامدانا تاوانەکێ د هزرا خوە دا دادڕێژیت، پشتی هینگێ ب حڕێنەکا وەکو یا تاوانباران، دا بێدەنگیا خوە شکێنیت و ل مەریەمێ کەتە هەوار، ب تایبەت دەمێ خوارن ب دلی نەبایە یان داخوازا گلاسەکا ئاڤێ یان پتر خوارنێ کربایە.

لێ ئەڤرۆکە ئەو نە وەکو بەرێ یە، ئەڤرۆ وی کەفچك ژ بۆ خوارنێ بکارئینا و ب دەستمالێ دەڤێ خوە پاقژ کر. دەمێ داخوازا ئاڤێ ژی کربایە دا بێژیت: زەحمەت نەبیت.

هەردیسان ب کەیف و خوشیەکا مەزن و بێی کو بێهنا خوە ڤەدەت یان بڕاوەستیت دا سحبەتان کەت.

ڕەشیدی ل سەر سفرا خوارنێ دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت: "ب بوچوونا من، ئەمریکیان شاشیەکا مەزن کر دەمێ چەك و تەقەمی داینە حیکمەتیاری. دەزگەهێ CIA ل سالێن هەشتێیان بڕەکا مەزن یا چەکی دا حیکمەتیاری داکو شەڕی دژی یەکێتیا سوڤییەتێ بکەت. لێ نوکە سوڤییەتی یێن ژ ڤێرێ چووین، بەلێ هێشتا ئەو چەك یێ ددەستێن وی دا و بەرێ تڤەنگ و دەبابەیێن خوە دایە خەلکەکێ بێگونەهێ وەکو دایك و بابێن تە و ئەو ب خوە هزردکەت ئەڤ چەندە جیهادە یان ژی شەڕکرنە د ڕێکا خودای دا. ئەڤە چ کارەساتە! ما جیهادێ چ پەیوەندی ب کوشتنا ژن و زارۆك و کەسێن بێگونەهـ ڤە هەیە. یا باشتر ئەوبوو ڤی دەزگەهی چەك دابا فەرماندە مەسعودی."

بێی کو پەیڤەك ژ دەڤێ وێ دەرکەڤیت، مەریەمێ بریێن خوە تێکبرن و ب مەندەهوشی ڤە گوت: "فەرماندە مەسعود؟ ئەڤ ئاخفتنە ژی بۆ وێ گەلەك یا سەیر بوو، چونکی بەری نوکە چەندین جاران وی ئاخفتن و خەبەرێن کرێت دگوتنە مەسعودی و ب کەسەکێ خائین و خوفروش و شیوعی ل قەلەم ددا، لێ ژبەرکو مەسعود ژی وەکو لەیلایێ تاجیکی یە، ئەڤرۆکە پەسنا وی دکر و دڤیا خوە ل بەر لەیلایێ شیرین بکەت.

"نوکە، ئەو دوستەکێ ژیرمەندە و کەسەکێ ئەفغانی یێ ڕەسەن و پاقژە. زەلامەکە هەموو گاڤان حەز ژ ئاشتی و تەناهیێ دکەت."

ڕەشیدی ملێ خوە هەژاند و بێهنا خوە کوور هەلکێشا.

"دڤێت ئەم باش هندێ بزانین کو بابەت ئەو نینە کو دلێ ئەمریکا ب مەڤەبوو، دەمێ یەکێتیا سوڤییەتێ هاتیە دناڤ وەلاتێ مە دا. ل دەڤ وان نەیا گرنگە نوکە پەشتوون و هەزارە و تاجیك و ئوزبەك کەفتینە ناڤ هەڤدوو دا و ڕۆژانە چەندین کەسان ژ هەڤدوو دکوژن. ئەرێ بێژە من ئەمریکیەك هەیە بشێت بزانیت جوداهی دناڤبەرا ڤان نەتەوەیان دا چیە؟ نەخێر ئەو قەت نزانن و پێدڤی ناکەت ئەم چاڤەڕێی وان بین هەتاکو دهێن هاریکاریا مە بکەن.

نوکە یەکێتیا سوڤییەتێ یا شکەستی و بەرژەوەندیا وان ل دەڤ مە نەمایە و ئەم ب کێر وان ناهێین، چونکی شولێ وان ب مە نەما. نوکە وەلاتێ ئەفغانستانێ بۆ وان وەکو

دەستئاڤەکێ یە. ببورە بۆ گوتنا ڤێ پەیڤێ لێ ئەڤ چەندە ڕاستی یە و ئەم نەشێین ڤەشێرین. ئەرێ بۆچونا تە چیە لەیلاخان؟"

لەیلایێ تشتەك گوت لێ کەس د ئاخفتنا وێ نەگەهشت، پاشی پرتەکا گوشتی کرە د ئافکێ دا. ڕەشیدی ژی هۆسا سەرێ خوە بۆ هەژاند و بۆ گرنژی دا بێژی ئەو د هەموو ئاخفتنا وێ گەهشت و بۆچونا وێ ژ هەموو بۆچونان بەرئاقلتر بوو.

مەریەم نەچاربوو ژ بەر ڤان ڕەفتارێن ڕەشیدی یێن نە دجهێ خوە دا، سەرێ خوە بچەمینیت و بەرێ خوە ژ وان ب وەرگێڕیت.

"ئەرێ تو دزانی بابێ تە یێ ڕەحمەتی بەردەوام ئەڤ سحبەتە بۆ من دکرن. هەتا بەری تو ژدایك ببی ژی، ئەز و ئەو پێکڤە دڕوونشتینە خوارێ و مە بەحسێ سیاسەتێ یان بەحسێ پەرتووکان دکر. مانە هۆسا بوو مەریەم؟ یان ژی نەمایە ل بیرا تە."

مەریەمێ بەرسڤا وی نەدا، بەلکو خوە ب ڤەخوارنا گلاسەکا ئاڤێ ڤە مژوول کر.

"هەر چەوا بیت، هیڤیا من ئەوە ڤان سحبەتێن من ل دوور سیاسەتێ، سەرێ تە گێژ نەکربیت."

پشتی هینگێ مەریەم چوو د لێنانگەهێ ڤە و ئامانێن خوارنێ ب ئاڤ و سابونێ شووشتن. هناڤێن وێ پیچەکێ دئێشان. وێ چ گرنگی نەددا ئاخفتنێن وی یێن بێ ڕامان و درەوێن وی یێن مەزن، ئەڤە ژ وێ ڕۆژا وی لەیلا ژبن داروبەران ئینایە دەرێ، بەردەوام درەوێن ب ڤی ڕەنگی دکرن و ب ڕۆلێ ئەکتەریێ ڕادبوو، ژلایەکی ڤە وی دڤیا دلەکی ل بەر دلێ وێ بدەت و ژلایەکێ دی ڤە سحبەتێن وی جهێ بێزاریێ بوون ژ بۆ وێ.

ژ نیشکەکێ ڤە مەریەمێ هەستپێکر کو ئەو گومانا ئەو ژ ڕەشیدی دبەت یا د جهێ خوە دایە. ترسەکێ خوە ل دلێ وێ دا و هاتە سەر هزرا وێ نەکو مەرەما ڕەشیدی ژ ڤان درەوان و ئەکتەریێ، ب تنێ ڕاکێشانا هەستێن وێ بیت یە و حەز ژێکرنا وێ کەفتبیتە د دلێ وی دا.

***

دەمێ مەریەم شیای ل سەر هزرێن خوە زالێ بیت و کونترۆلێ ل سەر خوە بکەت، چوو د ژوورا خوە ڤە.

ڕەشیدی جگارەك بەردابوویێ و گوت: "ڤێجا بوچی نە؟"

مەریەم یەکسەر تێگەهشت کو ئەو یا د ڤێ یاریێ دا شکەستی، وێ ئومێدەکا بچووك هەبوو، چاڤەڕێی هندێ بوو ڕەشید حاشاتیێ ژ ڤێ چەندێ بکەت. دبیت درەوەکا بچووك یان هێجەتەکا نەبەرئاقل ژی ئەو ڕازیکربایە خو هەکە ب دلێ وێ ژی نەبایە، بەلێ دەمێ وی ب تونەکا ئاسایی و دەبڕینەکا سارڕ ڤە دووپاتی ل سەر ئاخفتنێن خوە کری، هەموو هیڤی و ئومێدێن مەریەمێ ژناڤبرن.

ڕەشید ل سەر تەختێ خوە یێ درێژ کری بوو و پشتا خوە دابوو دیواری و پێن خوە یێن زڤر و درێژ ل سەر دووشەکێ درێژ کربوون، وی گوت: "وەرە ڤێرێ بڕوونە خوارێ، بەری کو تو هوشێن خوە ژدەستبدەی و بکەڤی و سەرێ تە بشکێت."

مەریەم ل سەر وێ کورسیکێ ڕوونشت یا ب ڕەخ تەختێ وی ڤە.

"کا وێ تەبلێکا جگارەیان بدەڤ من."

مەریەمێ تەبلێك داڤێ. وێ د دلێ خوە دا دگوت نوکە ژیێ ڕەشیدی نێزیکی شێست و تشتەك سالایە، هەرچەندە وێ ب خوە ژی ژیێ وی دروست نەدزانی، لێ سەرێ وی سپی ببوو و نیشانێن دانعەمریێ ل دەڤ دیاربوون. پیستێ لەشێ وی ژی یێ زڤر و ستوور بووی و چەندین هێلێن قورمچینی ل بن چاڤێن وی و حەفکا وی یێن دیاربووین.

پیستێ وی یێ تێکچووی و قورمچی و ڕوویێن وی ژ بەرێ پتر خواروڤیچ بووین. سپێدەهیا دەمێ ژ خەو هشیاردبووی پیچەکێ پشتا وی خوار دبوو، لێ هێشتا ملێن وی دفرەهـ بوون و دەستێن وی ب هێز بوون. زکێ وی ژی هند یێ مەزن بوو کو بەری هەموو ئەندامێن دی یێن لەشێ وی دکەفتە بەر چاڤێن مرۆڤی.

مەریەمێ دزانی کو ڕەشیدی پتر ژ وێ، یا خوە ل بەر ڕۆژێن نەخوش و گران یا گرتی. پشتی ڕەشیدی تەبلێکا جگارێ دانایە سەر زکێ خوە، گوت: "پێدڤیە ئەم ڤی بابەتی ل دووڤ یاسایێ ڕێکبێخین."

پاشی یاری ب لێڤێن خوە کرن و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "خەلك دێ بەحسێ مە کەن، تشتەکێ جوان و باش نینە ژنەکا گەنج و بێ مێر دناڤ مالا مە دا بیت، هەر بۆ سومعەتا من و بۆ یا وێ ژی، هەتا بۆ تە ب خوە ژی."

مەریەمێ گوت: "ئەڤە هەژدە سالە من شوو ب تە کری و هەتا نوکە من چ تشت ژ تە داخواز نەکرینە، لێ نوکە من داخوازیەك هەیە."

ڕەشیدی فرەك ل جگارەیا خوە دا و هێدی دووکێلا وێ بەردا و گوت: "ئەگەر داخوازیا تە ئەو بیت کو بێژی نابیت ئەو ب ڤی ڕەنگی ل ڤێرێ بمینیت، ئەز نەشێم خوارنێ بدەمێ و جلکان بۆ بکرم و ل سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ بنڤینم، یان ئەز کومەلا خاچا سۆر نینم وێ ب خودان بکەم..."

"بەلێ پا ئەو؟"

"ئەو چ؟ تو هزردکەی هێشتا ئەو زارۆکە؟ ژیێ وێ چواردە سالن و زارۆك نینە؟ ئەرێ ما توژی پازدە سال نەبووی یان ژ بیرا تە چوویە؟ دەمێ ئەز هاتیمە سەر دنیایێ ژیێ دایکا من چواردە سال بوون و وێ د ژیێ سێزدە سالیێ دا شوو کربوو."

مەریەم ژ وان ئاخفتن و سفکاتییێن وی تێر ببوو. وەکو کەسەکا لاواز و بێ دەستهەلات گوت: "بەلێ من ئەڤ چەندە نەڤێت."

"ئەڤ بڕیارە د دەستێ تە دا نینە بەلکو یا د دەستێ وێ دا."

"ما ئەز گەلەك یا مەزنم؟"

"ئەو هێشتا یا گەنجە و تو گەلەکا مەزنی. ئەڤە هندەك ئاخفتنێن تەمساڕن."

"ئەز گەلەکا مەزنم! ما ئەز یا پیرم هەتا تو ڤێ چەندێ دگەل من بکەی."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان مەریەمێ دەهمەنا کڕاسێ خوە ب هێز گرت و دلەرزی.

"ئەرێ بۆ تە ئەز یا پیرم، پشتی ڤان هەموو سالێن من دگەل تە ڤەتاندی، ژ نوو تە دڤێت هەویەکێ ب سەر من بینی؟"

"ژ ڤەستا خوە بێ تام نەکە. تو ب خوە دزانی ئەڤ چەندە تشتەکێ ئاسایی یە، من هەڤالێن هۆسا یێن هەین دوو، سێ هەتا هندەك چوار ژن ژی هەنە. بابێ تە ب خوە ژی سێ ژن هەبوون. ئەز گەلەك زەلاّمان دنیاسم ئەڤە چەند سالە وان ئەڤ کارە کری و تو ب خوە ڤێ چەندێ باش دزانی."

"ئەز ڕێکێ نادەم ڤی کاری بکەی."

ب گوهلێبوونا ڤێ چەندێ، گرنژینەکا ساڕ ل سەر لێڤێن ڕەشیدی پەیدابوو ب پێیەکێ خوە پەحنکا بنێ پێ خوە یێ دی خوراند و گوت: "باشە، چارەسەریەکا دی ژی هەیە، تو دشێی ژ ڤێرێ بچی و ئەز ڕێکێ ل تە ناگرم، لێ ئەز دزانم تو نەشێی ژ ڤێرە دوور بکەڤی و خوە ل بەر بگری چونکی تو نەشێی ئاڤ و خوارنێ بدەستخوڤە بێخی، هەروەسا چ

ڕۆپی ژی د بەریکا تە دانینن. هەر جهەکێ تو بچییێ ژی تۆپبارانکرنە. ب بۆچونا تە، ئەگەر تو ژ ڤێرێ چووی هەتا چەند ڕۆژان دێ شێی ژی؟ ئەز یێ پشتڕاستم یان دێ تە ڕەڤینن یان ژی دێ دەستدرێژییێ کەنە سەر تە و پاشی تە کوژن و هاڤێژنە دناڤ چاڵەکێ دا یان ژی ڕەنگە هەر سێ تشت پێکڤە بهێنە سەرێ تە."

پاشی ڕەشید کوخی و بالیفکا ل بن سەرێ خوە دروست کر.

"د ڤان کولان و جادەیێن باژێری دا کەس دلوڤانییێ ب کەسێ نابەت. مەریەم باوەر ژ من بکە تو بچیە هەر جهەکی، یێ پڕە ژ سەیێن هار و دز و تاوانباران. ئەز نابێژم کو تە چ بەخت نینە، لێ هزربکە موعجیزەیەك پەیدابوو تو ب سەلامەتی گەهشتیە پێشاوەرێ، ئەرێ پشتی هینگێ دێ چ کەی؟ ئەرێ تە ئاگەهـ ژ ڕەوشا کەمپێن پەنابەران هەیە؟

ڕەشیدی د پشت دووکێلا جگارەیا خوە تەماشەی وێ کر.

"ئەڤێن ل وان کەمپان، ل بن قەدێن کارتۆنان دژین. نەخوشییێن وەکو سلێ و زکچوونێ و تاوانێن جوراوجور ل وێرێ دبەربەلاڤن. ئەڤە هەموو بەری زڤستان بهێت. ل وەرزێ زڤستانێ ژی سەرمایەکا هشك و دژوار و نەخوشییێن سیهان دێ بەلاڤ بن. گەلەك کەس ل وێرێ دێ ژ سەرمان دا ڕەق بن و ئەو کەمپە دێ بنە گۆڕستانەکا بەستیگرتی."

پاشی دەستێ خوە لڤاند و بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە و گوت: "لێ تو دشێیێ ل مالەکا لەشفروشان ل پێشاوەر دا بمینی، ل وێرێ دێ تە گەرم بیت و کارێ تە دێ یێ باش بیت. بۆ کچەکا جوان ل وێرێ دێ بەختەکێ باش هەبیت، مانە هۆسایە؟"

پاشی تەبلێکا خوە یا جگاران دانا سەر مێزەکا بچووك و پێن خوە ل سەر تەختێ نڤستنێ درێژ کرن. پاشی شێوازێ خوە یێ ئاخفتنێ نەرم کر هەروەکو کا چەوا داگیرکەرەك ب سەرکەفتیانە دچیتە دناڤ وەلاتەکی دا و ب نەرمی دگەل خەلکێ وێ دئاخڤیت،

- "بەرێ خوە بدێ مەریەم، ئەز دزانم کو ڕازیبوونا تە ل سەر ڤێ چەندێ تشتەکێ ب سانەهی نینە و ئەز لومەی تە ناکەم، لێ پشتڕاستبە ئەڤ چەندە باشترین چارەسەری یە. مەریەم ئەز دێ ب ڤی کاری هاریکارەکێ بۆ تە ئینمە دناڤ مال دا و بۆ وێ ژی جهەکێ ڤەحەویان و خێزان و هەڤژینەکی یە. ئەڤ سەردەمە گەلەك یێ خراب بووی و ژن پێدڤی ب هەڤژینەکی یە داکو وێ بپارێزیت. تو ڤان هەموو بیژنان دبینی یێن ل سەر جادەیان

دنڤن؟ ئەو ژ بۆ بدەستڤەئینانا دەرفەتەکا هۆسا دشێن کوشتنێ بکەن. یا من دڤێت بێژم ئەوە کو ئەڤ کارێ ئەز دکەم باشیەکا ڕاست و دروستە نەك زێدەتر."

پاشی گڕنژی و گوت: "ئەز دبێژم ژ بۆ ڤی کاری، ئەز ژ هەژی مەدالیەکا شانازیێ ژی مە."

★★★

پشتی هینگێ دەمێ دنیا بوویە شەڤ، مەریەمێ ئەڤ بابەتە دگەل لەیلایێ ڤەکر. بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەو بێدەنگ ما و چ تشت نەگوتن.

مەریەمێ گوت: "هەتا سوباهی سپێدێ وی بەرسڤەك دڤێت."

لەیلایێ گوت: "هەر نوکە تو دشێی بچی بەرسڤا من بگەهینیێ و بێژیێ کو ئەز یا ڕازیمە."

# 30

## لەیلا

ل ڕۆژا پاشتر هێشتا لەیلا ل سەر تەختێ خوە یێ نڤستێ و دناڤ جهێن خوە دا دەمێ ڕەشید هاتیە د ژوورا وێ ڤە و پرسیارا ڕەوشا وێ ژێ کر و گوتێ دێ چمە سەرتڕاشخانێ. دەمێ نیڤرویەکا درەنگ زڤڕیە مال ژی، دیت هێشتا ئەو یا دناڤ جهێن خوە دا و نەڕابوویەڤە.

ڕەشیدی سەرێ خوە تڕاشیبوو و ڤاتەکا بکارهاتی ژی بۆ خوە کریبوو کو ڕەنگێ وێ یێ شین بوو هێلێن ڕەنگ کرێمی ل سەر بوون، هەردیسان حەلاقەیەك ژی بۆ وێ دگەل خوە ئینابوو.

ڕەشید ل سەر تەختێ نڤستنێ یێ لەیلایێ ڕوونشت و ب کەیفخوشیەکا مەزن و ب نەرمی ڤردێلا ڤالکا پاکیتەکێ ڤەکر و پاشی ب ئارامی حەلاقەیەکا زێری ژێ ئینا دەرێ کو وی حەلاقا مەریەمێ یا کەڤن بربوو دەڤ زێرنگری و ب ڤێ حەلاقا نوو گوهاڕت.

"تە خەم پێ نەبیت ئەو نزانیت، ب چ ڕەنگان ئەو تیبینیا هندێ ژێ ناکەت کو من حەلاقا وێ یا دگەل ڤێ گوهاڕتی."

لەیلایێ خوە ژێ دوور کر و چوو دوماهیا تەختی. وێ گوهـ ل دەنگێ هەلما ئامیرێ ئوتیکرنا جلکان دبوو کو مەریەمێ ل ڤاتێ خوارێ هەلکربوویێ.

ڕەشیدی گوت: "وێ چ جاران نەکربوو تبلا خوە."

لەیلایێ ب دەنگەکێ نزم ڤە گوت: "ببورە من نەڤێت، من ب ڤی ڕەنگی نەڤێت، پێدڤیە تو حەلاقا وێ لێ بزڤڕینی."

"چەوا؟ لێ بزڤڕینم؟"

نیشانێن بێ ئارامیێ ل سەر سەروچاڤێن وی پەیدابوون، لێ هەر زوو ب لەیلایێ کرە کەنی و گوت: "ئەز نەچاربووم هندەك پارێن دی ژی بدانمە سەر چونکی ئەڤە حەلاقەکا

جوانـتره و زێرێ وێ ژی باشتره و عەیارێ وێ 22 یە، سەحکێ چەند یا جوان و گرانە، کا بهەلگره و بزانە چەند یا ب سەنگە."

پاشی وی ڤالکا وێ گرت و گوت: "ئەرێ تو و گول د چەوانە؟ ئەرێ ئەڤ گولا ل سەر یا جوانە؟ ئەز نزانم کا تو حەز ژ گولان دکەی یان نە؟ یان ژی بەهرا پتر تو حەز ژ کیژ جورێ گولێ دکەی، گولبهار، گول هەلاڵ یان ژی گول بنەفش؟ یان ژی تو حەز ژ ژ وان ناکەی؟ باشە ئاریشە نینە و ئەز ب خوە ژی هند یێ شارەزا نینم؟ هەما من هۆسا هزرکر. ئەز ل ڤێرێ، دەهمازانگ، جلکدرەکی دنیاسم، سوباهی دێ تە بەمە دەڤ داکو بەژنا تە بپیڤیت و کراسەکی بۆتە کەر بکەت."

لەیلایێ سەرێ خوە هەژاند و وەك نیشانەك بۆ نەرازیبوونا وێ ل سەر داخوازیا وی. رەشیدی بریێن خوە لێ بلند کر.

لەیلایێ گوت: "من دڤێت زوو ئەڤ کاره بهێته کرن."

رەشیدی دەستێ خوە دانا سەر گەردەنا لەیلایێ، لەیلایێ خوە ل بەر نەگرت و نەچاربوو بەرەڤ پاشڤە بزڤریت. وێ هۆسا هەست ب زڤراتیا دەستێ وی کر خوە دا بێژی وێ چاکیتەکێ سۆفی یێ کەڤن و زڤر بێی جلکێن ناڤخۆیی یێ کریە بەر خوە.

"بەلێ؟"

"ئەز دبێژم یا باشترە ئەم زوو رێورەسمێن مەهرکرنێ دەست پێ بکەین، باشترە."

رەشیدی دەڤێ خوە ڤەکر و ژ کەیفان دا تژی سەر لێڤێن وی گرنژین بوو، ددانێن وی یێن زەر ل پشت لێڤێن وی دیاربون.

"زووتر. باشە ئەزێ رازیمە."

***

بەری هاتنا عەبدولشەریفی، لەیلایێ بڕیار دابوو بچیتە پاکستانێ. هەتا پشتی هاتنا وی ژی، لەیلایێ هەر هزرا خوە د هندێ دکر وێ مالێ بجهـ بهێلیت و بەرەڤ جهەکێ دوور بچیت و ژ ڤی باژێری دەربکەڤیت، ئەو باژێرێ ل سەر هەر جادەیەکا وی داڤەك هاتیە ڤەدان، دناڤ هەر کولانەکێ دا دێوەکی خوە ڤەشارتی هەروەکو وان دێوێن دناڤ یاریا دناڤ سندوقان دا دەمێ دەرگەهێ وێ ڤەدبیت یەکسەر خوە دهاڤێژنە ژ دەرڤە.

لێ ژ نیشکەکێ ڤە لەیلایێ دەست ژ ڤان هزران بەردا.

دگەل ڤێ دلڕابوونا ڕۆژانە و مەزنبوونا سینگێ وێ، ئەو نەشێت هزرا دەرکەفتنێ بکەت. زێدەباری ئاگەهداربوونا وێ ل سەر وێ ڕاستیێ کو دناڤ ڤێ گێلەشوکێ هەموویێ دا، ئەو هەیڤەك بوو خولا وێ یا هەیڤانە گیروو‌بووی.

لەیلایێ هزرێن خوە د کەمپێن پەنابەران دا کرن. وێ دەشتەکا بەرفرەهـ دگەل هزاران پارچەییێن پلاستیکی ئینانە پێشچاڤێن خوە کو ب ستوونێن بەروەخت ڤە هاتبوونە گرێدان و ئەو ژی ل بەر وی بایێ سارِ یا ڕوونشتیە و د بن خیڤەتەکا بەروەخت دا زارۆکێ خوە ئینا سەر دنیایێ، زارۆکێ تارِقی.

هەردیسان دهاتە پێشچاڤێن وێ کو ڕوویێن وێ دناڤێکدا یێن چووین و شەپیلکێن وێ ژ سەرمان دا دلەرزین و پیستێ لەشێ وێ یێ ڕەش و شین بووی. دەمێ هندەك کەسێن بیانی ژی سەرێ زارۆکێ وێ یێ ساڤا دشون، دێ کەلەخێ وی دناڤ کفنەکێ ڕەنگ قەهوای یێ ڤەبی دا نخێڤن و پاشی دێ کەنە دناڤ چالەکا بچووك دا کو ئەردەکێ هۆسایە بازێن ئەسمانان بەردەوام زێرەڤانیێ لێ دکەن.

ئەرێ نوکە دێ چەوا شێی ڕەڤی؟

لەیلایێ ناڤێن وان کەسان دهەژمارتن یێن وێ د ژیانا خوە دا نیاسین. ئەحمەد و نور یێن مرین، حەسینا یا چووی، گێتی یا هاتیە کوشتن، دایك و بابێن وێ ژی یێن مرین، تارِق ژی پشتی یێ بوویە نیڤ مرۆڤ، گیانێ خوە یێ ژدەستدای.

لێ ب شێوەیەکێ نەچاڤەڕێکری، تشتەك ژ ژیانا وێ یێ بۆ مای، پەیوەندیا وێ یا دوماهیێ دگەل کەسەکی کو پارچەیەکە ژ تارِقی و هێشتا یێ دناڤ زکێ وێ دا دژیت. دەستێن وی یێن بچووك هێدی هێدی یێ گەشە دکەن، ڤێجا چەوا ئەو دێ دلدەت تشتێ یەکانە یێ ژ ژیانا وێ یا بەرێ و ژ تارِقی بۆ مای ئێختە د مەترسیێ دا؟

ژبەر هندێ وێ بلەز بڕیار دا شوو ب ڕەشیدی بکەت، چونکی ئەڤە شەش حەفتی ل سەر وێ ڕۆژێ بورین دەمێ تارِق چوویە دەڤ و ئەو ماوەیە بەس بوو خوە بڤەشێریت، لێ پیچەکا وەخت ب سەرڤە بچیت، ڕەشید دێ گومانێ ژێ بەت.

وێ دزانی ئەڤ کارێ ئەو دکەت، کارەکێ ژ خوە شەرم نینە بەلکو کارەکێ ب گونەهـ و هەتکبەری یە و زۆلم و غەردەکا مەزنە ل مەریەمێ دکەت. هەرچەندە ئەو زارۆکێ دناڤ زکێ وێ دا هێشتا هندی نوکەکێ بوو، ئەو دشیا ژبەر خوە ببەت، لێ وێ دڤیا هەر ژ نوکە

وەك دایكەك خوە بكەتە قوربان و ڤێ گونەهێ بكەتە ستوویێ خوە و پاراستن و قورتالكرنا زارۆكی ل دەڤ وێ ژ هەموو تشتان گرنگتر بوو.

لەیلایێ دەستێ خوە ئێخستە سەر زكێ خوە و چاڤێن خوە نقاندن.

***

رۆژەكێ ژ رۆژان، لەیلا دێ رێورەسمێن ماركرن و شەڤا بووكینیا خوە یا بێدەنگ ب هەموو بەش و هووربینیێن وێ ڤە ئێنتە بیرا خوە.. چاكیت و پەنترۆنێ رەشیدی یێ خیت خیت، بێهنا تیژا سپرا ل سەرێ خوە كری، برینەكا بچووك ل سەر حەفكا وی ئەوا ژبەر دەفكێ رهتراشینێ پەیدابووی، بێهنا دووكێلا جگارێ دەمێ حەلاقە كریە تبلا وێ، ئەو پێنۆسێ نەدنڤیسی و پاشی چووین ل پێنۆسەكێ دی بگەرییێن، گرێبەستا هەڤژینیێ، ئیمزاكرنا وێ. وی ب دەستەكێ ب هێز و باوەری ب خوە هەی و وێ ژی ب دەستەكێ لەرزوك ترس ڤە ئیمزا كر. هەردیسان كرنا دوعایان و دانانا پەردەكێ ل سەر سەرێ وان و خۆدیكەكێ د بن پەردێ ڤە و دیتنا رەشیدی د خۆدیكێ دا كو بریێن خوە بلند كربوون.

د كوژیەكێ وێ ژوورێ دا، مەریەمێ چاڤدێریا ڤان رێورەسمان دكر. بابێ وێ ژوورێ یێ پڕ بوو ژ نەرازیبوون و ئاخ و ئوفێن وێ. لەیلا نەدشیا بەرێ خوە ژ ئاورینێن وێ ژنا مەزن ڤەكەت.

***

وێ شەڤێ لەیلایێ خوە ل سەر چوارچەڤا تەزی یا ل سەر ئەردی درێژ كربوو و تەماشەی رەشیدی دكر دەمێ پەردە بەردداین. ئەو گەلەك دترسیا و لەرزی هەتاكو بەری تبلێن وێ نێزیكی قولبكێن كراسێ وێ بكەت و ڤەكەت. ئەو گەلەك یێ ب كەیف بوو، دەستێ خوە ب سەر قەمیسێ خوە دا ئینان و پاشی قائیشا خوە ژ پەنتەرۆنی ئینا دەرێ، لەیلایێ سینگێ وی یێ قورمچی دیت، هەردیسان زكێ وی یێ مەزن و دەمارێن خوینێ یێن زراڤ یێن د ناڤەراستا زكێ وی دا و موویێن سپی ل سەر مل و دەستێن وی دیتن، چاڤێن وی ژی دیتن كا چەوا ب سەر لەشێ وێ دا دگەرییێن.

رەشیدی گوت: "خودا هاریكارێ من بیت، یا ژ من ڤە ئەز گەلەك حەز ژ تە دكەم."

د بن چكچكا ددانێن خوە ڤە، لەیلایێ داخواز ژێ كر رۆناهیێ بڤەمرینیت. پشتی هینگێ، دەمێ لەیلا پشتراست بووی كو ئەو یێ نڤستی، ل وێ كێركێ گەریا یا وێ ل بن

دووشەکا خوە ڤە ڤەشارتی. پاشی وێ برینەك ل تبلا خوە یا بەرانی کر و بەتەنیك ل سەر خوە ڕاکر و هێلا چپکێن خوینا تبلا وێ بکەڤنە سەر وێ چارچەڤێ یا وان ل سەر خوە درێژ کری.

# 31

## مەریەم

ل وان ڕۆژان هەمووان، مەریەمێ لەیلا نەددیت، ب تنێ دەنگێ چیرچیرا تەختێ وێ، دەنگێ کەفچکێ پەیالێ دەمێ چا بۆ خوە دبرە ژوورا خوە و تێکفە ددای، دەنگێ ڕەپ ڕەپا پێلاڤێن وێ، دەنگێ شرڕشرا ئاڤێ د سەرشوویێ ڤە دەمێ سەرێ خوە د شووشتی دهاتە گوهێن مەریەمێ. هندەك جارێن کێم ژی هەڤدیتنەکا کورت دناڤبەرا وان دا پەیدادبوو.

ژبەرکو ئەو هەردوو د مالەکێ ڤە دژیان، ژ نەچاری ڤە چاڤێن وان ب هەڤدوو دکەفتن ب تایبەت ل سەر دەرەجکان، د ژوورا مێهڤانان ڤە، د لێنانگەهێ ڤە، یان ژی ل بەر دەرگەهێ حەوشێ ب تایبەت دەمێ مەریەم ژ دەرڤە دهاتە مال دا د بەر وێ ڕا دبوری.

دەمێ ئەو هەردوو ب ڤی ڕەنگی دبەر هەڤدوو ڕا دبورین و چاڤێن وان ب یەك دکەفتن، گرژیەکا نەخوش دناڤبەرا وان دا پەیدادبوو. لەیلا دا دەهمەنا کراسێ خوە هەلدەت و ب پەیڤەکێ یان چەند پەیڤەکان د بن لێڤکان ڕا داخوازا لێبورینێ ژێ کەت و ڕێکا وێ دکر دەمێ ئەو بلەز دبەر وێ ڕا دبوری. مەریەمێ ژی دبن چاڤان ڕا تەماشەی وێ دکر بێی کو دگەل باخڤیت.

هندەك جاران بێهنا ڕەشیدی ژ لەیلایێ دچوو وێ، ب تایبەت بێهنا خوها لەشێ وی و تووتنا جگارەیێن وی، زێدەباری بێهنا حەزێن وی یێن بێ سنور. نوکە ئەو گەلەك یا کەیفخوشە کو ئێدی ب ڕەخ ڕەشیدی ڤە نانڤیت و دەرگەهێ ڤی بابەتی یێ هاتیە گرتن. نوکە ژی هەردەمێ بیرا وێ ل هندێ دهێت دەمێ دگەل ڕەشیدی دنڤستی، یەکسەر دلێ وێ ڕەش دبیت و هناڤێت وێ ڕەق دبن و ها دێ دلێ وێ ڕابیت.

ل دەمێ شەڤێ ژی، ئەڤ ڕەڤینا وان ژ هەڤدوو بابەتەکێ مەحال بوو چونکی بەری هینگێ ڕەشیدی گوتبوویێ کو ئەو هەموو ئەندامێن یەك خێزانێ نە، ب ڤی ڕەنگی ژی پێدڤیە ئەندامێن یەك خێزانێ پێکڤە ل سەر یەك سفرا نانخوارنێ ب ڕوونە خوارێ.

"ڤێجا ئەڤە."

ڕەشیدی کەفچك دانا ڕەخەکی و ب دەستی گوشت ژ هەستیکان ڤەدکر، پشتی بورینا حەفتیەکێ ب تنێ ل سەر مارکرنا لەیلایێ، ئێدی وەکو بەرێ خوارن ب دەستی دخوار و کەفچك و کەنچاڵ دانانە ڕەخەکی.

"ئەرێ ما من دوو پەیکەر بۆ خوە ئینواینە هۆسا د بێدەنگ؟ مەریەم پیچەکێ باخڤە تو هۆسا یا بێدەنگ، سحبەتەکێ دگەل لەیلایێ بکە."

ل وی دەمێ کو مەژیێ هەستیکی دمێژای، گوتە لەیلایێ: "تو لومەی وێ نەکە، ئەو هەموو گاڤان هۆسا یا بێدەنگە. باوەربکە کەسەکێ چ ئاخفتن ڤێ نەبن و نەزانیت باخڤیت، هەردەمێ تشتەك گوت ژی دێ بیتە پێتڕانك و هەموو پێ کەنە کەنی. ئەز و تو خەلکێ باژێرینە، لێ ئەو گوندیکە، نە نە ب دروستاهی گوندیك ژی نینە بەلکو دناڤ کۆلکەکی و دوور ژ مرۆڤان و ژ دەرڤەی گوندی یا مەزن بووی، چونکی بابێ وێ ئەو بربوو وێرێ. ها مەریەم دیارە تە ئەڤ چەندە نەگوتیە وێ؟ ئەرێ تە گوتیێ کو تو کچەکا بیژی بووی؟ ئاها ئەڤە ڕاستیا وێ یە، لێ سەرەڕای هندێ ژی ژنەکا باشە و هندەك ساخلەتێن باشیێ ژی ل دەڤ هەنە. لەیلا جان وەکو تو دبینی، ئەو ژنەکا ب هێز و خوراگرە و شولکەرەکا باشە و قەت گازندەیان ناکەت. ئەز دبێژم هەکە ئەو ترۆمبێل بایە دا ژ مارکا ڤۆلگا بیت."

هەرچەندە نوکە ژیێ مەریەمێ یێ گەهشتیە سیهـ و سێ سالان، لێ هێشتا پەیڤا بیژی یا ب دووڤ وێ ڤە و دەروونێ وێ دئێشینیت. نوکە ژی دەمێ گوهـ ل وێ پەیڤێ بووی، هزرکر ئەو مێریەکە یان کێزەکە و چ بەهایێ خوە نینە. بیرا وێ ل نانایێ هات دەمێ گوتیێ تو کچەکا بیژی یا گێژ و لالی، ئەرێ ئەڤە پاداشتێ منە بۆ هەموو وان نەخوشیێن من خوە ل بەر گرتی. تو بوویە ئەگەر ناڤێ بنەمالا مە پیس ببیت هەی بیژیا لاڵ.

ڕەشیدی گوتە لەیلایێ: "بەلێ پا تو، تو ژ مارکا مارسیدس بێنزی. مودێلا نوو و پلە یەکی. واو، واو، بەلێ پا..."

وی تبلا خوە یا شەهدێ یا ب دوهن بلند کر و بەردەوام دا ئاخفتنێ: "بەلێ ل سەر خودانێ بێنزێ یا پێدڤیە گەلەك یێ ل ترۆمبێلا خوە هشیار بیت، دڤێت ڕێزێ ل جوانی و بهایێ وێ بگریت، تو مەرەما من تێگەهشتی؟ دەمێ ئەز ب ڤی ڕەنگی بەحسێ ترۆمبێلا

دکەم، ڕەنگە هوون من ب کەسەکێ دین ل قەلەم بدەن، لێ د ڕاستی دا مەرەما من ئەو نینە بێژن هوون ترۆمبێلن، بەلکو ب تنێ من دڤیا ئەز پتر مەرەما خوە بۆ هەوە ڕوهن بکەم."

داکو ڕەشید بشێت بەردەوامیێ بدەتە ئاخفتنا خوە، ئەو گولمچکا برنجی د دەستێ وی دا کرە د سێنیکێ دا، هەردوو دەستێن خوە ژ خوارنێ دوور کرن و ب دێمەکێ ڕژد و ب سیمایەکێ پڕی هزرکرن ڤە بێی کو سەرێ خوە بلند بکەت گوت: "ل سەر ساخان پێدڤیە بەحسێ مریان ب خراپی نەکەن نەخاسم شەهیدان. مەرەما من کێمکرن و سفکاتی پێکرن نینە دەمێ ئەز ڤێ چەندێ دبێژم. لێ پێدڤیە تو باش بزانی کو ئەز کەسەکێ تا ڕادەیەکی خوەپارێز و گرتیمە. من گومان ل سەر هندەك ژ وان تشتان هەیە یێن دایك و بابێن تە، خودا ژێ ڕازی بیت و جهێ وان بکەتە بەهەشت، چاڤێن خوە ل سەر خشاندی و ب چ ڤە نەوەرگرتی. ل من ببورە بۆ گوتنا ڤێ چەندێ."

مەریەمێ دیت کو ب ئاورینەکا سارِ و پڕی کەرب و کین ڤە لەیلا یا تەماشەی ڕەشیدی دکەت، لێ ڕەشیدی سەرێ خوە بلند نەکربوو، ژ بەر هندێ تیبینیا وێ نەکر.

"تشتێ چووی یێ گرنگ نینە، یا گرنگ ئەوە نوکە ئەز هەڤژینێ تەمە و ئەرکێ سەر ملێ منە نەك بەرەڤانیێ ژ ناموسا تە بکەم، ناموسا تە یا مە هەموویانە و دڤێت ئەز بەرەڤانیێ ژێ بکەم چونکی ژ ڤی لایی ڤە ئەز پیچەکێ یێ دوودلم. هیڤی دکەم ژ من تۆڕەرنەبە. تو شاهژنا منی و ئەڤ مالە ژی کوچکا تەیە. هەر داخوازیەکا تە هەبیت، بێژە مەریەمێ و ئەو دێ بۆ تە بجهـ ئینیت، مانە هۆسا مەریەم؟ ئەگەر تە تشتەك ژی بڤێت دێ بۆ تە دگەل خوە ئینم. تو دبینی، ئاها ئەز ژ ڤی جورێ هەڤژینامە."

پشتی بۆ دەمەکێ کێم بێدەنگبووی، بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

"هەر تشتێ ئەز دبێژم بەرامبەری خوە ژی هەیە، باشە. تشتێ یەکانەیێ یێ ئەز ژ تە داخواز دکەم نەیێ ب زەحمەتە. ب تنێ من دڤێت تو بێی من ژ مال نەدەرکەڤی. ب تنێ ئەڤ چەندە نەك زێدەتر. ئەڤە یا ب ساناهیە مانە؟ ئەگەر ئەز ل مال نەبووم و تە پێدڤی ب تشتەکی هەبوو، مەرەما من تشتەکێ گەلەك پێدڤی کو تو خوە نەگری هەتا ئەز دزڤڕمە دمال، تو دشێی مەریەمێ پێشخوە ڤە فڕیکەیە بازاڕی و ئەو دێ چیت بۆ تە کریت.

تە نوکە زانی جوداهیی دناڤبەرا هەردوو ترۆمبێلان دا چیە، چ پێنەڤێت تە زانی. کەسەك نەشێت ترۆمبلا ڤۆلگا و ترۆمبێلا مانز وەکو یەك بهاژووت، چونکی ئەڤ چەندە

کارێ دینایە، مانە هۆسایە؟ هەردیسان من دڤێت دەمێ تو دچیە ژ دەرڤە ژی بورکەی بکەیە بەر خوە، هەلبەت ئەڤ چەندە بۆ پاراستنا تە ب خوەیە چونکی گەلەك سنێلە و گەنج ل ڤی باژێری هەنە، هندەك ژ وان زەلامێن سڤك و بێ رەوشتن و دەستدرێژیێ دکەنە سەر هەموو کچان، هەتا ژنێن ب مێر ژی و هەتکا وان دبەن. ب تنێ من دڤێت تو ڤی کاری ل سەر خاترا من بکەی. پێدڤیە تو باش وێ چەندێ ژی بزانی دەمێ کو ئەز ل مال نەبم، مەریەم چاڤ و گوهێن منە."

ل ڤێرێ بەرێ خوە دا مەریەمی، ئاورینا وی بۆ وێ وەکو وێ شەڤێ بوو یا تو ب پەحینەکا ئاسنی ددانیە لامەکێ.

"مەرەما من ئەو نینە کو من باوەری ب تە نینە، بەلکو بابەت بەروڤاژی یە. راستی بۆ من دیاربوو تو گەلەك ژ ژیێ خوە مەزنتر و تێگەهشتیتری، لێ دگەل هندێ ژی لەیلا جان تو کچەکا گەنجی و دوور نینە کچا گەنج بەرەڤ ئاراستێ شاش ڤە بچیت یان ئەهریمەن بچیتە د سەرێ وێ دا و سەردا ببەت. هەرچەوا بیت ئەگەر شاشیەك روودا ژی دێ مەریەم یا بەرپرسیار بیت."

رەشید یێ بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنێن خوە و بەردەوام داخوازیێن خوە وەکو مۆشەکێن کابولێ ب سەر وان دباراندن، مەریەم ژی ب بێدەنگی روونشتبوو خوارێ و د بن چاڤکان را تەماشەی لەیلایێ دکر.

★★★

رۆژەکێ دەمێ مەریەم د ژوورا مێهڤانان ڤە یا روونشتی و مژوولی ڤەدکرنا وان پارچێن قوماشی بوو یێن رەشیدی ژ ڤەنەپەیان ڤەکرین، وێ نەدزانی کا ژ کەنگی وەرە لەیلا ل بەر دەرگەهێ ژوورێ یا راوەستیایە و تەماشەی وێ دکەت، لێ دەمێ دەستێ خوە هاڤێتیە پارچەکا قوماشی و سەرێ خوە بلند کری، وێ دیت لەیلا یا ل بەر دەرگەهی راوەستیایە و پەیالەکا چایێ ب هەردوو دەستێن خوە یا هەلگرتی.

لەیلایێ گوت : "ببورە مەرەما من ئەو نەبوو تە بترسینم."

مەریەمێ ب تنێ تەماشەی وێ کر بێی کو پەیڤەکێ ژی باخڤیت.

ل وی دەمێ هەتاڤ دکەفتە سەر سەروچاڤێن لەیلایێ و چاڤێن وێ یێن کەسك و مەزن و ناڤچاڤێن وێ یێن پاقژ دتەیسین. بریێن وێ یێن زراڤ و رێکخستی نەوەکو بریێن

مەریەمێ بوون، پرچا وێ یا زەر ژی کو هێشتا ئەڤرۆکە شانە نەکربوو بەلکو د نیڤەکێ ڕا کربوو دوو بەش.

دەمێ مەریەمێ دیتی وێ پەیالە ب هەردوو دەستێن خوە حێل یا گڤاشتی و ملێن خوە یێن ڕەق کرین، بۆ وێ دیاربوو کو یا ئارام نینە.

"ها وەختە دێ بەلگێن داران زەر بن، تو دبینی؟ پایز ئەو وەرزە یێ ئەز گەلەك حەز ژێ دکەم. دەمێ بەلگێن داران دناڤ باخچەیان دا دهێنە سۆتن بێهنەکا خوش ژێ دهێت، بەلێ پا دایکا من پتر حەز ژ بهارێ دکر. ئەرێ تو دایکا من دنیاسی؟"

"نە گەلەك."

لەیلایێ دەستێ خوە ب گوهێ خوە ڤە نا و گوت: "ببورە تە چ گوت؟"

مەریەمێ دەنگێ خوە بلند کر و گوت: "من گوتی نەخێر، من دایکا تە نەدنیاسی."

"ئاها"

"باشە تە تشتەك دڤێت؟"

"مەریەم جان، من دڤێت ل سەر وان ئاخفتنێن شڤێدی ڕەشیدی گوتین دگەل تە ..."

مەریەمێ ئاخفتنا وێ بۆ تەمام کر و گوت: "من ژی دڤیا ل سەر ئاخفتنێن وی دگەل تە باخڤم."

لەیلا ب ڕژی و ب باوەری ب خوە هەبوون ڤە چەند پێنگاڤەکان خوە نێزیکی وێ کر و تا ڕادەیەکی کەیفخوش ژی بوو.

ژ دەرڤە، دەنگێ ئاوازێن بالندەیەکی دهاتە گوهێن وان، هەردیسان کەسەکی ژی عەرەبانەیەك ل دووڤ خوە ڕادکێشا. مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ چیر چیرا تائیرێن عەرەبانا وی دبوو. ل دووڤ دا دەنگێ تۆپەکێ و پاشی تەلقەکێ و ل دووڤ دا سێ تەلقێن دی هاتە گوهێن وان، ل دوماهیێ دووبارە بێدەنگیەك پەیدابوو.

مەریەمێ گوت: "ئەز نابمە خودراما تە، چ جاران."

لەیلایێ گوت: "نەخێر، ئەز ب خوە ڤێ چەندێ قەبوول ناکەم."

"دبیت تو شاهژنا کوچکێ بی و ئەز ژی گوندیك بم، بەلێ ئەز فەرمانان ژ تە ناوەرگرم. تو دشێی بچیە دەڤ وی و گازندێن خوە بۆ وی بکەی و بلا ئەو ژی بهێت سەرێ من ببڕیت، لێ ئەز قەت کارێن هۆسا ناکەم، تو تێگەهشتی؟ ئەز قەت نابمە خودراما تە."

"نەخێر مەریەم، من ژی ئەڤ چەندە نەڤێت."

"ئەگەر تو هۆسا هزربکەی دێ خوە ب جوانیا خوە نازدار کەی و ل دژی من بکارئینی داکو بشێی خوە ژ من ڕزگار بکەی، پشتڕاستبە تو یا شاشی، چونکی ئەز یەکەم جار یا هاتیمە ڤێرێ و نوکە ئەز خودانا مالێ مە ژبەر هندێ کەس نەشێت من بکەتە ژ دەرڤە، خو توژی."

لەیلایێ ب کزگریوك ڤە گوت: "ئەز ب خوە چ کارێن هۆسا ناکەم."

"باشە، مادەم برینێن تە پیچەکێ ساخبووینە، نوکە تو دشێی هندەك کارێن مالێ هاری من بکەی."

لەیلایێ یەکسەر سەرێ خوە زڤڕاند، هندەك ژ چایا د پەیالا وێ ڕێژت، لێ وێ ئاگەهـ ژێ نەبوو.

"بەلێ ئەز ژی ژ بەر هندێ یا هاتیمە خوارێ دا دگەل تە باخڤم. ئەز سوپاسیا تە دکەم کو تە چاڤێ خوە دایە من دەمێ ئەز یا نەخوش."

مەریەمێ بلەز گوت: "باشە، بەلێ پێدڤی نەدکر تو ڤێ چەندێ دگەل من بکەی. ئەگەر من زانیبا دێ ل من قولپی و هەڤژینێ من ژ من ستینی و دزی، من ڤەت خوارن نەددا تە و سەرێ تە نە دشووشت و ب ڕەخ تەڤە نەدڕاوەستیام."

"دزینا هەڤژینێ تە؟"

"ژ نوکە وێ ڤە ئەز ب تنێ دێ خوارنێ لێنم و ئامانان شووم، دڤێت توژی مالێ ب سەروبەر بکەی و جلکان بشوی. کاروبارێن دی ژی دێ کەینە گەڕانێ و هەر جار یەك ژ مە دێ کەت. من نەڤێت خوە بینمە ڕێزا تە. ب تنێ یا من دڤێت ئەوە کو ب چ ڕەنگان مایێ تە د من ناچیت و مایێ من ژی د تە ناچیت. ژ نوکە وێ ڤە دێ هۆسا پێکڤە ژین و ئەڤ چەندە دێ بیتە دەستوورێ ژیانا مە."

دەمێ وێ ئاخفتنێن خوە ب دوماهی ئینایین، دلێ وێ وەکو چەکوچی خوە لێددا و دەڤێ وێ هشك ببوو. بەری نوکە مەریەمێ دگەل چ مرۆڤان ب ڤی شێوەی نەئاخفتبوو و ب ڤی ڕەنگی دەربڕین ژ تۆڕەبوونا خوە نەکربوو. ڤێ چەندێ پیچەکێ بێهنا وێ فرەهـ کر. لێ چاڤێن مەریەمێ پڕبوون ژ ڕۆندکان. مەریەمێ هەستپێکر ڕەفتارا وێ نەیا دجهێ خوە دا بوو هەمبەر وێ کچێ.

مەریەمێ دەستێ خوە درێژ کر کو پارچەکا قوماشی تێدا بوو، گوتە لەیلایێ: "ها بگرە و بکە دناڤ چەکمەچێ دا نەک دناڤ قومسۆرێ دا. پێدڤیە تو جلکێن ناڤخۆیی بکەیە د ڕەخێ سەری دا و جلکێن دی دگەل گورەیان بکەیە د نیڤەکێ دا. لەیلایێ پەیالە دانا سەر ئەردی و دەستێ خوە درێژ کر داکو پارچا قوماشی ژێ وەربگریت.

"بۆ هەر تشتەکێ ڕوودای ئەز داخوازا لێبورینێ دکەم."

"چ پێنەڤێت دڤێت تو وەبکەی، دڤێت داخوازا لێبورینێ بکەی."

# 32

## لەیلا

لەیلایێ ڕۆژێن بەرێ دئینانە پێشچاڤێن خوە ب تایبەت بیرهاتنێن وێ یێن خوش دگەل دایکا وێ دەمێ دگەل کومەکا ژنێن جیرانان ل ناڤ باخچەیێ مالێ دڕوونشت و تیشەمبی یێن تەڕ دخوارین ئەوێن کو وەجمەیێ دناڤ دارا باخچەیێ مالا خوە دا کرین و کرینە د سێنیکەکێ دا و دگەل خوە ئینایە وێرێ. تیشەمبی د ڕەنگ سپی و سۆر بوون و هندەك ژی وەکو دەمارێن ل سەر دفنا وەجمەیێ د مور بوون.

وەجمەیێ پشتی کتەکا تیشەمبیێ هاڤێتیە د دەڤێ خوە دا، گوت: "ئەرێ هوون دزانن کا چەوا کورێ وی مریە؟"

نیلایێ، دایکا گێتیێ، گوت: "دبێژن دناڤ ئاڤێ دا نقووم بوو، مانە؟ دناڤ ئاڤا دەریاچێ دا نقووم بوو کو وی دەمی ئەو ل سەر لێڤا وێ بوو."

وەجمەیێ تبلا خوە بلند و سەرێ خوە لڤلڤاند خو دا بێژی ئەو یا ئەکتەریێ دکەت، ژبەر هندێ بەرێ هەمویان ما لێ هەتا تیشەمبیا دناڤ دەڤێ خوە دا داعیرای کا دێ چ بێژیت.

پاشی گوت: "بەلێ پا هەوە دزانی؟ هەوە دزانی کو ل وێ ڕۆژێ ڕەشیدی عارەق ڤەخواربوو و یێ سەرخوش بوو و گەلەك دکرە گری؟ خوە ب سەرخوشی ژی زێدە دکرە گری. من ب خوە ب چاڤێن خوە دیت کا وی چەوا وەکو زارۆکان دکرە گری بۆ ژ دەستدانا کورێ خوە. دەمێ بوویە نیڤرۆ وێ هوشێن خوە ژدەستدابوون و ئاگەهـ ژ خوە نەبوو تا وی ڕادەی ئەگەر تە تەپەك ل بن گوهێن وی پەڤاندبایە ژی، چاڤێن خوە ل سەر یەك نەڕادکرن."

هەردیسان دهاتە بیرا لەیلایێ کا چەوا وەجمەیێ دەستێ خوە دا بەر دەڤێ خوە و ئەزمانێ خوە دناڤ دەڤێ خوە دا گێڕاند و ئەو تشتێن ماینە د بەر ددانێن وێ ڕا پاڤژکرن.

"ئێدی هوون ب خوه یادی بینه پێشچاڤێن خوه. کورێ وی بێی چاڤێ کەسێ لێ بیت ب تنێ چوو دناڤ ئاڤێ دا و پشتی ماوەیەکی کەلەخێ وی ب مری دناڤ ئاڤێ دا دیت کو کەفتبوو سەر دەڤێ خوه. هەرچەندە خەلك د هەوارێ هاتن، نیڤەك چوونە دەڤ کورکی و نیڤەکێن دی ژی چوونە دەڤ بابێ وی. کەسەکێ شارەزا خوه ب سەر کەلەخێ کورکی دادا و ب دەڤێ خوه ب دەڤێ وی ڤەنا و هەناسە ددایێ، لێ مخابن ڤێ کریارێ چ مفا تێدا نەبوو هەموویان زانی ئەو ماوەیەك بوو کورکی گیانێ خوه ژدەستدای."

بیرا لەیلایێ باش دهێت کا چەوا وەجمەیێ تبلا خوه بلند کر و ب دەنگەکێ ترس ڤە گوت: "ژبەر هندێ خودای مەزن ڤەخوارنا عارەقێ یا حەرام کری، چونکی هەموو گاڤان کەسێ ب ئاگەهـ بهایێ گونەهێن کەسێ سەرخوش ددەت. ئەڤ ڕوودانە ژی ب هەمان شێوە بوو."

ئەڤ هزرە دهاتنە بیرا لەیلایێ پشتی کو وێ مزگینی دایە ڕەشیدی ئەو یا ب دووگیانە. ڕەشید ژی ژ کەیفان دا یەکسەر ل پایسکلا خوه سواربوو و بەرەڤ مزگەفتێ چوو دەست ب کرنا دوعایان کر.

ل وێ ئێڤارێ، مەریەمێ تەماشەی لەیلایێ دکر کا چەوا ب کەفچکەکی یاری ب پرتەکا گوشتی یا دناڤ سێنیکا ل بەر سینگێ خوه دکرن. لەیلا ب خوه ژی ل سەر سفرا نانخوارنێ یا ئامادە بوو دەمێ ڕەشیدی ئەڤ دەنگوباسە گەهاندیە مەریەمێ. لەیلایێ چ جاران نەدیتبوو کەسەك تا ڤی ڕادەی کەیفخوش بیت. دەمێ لەیلایێ گوهـ ل ڤی دەنگوباسی بووی، چەند جارەکان مژیلانکێن خوه نقاندن و سەروچاڤێن وێ سۆر بوون.

پشتی هینگێ، ڕەشید چوو ڤاتێ دووێ داکو گوهێ خوه بدەتە ڕادیویێ و لەیلایێ ژی هاریکاریا مەریەمێ کر ل دەمێ ڕاکرن و پاقژکرنا سفرا نانخوارنێ. مەریەمێ کو دندکێن برنجی و پرتێن نانی کومدکرن، گوت: "ئەگەر بەری نوکە تو بێنز بی، ئەرێ پا نوکە تو دێ بیە چ؟"

لەیلایێ ژی دڤیا خوه دگەل وێ تڕانێ بگونجینیت، گوت: "دبیت ئەز ببمە شەمەندەفرڕ یان ژی فرۆکەیەکا جامبو یا مەزن."

مەریەمێ ژی دڤیا یا دلێ خوه بێژیت و گوت: "هیڤیا من ئەوە ئەڤ چەندە نەبیتە هێجەتەك ئێدی خوه ژ کرنا کاروبارێن ناڤمالێ بدەیە پاش."

لەیلایێ دەڤێ خوە ڤەکر و دا تشتەکی بێژیت، لێ هەر یەکسەر تشتەکێ باشتر هاتە سەر هزرا وێ لەورا خوە بێدەنگ کر. وی ئینا بیرا خوە کو ل ڤی دەمی مەریەمێ چ گونەها خوە نینە. مەریەم و  ئەو زارۆکێ دناڤ زکێ لەیلایێ دا هەردوو د بێگونەهن.

پشتی هینگێ دەمێ لەیلا چوویە سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ، چاڤێن وێ پڕ بوون ژ ڕۆندکان.

"چ ڕوودایە؟

ڕەشیدی سەرێ خوە بلند کر و دڤیا بزانیت کا چ ڕوودایە هەتا ئەو بکەتە گری، ئەرێ تشتەکێ نەخوش ب سەرێ وێ هاتیە کو پەیوەندی ب زارۆکی ڤە هەیە؟ نەخێر، نەخێر؟ دیارە مەریەمێ سەرەدەریەکا ڕەق یا دگەل وێ کری؟

"مانە هۆسایە؟"

"نەخێر."

"ب وی خودایێ ئەز دایم، ئەگەر وێ دلێ تە هێلابیت نوکە دێ چمە خوارێ و وانەیەکا هۆسا دەمێ هندی ئەو یا ساخ بیت ژ بیرا وێ نەچیت. ئەو خوە چەوا دبینیت، ئەو بیژیا حەرام، هەتا ب ڤی شێوازێ خراب سەرەدەریێ دگەل تە بکەت..."

"نەخێر وێ دلێ من نەهێلایە."

ڕەشید ڕابوو سەر پێن خوە دا بچیتە خوارێ، لێ لەیلایێ دەستێ وی گرت داکو ب ڕوونتە خوارێ.

"وەنەکە، ئەو گەلەك ب جوانی سەرەدەریێ دگەل من دکەت و دلێ من ناهێلیت. بەلێ ئەز ب خوە پێدڤی بێهنڤەدانەکێ مە نەك زێدەتر. ب ئانەهیا خودای ب زووترین دەم دێ چاك بمەڤە."

ڕەشید ب ڕەخ وێ ڤە ڕوونشت و دەستێ خوە ب ملێ وێ دا ئینا خوارێ. هێدی هێدی و ب ئارامی دەستێ خوە ل سەر پشتا وێ ڕا دئینا و دبر. پاشی گوت: "باشە من دڤیا بزانم دێ شێم هاریکاریا تە کەم داکو ڕەوشا تە باشتر لێ بهێت."

***

دگەل هاتنا وەرزێ زڤستانێ، ئەو دارێن هێشتا نەهاتینە برین و بۆ سۆتنێ هاتینە هەلگرتن، بەلگێن خوە یێن ڕەنگ زەر دوەراندن و هێدی هێدی بایەکێ تەزی و سار خوە ب

سەر باژێری دادا. ڤی بایێ تەزی دوماهیك بەلگێن دارا وەراندن و داروبار ژی ل هەمبەر ڕەنگێ قەهوای یێ چیایان ڕووت خویا دكرن.

یەكەم چپكێن بەفرێ یێن وەرزێ زڤستانێ گەلەك د سڤك بوون و هەردەمێ دكەفتنە سەر ئەردی، یەكسەر د حەلیان. پشتی هینگێ گشت جادە بوونە بەستی و بەفر كەفتە سەر بانێن مالان و پەنجەركێن بەستیگرتی ژی تا نیڤەكێ نخافتن و كڕاسەكێ نوو كرە بەر باژێری.

دگەل بارینا بەفرێ، زارۆكان فرۆكەیێن خوە یێن كاغەزی ژی بلندكرنە بەر ئەسمانان كو ل سەردەمەكی ئەوان فرۆكەیان حوكمڕانی ل ئەسمانێ زڤستانا كابولێ دكر، لێ ل وی وەرزی، ژبەر مۆشەك و فرۆكەیێن جەنگی كەسێ هەست ب هەبوونا وان نەدكر.

ڕەشیدی بەردەوام دەنگوباسێن شەڕی بۆ دئینانە مال و لەیلایێ ژی گوهداریا وی دكر و هەست ب دوودلی و نەخوشیێ دكر دەمێ دزانی هێزێن چەكدار یێن بەری هینگێ هەڤپەیمان، نوكە ئەو ب خوە شەڕێ هەڤدوو دكەن.

ڕەشیدی گوت: "نوكە سەیاف شەڕی دژی هەزارەیان دكەت و هەزارە ژی شەڕی دژی مەسعودی دكەن. هەلبەت ئەو ژی شەڕی دژی حیكمەتیاری دكەت و پاكستانی پشتەڤانیا وی دكەن. ئەڤ هەردوو كەسە، مەسعود و حیكمەتیار یێن ل بەر هەڤدوو ڕاوەستیاین و د ئامادەنە خوینا هەڤدوو فڕكەن. سەیاف پشتەڤانیا مەسعودی دكەت و حیكمەتیار ژی بەرەڤانیێ ژ هەزارەیان دكەت."

پاشی ڕەشیدی گوت كو كەس هەلویستێ "دوستومی" ێ فەرماندەیێ ئوزبەكی نزانیت. مرۆڤ چ جاران پێشبینیا هندەك تشتان ناكەت. دوستومی ل سالێن هەشتێیان دگەل چەكداران شەڕ دژی هێزێن یەكێتیا سوڤییەتێ دكر، لێ پشتی سوڤییەتی ژ ئەڤغانستانێ دەركەفتین، وی دەست ژ پشتەڤانیكرنا چەكداران بەردا و چوو پشتا ڕژێما شیوعی یا نەجیبوللاهی. بەری جارەكا دی پشتا وی ژی بەردەت و بچیتە دگەل چەكداران، مەدالیا زیرەكی وچاڤنەترسیێ ژ لایێ نەجیبوللاهی وەرگرتبوو. نوكە ژی ئەو بەرەڤانیێ ژ مەسعودی دكەت.

ل باژێرێ كابولێ، ب تایبەت ل بەشێ ڕۆژئاڤایێ باژێری، شەڕ گەلەك یێ گەرم بوو بەردەوام دووكێلا ڕەشا بەفرێ وەكو كڤاركان ل سەر وان جهان بلند دبوو یێن بەفرێ

نخافتین. هەموو وەلاتان بالیوزخانەیێن خوە گرتبوون و قوتابخانە هاتبوونە وێرانکرن و ڕاوەستاندن.

ڕەشیدی دگوت کو ل نەخوشخانەیان هند بریندار یێن کەفتینە سەر یەك، بەردەوام خوینا وان دچیت هەتا دمرن. د ژوورێن نشتەگەریان ژی، ژبەر نەبوونا دەرمانان، بێی بەنجکرن، دەست و پێن برینداران ژێڤە دکەن.

"بەلێ تو خوە نەترسینە گولا من، تو ل دەڤ من دێ یا ب سەلامەت بی. یێ دەستێ خوە بۆ تە درێژ بکەت یان زیانێ بگەهینتە تە، دێ مێلاکا وی ئینمە دەرێ و دێ وی نەچار کەم ئەو ب خوە مێلاکا خوە بخوت."

ل وێ زڤستانا سارِ، لەیلایێ تەماشەی هەر جهەکی کربایە ب تنێ دیوار دهاتنە پێشچاڤێن وێ. هزرا خوە د وان ڕۆژان دا دکر دەمێ هێشتا ئەو زارۆك و ئەسمان هەموو ل بەر ڕوویێ وێ یێ ڤەکری. هەردیسان بیرا خوە ل وان ڕۆژان دئینا دەمێ دگەل بابێ خوە دچووینە "بوزکاشێ" کو بەریکانەیا فرۆکەیێن کاغەزی لێ دهاتە ئەنجامدان، زێدەباری وان ڕۆژان یێ، دگەل دایکا خوە دچوویە "ماندی"یێ بۆ بازارکرن و کڕینا کەلوپەلان.

ئەو ڕۆژ دهاتنە بیرا وێ یێن دگەل گێتی و حەسینایێ ل سەر جادەیان دا دچووین و بەحسێ کورکان دکر. ل دەمەکی دگەل تارقی ل سەر لێڤا ڕووباری دروونشت و یاری و ترانە ب هەڤدوو دکرن و تەماشەی دیمەنێ ڕۆژئاڤابوونێ دکر.

هزرکرن د تارقی دا خیانەت بوو، چونکی بەری ئەو ڕێکێ ل وان هزرا بگریتن تارق دهاتە پێشچاڤێن وێ کو ل دووری وەلاتی ل سەر تەختەکی یێ درێژکریە و سوندە ب هەموو لەشێ وی یێ سۆتی ڤە دگرێداینە، وەکو وێ تایا بەلاعیمان یا هەموو ڕۆژان گەوریا وێ دسۆت. خەمەکا مەزن دناڤ سینگێ وێ دا پەیدابوو و ئەو لاواز و بێ قات دکر تا وی ڕادەی نەدشیا خوە ل سەر پێن خوە بگریت و دەستێ خوە ب تشتەکی ڤە دگرت داکو نەکەڤیت.

لەیلایێ زڤستانا سالا 1992ێ ب پاقژکرنا ناڤمالێ و بۆیاغکرنا دیوارێن ژوورا خوە و ڕەشیدی یا نڤستنێ و شووشتنا جلکان دناڤ تەستەکا مەزن یا مسی دا دناڤ حەوشێ دا بوراند.

هندەك جاران هەست ب لاوازيێ دكر و ل دور سەرێ خوە دزڤڕى. ل وى دەمى دا ل سەر تەختكەكى ل بەر تەستێ ڕوونتە خوارێ و هەتا سەر چووكان كڕاسێ خوە ڕاكەت و دەستێن خوە يێن پيڤازى دكرنە دناڤ ئاڤا تەزى دا و جلكێن ناڤخۆيى يێن ڕەشيدى دشووشتن، ل وى دەمى وەكو كەسەكا بەرزەبووى خوە ددیت، وەكو وێ گەميا شكەستى يا پێلێن ئاڤێ ياريان ب پارچەيێن وێ دكەن و چ كەنار نينن بگەهنێ بەلكو هندى دچن هەر ئاڤە.

دەمێ با هند ساڕ دبووى كو ب چ ڕەنگان كەس نەدشيا بچيتە ژ دەرڤە، لەيلا دناڤ مال دا دهات و چوو. ب دەستوچاڤێن نەشووشتى و پرچەكا ڤژ ڤە، تبلەكا خوە ل سەر ديوارى دخشاند و هەتا دەڤ دەرگەهى دچوو دزڤڕى ڤە. يان ژى دا چيتە سەر دەرەجكان و چيتە خوارێ و پاشى زڤڕيتەڤە سەرى. دا چيت هەتا دكەڤتە بەر سينگێ مەريەمێ و ئاورينەكا ساڕ تەماشەى وێ كەت و پاشى خوە ب سپيكرنا پيڤازان و پاڤژكرنا گوشتى و ژێڤەكرنا بەزى ڤە مژوول كەت.

بێدەنگيەكا كوژەك پەڕێن خوە ب سەر مالا وان دا ئينابوون و لەيلايێ هەست ب وێ بێدەنگيێ دكر يا كو نەدشيايى ب چ پەيڤان دەربڕينێ ژێ بكەت. ئەو بێدەنگيا ژ مەريەمێ دفڕى هەروەكو وان پێلێن گەرم بوو يێن ڕۆژەكا هاڤينێ ژ چيمەنتويێ دەردكەڤن. پاشى دا زڤڕيتە ژوورا خوە و ل سەر تەختى ڕوونتە خوارێ و تەماشەى بارينا بەفرێ كەت.

★★★

ڕۆژەكێ ڕەشيدى ئەو دگەل خوە برە دكانا خوە يا پێلاڤان. دەمێ ئەو ژ دەرڤە، ڕەشيدى ب دەستەكى ئەنيشكا وێ گرتبوو. چوونا ژ دەرڤە بۆ لەيلايێ وەكو جورەكێ ڕاهێنانێ بوو ژ بۆ خوە پاڕاستن ژ كەفتن و بريندابوونێ، چونكى پێدڤى بوو ئەو چاڤێن خوە د گەل پێچەيا كون كون يا بوركەيى ب گونجينيت دەمێ ب ڕێڤە دچيت و دڤێت ئاگەهـ ژ خوە هەبيت بوركە نەكەڤيتە بەر پێن وێ و هەڤسەنگيا وێ تێكبچيت.

ب درێژاهيا ڕێكێ ژ هندێ دترسيا نەكو پێ وێ ب جهەكێ بلند بكەڤيت يان پێ وێ بكەڤيتە دناڤ چاڵەكێ دا و چوكێ وێ بشكێت. لێ ژبەركو بوركەى ئەو دڤەشارت و كەسێ نەدنياسيى، هەست ب ئارامیێ دكر.

ئەگەر کەسەکێ نیاس یان مرۆڤەکێ وێ یێ کەڤن ژی ئەو دیتبایە پێدڤی نەدکر خوە مەندەهوش بکەت یان ترسا هندێ هەبیت دلێ خوە پێ بسۆژیت یان پرسیاران ژێ بکەت کا ئەڤە چ ل وێ هاتیە و نوکە چ دکەت، چونکی بورکە رێگر بوو ئەو وێ ببینن.

دکانا رەشیدی گەلەك ژ وێ چەندێ مەزنتر و روهنتر بوو یا لەیلایێ پێشبینی بۆ دکر. رەشید ل پشت مێزەیەکا کارێ خوە روونشت کو هژمارەکا چمکێن پێلاڤان یێن کەڤن و پارچەیێن پیستی ل سەر بوون. وی چەکوچێن خوە نیشا وێ دان و پاشی بۆ دیارکر کا چەوا تائیرێن دولابا وی یا چێکرنا پێلاڤان کاردکەن.

رەشیدی کراسێ وێ بلند کر و دەستێ خوە دانا سەر زکێ وێ. دەستێ وی یێ زڤر ل سەر پیستێ لەیلایێ دا بێژی وەکو دەڤەکا داری یا زڤرە ل سەر پارچەیەکا پەمپی. لێ پشتا دەستێ وی هژمارەکا دەماران ل سەر ددیاربوون کو هەموو گاڤان وەکو ساخلەتەکا زەلامینیێ یا وەکو تارڤی دهاتە پێشچاڤێن وێ.

رەشیدی گوت: "گەلەك یێ بلند بووی، ئەز یێ پشتراستم دێ کورەکێ مەزن ژێ دەرکەڤیت. کورێ من ژی وەکو بابێ خوە دێ بیتە ڤەهرەمان."

لەیلایێ هەر زوو کراسێ خوە دانا چونکی ڤان ئاخفتنێن رەشیدی ترسەك د دلێ وێ دا پەیداکر.

"باشە رەوشا تە دگەل مەریەمێ یا چەوانە؟"

لەیلایێ گوتێ کو ئەو هەردوو پێکڤە دخوشحالن.

"ێ ێ گەلەك باشە."

لەیلایێ نەگوتە رەشیدی کو شەرەکێ ب دروستاهی دناڤبەرا وێ و مەریەمێ دا یێ روودای، ئەو شەرێ بەری چەند رۆژەکان روودای دەمێ لەیلا چوویە د لێنانگەهێ ڤە و دیتی مەریەم یا چەکمەچەیێن کەوانتەرا ئامانان یەك یەکە ڤەدکەت و ب هێز دگریتەڤە، مەریەمێ گوتێ کو ئەو یا ل وی کەفچکێ داری یێ مەزن دگەرییت ئەوێ هەر جار برنجێ پێ تێکڤە ددەن.

مەریەم ل دور خوە زڤری و گوتە لەیلایێ: "تە دانایە کیڤە؟"

لەیلایێ گوت: "من؟ من دەستێ خو نەکریێ. ئەز گەلەك کێم دهێمە د ڤێرێ ڤە."

"بەلێ چاڤێ من لێبوو..."

"چیه تو من تاوانبار دکەی؟ تە ب خوە ئەڤ چەندە دڤیا. بیرا تە دهێت دەمێ تە گوتی ئەز دێ خوارنێ بەرهەڤ کەم، بەلێ ئەگەر تە دڤێت ژ نوکە وێ ڤە چێنەکەی."

"ئانکو دیارە کەفچك ب خوە یێ ب پی کەفتی و یێ چووی، تەپ تەپ، مانە هۆسایە؟"

"ئەزا دبێژم..."

لەیلایێ بزاڤ دکر ل سەر خوە زالێ ببیت و چیرچیرێ دگەل وێ درێژ نەکەت، ب ڕاستی ژی بەردەوام وێ خوە ل هەمبەر ئاخفتنێن کرێت و یاری و لومەیێن مەریەمێ دگرت. لێ سەرێ چوکێ وێ وەڕمیبوو سەرێ وێ ژی گەلەك دئێشا و گەدەیێ وێ تڕش بوو ژبەر هندێ نەدڤیا بەرسڤا وێ بدەت.

"دبیت تە نەدانابیتە جهێ وی ڤە."

مەریەمێ ب هێز چەکمەچەك ڤەکر و دەنگێ کەفچك و چەتەلان ژێ بلند بوو.

"من نەدانابیتە جهێ وی! ما ژ کیڤە تو دهێیە د ڤێرێ ڤە هەتا بزانی؟ ئەڤە چەند هەیڤە تو نەهاتی؟ نوزدە سالە ئەز دناڤ ڤێ مالێ دا دژیم و ئەز دزانم کا هەر تشتەك ل کیڤەیە. خاتین هێشتا دایکا تە ب تە یا دووگیان بوو دەمێ من ئەو کەفچك ل ڤێرێ هەلگرتی."

لەیلا کو ئێدی نەدشیا زێدەتر هەدارێ بکێشیت، ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن داکو چ ئاخفتنێن نەخوش ژ دەڤی نەدەرکەڤن.

"ێ ڕەنگە تە دانابیتە جهەکێ دی و ژ بیرا تە چووبیت."

"ما کی نابێژیت تە ڤەشارت بیت داکو من تۆڕە بکەی."

لەیلا تۆڕەبوو گوت: "تو ژنەکا دامایی و بەختڕەشی."

مەریەم ل دور خوە زڤڕی و لێڤێن خوە ل سەر یەك ڕاکرن و گوت: "توژی قەحبەی، قەحبەیەکا دزیکەر. بەلێ تو قەحبەی و دزیکەری ژی. تو یا هۆسایی."

ل دووڤ دا بوو ڤێژ ڤێژا وان، هەر یەکێ دەستێ خوە هاڤێتە تشتەکی لێ د هەڤدوو نەوەکرن لێ وان بەردەوام خەبەر و ئاخفتنێن کرێت دگوتنە هەڤدوو، خەبەرێن هۆسابون کو ڕوویێن لەیلایێ سۆر بوون ژ شەرمان دا. پشتی وی شەڕی ئێدی ئەو ژ هەڤدوو سل بوون.

لەیلا حێبەتی ما کا چەوا هۆسا سانەهی نەشیا کونترۆلێ ل سەر خوە بکەت. لێ د ڕاستی دا وێ ژ نیڤا دلێ خوە کەیف ب ڤێ چەندێ هات. بۆ وێ خوشبوو کو ب ڤی ڕەنگی خوە ل مەریەمێ بدەت، چونکی ل دوماهیێ وێ کەسەك دیت کەرب و کینا خوە هەموویێ د سەرێ وێ ڕا بشکێنیت. لەیلایێ د دلێ خوە دا گوت ڕەنگە نوکە مەریەمێ ژی هەمان هەست هەبیت.

پشتی هینگێ بلەز چوو د ژوورا خوە ڤە و ل سەر تەختێ ڕەشیدی خوە درێژ کر لێ مەریەمێ هێشتا ل خوارێ دکرە هەوار و دگوت: "خولی ب سەرێ تە وەربیت، خولی ب سەرێ تە وەربیت،"

لەیلایێ ل سەر تەختی خوە درێژ کر و سەرێ خوە دانا سەر بالیفکێ و دەست ب گریێ کر و ژ نیشکەکێ ڤە هەستپێکر ئەو یا هزرا دایك و بابێن خوە دکەت تا وی ڕادەی خو دەمێ ئەو ڕوودان ژی ب سەری هاتی هند هزرا وان نەکربوو.

ب هەردوو دەستێن خوە ڕوویێ دووشەکێ ب هێز شداند تا بێهنا وێ چك بووی. پاشی دەستێ خوە دانا سەر زکێ خوە و هەست ب تشتەکی کر.

بۆ ئێکەم جار زارۆکێ وێ خوە لڤاند.

# 33

## مەریەم

سپێدەهیەکا زوو یا ڕۆژەکێ ژ ڕۆژانێن بهارا سالا 1993ێ، ل بەر پەنجەرا ژوورا مێهڤانان یا ڕوونشتی بوو چاڤێ وێ ل ڕەشیدی بوو دەمێ دەستێ لەیلایێ گرتی و دگەل خوە بریە ژ دەرڤە. پشتا لەیلایێ یا خوار بوو دەستەکێ وێ ب زکێ وێ ڤە و دەستەک ژی ب تەنیشتێ ڤە بوو هێدی پێنگاڤێن خوە دهاڤێتن.

د بن بورکەیی ڤە، ب تەمامی زکێ وێ مەزن دکر و ڕەشیدی ژی ب هشیاری و ئاگەهـ ژ خوەهەبوونەکا مەزن ڤە دەستێ وێ گرتبوو و وەکو پولیسەکێ هاتنوچوونێ شیرەت و ڕێنمایی ددانێ. ڕەشیدی داخواز ژێ کر براوەستیت و پاشی چوو ب پیەکی دەرگەهێ حەوشێ بۆ ڤەکر و گوتێ وەرە بورە، دەمێ لەیلا گەهشتیە دەڤ وی، دەستێ وێ گرت و هاریکاریا وێ کر هەتا ژ مال دەرکەفتی.

مەریەمێ گوهـ ل ئاخفتنا وی دبوو کو بەردەوام گوتێ: "چاڤێ تە ل بەر پێن تە بیت گولا من."

ئێڤاریا ڕۆژا ل دووڤ دا، ژ نوو ئەو ڤەگەریانە مال.

مەریەمێ دیت ڕەشید ل دەستپێکێ هاتە د ژوور ڤە و گەلەك یێ دامای و پۆسیدە بوو، وی هۆسا دەرگەهـ ل دووڤ خوە بەردا چ نەمابوو ب ناڤچاڤێن لەیلایێ بکەڤیت. ڕەشید هەر زوو دناڤ حەوشێ ڕا بوری و هاتە د ژوور ڤە. مەریەمێ دیت ناڤچاڤێن وی یێن تێکچووین و تاڕی بووین. دەمێ چوویە د ژوور ڤە، هەر یەکسەر چاکیتێ خوە ئێخست و هاڤێـە سەر قەنەپێ. پاشی ب ڕەخ مەریەمێ ڤە ڕوونشت و ب دەنگەکێ هشك گوت: "ئەز یێ برسیمە، بۆ من شیڤێ بەرهەڤ بکە."

دەمێ پشتی هینگێ مەریەمێ تەماشەی بەر دەرگەهێ حەوشێ ژی کری، دیت لەیلا یا دهێتە د ژوور ڤە و زارۆکا خوە یا ساڤا یا ڕاپێچای و دایە بەر سینگێ خوە. د دەرگەهی

دا، پێیەکێ وێ ل کولانێ بوو پێیەك د ژوور ڤە بوو داکو دەرگەهـ نەهێتە گرتن و ب دەستەکی ئەو چانتە هەلگرت یێ کەلوپەلێن خوە یێن پێدڤی کرینە تێدا، هەلگرت و ئینا ژوورە. هۆسا دیاربوو گەلەك یا واستایی بوو. دەمێ لەیلایێ سەرێ خوە بلند کری چاڤێ وێ ب مەریەمێ کەفت، لێ هەر یەکسەر مەریەمێ بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا و چوو د لێنانگەهێ ڤە داکو شیڤێ بۆ ڕەشیدی بەرهەڤ بکەت.

★★★

ڕەشیدی چاڤێن خوە تێکبرن و گوت: "خو دێ بێژی کەسەکێ دەرنەفیسی دکەتە د گوهێن من دا."

پشتی بورینا کێمتر ژ دوو هەیڤان ل سەر نەساخبوونا لەیلایێ، ڕەشید ل بەر دەرگەهێ ژوورا مەریەمێ یێ ڕاوەستای بوو و چاڤێن خوە د پەرخاندن و شورتەکێ ناڤخۆیی کربوویێ کو هۆسا دیاربوو یێ پیس بوو، داڤێن پرچا وی یا سپی ژی هەر یەك ب ڕەخەکی ڤە چووبوو. ب تۆڕەیی ڤە گوت: "ئەز هەدارێ ل سەر ڤێ گرییێ ناکێشم."

ل ڤاتێ خوارێ، لەیلایێ دەستێ زارۆکا خوە گرت بوو لایێ لایێ بۆ دگوت و بزاڤ دکر ب ڤان سترانان وێ تەنا بکەت. ڕەشیدی گوت: "ئەڤە دوو هەیڤە ئەز وەکو مروڤان نەنڤستیمە، بێهنەکا گەلەك پیس ژ ژوورا من دهێت، بچمە هەر کوژیەکی مالێ پاتەیێن پیساتییێ لێ هەنە نە. پێر ب شەڤێ پێ من کەفتە سەر پاتەیەکێ ب پیساتی."

د دل دا کەیفا مەریەمێ هات و کرە کەنی. ڕەشیدی کرە هەوار: "وێ ببە ژ دەرڤە، ئەرێ ما تو نەشێی وێ ببەیە ژ دەرڤە؟"

لەیلایێ سترانا خوە ڕاوەستاند و گوت: "بەلێ دێ وێ سارِ بیت."

"چ؟"

ڕەشیدی ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن و ب بدەنگێ خوە یێ بلند لێ کرە ڤێری: "ئەز یێ دبێژم ژ دەرڤە دنیا یا گەرمە."

"ئەز نابەمە ژ دەرڤە."

پاشی لەیلایێ دووبارە دەست ب سترانا خوە بۆ زارۆکێ کرەڤە.

"تە هند دیت من جارەکێ کرە د سندوقەکێ دا و هاڤێتە د ڕووبارێ کابولێ دا هەروەکو موسا پێغەمبەری سلاڤێن خودای ل سەر بن."

ڕەشیدی چ جاران ب وی ناڤی گازی نەدکرە وێ زارۆکێ یا دایکا وێ پێ ناڤ کری، ئانکو گازی نەدکرێ "عەزیزا"، بەلکو ل شوونا ناڤێ وێ دا بێژیت "ڤێ زارۆکێ" یان ژی هندەك جاران دەمێ یێ تۆڕە دگوت "ڤی تشتی".

هندەك شەڤان مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ قەرەقەشەیا وان دبوو، هێدی ب سەر تبلێن پێیان، دا خوە نێزیکی ژوورا وان کەت و گوهێ خوە ب دەرگەهی ڤەنیت، وێ گوهـ ل گازندەیێن ڕەشیدی دبوو دەمێ ژ زارۆکا ساڤا دکرین. گریا وێ یا بەردەوام، بێهنا وێ یا نەخوش، یارییێن وێ یێن پێ تەنا دبوو، ب وێ ڕێکێ یا لەیلایێ ژ بەر زارۆکێ ئاگەهـ ژ ڕەشیدی نەدمایی وەك پێدڤیا وێ یا بەردەوام بۆ خوارنا شیری و دلڕابوونا وێ و گوهۆڕینا جلوبەرگێن وێ ب بەردەوامی و چاڤدێریکرنا وێ.

ئەڤ پێدڤیە هەموو ببوونە ئەگەر ئێدی لەیلا ب زارۆکێ ڤە یا مژوول بیت و ڕەشیدی ژبیربکەت. لەیلایێ ژی گازندە ژ ڕەشیدی دکرن کو د ژوور ڤە جگارەیان دکێشیت و ناهێلیت زارۆکێ ل بەر سینکێ خوە بنڤیینیت، زێدەباری چەندین گازندەیێن ب ڤی ڕەنگی، لێ وێ ب دەنگەکێ نزم ئەڤ گازندە دکرن.

"نوشداری گوتی شەش حەفتیان."

"هێشتا چێنابیت، ڕەشیدی چێنابیت، هیڤی دکەم بەلاڤ خوە ژ من ڤەکە."

"بەلێ ئەڤە نێزیکی دوو هەیڤان بورین."

"هششششش، ها دێ زارۆك ژ خەو هشیار بیت."

پاشی ب دەنگەکێ بلندتر و تۆڕەڤە گوت: "ئاها نوکە بێهنا تە هات کو زارۆك هشیاربووی."

مەریەمێ هێدی پێنگاڤێن خوە بۆ پشتێ هاڤێتن و چوو د ژوورا خوە ڤە. ڕەشید چوو دەڤ مەریەمێ و گوت: "باشە تۆژی نەشیێ هاریکاریا مە بکەی؟ بێگومان تو دێ هەر شێی تشتەکی کەی."

مەریەمێ گوت: "ڤێجا ئەز چ ژ خودانکرنا زارۆکان دزانم؟"

لەیلایێ گوت: "ڕەشید، دێ شێی مەمکێ وێ یێ شووشەی ئینی؟ من یێ دانایە سەر مێزێ، ئەڤ زارۆکە شیرێ من ناخوت ژبەر هندێ دێ وێ فێری مەمکێ شووشەی کەم."

ڤێژیێن زارۆکێ وەکو ساتۆرا گوشتفرۆشی بوو دەمێ ددانایە سەر گوشتی و دبڕی. ڕەشیدی چاڤێن خوە گرتن و گوت: "ئەڤ تشتە وەکو حیکمەتیاری یە، ئەز دبێژم لەیلایێ گول بادینەکێ وەکو حیکمەتیاری یێ بووی."

★★★

دەمێ لەیلایێ وەختێ خوە ب شیردان و نازدارکرن و سەرشووشتن و هەمبێزکرنا زارۆکێ ڤە دچوون، مەریەمێ ژی چ ژ دەستان نەدهات ب تنێ تەماشەی وێ دکر. هەتا دەمێ زارۆکا وێ د خەو چووبایە ژی، ڤێجا گەڕا کومکرنا جلکێن وێ یێن ب پیساتی و دانانا وان دناڤ تەستێ و شووشتنا وان دهات کو یا پڕ بوو ژ تایتێ و بەری هینگێ لەیلایێ خورتی ل ڕەشیدی کربوو هەتا بۆ کری.

ل دووڤ دا وێ نینوکێن خوە قوستاندن، جلوبەرگێن خوە ژی شووشتن و ڕائێخستن داکو هشك ببن. هندەك جاران جلگێن زارۆکێ ژی وەکو ئاریشەیێن دی یێن ڕۆژانە دبوونە بابەتێ شەڕ و گەنگەشەیێن وان.

ڕەشیدی گوت: "ڤێجا چ کێماسی تێدا هەنە؟"

"بەلێ ئەڤە جلکێن کورکانە یێن تە ئینایین نەك یێن کچانە."

"ڤێجا یا ژ تەڤە زارۆك دشێن جوداهیێ بێخنە دناڤبەرا جلکێن کچ و کوران دا، تو دزانی کا من چەند پارە داینە ب ڤان جلکان؟ من دڤێت تشتەکی بێژمە تە، جارەکا دی ب ڤی شێوەی دگەل من نەئاخڤە و هزربکە ئەڤ چەندا من گوتی وەکو هۆشداریەکێ یە."

هەموو حەفتیان جارەکێ، لەیلایێ کوچکێ ئاگری هەلدکرێ و مەنقەل ددانا سەر و هندەك توڤێ "ئەسپەندەرێ" دهاڤێتە دناڤ دا و دوکێلا وێ دهاڤێتە سەروچاڤێن زارۆکا خوە داکو ژ چاڤێن حەسید و نەیاران بپارێزیت.

مەریەمێ هەستپێکر ئەڤ ڕەفتارێن ب کەیف یێن لەیلایێ وێ ماندی دکەن، لێ د دلێ خوە ژی دا تا ڕادەیەکی کەیفا وێ ب لەیلایێ دهات دەمێ ژبەر زارۆکا وێ، کەیفخوشی و بەختەوەری دناڤ چاڤێن وێ دا ڕەنگڤەددەت. هەتا وان سپێدەهیێن دەمێ ژ خەو هشار بایە دێمێ وێ یێ خاڤ بایە ژی یان پرچا وێ وەکو شەمالکان یا چربایە، لێ وێ ژ نیڤا دلێ خوە دکرە کەنی دەمێ زارۆکا خوە د هەلکرت و دەنگێ بەردانا بای ژێ دهات، هەر گوهۆڕینەکا سەر ب زارۆکێ دا هاتبا یان لڤینەکا سەیر کربایە دا بیتە جهێ سەرنجڕاکێشانا وێ.

"سەحکێ ڕەشید یا دەستێ خوە بۆ یاریکێ درێژ دکەت."

ڕەشیدی گوت: "حەزکەی دا هەموو ڕۆژنامەیان ئاگەهدار کەم داکو ڤی دەنگوباسی بەلاڤ بکەن."

هەموو شەڤان ئەڤ کارە دووبارە دبوون، دەمێ لەیلایێ بەردەوام داخواز ژ ڕەشیدی دکری تەماشەی زارۆکێ بکەت، وی نە ژ دل سەرێ خوە بلند دکر و دبن چاڤکان ڕا تەماشەی وێ دکر.

"سەحکێ سەحکێ، دەمێ ئەز دەستان بۆ دقووتم چەوا ئەو دکەتە کەنی، تو وێ دبینی، تو دبینی یا چ دکەت؟"

ڕەشیدی باوشکەك ڤەدا و سەرێ خوە نزماندە ڤە.

مەریەمێ ئینا بیرا خوە کا ل ڕۆژێن دەستپێکێ دەمێ وان لەیلا ئینایە مالا خوە، لەیلا تا چ ڕادە ببوو جهێ دلخوشیا ڕەشیدی. هەر تشتەکێ گوتبا یەکسەر پەسەند دکر و بۆ دئاخفت و سحبەت دکرن ب تنێ دا سەرنجا وێ بۆ خوە بڕاکێشیت و جەختی ل سەر ئاخفتنێن وێ دکر. لێ پشتی ڕەشید دگەل وێ ژی هاتیە گوهۆڕین، پێدڤی بوو کەیفا مەریەمێ ب ڤێ چەندێ هاتبایە و هەستێ تولڤەکرنێ د ناخێ وێ دا هەژیابایە، لێ د ڕاستی دا هۆسا نەبوو بەلکو مەریەمێ ب حێبەتی ڤە هەست ب هندێ دکر کو دلێ وێ ب لەیلایێ دسۆژیت.

ل دەمێ ئێڤاری و ل سەر شیڤێ، لەیلایێ گازندە ژ هندەك تشتان کرن ب تایبەت نەخوشیا هەودانا سیهان کو دگەل هەر کوخکەکا بچووك یا زارۆکێ وێ هەست ب ترسێ دکر نەکو ئەڤ نەخوشیە هاتبیتە زارۆکێ. پشتی هینگێ زکچوون و هندەك کۆلکێن سۆر و پاشی سۆرك هاتنێ.

شەڤەکێ ڕەشیدی گوت: "نابیت تو خوە ب وێ ڤە مژوول بکەی."

"مەرەما تە چیە؟"

"دوهی ب شەڤ من گوهێ خوە ددا ڕادیویا دەنگێ ئەمریکا کو بەحسێ سەرژمێریەکا سەیر دکر. گوت ل وەلاتێ ئەڤغانستانێ، ژ هەر سێ یان چوار زارۆکێن ساڤا، یەك ژ وان ناگەهیتە ژیێ پێنج سالیێ و دمریت. وان ئاها ئەڤ تشتە دگوت. ڤێجا ئێدی ئەڤە چیە؟ بەلێ چیە؟ دێ کیڤە چی؟ بزڤڕەڤە، هەر نوکە بزڤڕەڤە."

ب حەیری ڤە تەماشەی مەریەمێ کر و گوت: "ئەڤە چ ل ڤێ هاتیە؟"

ل وێ شەڤێ دەمێ مەریەم یا ل سەر جهێن خوە ڕازای، دیسان دووبارە وێ گوهـ ل شەڕ و قەڕەشەیا وان بوو. دنیا گەلەك یا گەرم بوو شەڤەکا دەستپێکا وەرزێ هاڤینێ (هەیڤا سەرەتان)ێ بوو ل کابولێ. مەریەمێ کو بەری هینگێ پەنجەرا ژوورا خوە ڤەکربوو، ڕابووڤە گرتەڤە چونکی وێ هەستپێکر ژبلی وان مێشومورێن دهێنە د ژوور ڤە، گەرماتیا ل سەر ئەردی یا بلند بیت و دگەل گەرماتیا سەر چەق و بەلگێن دارا هەموو یا دهێتە د ژوورا وێ ڤە.

هەرچەندە پتریا جاران گەنگەشەیا وان چەند خولەکەکان ڤەدکێشا، لێ ئەڤ شەڤە ژ نیڤ دەمژمێرێ بوری و گاڤ بۆ گاڤێ گەرمتر و توندتر لێ دهات تا وی ڕادەی مەریەمێ گوهـ ل قیرییێن ڕەشیدی دبوو. دەنگێ لەیلایێ ژی یێ نزمتربوو لێ دەنگێ وێ ژی یێ تیژ بوو ڤێژ ڤێژ دکر، پشتی هینگێ دەنگێ گریا زارۆکێ ژی بلند بوو.

پشتی هینگێ مەریەمێ گوهلێبوو کو دەرگەهێ ژوورا وان ب هێز هاتە ڤەکرن، دەمێ سپێدێ ڕابوویە ڤە ژی دیت دەستکێ دەرگەهێ ژوورا وان یێ ژ جهێ خوە چووی. ل وی دەمی مەریەم ل سەر تەختێ خوە یێ نڤستێ یا درێژکری بوو دەمێ ژ نیشکەکێ ڤە دەرگەهێ ژوورا وێ هاتیە ڤەکرن و ڕەشید هاتیە د ژوور ڤە.

فانێلەکی سپی و دەرپێیەك ل بەر ڕەشیدی بوون. بنکەفشێن وی ژی خوهەکا زەر گرتبوو. جووتەکێ نەعالان ل پێ وی و قائیشەك د دەستان دابوو، هەر ئەو قائیشا پیستی یا ڕەنگ قەهوای بوو دەمێ ل ڕۆژا مارکرنا لەیلایێ کریبوو، سەرێ وێ یێ کون د دەستێ خوە ئالاَند بوو.

ڕەشید هاتە سەر سەرێ مەریەمێ و لێ خوڕی و گوت: "ئەز دزانم ئەڤە شولێ تەیە."

مەریەم ل سەر تەختێ خوە ڕابووڤە و خوە د کوژیەکێ ژوورێ ڤە چکلاند و بێی ئاگەهـ ژ خوە هەبیت هەردوو دەستێن خوە وەکو خاچێ دانانە سەر سینگێ خوە چونکی وێ دزانی یەکەم قائیش دێ ب وێرێ کەڤیت.

مەریەمێ دەڤێ خوە تێکبر و گوت: "تو بەحسێ چ دکەی؟"

"ئەو خوە دوورکرن و پاڕاستنا وێ ژ من، ئەز دزانم تو یا وێ فێری ڤێ چەندێ دکەی کو نێزیکی من نەبیت."

ئەو چەندین سال بوو مەریەمێ خوە ل بەر لومە و ڕەزیلکرن و سفکاتیپێکرنا ڕەشیدی دگرت، لێ نەدشیا خوە ل سەر ترسا دناڤ ناخێ خوە دا زاڵ بکەت. نوکە ژی پشتی وان هەموو سالان، دیسان وێ دیت ڕەشید یێ ب ناڤچاڤگرێ ڤە تەماشەی وێ دکەت و قائیشەکا ب دەستێ خوە گرتی و کەرب و کین یا ژێ دفرپیت، ترسەکا مەزن دلێ وێ گرت، هەروەکو وێ ترسێ دەمێ تو بزنەکا بێ دەستهەڵات دکەیە د قەفەسا پلنگەکێ هار دا و پلنگ ژی دگەل نڕینێ، یەکەم نینوکێن خوە یێن تیژ بۆ وێ درێژ بکەت.

ل وی دەمی، لەیلایێ ب دوو چاڤێن ویق و دێمەکێ پڕی ترس و لەرز ڤە هاتە د ژوورا مەریەمێ ڤە. ڕەشیدی تفکرە مەریەمێ و گوت: "پێدڤی بوو من ل دەستپێکێ زانیبایە کو تو دێ فعلێن وێ ژی خراب کەی."

ڕەشیدی بۆ تاقیکرن، قائیشەك دانا ڕانێ خوە، دەنگەکێ ب هێز ژ سەرێ وی یێ ئاسنی هات. لەیلایێ کرە قێژی: "بەسە ڕەشید. نابیت تو کارەکێ هۆسا بکەی."

"تو مایێ خوە تێ نەکە و هەر نوکە بزڤڕە ژوورا خوە."

دیسان مەریەمێ پتر خوە تێکبر.

"نەخێر، چ کارێن هۆسا نەکەی."

"ها بگرە."

ڤێ جارێ ڕەشیدی قائیشا خوە بلند کر و د مەریەمێ وەکر داکو ب وێ بکەڤیت، لێ ل ڤێرێ تشتەکێ سەیر ڕوودا، لەیلایێ ڕێك لێ گرت. ب هەردوو دەستێن خوە ملێن ڕەشیدی گرتن و بزاڤ دکر بینتە خوارێ، وێ هەموو بزاڤکرن ڕەشیدی بڕاوەستینیت و ئێدی بەس نێزیکی مەریەمێ بیت.

ڕەشیدی کرە هەوار: "من بەردە."

"تو ب سەرکەفتی. بەلێ تو ب سەرکەفتی. ڤێ چەندێ نەکە ڕەشید. هیڤی دکەم وەنەکە و چ قائیشان نەدانێ، هیڤی دکەم وەنەکە."

ب ڤی ڕەنگی لەیلایێ ڕەشید گرتبوو و هیڤی ژێ دکرن نەدانیتە مەریەمێ. ڕەشیدی ژی ژ لایەکی ڤە سەحدکرە مەریەمێ و ژ لایێ دی ڤە بزاڤ دکر لەیلایێ ژ خوە دوور بکەت.

ل دوماهیێ مەریەم گەهشتە وێ باوەریێ کو ئەڤ شەڤە ئەو قوتانێ ناخوت. ڕەشید گەهشتە مەرەما خوە. چەند چرکەیەکان دەستێ وی مابوو ل ئەسمانان و ناڤچاڤێن وی

**ببوونه خوهـ. پاشی هێدی هێدی دەستێ خوه ئینا خوارێ و لەیلایێ ژی ئەو بەردا، لێ ژ ژوورێ نەدەرکەفت چونکی وێ باوەری ب ڕەشیدی نەبوو کو بەلاٚ خوه ژ مەریەمێ ڤەکەت. ل دوماهیێ ڕەشیدی ئەو ژ خوه دوور کر.**

**ڕەشیدی قائیشا خوه ل ملێ خوه دا و گوت: "ئەگەر خودا حەزبکەت ئەز ڤێ چەندێ بۆ هەوە هەردووکا ناهێلم و دێ باش چاڤدێریا هەوە کەم، ئەز ناهێلم هوون دناڤ مالا من دا بن و هزربکەن ئەز یێ خشیم و نەفامم."**

**دوماهیك ئاورینا خوه یا ژەهراوی ژی گرتە مەریەمێ و زڤڕی و پاڵەك ل لەیلایێ دا و ژ ڕێکا خوه لادا و دەرکەفتە ژ دەرڤە.**

**دەمێ مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ گرتنا دەرگەهی بووی، چوو سەر تەختی و خوه درێژ کر و سەرێ خوه دانا سەر بالیفکێ و ل هیڤیا هندێ بوو لەرزینا لەشێ وێ بڕاوەستیت و ئارام ببیت.**

**ل وێ شەڤێ، مەریەم سێ جاران ژ تڕسان دا ژ خەو هشیاربوو، جارەکێ ژبەر دەنگێ وان مۆشەکان یێن ل ڕۆژئاڤایی ل دەڤەرا "کارتەچار" دهاتینە پەڤاندن. جارا دووێ ژی ل دووڤ دەنگێ گریا زارۆکێ کو ل ڤاتێ خوارێ دهاتە گوهێن وێ و دەنگێ چك چکا کەفچکێ دناڤ ڤودیکا شیری دەمێ لەیلایێ بۆ بەرهەڤ دکر. جارا سیێ ژی تێهنیبوونێ دەڤێ وێ هشك کر و ژ خەو هشیار کر.**

**ل ڤاتێ خوارێ، ژوورا ڕوونشتێ یا تاڕی بوو. ژبلی ڕوناهیا هەیڤێ کو د پەنجەرێ ڕا دهاتە د ژوور ڤە. مەریەمێ گوهـ ل فرتە فرتا مشکەکی بوو کو د کونجەکا ژوورێ دا دهات و چوو، زێدەباری بوریا وێ سوپا داران ئەوا ل نیڤەکا خانی هاتیە دانان و بوریا وێ هەتا سەر بانی یا دیاربوو د کونەکێ ڕا دچوو ژ دەرڤە.**

**د لێنانگەهێ ڤە، پێ وێ کەفتە سەر تشتەکی و وەخت بوو وێ سەر و سەر ل ئەردی بدەت. پەیکەرەکێ نەدیار کەفتە بەر چاڤێن وێ، دەمێ چاڤێن خوه باش دناڤ تاڕیاتیێ دا برین، دیت لەیلا و کچا خوه د لێنانگەهێ ڤە و ل سەر دوشەکەکێ یێ دڕازاین. لەیلا کەفتبوو سەر تەنشتێ و نڤست بوو لێ زارۆکا ل بەر سینگێ وێ یا هشیار بوو.**

**مەریەمێ چرایەك هەلکر و کەفتە سەر چوکێن خوه، ل بەر ڕۆناهیا وی چرایی دا بۆ یەکەم جار ژ نێزیك ڤە تەماشەی کچا هەویا خوه کر. پرچەکا ڕەش و دوو چاڤێن**

هنگڤینی و مژویلانکێن درێژ و دوو لامێن پیڤازی و دوو لێڤێن هناری کەفتنە بەر چاڤێن وێ.

مەریەمێ دیت ئەو زارۆك هێشتا گەلەك یا بچووکە و سەرێ خوە بۆ ڤی لایی و لایێ هە دلڤلڤینیت و ب مەندەهوشی ڤە تەماشەی مەریەمێ دکر. مەریەمێ پیچەکێ خوە ژێ دوور کر نەکو زارۆك ژ وێ بترسیت. لێ ل دوماهیێ زارۆکێ ڤێژیەکا کەیفێ کر و گرنژی، دبیت ئەڤە نیشانەیەك بیت ل سەر هندێ کو ئەو ژ مەریەمێ نەترسیایە بەلکو بۆ وێ جهێ رازیبوونێ یە.

مەریەمێ ب دەنگەکێ نزم گوت: "هش هش، دایکا تە دێ ژ خەو هشیاربیت، هەرچەندە وێ باش ب گوهەکی گوهـ لێ نابیت ژی."

زارۆکێ دەستێ خوە گڤاشت و پاشی ئینا خوارێ و دیسا برە سەری و کرە د دەڤێ خوە دا. مەریەمێ بۆ زارۆکێ کرە کەنی چونکی تفا وێ ل سەر لێڤێن وێ د برسقی.

"سەحکێ ب ڤان جلکێن کورکان تو چەند یا ب کەنی، ب ڤان هەموو جلکێن ل بەر تە و ل بەر ڤێ گەرمێ، یا سەیر نینە ئەگەر خەوا تە نەهێت."

مەریەمێ بەتەنیك ل سەر زارۆکێ راکر، دیت بەتەنیەکا دی ژی یا ل دبن وێ بەتەنیکێ ڤە. زارۆکێ ئەزمانێ خوە گەزت لێ مەریەمێ ئەزمانێ وێ ژبەر ددانێن وێ راکر، زارۆکێ ژی ژ کەیفا دا ڤێژیەك ڤەدا و هەردوو دەستێن خوە ڤەکرن هەروەکو کا چەوا دەمێ باڵندە دفرن و پەرێن خوە ڤەدکەن.

"هۆسا باشترە، مانە."

مەریەمێ دڤیا هێدی هێدی خوە ژێ دوور بکەت و بچیت لێ زارۆکا ساڤا ب تبلێن خوە یێن زراڤ تبلا وێ گرت، تبلێن وێ د گەرم و نەرم بوون.

دەنگەك ژ زارۆکێ هات: "گوونهـ."

"باشە بەسە، نوکە دڤێت بچم."

دیسان زارۆکێ خوە نێزیکی وێ کر و دەستێن خوە بلند دکرن. مەریەمێ تبلا خوە کێشا لێ زارۆکێ کرە کەنی و دووبارە دەستێ خوە کرە د دەڤێ خوە دا.

"ئەرێ بوچی تو هۆسا یا ب کەیفی؟ تو ب چ دکەیە کەنی؟ تو هند یا زیرەك نینی ژی هەروەکو دایکا تە دبێژیت. ئەگەر تو بزانی کو بابێ تە وەکو گیانەوەرایە و دایکا تە ژی یا لالە، تو ناکەیە کەنی، دێ نوکە بنڤە."

مەریەم ڕابووڤە و چەند پێنگاڤەکان دوورکەفت، لێ زارۆکێ دەست ب ئم ئمێ کر، مەریەمێ زانی ئەڤە نیشانا دەستپێکا گریەکا ب هێزە، ژبەر هندێ دووبارە هاتە دەڤ وێ و گوتێ: "چ چێبوویە؟ تە چ ژ من دڤێت؟"

زارۆکێ ب دەڤێ خوە یێ بێ ددان بۆ وێ کرە کەنی.

مەریەمێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و ل دەڤ زارۆکێ ڕوونشت و دەستێ خوە داڤێ داکو یاریان بۆ خوە پێ بکەت. وێ دیت زارۆکێ یەکسەر دەستێ وێ گرت و ئینا و بر. مەریەمێ ژی ل وی جهی خوە درێژ کر هەتا هێدی هێدی خەوا وێ هاتی و کەفتە پرخە پرخێ.

ژ دەرڤە، باڵندەیان ئاواز دخواندن. دەمێ جار جار باڵندەیەك دفڕی، پەڕێن وان دناڤ ڕۆناهیا ڕۆژێ دا دتەیسین. هەرچەندە مەریەم یا تێهنی بوو گەوریا وێ هشك ببوو پێن وێ ڕەق بوون و مێریان لەق ددانانێ، لێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەو ما ل دەڤ زارۆکێ هەتا ل دوماهیێ تبلا خوە ژ دەڤێ وێ ئینایە دەرێ ڕابوویەڤە و چووی.

# 34

## لەیلا

ل دەڤ لەیلایی، مەزنترین خوشی ل سەر ڕوویێ ئەردی ئەوبوو دەمێ ب ڕەخ عەزیزاییێ ڤە خوە درێژ دکری و سەروچاڤێن وێ یێن سافا و بێگونەهـ هند نێزیکی وێ بن کو ب سانەهی بیبیکێن چاڤێن وێ ببینیت دەمێ مەزن دبن و دووبارە خاڤ دبن.

لەیلاییێ دڤیا تبلێن خوە ل سەر پیستێ نەرم یێ لەشێ عەزیزاییێ و ڤالاهیێن دنیڤەکا دەستێن وێ و ئەنیشکێن وێ یێن گوشتی دا بینیت و ببەت. هندەك جاران وێ ل سەر پشتێ خوە درێژ دکر و عەزیزا ددانا سەر سینگێ خوە و بەحسێ تاڕقی بۆ دکر، ئەو بابێ کو بۆ عەزیزاییێ وەکو کەسەکێ دوور و غەریب دێ مینیت و ڕەنگە چ جاران وی نەبینیت. لەیلاییێ بەحسێ شیانێن تاڕقی د گوتنا مەتەل و فێلبازی و نوکتەیان دا دکر.

"تاڕقی هندەك مژیلانکێن گەلەك جوان هەبوون کو وەکو یێن تە د تژی بوون. ئەرزنکەکا بلند و دفنەکا بچووك و ناڤچاڤێن گرۆڤر. چاڤێ خودای لێ بیت ئەو گەلەك یێ کەشخە بوو. عەزیزایا من ئەو ژی وەکو تە کەسەکێ سادە و بێگونەهـ بوو."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، ئەو گەلەك یا ل خوە هشیاربوو نەکو کەسەکی گوهـ ل وێ ببیت نەخاسم دەمێ ناڤێ تاڕقی دئینیت.

هندەك جاران وێ ڕەشید ددیت دەمێ ب شێوەیەکێ سەیر و تایبەت تەماشەی عەزیزاییێ دکر. ڕۆژەکێ ئەو یێ ل سەر ئەردی د ژوورا خوە یا نڤستنێ ڤە یێ ڕوونشتی بوو و پرسکەکا گوشتی ژ پێ خوە ڤەدکر، پرسیار کر: "باشە چ دناڤبەرا هەوە دا هەبوو؟"

لەیلاییێ ب مەندەهوشی ڤە تەماشەی وی کر هەروەکو تو بێژی د پرسیارا وی نەگەهشت بیت.

"لەیلا و مەجنون، تو و ئەو کورکێ ب پیەکی، چ دناڤبەرا هەوە دا هەبوو؟"

لەیلایێ بزاڤ دکر ل سەر خوە بیت و تونا دەنگێ خوە نەگوهۆڕیت، گوت: "ب تنێ ئەو هەڤالێ من بوو."

پاشی وێ خوە ب ئامادەکرنا بتلەکێ شیری ڤە مژوول کر.

"تو ب خوە دزانی."

"بەلێ پا ئەو تشتێ پێدڤیە ئەز بزانم، ئەز نزانم."

ڕەشیدی ئەو پرسکا گوشتی یا ژ بنێ پێ خوە ڤەکری دانا سەر لێڤا پەنجەرێ و پاشی چوو سەر تەختی خوە درێژ کر. سپرنگێن تەختێ چیڕ چیڕ دکر. وی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "ئەرێ وەکو دوو هەڤالێن نێزیك، هەوە چ کارێن نەدروست و شاش پێکڤە نەکربوون."

"کارەکێ نەدروست؟"

ڕەشیدی پێ کرە کەنی، لەیلایێ ژی هەست ب ئاورینێن وی یێن سارِ و کوژەك دکر.

"باشە من دڤێت بزانم وی چ جاران تو ماچی نەکربووی؟ یان ژی دەستێ خوە نەکربوو جهەکێ تە کو چێنەدبوو دەستێ خوە بکەتێ."

لەیلایێ بێهنا خوە هەلکێشا و دڤیا سیمایێ تۆڕەبوونێ ل سەر خوە دیاربکەت، وێ هەستپێکر دلێ وێ وەکو تەبلەکێ یێ خوە لێددەت.

"نەخێر، ئەو وەکو برایێ من بوو."

"نوکە هەڤالێ تە بوو یان برایێ تە؟"

"هەردووك."

"کیژ ژ وان؟"

"هەردووك."

"بەلێ دبێژن خوشك و برا ژی نەشێنە خوە و هندەك جاران تشتێن نەباش نیشا هەڤدوو دکەن."

لەیلایێ گوت: "تو وەل من دکەی دلێ من ڕابیت."

"ئانکو چ تشت دناڤبەرا هەوە دا نەبوون."

"من نەڤێت ئێدی ئەم زێدەتر بەحسێ ڤێ چەندێ بکەین."

ڕەشیدی سەرێ خوە دانا و لێڤا خوە گڤاشت و پاشی دووبارە گوت: "خەلکی بەردەوام دئاخفت. باش دهیتە بیرا من، خەلکی هەموو تشت بەحسێ هەوە دکرن و نوکەژی تو دبێژی چ تشت دناڤبەرا هەوەدا نەبوون."

لەیلایێ ب ناڤچاڤگرێ ڤە تەماشەی وی کر.

ڕەشیدی ژی بۆ ماوەیەکێ درێژ و ب ئاورینەکا کوژەك و بێی کو مژیلانکێن خوە بلڤلڤلڤینیت تەماشەی چاڤێن وێ کر تا وی ڕادەی تبلێن لەیلایێ ل دورماندوری بتلێ شیری سپی بوون و هەموو هێزو شیانێن خوە بکارئینان هەتاکو بشێت هەڤسەنگیا خوە بپارێزیت.

لەیلایێ هزرا خوە دکر ئەگەر ڕەشید بزانیت وێ دزی یێ ژ وی کرین دێ چ کەت. هەر ژ وێ ڕۆژا عەزیزا ژ دایکبووی، وەختێ ڕەشید دنڤست یان دچوو دەستئاڤێ، جزدانکا وی ڤەدکر و پارەك ژێ دئینا دەرێ. ئەگەر جزدانکا وی یا سڤك بایە دا پارەیەکێ پێنج ئەڤغانی ژێ ئینتە دەرێ یان ژی هندەك جاران ژ ترسا هندێ نەکو پێ بحەسیت چ پارە ژێ نەدئینانە دەرێ، ئەگەر جزدانکا وی یا گران بایە ژی دەهـ ئەڤغانیەك یان بیست ئەڤغانیەك ژێ دئینا دەرێ و جارەکێ ژی نەمەردی نەکر و دوو بیست ئەڤغانی ژێ ئینانە دەرێ. وێ ئەو پارە دکرنە دناڤ کیسکەکی دا و دکرنە دناڤ بەریکا چاکیتێ خوە یێ زڤستانێ دا.

هند جاران ژی هزرا خوە دکر ئەرێ ئەو دێ چ کەت ئەگەر هات و ڕەشیدی نەخشێ وێ زانی یێ وێ د سەرێ خوە دا دانای کو ل بهارا بهێت یان هەر چ نەبیت ل سەرێ هاڤینا بهێت برەڤیت و وی بجهـ بهێلیت.

هیڤیا لەیلایێ ئەوبوو هەتا وی دەمی هزار پارەیێن ئەڤغانی کوم بکەت کو نیڤا وان د پێدڤی بوون بۆ کرێیا پاسێ یا دناڤبەرا کابول و پێشاوەرێ. هەردیسان دەمێ ڕەڤینێ نێزیك دبیت، دێ حەلاڤا خوە یا هەڤژینیێ و وان زێرێن خوە یێن ڕەشیدی ل دەمێ هێشتا شاهژنا کوچکێ بۆ ئینایین، فرۆشیت.

ڕەشیدی کو ب تبلێن دەستێ خوە تەپ ل زکێ خوە ددان، گوت: "هەرچەوا بیت، پێدڤی ناکەت تو لومەی من بکەی چونکی ئەز هەڤژینێ تەمە و هەڤژین ژی بەردەوام ڤان پرسیاران ژ خوە دکەن. بەلێ پا یا ڕاستی بیت ئەو یێ ب بەخت بوو ب وی جوری مری، هەکە ئەو یێ ساخبایە و نوکە ل ڤێرێ بایە، دا دەستێ من گەهیتێ و خودا دزانیت کا دا چ لێ کەم..."

پاشی دەڤێ خوە تێکبر و سەرێ خوە هەژاند.

"نوکە چ چێبوویە هەتا تو ل پشت مریان ژی بەحسێ وان دکەی؟"

"ئەز هەست پێ دکەم هندەك كەس وەكو پێدڤی نەمرینە."

★★★

دوو ڕۆژێن پشتی هینگێ، دەمێ لەیلا سپێدێ ژ خەو هشیاربووی، دەستەکێ جلکێن پاقژ و یێن ب دەستی دری ل بەردەگەهێ ژوورا خوە یا نڤستنێ دیتن. کڕاسەك بوو هاتبوو چنین و نەخشەیێ ماسیێن پیڤازی یێن بچووك ل دورماندور هەبوون. ئەو کڕاسێ هریێ یێ ڕەنگ شین و گول گولی دگەل گورەیەکا کارێ دەستی ب هەمان ڕەنگ و بێجامەیەکێ زەرێ خالخال و شورتەکێ کتانی بوون.

ل دەمێ ئێڤاری ل سەر شیڤێ، ڕەشیدی بێی کو تەماشەی عەزیزاییێ و بێجامێ وێ یێ نوو بکەت، زمانێ خوە د لێڤێن خوە دا و گوت: "گوتگوتکەك هەیە دبێژن ڕەنگە دۆستوم ژی بچیتە دگەل حیکمەتیاری و ل وی دەمی دێ مەسعود نەچاربیت شەڕێ هەردووان کەت، پێدڤیە ئەو هەزارەیان ژی ژبیرنەکەت."

پاشی دەستێ خوە هاڤێتە کتەکا باجانڕەشکێ دناڤ ترشی دا کو مەریەمێ ل هاڤینا وێ سالێ دروست کربوو، و گوت: "دڤێت ئەم هیڤیا بکەین ئەڤ ئاخفتنە ب تنێ گوتگوتك بیت، چونکی ئەگەر تشتەکێ هۆسا ڕووبدەت، ل وی دەمی ئەڤ شەڕە دێ وەکو سەیرانەکا ڕۆژا ئەینیا دەڤەرا پاغمانێ لێ هێت."

ل دەمێ شەڤێ ژی، بێی کو پەیڤەك ژ دەڤێ وی بهێتە دەرێ، یەکسەر خوە هاڤێتە سەر کەلەخێ لەیلایێ کو هەموو جلکێن وی ل بەربوون ب تنێ بێجامێ وی نەبیت هەتا سەرچووکان ئینابوو خوارێ. پشتی هەستێن وی یێن وەکو دینان ئارام بووین، یەکسەر خوە ل سەر هاڤێت و پشتی چەند خولەکەکان خەو ب چاڤێن وی کەفت.

لەیلا چوو تاقێ خوارێ، وێ دیت مەریەم د لێنانگەهێ ڤە ل سەر تەختکەکی یا ڕوونشتیە و مژوولی پاقژکرنا دوو ماسیان بوو. لەگەنەکا دی ژی ب ڕەخ وێ ڤە بوو کو هندەك برنجێ نمیای تێدابوو. بێهنا دوهنی و دووکێل و پیڤازێن کەرکری و ماسیان ژ لێنانگەهێ دهات.

لەیلا ل کوژیەکی ڕوونشت و ب دەهمەنا تەنوریٚ خوە هەردوو چوکێن خوە ڤەشارتن و گوت : "سوپاس."

مەریەمێ چ پیتە پێنەکر، ماسیا یەکێ پاقژ کر و دەست هاڤێتیە یا دی. ب کێرکەکا دەڤ مشار پەرێن وێ برین و پاشی بلند کر ب ڕەنگەکی زکێ وێ سەرئەڤراز بوو کێرکا خوە د کوریا وێ ڕا بر هەتا د دەڤێ وێ ڕا دەرکەفتی. چاڤێ لەیلایێ لێبوو کا چەوا تبلا خوە دکرە دناڤ دەڤێ ماسیێ دا و ل بن شەپیلکا وێ یا خوارێ و ب لڤینەکێ هەموو هناڤێن وێ ئینانە دەرێ.

"ئەو جلك گەلەك د جوان بوون."

مەریەمێ د بن لێڤکان ڕا گوت: "ب کێر من نەدهاتن."

وێ ماسی دانا سەر ڕۆژنامەیەکێ کو خوینا وێ یا ڕەنگ گەور ئەو ڕۆژنامە تەڕکر.

"پێدڤی بوو من دابانە کچا تە یان ژی مشکان خواربانە."

"تو چەوا هۆسا فێری پاقژکرنا ماسیان بوویە؟"

"دەمێ ئەز زارۆك مالا مە ل سەر ڕووبارەکی بوو من ب دەستێ خوە ماستی دگرتن."

"من چ جاران ماسی نەگرتینە."

"چ زەحمەتی پێنەڤێت، ب تنێ پێدڤیە مرۆڤ یێ بێهنفرەهـ و چاڤەڕێ بیت."

لەیلایێ سەحکرێ وێ ماسی کرە سێ پارچە.

"ئەرێ تە ب دەستێ خوە ئەو جلك دریبوون؟"

مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند وەك بەرسڤەکا ئەرێنی بۆ پرسیارا وێ.

"کەنگی؟"

مەریەمێ ئەو پارچەیێن ماسیان دناڤ ئاڤێ دا شووشتن و گوت: "یەکەم جار دەمێ ئەز ب دووگیان کەفتیم، دبیت ژی جارا دووێ بیت، ئانکو بەری هەژدە یان نوزدە سالان بوو. هەرچەوا بیت، ماوەیەکێ گەلەك درێژە و وەکو من گوتی ئێدی ب کێر من ناهێن چونکی ئێدی من زارۆك نابن."

"ب ڕاستی توو جلکدرەکا ژێهاتی، بەلکو ڕۆژەکێ تو من ژی فێربکەی."

مەریەمێ پارچەیێن ماسیان کرنە دناڤ ئامانەکێ دی دا و چپکێن ئاڤێ ژ سەرێ تبلێن وێ دکەفتن. پاشی زڤڕی و سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی لەیلایێ کر خو دا بێژی ئەڤە یەکەم جارە ئەو لەیلایێ دبینیت.

مەریەمێ گوت: "شەڤا بوری دەمێ ئەو .... ب ڕاستی هەتا نوکە کەسێ بەڕەڤانی ژ من نەکریە دەمێ وی ئەز د قووتایم."

لەیلایێ ب هووری تەماشەی لامێن مەریەمێ یێن داکەفتی و پشتچاڤێن وێ یێن ژبەر واستیانێ قورمچین و هێلێن قورمچینێ یێن دەوروبەری دەڤێ وێ کر، ب شێوەیەکێ هۆسا تەماشەی وێ دکر دا بێژی ئەڤە یەکەم جارە وێ کەسێ دبینیت، بۆ یەکەم جار ژی هەستپێکر کو ئەڤە دێمێ دوژمن یان هەڤڕکا وێ نینە، بەلکو دێمەك بوو کو یێ پڕ بوو ژ خەم و نەخوشییێن بێدەنگ و نەگوتی، دێمەکێ واستیایی و خوە ل بەر نەخوشیان گرتی و گازندە نەکرین.

لەیلایێ د دلێ خوە دا گوت ئەگەر ئەو ژی ل ڤێرێ بمینیت، ڕەنگە هەتا بیست سالێن دی دێمێ وێ ژی وەلێ بهێت. لەیلایێ گوت: "ئەز دشیام بەلاٚ خوە ژێڤەکەم و ڕێگرییێ لێ نەکەم، لێ ئەز د مالەکێ دا مەزن نەبوویمە کو ئەندامێن وێ ب ڤی ڕەنگی ڕەفتارێ بکەن."

"بەلێ ژ ئێدی وێ ڤە ئەڤە مالا تەیە و پێدڤیە ئەڤ چەندە بۆ تە تشتەکێ ئاسایی بیت."

"بۆ ڤێ چەندێ نەخێر، ئەز کارێن هۆسا ناکەم."

مەریەمێ ل دەمێ کو دەستێن خوە ب پارچەیەکا قوماشی پاقژ دکرن، گوت: "ل دوماهیێ دێ دگەل تەژی هێتە گوهۆڕین. ئەگەر ڕەوش ب ڤی ڕەنگی بیت، پشتی دەمەکێ کورت دێ دەستێ خوە ل تەژی بلند کەت. تە کچەك یا بووی، لەوڕا گونەها تە ل دەڤ وی ب زەحمەتر دێ هێتە ژێبرن."

لەیلا ڕابوو سەر پێن خوە و گوت: "ئەز دزانم ژ دەرڤە دنیا یا سارە، لێ تو چ دبێژی ئەم هەردوو پێکڤە بچینە ژ دەرڤە و دوو چاییێن گەرم ڤەخوین."

مەریەمێ ب مەندەهوشی ڤە گوت: "ئەز نەشێم، دڤێت لوبیکان پاقژ بکەم و بشوم."

"سوباهی پاشی ئەز دێ هاریکاریا تە کەم."

"بەلێ دڤێت ڤێرێ ژی پاقژ بکەم."

"دێ وێ ژی پێکڤە کەین، ئەگەر یا شاش نەبم پیچەکا حەلاوێ یا د وێرێ دا مای، خوشە دگەل چایێ ڤەخوین."

مەریەمێ پاتە ل سەر کەوانتەرێ دانا. لەیلایێ هەست ب حێبەتیێ کر ژ بەر وێ رێکا مەریەمێ دەهمەنێن کراسێ خوە کێشاین و دەرسوکا خوە دروستکری و داڤێن پرچا خوە بۆ پشتێ برین.

"چینی دبێژن بلا مرۆڤ سێ رۆژان ل سەر یەك خوارنێ نەخوت بەلێ بلا دانەکی ڤەخوارنا چایێ ژ مرۆڤی نەچیت."

مەریەمێ گوت: "گوتنەکا جوانە."

"بەلێ راستە."

"بەلێ ئەز نەشێم گەلەك بمینم."

"باشە ب تنێ دێ پەیالەکێ ڤەخوین و هێنە د ژوور ڤە."

ژ دەرڤە، ئەو ل سەر کورسیکان روونشتنە خوارێ و پێکڤە حەلاوە ب تبلان دخوار. پشتی وان پەیالا د وێ یا چایێ ڤەخواری، لەیلایێ پرسیار ژ مەریەمێ کر کا دێ پەیالەکا دی ژی ڤەخوت، لێ وێ نەگوتێ نەخێر.

ل سەرێ گری، دەنگێ پەڤینا تۆپەکێ هاتە گوهێن وان، وان ژی تەماشەی وان پرتێن عەوران دکر یێن هێدی هێدی رووییێ هەیڤێ دڤەشارتی. هندەك ستێر ژی درژیان و کڤانێن رۆناهیێ یێن زەر دناڤ ئەسمانێ تارى دا دکێشان. دەمێ دەنگێ گریا عەزیزایێ بلند بووی و رەشیدی کریە هەوار داکو لەیلا د هەوارێ بچیت و بێدەنگ بکەت. ئاورینەك دناڤبەرا مەریەم و لەیلایێ دا هاتە لێکگوهۆرین، د ڤێ ئاورینا بێ ئاخفتن دا، لەیلایێ زانی کو ئێدی ئەو دوژمنێن هەڤدوو نینن.

# 35

ئێدی ژ وێ شەڤێ وێڤە، مەریەمێ و لەیلایێ هەموو کارێن خوە یێن ناڤمالێ پێکڤە دکرن. پێکڤە د لێنانگەهێ ڤە دروونشتنە خوارێ و هەڤیر دشێلا و پیڤاز دچنین و پاقژ و سپی دکرن و هندەك پرتێن خیاری دکرنە د دەستێ عەزیزاییێ دا کو ل وێ ڤەتری وان یا روونشتی بوو. کەفچکەك د دەستێ وێ دابوو و ل سەر ئەردی دخشاند و یاری ب گیزەکێ دکرن.

وان هەردووان پێکڤە کارێ عەزیزاییێ باش دکر و جلکێن گەرم دکرنە بەر و لحافەکا ستوور دکرە ستوییێ وێ و دکرە د لانکێ دا و بەردەوام چاڤێ وان لێ بوو. هندەك جاران ژی وان دناڤ یەك تەستا ئاڤێ دا جلکێن عەزیزاییێ دشووشتن و سابین لێ ددا و دبەرا تبلێن وان ڤێکدکەفتن.

ب شێوەیەکێ هێدی هێدی مەریەم ل سەر ڤێ هەڤالینێ راهات. ئێدی ب کەیف و جوش ڤە چاڤەرێی ڤەخوارنا سێ پەیالەیێن چایێ بوو دگەل لەیلایێ دناڤ حەوشێ دا کو نوکە بۆ وان وەکو رێورەسمەکێ رۆژانە لێ هاتیە.

سپێدەهیان مەریەم چاڤەرێی رەق رەڤا دەنگێ نەعالێن لەیلایێ دبوو دەمێ ژ دەرەجکان دهاتە خوارێ و ژ بۆ خوارنا تێشتێ دهاتە د لێنانگەهێ ڤە، زێدەباری دەنگێ گریا عەزیزاییێ و دیمەنێ هەر هەشت ددانێن وێ یێن بچووك و شیری کو هێشتا بێهنا شیرێ خاڤ ژێ دهات.

دەمێ ب شەڤێ ژی لەیلا و عەزیزا د خەو دچووین، مەریەمێ چاڤەرێی هشیاربوونا وان دکر، ژبەر هندێ خوە ب شووتنا وان ئامانان ڤە مژوول دکر یێن پێدڤی ب شووتنێ نەی. یان ژی دا روویێن دووشەکان ژێڤەکەت و هندەکێن نوو پاقژ ئێخیتێ. هندەك جاران ژی دا پەردێن پەنجەران داقوتیت و پاقژ کەت یان ژی دا ژێڤەکەت و شووت. تا وی دەمێ لەیلایێ دهاتیە خوارێ بۆ لێنانگەهێ و عەزیزا ل ملێ وێ، وێ خوە ب ڤان کاران ڤە مژوول دکر.

سپێدەهیان، دەمێ یەکەم جار چاڤێن عەزیزایێ ب مەریەمێ دکەفتن، چاڤێن خوە باش ڤەدکرن و خوە ل ملێ دایکا خوە دلڤلڤاند و دەستێ خوە بۆ مەریەمێ درێژ دکر و داخواز ژێ دکر بکەتە ملێ خوە. دەستێن خوە یێن بچووك بلەز ڤەدکرن و دگرتن و حەزەکا مەزن ل سەر دێمێ وێ خویا دبوو.

""ئەڤە چ شانوگەریە تو دکەی؟"

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، لەیلایێ ئەو بەردا داکو بەرەڤ مەریەمێ بچیت. پاشی گوت: ""ئەڤە چ شانوگەریە تو دکەی؟ بێهنا خوە فرەهـ بکە. خالەتا مەریەم ناچیتە چ جهان. ها ئەڤە یا ل ڤێرێ، ئەڤە خالەتا ل ڤێرێ یا ڕوونشتیە، تو دبینی؟ نوکە هەرە دەڤ وێ. نوکە."

پشتی عەزیزا چوویە دەڤ مەریەمێ و وێ ژی ئەو کریە ملێ خوە، هەر یەکسەر تبلا خوە کرە د دەڤێ خوە دا و سەرێ خوە دانا سەر ملێ وێ.

مەریەمێ ژی ب گرنژینەکا نیڤ دوودلی و نیڤ سوپاسی ئەو ب هێز هەمبێز کر. بەری نوکە کەسێ ب ڤی شێوەی حەز ژ وێ نەکریە. ب ڕاستی ژی کەسێ بەری نوکە هۆسا ب دلەکێ یاقژ و پڕی ڤیان و بێی بەرژەوەندی حەز ژ وێ نەکریە.

لێ عەزیزایێ وەل مەریەمێ کر ژ نیڤا دلێ خوە بکەتە گری.

"ئەرێ چەوا تو ب ڤی دلێ خوە یێ نازك و بچووك داخباری پیرەژنەکا وەکو من یا کرێتی؟"

مەریەمێ دەستێ خوە دکرە دناڤ پرچا عەزیزایێ دا و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "ها دێ بێژە؟ ئەز چ تشت نینم، ما تو من نابینی؟ ب تنێ ئەز پیرەژنەکا گوندیکم و نەزێدەتر. ما من چ هەیە ب دەمە تە؟"

لێ عەزیزایێ ب ڕەزامەندیا خوە پتر بۆ دگرنژی و سەرێ خوە پتر ددانا سەر ملێ وێ. دەمێ وێ ئەڤ چەندە دکری، مەریەمێ ئاگەهـ ژ خوە نەدما و چاڤێن وێ تژی ڕۆندك دبوون و دلێ وێ ژ کەیفان دا دفڕی. مەندەهوش دما کا چەوا پشتی ڤان سالێن درێژ یێن بەرزەبوون و ژ دەستدانێ. ل دوماهیێ، وێ د ڤێ زارۆکا بچووك دا یەکەمین پەیوەندیا ڕاستەقینە یا ژیانا پڕی درەو و ژ قەستا دیت.

***

ل دەستپێکا سالا ل دووڤ دا، ل هەیڤا کانوونا دووێ یا سالا 1994. دۆستەمی ئاڕاستێ خوە گوهۆڕی و هەڤپەیمانیەکا نوو دگەل گولبەدین حیکمەتیاری گرێدا و بنگەهێ خوە ل نێزیکی "بالا حیسار"ێ دانا، ئانکو ل بەر دیوارێن وێ کەلها کەڤن یێن ل بەرێ وان ژ چیایێ "کوهـ-ی-شیردەروازە" ئەوا دکەفتیە باژێری.

ئەو هەردوو پێکڤە کەفتە تۆپبارانکرنا هێزێن مەسعودی و ڕەببانی یێن د وەزارەتا بەرڤانییێ و کوچکا سەرۆکاتیا کوماریێ دا خوە ئاسێ کری. هەردوو لایەنێن شەڕکەر ل ڤی لایی و لایێ دی یێ ڕووباریێ کابولێ ب تۆپخانەیێن خوە هەڤدوو تۆپباران دکرن.

جادە پڕ بوون ژ کەلەخێن مرۆڤان و پارچەیێن شووشەیان و کانزا و فیشەك وبەرمایکێن چەکی. زێدەباری ڤێ چەندێ، کوشتن و تالانکرن و دەستدرێژیا سەر ژنان ژی زێدەبوو کو ئەڤ چەندە بۆ ئاکنجیێن باژێری و سزادانا کەسێن نەسەرباز دهاتە پەیرەو کرن.

مەریەمێ گوهلێبوو کو هژمارەکا مەزن یا ژنان داکو تووشی دەستدرێژیا سێکسی نەبن، یێن خوە کوشتین، هەردیسان چەندین زەلامان ژ پێخەمەت پاڕاستنا ناموسا خوە، ژن و کچێن خوە دکوشتن بەری کو دەستدرێژی ل سەر بهێتە کرن.

دگەل پەقینا دەنگێ هەر تۆپەکێ دا، عەزیزایێ ژ بنێ پییان دکرە قێری. مەریەمێ ژی داکو عەزیزایێ تەنا بکەت، ب دنکێن برنجی وێنەیێن خانی و دیکل و ستێران ل سەر ئەردی بۆ دکێشان، عەزیزایێ ژی دەستێ خوە لێددا و هەموو جاران ژێك بەلاڤە دکرن، یان ژی هەروەکو بەری هینگێ جەلیلی ئەو فێرکری، ب جارەکێ و بێی کو پێنۆسێ خوە ل سەر کاعەزێ ڕاکەت وێنێ فیلەکی بۆ دکێشا.

ڕەشیدی گوتی ڕۆژانە ب دەهان کەسێن مەدەنی ل سەر جادەیان دهێنە کوشتن، ژبلی هندێ هەتا نەخوشخانە و دەرمانخانە ژی دهێنە تۆپباران کرن. هەردیسان گوت کو بەری چەند ڕۆژان چەکداران ڕێك ل وان لوریان گرت یێن ئازوقە و خوارنا پێدڤی بۆ خەلکێ باژێری ئینای، لێ ئەو چوونە بەراهیا وان و تەقە لێکر.

مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەرێ تو بێژی نوکە ڕەوشا هیراتێ ژی تێکچوو بیت؟ ئەرێ ئەگەر هۆسا بیت، تو بێژی مەلا فەیزوللاهـ مابیتە ساخ؟ نوکە ئەو مژوولی چیە؟ ئەرێ بیبی جان نوکە چ دکەت؟ ئەرێ نوکە ڕەوشا وێ یا چەوایە؟ ئەو، کورێن وێ، بووکێن

وێ و نەڤیێن وێ؟ ئەرێ پا جەلیل؟ ئەرێ تو بێژی نوکە وی ژی وەکو مەریەمێ وان خوە د مال ڤە ڤەشارت بیت؟ یانژی دەستێ هەڤژین و زارۆکێن خوە گرتیە و وەلات بجھ هێلایە؟"

مەریەمێ هیڤی دخواست نوکە جەلیل یێ ب سەلامەت بیت و ڤێ هەموو کوشتن و کوشتارگەهێ یێ دوور بیت.

بۆ ماوەیێ پتر ژ حەفتیەکێ شەڕ یێ ب هێز و گران بوو تا وی ڕادەی ڕەشید ژی نەچاربوو بمینتە د مال دا و نەدەرکەڤیت، وی دەرگەهێ حەوشێ قوفل کر و ژ پشت ڤە تێلەك ئێخستێ. هەردیسان دەرگەهێ سەرەکی یێ مالێ ژی گرتبوو و قەنەپەك دانا پشت. بەردەوام دناڤ مال دا دهات و چوو جگارەیەك د دەڤی دابوو هندەك جاران ژی ل بەر پەنجەرێ د ڕاوەستیا و تەماشەی ژ دەرڤە دکر.

دەمانجا خوە پاقژ کر و عەمبارا وێ یا فیشەکان ئینا دەرێ و تژی فیشەك کر. دوو جاران تەقە ل جادەیێ کر ب هێجەتا هندێ کو وی کەسەك یێ دیتی و بزاڤ دکر ب سەر دیوارێ مالێ دا ب سەرکەڤیت و بهێتە د ژوور ڤە.

ڕەشیدی گوت: "چەکدار خورتیێ ل گەنجان دکەن بچنە دگەل ڕێزێن وان. ل ڕۆژا ڕوهن و ب خورتیا چەکی و ل سەر جادەیان گەنجان کوم دکەن و دبەنە دگەل خوە. دەمێ چەکدارێن سەر ب میلیشاییێن نەیارێن وان ڤان گەنجان دەستەسەر دکەن، وان ئەشکەنجە ددەن و گەلەك دئێشینن. من یا گوهلێبووی دبێژن لەشێ وان کارەب دکەن. من ب گوهێن خوە یا گوهلێبووی دبێژن ب پلایسان گونێن وان دپەڤینن و پاشی وان گەنجان نەچار دکەن بەرەڤ مالێن خوە ببەن و ل وێرێ بابێن وان دکوژن و دەستدرێژیێ دکەنە سەر دایك و خوشکێن وان."

پاشی وی دەمانجە ل سەر سەرێ خوە ڕا خشاند و ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو: "ئەگەر ئەو خوە ددانن زەلام، بلا بهێن دەرگەهێ مالا من بشکێنن. سوز بیت ئەز گونێن وان ب پەڤینم و قەرقودێ سەرێ وان بشکێنم. هوون دزانن کو هەوە بەختەکێ مەزن یێ هەی ژبەرکو ئەز هەڤژینێ هەوە. ئەز خو ژ ئەهریمەنی ناترسم."

ڕەشیدی تەماشەی بەر پێن خوە کر دیت عەزیزا یا ل سەر ئەردی ل بەر پێن وی، لێ کرە قێژی و گوت: "پێ من بەردە."

پاشی ب دەمانجێ ئەو ترساند، دیارە دڤیا ب یاری ڤە تەقێ لێ بکەت.

"ل دووڤ من نەهێ. هۆسا دەستێن خوە بۆ من درێژ نەکە چونکی ئەز هەر تە ناکەمە ملێ خوە. یەلا ژ ڕێکا من ڕابە داکو پێ ل تە نەدانم."

عەزیزا ژ ترسان دا لەرزی. ب سەروچاڤێن ترس و لەرز ڤە و ل سەر دەست و پێن خوە بەرەڤ مەریەمێ چوو ل سەر چوکێ مەریەمێ ڕوونشت و تبلا خوە کرە د دەڤێ خوە دا و تەماشەی ڕەشیدی کر. پاشی چەند جارەکان سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی مەریەمێ کر، مەریەم تێگەهشت کو ئەو یا داخوازا هندێ دکەت وێ ئارام بکەت، لێ هندی بابێ وێ ل وێرێ، مەریەم نەشیا وێ بکەتە ملێ خوە و ئارام بکەت.

★★★

پشتی ڕەوش پیچەکێ ئارام بووی و شەڕ ڕاوەستیای، بێهنا مەریەمێ گەلەك فرەهـ بوو چونکی وێ دزانی ئێدی ڕەشید نامینتە د ژوور ڤە و ئەو ئێدی نەچار نابیت بەردەوام سەروچاڤێن وی بینیت و خوە ل بەر ڕەفتارێن وی یێن ڕەق و نەخوش بگریت کو هەموو سەقایێ مالێ ڤەگرتبوو، یان ژی دەمێ یاری ب دەمانجا خوە دکرن و عەزیزا دترساند، ل وی دەمی دلێ مەریەمێ ژی خوە ل سەر هزارێ دقووتا نەکو فیشەکەك ب شاشی ڤە ژ دەمانجا وی دەربکەڤیت.

ڕۆژەکێ ژ ڕۆژێن زڤستانێ، لەیلایێ داخواز ژ مەریەمێ کر ڕێکێ بدەتێ پرچا وێ بۆ شانە بکەت و بکەتە کەزیك. مەریەم ژی ب بێدەنگی ڕوونشت و د خۆدیکێ ڕا تەماشەی تبلێن وێ یێن زراڤ کر کا چەوا پرچێ وێ دڤەهینیت و دکەتە کەزیك.

عەزیزایێ ل سەر ئەردی خوە درێژ کر کربوو خەو کەفتبوو چاڤێن وێ و بووکەك هەمبێز کربوو کو مەریەمێ ب دەستێ خوە بۆ دروست کربوو. لەیلایێ ناڤ زکێ بووکێ پرکربوو ژ لوبیکێن هشك و ب قوماشەکی کو ب چایێ ڕەنگ کربوو، کراسەك بۆ چێکربوو ڕستکەکا مورکان ژی کربوو ستوویێ وێ.

ژبەر خەو، عەزیزایێ هندەك با بەردا، لەیلایێ دەست ب کەنیێ کر و پاشی مەریەمێ ژی ل دووڤ دا کرە کەنی. چاڤێ وان هەردووان د خۆدیکێ ڕا ل هەڤدوو بوو، هند کرە کەنی هەتا ڕۆندك کەفتینە چاڤێن وان. ئەو دەم بۆ وان هند یێ خوش و سرۆشتی بوو، هەر یەکسەر مەریەمێ کرە سحبەتا جەلیل و نانایێ و ئەجنەیان. لەیلایێ هەردوو

دەستێن خوە دانانە سەر ملێن مەریەمێ و چاڤێن خوە ژی د خۆدیکێ ڕا برنە سەر چاڤێن وێ.

مەریەمێ بەحسێ بیبی جان و مەلا فەیزوللاھـ و ڕەفتارێن ب یاری و ترانە یێن جەلیلی و خوە کوشتنا نانایێ کر. هەردیسان بەحسێ ژنێن جەلیلی و مارکرنا وێ یا بلەز دگەل ڕەشیدی و گەشتا وێ بۆ کابولێ و ب دووگیانبوونا وێ و ڕۆژانێن بێ دوماهی یێن پڕی ئومێد و پاشی ڕۆژێن وێ یێن بێ ئومێد و ژێ دوورکەفتنا ڕەشیدی ژ وێ.

پاشی لەیلایێ ل بەرامبەر کورسیکا ئەو ل سەر ڕوونشت و پارچەکا گلێشی ژ سەرێ عەزیزاییێ ڤەکر و پشتی ماوەیەکی کێم ژ بێدەنگیێ گوت: "من ژی دڤێت تشتەکی بۆ تە بێژم."

***

وێ شەڤێ خەو ژ چاڤێن مەریەمێ ڤەڕەڤی. ل سەر تەختی خوە یێ نڤستنێ ڕوونشت و تەماشەی بارینا هێدی یا بەفرێ دکر.

وەرزێن سالێ هاتن و چوون و چەندین سەرۆك كومار ل کابولێ چوونە سەر کارێن خوە و هاتنە کوشتن. ئیمپراتۆریەك هەرفتبوو، شەڕێن کەڤن ب دوماهی هاتبوون و شەڕەکێ نوو دەستپێکربوو. لێ مەریەمێ ب زەحمەت تیبنیا ڤێ چەندێ دکر و ب زەحمەت گرنگی پێ ددا.

وێ ئەڤ هەموو سالە د گوشەیەکا دوور د مەژیێ خوە دا بوراند بوون. دناڤ باخچەیەکێ هشك و بەیار دا، ل لایەکی ب تنێ ئومێد و زێمار و ل لایەکێ دی ژی خەون و بێ هیڤیبوون بوو. ئێدی پاشەڕۆژ بۆ وێ یا گرنگ نەبوو ڕابردوویی ژی ب تنێ ئەڤ پەندە دگەل خوە هەلگرتبوو:

*"ئەڤینی سەرداچوونەکا وێرانکەرە و هەڤشێوەیێ وێ ژی ئانکو هیڤی و ئومێد، سەرابەکا خاپینوکە. هەر دەمێ ئەڤ هەردوو گولێن ژەهراوی دناڤ وی باخچەی دا چەریبانە، مەریەمێ ژ ڕهورپشالان دکێشانە دەرێ، بەری بکەڤنە سەر پێ و جهێ خوە بگرن، وێ ژ بنی هەلدکێشان دهاڤێتنە دناڤ چاڵەکێ دا."*

بەلێ ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان، ل ڤان هەیڤێن دوماهیێ لەیلا و عەزیزا، کو ئەو ژی وەکو وێ بیژی یە، بوونە ئەگەرێ بەردەوامبوونا وێ د ژیانێ دا. و نوکە ژی، ئەو ژیانا مەریەمێ چەندین سالان خوە ل بەر گرتی، ئێدی نەشێت بێی وان هەدارێ بکێشیت.

*"ڤێ بهارێ ئەز و عەزیزا دێ ڕەڤین، مەریەم توژی دگەل مە وەرە."*

سالێن بوری، ڕۆژگار دگەل مەریەمێ د دلوڤان نەبوون، وێ د دلێ خوە دا گوت ڕەنگە هندەك سالێن باشتر ل پێشیا وێ بن، ژیانەکا نوو بەختەوەر، ژیانەکا هۆسا کو ئەو بەختەوەری ببیتە بەهرا وێ یا نانایێ هەموو گاڤان دگوتی زارۆکێن بیژی چ جاران بەختەوەریێ نابینن.

ب شێوەیەکێ چاڤەڕێنەکری، دوو گولێن نوو دناڤ ژیانا مەریەمێ دا بشکڤین. دەمێ مەریەمێ تەماشەی چیکێن بەفرێ دکری، مەلا فەیزوللاهـ دئینا پێشچاڤێن خوە کو یاری ب تزبیێن خوە دکرن و دگوت: "بەلێ ئەڤە ژ حەزکرنا خودای یە و وێ ئەو هەردوو گول یێن د ژیانا تە دا چاندین. مەریەم جان، هەر حەزکرنا وی یە کو وەل تە گری ببیە هەڤالێ وان. کچا من ئەڤە حەزکرنا وی یە."

# 36

## لەیلا

ل وێ سپێدەهیا بهارێ یا سالا 1994 دەمێ تیرۆژکێن ڕۆژێ هێدی هێدی تاڕیاتیا شەڤێ دڤەڕەڤاندی، لەیلا پشتڕاست بوو کو ئێدی ڕەشید هەموو تشتان دزانیت.

د هەر چرکەیەکێ دا وێ پێشبینیا هندێ دکر کو ڕەشید بهێت وێ ل سەر تەختی ڕاکێشیت و پرسیارێ ژێ کەت کو ئەو هزردکەت ڕەشید هند یێ خشیم و کەرە هەتا ڤی ڕادەی و چ تشتان نزانیت. لێ دەنگێ بانگی بلند بوو تیژکێن ڕۆژێ کەفتنە سەر بانان و دنیا ڕوهن کر و دیکلان ژی دەست ب دانا بانگێ سپێدێ کر و چ تشتێن نەسروشتی ڕوونەدان.

نوکە وێ باش گوهـ ل دەنگێ وی هەیە، دەنگێ دەفکێن وی یێن ڕهتڕاشینێ دەمێ ددانتە سەر سێنیکا وێ یا کەفێ، ل دووڤ دا ل خوارێ دهات و چوو چار گەرم کر و پشتی هینگێ ژی دەنگێ کلیلێن دەرگەهی ژی هاتە گوهێن وێ هەتا ل دوماهیێ چوویە دناڤ حەوشێ دا و ل پایسکلێ سوواربووی.

لەیلایێ دناڤ شەقێن پەردا ژوورا ڕوونشتێ ڤە تەماشەی وی دکر دەمێ دناڤ حەوشێ دا سوواری پایسکلا خوە دبووی. زەلاّمەکێ مەزن و ب کەلەخ ل سەر پایسکلەکا بچووك، د هەمان دەم دا تیشکا ڕۆژێ دەستکێن پایسکلا وی د تەیساندن.

"لەیلا؟"

مەریەم ل بەر دەرگەهی یا ڕاوەستای بوو. لەیلایێ دزانی شڤێدی هەموویێ خەو نەکەفتیە چاڤێن وێ ژی، ژبەر هندێ د دلێ خوە دا گوت: "دیارە شڤێدی هەتا سپێدێ پێلێن خوشی و نیگەڕانیێ مەریەم ژی یا ئینایی و بری.

پاشی گوت: "پشتی نیڤ دەمژمێرا دی ئەم دێ ب ڕێ کەڤین."

★★★

د کوشنێ پشتێ یێ تەکسیێ دا وان دگەل هەڤدوو نەدئاخفت. عەزیزا ژی د هەمبێزا مەریەمێ دابوو بووکا خوە یا بچووك ژی ب هێز گرتبوو ب چاڤێن خوە یێن نازك ڤە و ب مەندەهوشی تەماشەی دیمەنێن باژێری دکرن کو گەلەك بلەز د بەر چاڤێن وێ ڕا دبورین.

عەزیزایێ دەمێ هندەك کچکێن بچووك دیتین کو یێ یاریا وەریسکانێ دکەن، کره گری و ب زمانێ خوە یێ ساده گوت: "ئونا! مایام، ئونا!"

لەیلایێ تەماشەی هەر جهەکی کربایە ڕەشید دهاتە پێشچاڤێن وێ. دەمێ ژ سەرتڕاشخانەیەکێ دەردکەفت یاکو پەنجەرێن وێ ب ڕەنگێ گەور هاتینە بۆیاغکرن، یان ژی د وان دکانان ڤە بوو یێن کەو دفروتن، یان ڕەنگە د وان دکانان ڤە یێن دەرگەهێن وان تێکچووین و ل بەر سینگێ وان کومێن تائیرێن ترۆمبێلان کەفتینە سەر یەك.

ل سەر جهێن خوە بێدەنگ ما و سەرێ وێ کەفتە سەر ملێ وێ.

مەریەم ژی ب ڕەخ وێ ڤە یا ڕوونشتی بوو و دوعاییێن خێرێ دکرن. لەیلایێ دڤیا سەروچاڤێن وێ ببینیت لێ هەردووان بورکە کربوو بەر خوە، ب تنێ وان برسقینا چاڤێن هەڤدوو دناڤ پێچەیا بورکەی دا ددیتن.

پشتی چەند حەفتیەکان مایە د مال دا، ئەڤە یەکەم جار بوو لەیلا ژ مال دەرکەڤیت، ژبلی دەرکەفتنا وێ یا دووهی کو چووبوو دکانەکا زێرنگران و ل وێرێ حەلاڤا خوە ل سەر مێزەیا شووشەی یا دکانێ و ل بەر سینگێ کابرای بەرچاڤ دکر و پاشی ب خوشحالی ڤە ژ دکانێ دەرکەفتبوو چونکی دزانی جارەکا دی نازڤڕیتەڤە ڤی جهی.

دەمێ ب ڕێکێ ڤە لەیلایێ تەماشەی دەوروبەرێن خوە دکری، بەرمایکێن شەڕێ ڤێ دوماهیێ ددیتن ئەوێ دەنگێ توپێن وان خو دگەهشتیە مالا وان. ئەو خانییێن بووینە داروبەر و ئەو ئاڤاهییێن توپان کونێن مەزن لێکرین زێدەباری وان ستوونێن ژ بنی هاتینە دەرێ و ئەو ترۆمبێلێن قولپینە سەر پشتێ و هندەك ژی کەفتبوونە سەر یەك و تێکرا چووبوون. چەندین دیوار ژی هەرفتبوون و دەرزێن مەزن کەفتبوونێ و پارچەیێن شووشەیان ل سەر هەموو جهان د بەلاڤەبوون.

وێ هندەك کەس دیتن دەمێ تەرمەك بەرەڤ مزگەفتێ دبری و پیرەژنەك ژی ب دووڤ وان ڤە بوو کو عەبایەکێ ڕەش ل بەر بوو پرچا خوە دکێشا و دکرە هەوار. پشتی

هینگێ دبەر گۆڕستانەکێ ژی ڕا بوری کو یا پڕ بوو ژ کێلیێن گۆڕان و ئالایێن کەڤن یێن شەهیدان ل سەر بوون و بای ئەو ئالایە دلڤاندن.

لەیلایێ دەستێ خوە نێزیکی چانتێ خوە کر و پاشی تبلێن نەرم یێن کچا خوە پەرخاندن.

ل وێستگەها دەرگەهێ "لاهور" ل نێزیکی پرا مەحمودخانی ل ڕۆژهەلاتێ کابولێ، ڕێزەکا پاسان ل سەر جادێ دڕاوەستایی بوون. زەلامێن دەرسوك ل سەری چانتەیێن مەزن و سندوق ددانانە سەر پشتا پاسان و پاشی ب وەریسکان دگرێدان.

د وێستگەهێ ڤە، زەلام ل پشت هەڤدوو ب ڕێز د ڕاوەستیای بوون و سرایا وان هەتا بەر دەرگەهێ جهێ برینا پلێتان گەلەك درێژ ببوو. ژنێن بورکە ژی ل بەر خوە کربوونە گرۆپ و پست پست دکر. کەلوپەلێن وان ل بەر پێن وان بوون و زارۆکێن وان ژی ل ملێن وان بوون و دگوتنە زارۆکێن خوە یێن دی ژی دوور نەکەڤن.

میلیشیایێن چەکدار ژی دناڤ وێستگەهێ و ژ دەرڤە دهاتن و چوون و ب توندی فەرمان ل خەلکی دکرن. جزمەیێن درێژ ل پێن وان بوون و کولاڤێن کەسك "پاکول" ل سەرێ وان بوون و هەموویان ژی چەکێ کلاشینکوڤ هەلگرتبوون.

لەیلایێ هەستپێکر کەسەك یێ زێرەڤانیا وێ دکەت. هەرچەندە وێ تەماشەی کەسێ نەدکر لێ هۆسا هەستپێکر کو بەرێ خەلکی هەموویێ یێ ل وان و هەموو دزانن کا مەرەما وێ و مەریەمێ چیە و دێ کووڤە چن.

لەیلایێ پرسیار کر: "ئەرێ تە چ کەس نەدیتن؟"

مەریەمێ عەزیزا ژ ڤی ملی دانا سەر ملێ خوە یێ دی و گوت: "هندی ئەزا تەماشەی دەوروبەری مە دکەم کەسێ نیاس نابینم."

لەیلایێ دزانی کو یەکەمین قوناغا مەترسیێ دەستپێکر ئەو ژی زەلامەکێ گونجایی ببینن و بچنە دگەل و هۆسا خوە دیاربکەن ئەڤە خێزانێن وی نە.

ئەو ئازادیا ژنێن ئەڤغانی دناڤبەرا سالێن 1978 هەتا 1992 دا هەی، نوکە یا بوویە پشکەك ژ دیرۆکێ. بیرا لەیلایێ دهێت دەمێ بابێ وێ بەحسێ فەرمانڕەوایا شیوعان بۆ کری و گوتبوویێ کو ژنبوون د ڤی سەردەمێ ئەڤغانستانێ دا نیعمەتە.

هەر ژ وی دەمێ چەکداران ل نیسانا سالا 1992 دەستهەلآت گرتیه دەست، ناڤێ ئەڤغانستانێ هاته گوهۆڕین بۆ دەولەتا ئیسلامی یا ئەڤغانستانێ. نوکه مەلاییێن تۆندەر ب سەروکاتیا ڕەبانی د شوڕایا بلند یا وەلاتی دا زۆرینه بوون و پشت دابوو وان هەمبوو یاسایان یێن ل سەردەمێ شیوعیان ئازادی ددایه ژنێ. ل شوونا وان هندەك یاساییێن دی ب پشتبەستن ل سەر شەڕیعەتی دانان و فەرمان دا هەموو ژن بورکەی بکەنە بەر خوە و بێی زەلآمان گەشتان نەکەن و ئەوا زینایێ ژی بکەت دڤێت بهێته ڕەجماندن.

هەرچەندە هندەك جاران ئەڤ یاسایه دهاتنە پەیرەوکرن، لێ لەیلایێ گوته مەریەمێ ئەگەر ئەڤ گرۆپێن چەکدار مژوولی شەڕێ ناڤخۆ کوشتنا هەڤدوو نەبانە، نوکە دا گەلەك خراپتر وان یاسایان ل سەر وان بجهـ ئینن.

قوناغا دووێ یا مەترسیێ ئەوبوو دەمێ ئەو دگەهنە پاکستانێ. نێزیکی دوو ملیون پەنابەرێن ئەڤغانی یێن چووینە پاکستانێ و ل هەیڤا کانوونا دووێ یا ڤێ سالێ، پاکستانێ سنورێن خوە ل هەمبەر ئەڤغانیان گرتبوون.

لەیلایێ گوهلێبوو کو ب تنێ ڕێکێ ددەنە وان کەسان یێن ڤیزە وەرگرتی. لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی خەلك هەر ژ سنوری دەرباز دبن و هەموو گاڤان ئەڤ تشته هەیه. لەیلایێ دزانی کو نوکە ژی ڕۆژانە ب هزاران ئەڤغانی ب ڕێکا دانا بەرتیلان یان ژبەر هەبوونا هەستەکێ مرۆڤایەتی ژ سنوری دەربازدبن و بەردەوام ژی قاچاغ یێن هەین خەلکی ب پارە دەرباز دکەنە ڕەخێ دی. ژبەر هندێ دگوته مەریەمێ ئەگەر ئەو گەهشتنە سەر سنوری، ل وی دەمی دێ ڕێکەکێ بۆ خوە بینن.

مەریەمێ دەستێ خوە درێژ کرە کەسەکی و گوتێ: "ئەوێ هە یێ چاوایە؟"

"یێ دیارە ئەو نە جهێ باوەریێ یە."

"باشە وێ هە؟"

"گەلەکێ دانعەمرە، دوو زەلآمێن دی ژی یێن دگەل."

ل دوماهیێ لەیلایێ زەلآمەك دیت کو ل سەر کورسیکەکا درێژ یا پارکێ یێ ڕوونشتی بوو. ژنەکا ب عەبا ب ڕەخ وی ڤە بوو زارۆکەکێ بچووك کو کولاڤەك ل سەری بوو و ژیێ وی نێزیکی ژیێ عەزیزایێ بوو ل سەر چوکێ وی بوو. زەلآمەکێ بەژن زراڤ و ب ڕێهـ و درێژ بوو. کراسەکێ ئوتیکری و چاکێتەکێ گەور یێ سادە یێ بێ قومچك ل بەر بوو.

لەیلایێ گوتە مەریەمێ: "تو ل ڤێرێ ڕاوەستە."

دەمێ ئەو ژ مەریەمێ دوورکەفتی ژی، دیسان وێ ئاگەهـ ژێ هەبوو مەریەم هێشتا یا دوعایان دکەت. دەمێ لەیلا نێزیکی وی زەلامێ گەنج بووی، دەستێ خوە دانا بەر سەری خوە داکو تیشکا ڕۆژێ ل چاڤێن وێ نەدەت."

"ببورە برا، بەلێ هوون ژی دێ چنە پێشاوەرێ؟"

زەلامی ب دوو چاڤێن نیف ڤەکری سەرێ خوە بلند کر و گوت: "بەلێ."

"ئەز یا هاتیم داخوازا ژ تە بکەم هاریکاریا مە بکەی. دێ شێی قەنجیەکێ دگەل مە کەی؟"

وی زارۆك داڤ هەڤژینا خوە و دگەل لەیلایێ چەند پێنگاڤەکان چوونە وێ ڤەتر.

"فەرموو خوشکێ تو پێدڤی چی؟"

دەمێ لەیلایێ چاڤێن وی یێن بێگونەهـ و پڕی دلوڤانی دیتین، هێز هاتە لەشێ وێ و شیا دەست ب ئاخفتنێ بکەت. ئەو چیرۆك بۆ ڤەگێڕا یا دگەل مەریەمێ ل سەر ڕێکەفتین. گوتێ کو ئەو بیژنە و ژبلی دایك و کچا خوە یا یەکانە، کەسێ دی ل کابولێ نینە و ل بەرە بچنە پێشاوەرێ ل دەڤ مامێ خوە داکو دگەل وی بژین.

زەلامێ گەنج گوتێ: "هەوە دڤێت دگەل مە بهێن؟"

"ئەز دزانم بۆ هەوە زەحمەتە، لێ یا دیارە تو برایەکێ بەڕێزی و ئەز ژی ..."

"نیگەڕان نەبە خوشکێ، ئەز د ڕەوشا هەوە دگەهم و چ زەحمەتی تێدا نینە. نوکە دێ چم بۆ هەوە پلێتان کرم."

"سوپاس برا، ڤی کارێ تە دێ پاداشتێ خوە هەبیت و خودای مەزن دێ پاداشتێ تە دەتە تە."

دبن بورکەیێ خوە ڤە زەرڤەك ئینا دەرێ و کرە د دەستی دا کو هزار و سەد پارەیێن ئەفغانی تێدابوون، نیڤەکا وی پارەی ئەڤە ژ پار وەرە وێ ڤەشارتین و پارێ دی ژێ یێ حەلاڤێ بوو. زەلامی پارە کرنە د بەریکا پەنترۆنێ خوە دا.

"تو ل ڤێرێ ل هیڤیا من بمینە."

لەیلایێ دیت ئەو بەرەڤ وێستگەهێ چوو پشتی نیف دەمژمێرێ زڤڕی. زەلامی گوت: "یا باشتر ئەوە پلێتێن هەوە ل دەڤ من بن، پاس دێ پشتی دەمژمێرەکا دی، ئانکو دەمژمێر

یازده دەتە ڕێ و پاشی دێ پێکڤە سووار بین. ناڤێ من وەکیلە و ئەگەر کەسەکێ پرسیار کر کو گەلەك کێم پرسیار دکەن، دێ بێژمێ تو دوتماما منی."

لەیلایێ ژی ناڤێ خوە و مەریەم و عەزیزاییێ بۆ گوت، وی ژی بۆ دیارکر کو ناڤێ وان ژبیرناکەت، پاشی گوت: "ل ڤان دەوروبەران بن و خوە بەرزە نەکەن."

ئەو ژی ل سەر کورسیکەکا درێژ یا نێزیکی خێزانا وەکلیلی ڕوونشتن. سپێدەهیەکا ب هەتاڤ و گەرم بوو، ب تنێ چەند عەورەکێن کێم ل ئەسمانی هەبوون. مەریەمێ چەند پسکێتەك کرنە د دەستێ عەزیزاییێ دا کو ل دەمێ وان بلەز کەلوپەلێن خوە لێکداین ژبیرا وێ نەچووبوو ڤان پسکێتان دگەل خوە بینیت، پسکێتەك دا لەیلاییێ ژی.

لەیلاییێ کرە کەنی و گوت: "هەما من خوار دێ دلێ من ڕابیت، گەلەك دلێ من یێ ڕابووی.

"یێ من ژی."

"سوپاس مەریەم."

"بوچی؟"

لەیلاییێ گوت: "بۆ ڤێ چەندێ، هاتنا تە دگەل مە، من نە باوەربوو کو ب تنێ شیابام ڤی کاری هەموویێ بکەم."

"بەلێ تو یا نەچار نەبووی من دگەل خوە بینی."

"ڕاستە بەلێ ئەو جهێ ئەم دێ چینێ، ڕەوشا مە دێ گەلەك باشتر لێ هێت، مانە وەیە مەریەم؟"

مەریەمێ دەستێ خوە ئینا دەرێ و ل سەر کورسیکێ دەستێ وێ گرت و گوت: "قورئانا پیرۆز دبێژیت کو خودا یێ ل ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤاییە، تو بچیە هەر جهەکی، ئەو ژ حەزکرنا خودایە."

عەزیزاییێ دەستێ خوە درێژ کرە پاسەکێ و گوت: "بۆڤ، مەیەم، بۆڤ."

"عەزیزا جان ئەز دبینم."

مەریەمێ پێ کرە کەنی و گوت: "تو ڕاست دبێژی، بۆڤ، ل دەمەکێ نێزك ئەم ژی دێ ل بۆڤێ سووار بین، ل وی دەمی تو دێ گەلەك تشتان بینی."

لەیلایێ ژی کرە کەنی. پاشی تەماشەی دارتاشەکی کر کو د دکانا خوە ڤە ل لایێ دی یێ جادێ مژوولی برینا دارەکێ بوو و هوورکێ دارێ ل وان جهان بەلاڤ دبوو. تەماشەی ترۆمبێلان دکر گەلەك بلەز دهاتن و چوون کو جامێن وان ژی ب تەقنێ و تۆزێ پیس بوون. پاسێن گەراجی ب شێوەیەکێ هێدی بۆ پێشڤە و پاشڤە دچوون و چەندین وێنەیێن تاوس و شێر و دیمەنێ رۆژئاڤابوون و شیر و مەتالێن بریسقەدار ل سەر د نەخشاندی بوون.

لەیلایێ ل بەر گەرماتیا هەتاڤا سپێدێ هەست ب گێژبوونا لەشێ خوە و وێرەکیێ دکر. دەمێ سەیەکێ بەردایی ب دوو چاڤێن ل نێزیکی وان دەست ب رەوینێ کری، لەیلایێ دەستێ خوە ل سەر پشتا وی دا ئینا خوارێ.

چەند خولەکەك بۆ دەمژمێر یازدە مابوون. کابرایەکی کو دەنگ بلندکەرەك د دەستان دا بوو، داخواز ژ رێڤینگێن پێشاوەرێ کر سوواری پاسێ بن. دەرگەهێن پاسێ ڤەبوون و رێڤینگ کوم کومە بەزینە پاسێ و هەر یەکی دڤیا بەری یێ دی سووار بیت، تا وی رادەی هەموو کەفتنە ناڤ دەست و پێن هەڤدوو دا.

وەکیلی کو کورێ وی ل ملێ وی بوو، ئاماژە دا لەیلایێ داکو بچن سووار بن. لەیلایێ گوت: "ئەڤە ئەم دێ هێن."

وەکیل کەفتە پێشیا وان، دەمێ ئەو نێزیکی پاسێ بووین، لەیلایێ ل سەر جامێن پاسێ کومەکا سەروچاڤ و دفن و دەستان دیت یێن ماینە ب شووشەیا جامێ ڤە. ل دەروبەری وان هەموو خەلك بوون و خاترا خوە ژ هەڤدوو دخواست.

سەربازەکێ گەنج یێ میلیشاییێن چەکدار پلێتێن رێڤینگان ل بەر دەرگەهێ پاسێ دپشکنین دەمێ سووار دبووین. عەزیزاییێ کرە قێژی و گوت: "بۆڤ."

وەکیلی پلێت دانەڤ سەربازی و وی ژی د نیڤەکێ را کرنە دوو پرت و دانەڤ وەکیلی ڤە. وەکیلی یەکەمجار هەڤژینا خوە سووار کر. پاشی وەکیلی چاڤەك ل سەربازی نقاند و ل سەر کوسیکا یەکێ یا پاسێ روونشت و گازی سەربازی کر و چوو بن گوهێ وی و هندەك ئاخفتن بۆ گوتن. سەربازی ژی تەماشەی لەیلایێ وان کر.

لەیلا ترسیا و دلێ وێ بلەز خوە قوتا.

سەربازی گوتێ: "هوون هەردوو دگەل وێ زارۆکێ وەرنە خوارێ."

لەیلایێ دڤیا خوە کەڕ بکەت و بچیت ل سەر کورسیکەکێ ب ڕوونتە خوارێ. لێ سەربازی ملێ وێ گرت و ژ سرایێ ئینا دەرێ و پاشی تەماشەی مەریەمێ ژی کر و گوت: "دێ توژی بلەز، ژبەر ڕێکا خەلکی ڕابە."

لەیلایێ ب دوو لێڤێن هشك ڤە گوت: "چ چێبوویە برا؟ مە پلێتێن، خوە یێن بڕین. ئەرێ پسمام ما تە پلێتێن مە نەدانەڤێ؟"

سەربازی ب تبلێ ئەو بێدەنگ کر و پاشی دگەل سەربازەکێ دی ئاخفت. سەربازێ دی کەسەکێ خر و کورت بوو و شوونوارێن برینەکێ ل سەر سەروچاڤێن وی بوو. تەماشەی وان و کر و پاشی گوتە لەیلایێ: "ل دووڤ من بکەڤن."

لەیلایێ کرە قێژی و گوت: "دڤێت ئەم سوواری ڤێ پاسێ بین."

پاشی هەستپێکر کو دەنگێ وێ یێ دلەرزیت. دووبارە گوت: "مە پلێت یێن بڕین. تو بوچی ڤێ چەندێ دگەل مە دکەی؟"

"نابیت هوون سواری ڤێ پاسێ بن. دڤێت هوون گوهێ خوە بدەنە من و ل دووڤ من وەرن یان ژی هەوە دڤێت ئەز ل پێشچاڤێن ڤێ زارۆکێ هەوە ڕەزیل بکەم."

دەمێ سەربازی ئەو برین دا سوواری لوریێ بکەن، لەیلا ل پشت خوە زڤڕی و تەماشەی پاسێ کر، وێ کورێ وەکیلی د جامەیا پاسێ دا دیت و ب دلەکێ خوش دەستێ خوە بۆ بلند کر.

***

ل بنگەهێ پولیسێن دووریانا "توراباز خان"، ئەو هەردوو ل ڤی سەری و سەرێ دی مەمەرێ درێژ و پڕی ڤەرەبالغ ل دووری هەڤ ڕوونشتن. مێزەیەك ل بەر سینگێ وان بوو کو زەلامەك یێ ل سەر ڕوونشتی بوو جگارە ب جگارێ ڤەدنا و دکێشا و جار جارە ژی دەستێ خوە ل سەر وێ دوکمەیا بەر سینگێ خوە ددا و چایەك داخواز دکر.

نێزیکی سێ دەمژمێران ئەو ب ڤی ڕەنگی مان. جار عەزیزا ژ دەڤ مەریەمێ دچوو نك لەیلایێ و جار ژی بەروڤاژی. پرتەکا کاغەزێ د دەستێ وێ دا بوو کو وی زەلامی دابووڤێ. پشتی پسکێتێن خوە خوارین، ل دوماهیێ ل سەر ملێ مەریەمێ د خەو چوو.

نێزیکی دەمژمێر سێی ئێڤاری لەیلا برە ژوورەکێ بۆ ڤەکولینێ و گوتە مەریەمێ ژی ژ دەرڤە ل دەڤ عەزیزایێ بمینیت.

ئەو زەلامێ د ژوورا ڤەکولینێ ڤە ل پشت مێزەکێ یێ ڕوونشتی بوو و ژیی وی نێزیکی سیه و چەند سالەکان بوو جلکێن مەدەنی ل بەر بوون. چاکیت و پەنتەرۆنەکێ ڕەش و بوینباغ و پێلاڤەکا ڕەش، ڕێهێن وی د ڕێکوپێك بوون و پرچەکا کورت و دوو بریێن زراڤ هەبوون. تەماشەی لەیلایێ کر و پێنۆسێ خوە دانا سەر وێ مێزا ل بەر سینگێ خوە.

پاشی کوخی و دەستێ خوە دانا بەر دەڤێ خوە و گوت: "ئەم دزانین هەتا نوکە تە درەوەك یا کری. ئەو زەلامێ گەنج یێ ل وێستگەها پاسان پسمامێ تە نەبوو. وی ب خوە ئەڤ چەندە گوتە مە. پرسیارا من ئەوە کا ئەرێ نوکە ژی تە دڤێت هەر درەوان بکەی؟ ئەز تە شیرەت دکەم کو ڕاستییێ بێژی و درەوان نەکەی."

لەیلا: "مە دڤیا بچینە دەڤ مامێ من، ئەڤە هەموو ڕاستیا بابەتی یە."

ئەفسەری پرسیار کر: "باشە ئەو ژنا ژ دەرڤە، دایکا تەیە؟"

"بەلێ."

"بەلێ پا ئەو ب زاراڤێ هیراتێ دئاخڤیت و تو وەکو وێ نائاخڤی؟"

"ئەو یا ل هیراتێ مەزنبووی لێ ئەز ل کابولێ یا هاتیمە سەر دنیایێ."

"بەلێ، ڕاستە تو بیژنی؟ تە وەگوتبوو مانە؟ خودا هاریکارێ هەوە بیت. باشە ئەڤ مامێ تە ل کیڤە دژیت؟"

"ل پێشاوەرێ."

"بەلێ، تە بەری نوکە ژی وەگوتبوو."

سەرێ قەلەمی نێزیکی دەڤێ خوە کر و پاشی دانا سەر کاغەزەکا سپی و گوت: "بەلێ پا ئەو ل کیرا پێشاوەرێ یە؟ ل کیژ تاخی؟ ل کیژ جادێ؟ ل کیژ بەشی؟"

لەیلایێ بزاڤ دکر ل سەر وێ ترس و لەرزینێ زالێ بیت یا هەموو گیانێ وێ ڤەگرتی. وێ ناڤێ جادەیەکێ ل پێشاوەر گوت کو ئەو ناڤ ب تنێ دزانی. دەمێ چەکدار هاتینە دناڤ کابولێ دا، دایکا خوە گەلەك ژ وان مێهڤان کربوونە مالا خوە و هینگێ ناڤێ وێ جادێ گوهلێبببوو.

"مالا وی یا ل جادەیا جەمرود."

"ئاها بەلێ، ل هەمان وێ جادا هوتێلا "بێرل کونتینیتال" لێ هەی، پێدڤی بوو وی ئەڤ چەندە ژی گوتبایە."

لەیلایێ ئەڤ چەندە ب دەلیڤە زانی و گوت: "بەلێ ئەڤە ئەو جادەیە."

"ژبلی هوتێلێ، جادا خەیبەر ژی یا ل وێرێ."

دەنگێ گریا عەزیزایێ ژ دەرڤە هاتە گوهێن لەیلایێ. وێ گوت: "کچا من گەلەك یا ترسیای. ئەز دێ شێم چم وێ ئینمە دەڤ خوە، برا؟"

"یا باشتر ئەوە تو ب ناڤێ ئەفسەر گازی من بکەی. چ نەمایە دێ چیە دەڤ وێ. باشە ژمارا تێلەفونا مامێ تە ل دەڤ تە هەیە؟"

"دگەل من بوو، بەلێ پا ..."

هەرچەندە بورکە ژی ل بەر لەیلایێ بوو، لێ ئەو نەدشیا خوە ژ ئاورینێن وی یێن تیژ وکوژەك بپارێزیت.

"ئەز گەلەك یا واستیای مە، ژبەر هندێ یا ژ بیرا من چووی."

ئەفسەری بێهنا خوە هەلکێشا و پرسیارا ناڤێ مام و ژنماما وێ ژێ کر. چەند زارۆك هەنە؟ ناڤێن وان چنە؟ چ کار دکەن و ل کیڤە؟ ژیێ وی چەند سالە؟ ب ڤان پرسیاران وی سەرێ لەیلایێ گێژ کر.

ئەفسەری پێنۆسێ خوە دانا و تبلێن خوە دناڤێکرا برن و وەکو وان دایك و بابان یێن دڤێن زارۆکێن خوە یێن بچووك شیرەت بکەن، گوت: "تو دزانی خوشکا من ڕەڤینا ژنێ ژ مالا هەڤژینێ خوە تاوانە؟ مە گەلەك ئەڤ تشتە یێن دیتین، ئەو ژنێن ب تنێ گەشتێ دکەن ل هێجەتا هندێ کو زەلامێن وان یێن مرین. هندەك جاران ئەو ڕاست دبێژن و گەلەك جاران ژی درەوان دکەن. دەمێ ژنەك ژ مالا هەڤژینێ خوە دڕەڤیت، دهێتە زیندانکرن. ئەز دبێژم نوکە تو باش د من گەهشتی؟"

"ئەفسەرێ هێژا، هیڤی دکەین دەلیڤێ بدە مە داکو ئەم بچین. هیڤی دکەم نەبە ڕێگر د ڕێکا مە دا."

پاشی وێ ناڤێ وی ل سەر ئارمێ ل سەر سینگێ وی خواند و گوت: "ئەفسەر ڕەحمان، ڕێزێ ل ڕامانا ناڤێ خوە بگرە و دلوڤانیێ ب مە ببە. ئەرێ ما چ جوداهی بۆ تە هەیە ئەگەر ڕێکێ بدەیە دوو ژنان بچن؟ ئەگەر تو مە ئازاد بکەی ما دێ زیان گەهیتە کێ؟ مە چ تاوان نەکرینە."

"ببورە، ئەز نەشێم."

"هیڤی ژته دکەم، هیڤی دکەم."

ڕەحمانی گوت: "بابەت گرێدای یاسایێ یە، یاسایێ، خوشکێ"

پاشی دەنگێ خوە خوش کر و گوت: "ئەز بەرپرسیارم ژ هندێ کو یاسایێ بپارێزم."

لەیلا گەلەك یا شەپرزە و ماندی بوو. کەنیا وێ ب وێ ئاخفتنێ هات، چونکی بۆ وێ یا سەیر بوو کو سەرەڕای وان کارێن خڕاب یێن چەکدار ئەنجام ددەن، ژ نوو ئەڤە بەحسێ یاسا و سیستەمی دکەت. ئەو هەموو کوشتن و تالانکرن و دەستدرێژی و ئەشکەنجەدان و سێدارەدان و تۆپبارانکرن کو ب دەهان هزار تۆپ د هەڤدوو وەرکرینە بێی کو ئەو گوهێ خوە بدەنە هندێ کو ب ڤی کارێ خوە وان دنیایەکا مرۆڤێن بێگونەهـ کوشتینە، ژ نوو بەحسێ یاسایێ دکەت.

لێ وێ کونترۆل ل سەر خوە کر و ل شوونا هندێ ب ڕەزیلی ڤە گوت: "ئەگەر تو مە فرێکەیە مال، ئێدی پێدڤی ناکەم بۆ تە بێژم کا دێ چ ب سەرێ مە هێت."

لەیلایێ دیت کا چەوا ئەو یێ بزاڤێ دکەت بەرێ خوە ژ وێ ڤەنەکەت و چاڤێ وی ل سەر چاڤێ وێ بیت.

"ئەو کارێ زەلاّم دناڤ مالا خوە دا ئەنجام ددەت، پەیوەندی ب وی ب خوە ڤە هەیە."

رۆندکێن تۆڕەبوونێ چاڤێن لەیلایێ تەڕکرن، پاشی گوت: "ێ پا ڤێجا ئێدی چ مفایەك د یاسایێ دا هەیە، ئەفسەر ڕەحمان؟ تو ژ بۆ پاڕاستنا سیستەمی و یاسایێ دشێی ل وێرێ ژی ئامادە ببی؟"

"خوشکێ، سیاسەتا مە ئەوە مایێ خوە د کاروبارێن ناڤخۆیی یێن خێزانان نەکەین."

"چ پێنەڤێت هوون وەناکەن چونکی ئەو چەندە د بەرژەوەندیا زەلاّمان دایە. مانە ئەڤەژی هەر کاروبارەکێ خێزانی یە؟ مانە هۆسایە؟"

ئەفسەری کورسیکا خوە برە پشتێ و ڕابوو سەر پێن خوە و چاکیتێ خوە دروست کر و گوت: "ئەز دبێژم ڤەکۆلینا مە ب دوماهی هات، خوشکێ. دڤێت بێژمە تە کو تە دوسیەکا ڕەش بۆ خوە تومار کر، دوسیەکا ڕەش و خڕاب. باشە تو نوکە دشێی ژ دەرڤەی چاڤەرێی بی هەتا دوو ئاخفتنان دگەل وێ.. تە گوت چ تشتا تەیە؟ دگەل وێ ژی باخڤم."

لەیلایێ خوە نەڕازیکر و پاشی کرە ڤێژی و هەوار، ژبەر هندێ ئەفسەر نەچاربوو گازی کەتە دوو سەربازان داکو دەستێ وێ بگرن و ببەنە ژ دەرڤە. ڤەکولینا دگەل مەریەمێ گەلەك نەڤەکێشا، دەمێ هاتیە ژ دەرڤە لەشێ وێ هەموو د لەرزی.

مەریەمێ گوت: " گەلەك پرسیار ژ من کر، ببورە لەیلا ئەز وەکو تە یا زیرەك نینم. وان گەلەك پرسیار دکرن و من بەرسڤا وان نەدزانی. ل من ببورە لەیلا."

لەیلایێ ب کزگریوك ڤە گوت: "خەتاییێن تە نینن مەریەم، خەتاییێن منن. ئەڤ چەندە هەموو خەتاییێن منن. هەموو."

★★★

دەمژمێر ژ شەشێ ئێڤاری بوری بوو دەمێ ترۆمبێلا پولیسان ل بەر دەرگەهێ وان ڕاوەستیا. لەیلا و مەریەم ل سەر کوشنێ پشتێ ڕوونشتبوون و سەربازەکێ چەکدار ژی ل پێشیێ ڕوونشتبوو زێرەڤانی ل وان دکر.

شۆفێرێ ترۆمبێلێ هاتە خوارێ و دەرگەهێ مالێ ڤوتا و پشتی ڕەشیدی دەرگەهـ ڤەکری، دگەل ئاخفت. ڕەشیدی ژی ئاماژە دایێ بچنە د ژوور ڤە. ئەو سەربازێ ل پێشیێ ژی ڕوونشتیە خوارێ، جگارەیەك بەردایێ و گوتێ: "هوون بخێر بچن بۆ مالا خوە."

★★★

ڕەشیدی گوتە مەریەمێ: "جارێ تو ل ڤێرێ ب مینە."

مەریەم ب بێدەنگی ل سەر ڤەنەپێ ڕوونشت.

"هوون هەردوو ژی هەڕنە ڤاتێ سەری."

ڕەشیدی چنگلێ لەیلایێ گرت و بەرەڤ دەرەجکان پالدا. هێشتا پێلاڤێن وی یێن شولی ل پیا بوون و دەمژمێر و چاکیتێ خوە نەئێخستبوو. لەیلایێ دئینا پێشچاڤێن خوە کو ڕەنگە ب دەمژمێرەکێ یان چەند خولەکەکان بەری وان یێ هاتیە مال و ژ ژوورەکێ یێ چوویە ژوورەکا دی و دەرگەهـ ب هێز یێن پێکڤە داین و یێ تۆڕەبووی و نەفرەت یێن ل وان باراندین.

ل سەر دەرەجکا دوماهیێ، لەیلا ل پشت خوە زڤڕی و تەماشەی وی کر. لەیلایێ گوت: "هیڤی دکەم بەلاَ خوە ژ وێ ڤەکە، وێ نەدڤیا چ کارێن هۆسا بکەت بەلکو من نەچار کر دگەل من بهێت، هەکە وێ نەدڤیا بهێت."

لەیلایێ نەزانی کا چەوا کولمەك ب وێ کەفت. وێ هند دیت ئەو کەفتە سەر چوکێن خوە و ب چاڤێن زل و سەروچاڤێن سۆربووی ڕابووڤە، بزاڤ دکر بێهنا خوە ب هەلکێشیت. خوە دا بێژی ترۆمبێلەکا بلەز ئەو یا ل دووڤ خوە ڕاکێشای. وێ هند دیت عەزیزا ژی ژ دەستێن وێ کەفت و کرە قێژی. جارەکا دی بێهنا وێ تەنگ بوو ئاڤ ژ دەڤی هاتە دەرێ.

پشتی هینگێ ڕەشیدی دەستێ خوە هاڤێتە پرچا وێ و ل سەر ئەردی خشاند. عەزیزا ژی کو ڕاببوو سەر پێن خوە، نەعالێن وێ د پێن وێ نەبوون، ڕەشیدی ئەو ژی ل دووڤ خوە دکێشا. ڕەشیدی هۆسا پرچا لەیلایێ دکێشا دا بێژی ها وەختە هەموو دێ هێتە دەرێ، ژبەر هندێ چاڤێن وێ تژی ڕۆندك ببوون.

پشتی هینگێ وی ژوورا مەریەمێ ڤەکر و عەزیزا هاڤێتە د ژوور ڤە و ل دووڤ دا لەیلا ژی خشاندە د ژوور ڤە و پرچا وێ بەردا و ب سەرێ پێلاڤا خوە یا تیژ پێهن ل ڕانێن وێ ددان.

پشتی وی دەرگەهێ ژوورێ ل لەیلایێ گرتی، ژ نوو وێ هەست ب ئێشانا لەشێ خوە کر و دەست ب گریێ کر. دەمێ دەنگێ لڤاندنا کلیلا د دەرگەهی ڕا دهاتی، عەزیزایێ ژ بنێ پیان کرە قێژی و ترسیا. لەیلا ل سەر ئەردی گێژ ببوو بێهنا وێ چك بوو، لێ پاشی هێدی هێدی و ل سەر دەستا خوە نێزیکی عەزیزایێ کر و دەستێ خوە درێژ کری و گەهاندە دەڤ خوە.

پشتی هینگێ دەنگێ قوتان و لێدانێ ل خوارێ هاتە گوهێن وێ. ئەو دەنگێ لەیلایێ گوهـ لێ دبووی وەکو شەڕەکێ پرۆگرامکری یێ ڕۆژانە بوو. نەفرەتکرن و قێری و هەوارێن ڕەشیدی، بێدەنگیا مەریەمێ سەرەڕای قووتان و لێدان شەقێن بەردەوام ب لەشێ وێ دکەڤن.

هەروەکو کا چەوا دەمێ تشتەك ب دیواری دکەڤیت و دەنگ ژێ دهێت بێی کو دیوار باخڤیت، ئاها ڕەوشا ڤێ ژنا بەلەنگاز ژی ددەستێ ڕەشیدی دا یا هۆسابوو. جار جار دەنگێ ڕەڤینا مەریەمێ ژ بن دەستێن وی و شکەستنا شووشەیان و تێوەرکرنا هندەك تشتان دهاتە گوهێن لەیلایێ.

لەیلایێ عەزیزا کرە ملێ خوە، هەستپێکر تشتەکێ گەرم ب کراسێ وێ دا ڕژیا، دەمێ سەحکریێ، دیت عەزیزایێ میزتە ب خوە ڤە.

ل دوماهییێ دەنگێ ڕەڤێ و قوتان و لێدانێ ل خوارێ نەمان ب تنێ دەنگێ تشتەك دهات ئەو ژی ڕاكێشانا كەسەكی بوو ل سەر ئەردی. لەیلایێ ژی بەردەوام عەزیزا ل ملێ خوە دهەژاند هەتا بێدەنگ بووی.

ژ نیشكەكێ ڤە وێ گوهـ ل دەنگێ ڤەبوونا دەرگەهێ سەرەكی یێ مالێ بوو. وێ عەزیزا دانا سەر ئەردی و چوو بەر پەنجەرێ، ڕەشیدی حەفكا مەریەمێ ژ پشتێ ڤە گرتبوو ڕادكێشا ناڤ حەوشێ. مەریەم یا پێخواس و وەڕمتی بوو خوین ژ دەستێن وێ دهات. هەردیسان خوین ب ناڤچاڤ و پرچ و حەفك و پشتا وێ ڤەبوو، كڕاسێ وێ ژی ژ سینگی ڤە دڕیابوو.

لەیلایێ د پەنجەركێ دا كرە هەوار: "ل من ببورە مەریەم."

لەیلایێ دیت ڕەشید یێ وێ بەرەڤ كۆگەها بچووك یا دناڤ حەوشێ ڤە دبەت و پالڵدا د ژوور ڤە. پاشی ڕەشید دەركەفت و چەكوچ و هندەك پارچەیێن داری د دەستی دا بوون. وی هەردوو دەرگەهێن كۆگەهێ گەهاندنە یەك و كلیلا وێ ژ بەریكا خوە ئینا دەرێ و قوفل كر و دوو سێ جاران تاقیكر كا باش هاتیە گرتن و پاشی چوو پشتا كۆگەهێ و پێستركەك ئینا.

پشتی چەند خولەكەكان، كو بەرێ خوە دا پەنجەرا ژوورا لەیلایێ، هندەك بزمار ژی دبەر لێڤا وی ڕا بوون و پرچا وێ یا ڤژ بوو و چپكێن خوینێ ژی ب ئەنیا وێ ڤەبوون. دەمێ چاڤێ عەزیزایێ ڤێكەفتی، كرە ڤیژی و سەرێ خوە دانا سەر ملێ لەیلایێ.

ڕەشیدی ئەو پارچەیێن داری دانانە سەر پەنجەركا ژوورا لەیلایێ و بزمار تێ قووتان.

★★★

ژوور هەموو تاری بوو، چ تشت دبەرا نەدچوون، هەتا تیرۆژكێن رۆژێ ژی نەدشیان دپەنجەركێ ڕا بهێنە د ژوور ڤە. ڕەشیدی هەموو دەرزێن دناڤبەرا پارچەیێن داران ژی گرتن و تشتەكێ مەزن دانا بەر دەرگەهێ ژوورێ داكو چ تشت دبن دەرگەهی ڕا نەهێنە د ژوور ڤە. هەردیسان پارچەكا پاتەی كرە د كونا كلیلكا دەرگەهی ڕا.

ئێدی لەیلایێ ب ڕێكا چاڤان نەدزانی كا چ وەختە ژبەر هندێ بڕاڤ كر ئێدی ب هاریكاریا گوهێ خوە یێ دروست وەختان بزانیت. ب ڕێكا دەنگێ بانگی و دەنگێ دیكلان وێ

دزانی دنیا یا بوویه سپێده. دەنگێ کەفچك و سێنیکان ل لێنانگەها خوارێ و سترانێن ل سەر ڕادیوییێ ژی نیشانێن دەمێ ئێڤاری بوون.

ل ڕۆژا یەکێ وان هەردووان ب ڕێکا دناڤ تارپاتییێ دا هەڤدوو دگرت و هەمبێز دکر. لەیلایێ عەزیزا نەددیت دەمێ دکریە گری یان دەمێ خوە ل سەر ئەردی دخشاندی.

عەزیزایێ دکرە گری و گوت: "ئایش، ئایش."

لەیلایێ کچا خوە ماچی کر، وێ هزرکر ناڤچاڤێن وێ یێن ماچی کرین، لێ د ڕاستی دا وێ پشتا سەرێ وێ ماچی کربوو.

"هەر نوکە دێ شیری دەمە تە، پیچەکێ بێهنا خوە فرەهـ بکە وەکو دایکا خوە هەتا بۆ تە ئایشی دئینم."

پاشی لەیلایێ هندەك ستران بۆ گوتن.

بانگ بۆ جارا دووێ ژی بلند بوو، لێ ڕەشیدی خوارن و ئاڤ نەدابوویێ. ل وێ ڕۆژێ دنیا گەلەك یا گەرم بوو. گەرمایا وێ ڕۆژێ، ژوورا وان کربوو مەنجەلا هەلێ. لەیلایێ ئەزمانێ خوە د لێڤێن خوە دا و ئاڤا تەزی یا بیرا دناڤ حەوشێ دا ئینا بیرا خوە.

عەزیزایێ ژی بەردەوام دکرە گری و لەیلایێ ب پۆسیدەی ڤە تەماشەی وێ دکر وەختێ دەستێن خوە ب ڕوویێن خوە دا دئینا خوارێ. لەیلایێ جلکێن عەزیزایێ ژبەر کرن و ل تشتەکی دگەریا داکو بای لێ بکەت، ئێدی ئەو ب هندێ ڤە یا مژوول بوو هەتا عەزیزا بێدەنگ بووی و پشتی دەمەکێ کێم د خەو چووی.

ل وێ ڕۆژێ، لەیلایێ شەق و پێهن ل دیوارێ ژوورا خوە ددان و دکرە هەوار بەلکو کەسەك یان جیرانەکی ئاگەهـ ژێ هەبیت و د هەوارا وان بچیت لێ هەر کەس د هەوارا وان نەهات، بەلکو دەنگێ وێ ب تنێ عەزیزا دترساند و دووبارە دەست ب گرییێ کرە ڤە لێ ڤێ جارێ ب دەنگەکێ نزمتر.

لەیلایێ خوە ل سەر ئەردی درێژ و دلێ وێ ما د دووڤ مەریەمێ ڕا، چونکی ڤوتانەکا مەزن خوار بوو لەشێ وێ ژی هەموو ببوو خوین و ل وێ گەرما هاڤینێ ژی دناڤ کۆگەهێ دا زیندان کربوو، ژبەر هندێ وێ هەست ب گونەهێ دکر.

هەر د وی دەمی و دناڤ خوهێ دا، لەیلا د خەو چوو. وێ د خەونێ دا دیت ئەو و عەزیزا یێ بەرەڤ تارڤی دکەنە غار. ل جادەیەکا پڕی ڤەرەبالغ و ل بن سیبەرا دکانەکا

درینێ دا ل لایێ دی یێ جادێ یێ ڕاوەستای بوو. ئەو ل سەر کورسیەکا پەککەفتیان یێ ڕوونشتی بوو و هژیرەك د ناڤ عەلاگەی دا ئینا دەرێ. لەیلایێ گوتە عەزیزایێ: "ئەوێ هە بابێ تەیە. تو وی دبینی؟ ئەو بابێ تە یێ ب دروستاهی یە." وێ گازی کرە تاڕقی لێ قەرەبالغا خەلکی ل سەر جادێ نەهێلا دەنگێ وێ بگەهیتە تاڕقی.

لەیلا ل دووڤ دەنگێ وان مۆشەکان هشیار بوو یێن د سەر بانێ وان ڕا دچووین. ل جهەکی کو وێ نەددیت، پەقینەك ڕوویدا و دوکێلا ڕەش چوو بەر ئاسمانی و پاشی دەنگێ فیشەکێن یەك ل دووڤ یەکێ یێن ڕەشاشەیان هات. لەیلایێ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك ڤە، لێ دووبارە ل دووڤ دەنگێ ڕەپ ڕەپا پێن ڕەشیدی هشیاربوو. خوە نێزیکی دەرگەهی کر و بهێز دکێشا.

"ڕەشید بەس یەك گلاسا ئاڤێ، نە بۆ من، بەلکو بۆ ڤێ زارۆکێ. ئەگەر ئەو مر دێ خوینا وێ کەڤیتە ستوویێ تە."

ڕەشید د بەر دەرگەهێ ژوورێ ڕا بوری بێی کو بەرسڤا وێ بدەت. لەیلایێ دەست ب هیڤیان کر و داخوازا لێبورینێ ژێ کر و سوزدایێ ڤێ چەندێ دووبارە نەکەت، لێ وی هەر بەرسڤا وێ نەدا لەوڕا وێ نەفرەت ل وی کرن. دەرگەهێ ژوورا ڕەشیدی هاتە گرتن و دەنگێ ڕادیوییێ بلند بوو.

مەلای بۆ جارا سیێ بانگ دا، دنیا هەر یا گەرم بوو عەزیزا هند بێهێز و لاواز بوو، ئێدی نە شیانێن گرییێ مان و نەیێن هاتن وچوون و خوە خشاندنێ.

لەیلایێ بەردەوام گوهێ خوە ب دەڤ و سینگێ عەزیزایێ ڤە دنا، چونکی دترسیا نەکو جارەکێ وێ گوهـ ل هەناسەیێن وێ نەبیت. ئەو لڤینا سادە و ڕابوونا وێ و گوهدانا هەناسەیێن عەزیزایێ، بۆ وێ گەلەك د گران و ب زەحمەت بوون.

دەم بۆ دەمی د خەو دچوو هندەك خەون ددیتن، لێ دەمێ هشیار دبووی، خەونێن وێ ژ بیرێ دچوون، ژبەر هندێ دا دەستێ خوە درێژ کەتە عەزیزایێ، هەست ب لێڤێن وێ یێن هشك و لێدانێن دلێ وێ یێن هێدی دکرن. جارەکا دی خوە درێژ کر چونکی دزانی ئێدی ئەو دێ ل ڤێرێ مرن.

ئەو ب تنێ ژ تشتەکی دترسیا، ئەو ژی نەکو ئەو پشتی مرنا عەزیزایێ ب مینتە ساخ. ژبەرکو عەزیزا یا بچووك و نازك بوو، وێ هزردکر ئەو دێ پتر ژ وێ خوە ل بەر ڤێ

نەخوشییێ گریت. عەزیزا دێ ل بەر ڤێ گەرمێ مریت و ئەو ژی دێ نەچار بیت ب ڕەخ کەلەخێ وێ خوە درێژ بکەت و چاڤەڕێی مرنا خوە بکەت.

دیسان خەو کەفتە چاڤێن وێ، هشیاربوو، دووبارە خەو کەفتە چاڤێن وێ ڤە. ئێدی د ناڤبەرا نڤستن و هشیاربوونێ دا پۆسیدە بوو ڕەنگ لێ نەما.

ل ڤێرێ، ئەو ل دووڤ دەنگێ بانگی یان دیکلی هشیار نەبوو، بەلکو ل دووڤ دەنگێ ڕاکێشانا تشتەکێ گران ل سەر ئەردی هشیاربوو. دەنگێ کلیلا دەرگەهی هات و ژ نیشکەکێ ڤە ژوور پڕ بوو ژ ڕۆناهییێ. چاڤێن خوە پەرخاندن و سەرێ خوە بلند کر. لێ هێشتا چاڤێن وێ ژبەر ڕۆناهییێ نەدشیان باش ڤەبن، ژبەر هندێ دەستێ خوە دانا بەر چاڤێن خوە و دناڤ دەرزێن تبلێن خوە دا سیبەرەکان مەزن دیت و دلڤلڤی.

پاشی وی خوە نێزیکی وێ کر و ئەڤ ئاخفتنە د گوهێ وێ دا گوتن: "ئەگەر جارەکا دی هوون کارەکێ هۆسا بکەن، ئەز دزانم دێ چەوا ب جهێ هەوە کەڤم. سووند ب پێغەمبەری ئەز هینگێ برِاوەستم هەتا هەوە دبینم. ئەگەر من هوون دیتن ژی پاشی ئەز دزانم دێ چ کەم چونکی چ دادگەهـ ل ڤی باژێری کاڤلێ و نەفرەتی دا نەشێت لێپرسینێ دگەل من بکەت. ل دەستپێکێ دێ ب سەرێ مەریەمێ ئینم و پاشی کچکا بچووك و ل دوماهیێ تە. دێ وەل هەوە کەم هوون ب چاڤێن خوە ببینن کا دێ چ ل هەوە کەم، تو تێگەهشتی؟ دێ وەل تە کەم تو ب ڤان چاڤێن خوە ببینی."

ڕەشیدی ئەڤ ئاخفتنە گوتن و ژ ژوورێ دەرکەفت، لێ بەری ب دەرکەڤیت پێهنەك ل تەنشتا لەیلایێ دا کو بوو ئەگەر بۆ ماوەیێ چەندین ڕۆژان خوین دگەل میزا وێ ب دەرکەڤیت.

# 37

**مەریەم،**

**ئیلون، 1996**

**پشتی بورینا دوو سالان ل سەر وێ ڕوودانێ، ل ڕۆژا 27ێ ئیلونێ مەریەم ل دووڤ دەنگێ ڤێژی و فیتك و یارییێن ئاگری و موزیکێ هشیاربوو. مەریەم بەرەڤ ژوورا ڕوونشتێ ڤە چوو، دیت لەیلا یا ل بەر پەنجەرێ ڕاوەستیایە و عەزیزا یا کریە ملێ خوە. لەیلا لێ زڤڕی و بۆ گرنژی.**

**لەیلایێ گوت: "تالێبان یێن هاتین."**

★★★

**مەریەمێ بەری هینگێ ب دوو سالان ل چریا یەکێ ل سالا 1994ێ، بۆ یەکەم جار هندەك تشت دەربارەی تالێبانێ گوهلێببوون، ئەو ژی دەمێ ڕەشید هاتیە مال و ئەو دەنگوباس بۆ دگەل خوە ئینای و گوتیێ کو ل قەندەهارێ هێزێن تالێبانێ سەرکردەیێن لەشکەری یێن ئێخستین و ب تەمامی دەستێ خوە یێ دانایە سەر باژێری.**

**ڕەشیدی گوتبوو ئەو کومەکا گەریلانە و ژ گەنجێن پەشتوونی پێکدهێن کو ل دەمێ شەڕی دگەل سوڤییەتێ، خێزانێن وان ئاوارەی پاکستانێ ببوون و پتریا وان ژی ل کەمپێن پەنابەران ل سەر سنورێ دناڤبەرا پاکستان و ئەڤغانستانێ دا یێن مەزن بووین، هندەك ل وێرێ ب خوە ژی ژ دایکبووینە و ل قوتابخانەیێن پاکستانێ و ل سەر دەستێ مەلایان شەریعەتێ ئیسلامێ خواندیە.**

**ڕێبەرێ وان کەسەکێ نەخواندەڤان و ب چاڤەکی یە و ژیانا وی یا نهێنی و نەدیارە ب ناڤێ "مەلا عومەر". پاشی ڕەشید هاتبوو بن گوهێن وان ب دەنگەکێ نزم ڤە گوت: "ئەو دبێژتە خوە ئەز (ئەمیر ئەلمؤمنین)ێ موسڵمان امە."**

ل دووڤ دا کو ڕەشیدی نە ئاخفتنا خوە ئاڕاستەیی مەریەمێ و نەژی لەیلایێ کر، گوت: "ڕاستە ئەڤ کورە د بێ ڕهوریشالن."

مەریەمێ دزانی کو پشتی ڕەڤینا وان یا بێ ئەنجام ئەوا بەری دوو سال و نیڤان ئەنجامدای، ئێدی ئەو هەردوو د چاڤێن ڕەشیدی دا وەکو یەك لێهاتبوون. هەردوو ببوونە جهێ نەباوەری و سفکاتیپێکرن و پشتگوهاڤێتنێ. دەمێ وی دئاخفتی، مەریەمێ هەستپێدکر ئەو یێ دگەل خوە یان دگەل کەسەکێ بەرزە د ژوورێ ڤە دئاخڤیت. بەروڤاژی وێ و لەیلایێ، بۆچوونێن وی هەژی گوهداریکرنێ بوون.

"ڕەنگە وان چ ڕابردوو نەبیت."

دگەل دەستپێکرنا ڤێ سحبەتێ، وی جگارەیەك بەردایێ و تەماشەی بانێ ژوورێ کر، بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "ڕەنگە ئەو چ تشتان ل دور دیرۆکا ڤی وەلاتی نەزانن. بەلێ، دبیت مەریەم ل پێش وان ڤە پرۆفیسورا زانکۆیێ بیت! ها ها ها. ئەڤ تشتە هەموو ڕاستن، لێ تەماشەی دەوروبەرێن خوە بکە کا دێ چ بینی؟ گەندەلیێ، فەرماندەیێن چەکداری یێن شەڕکەر کو هەتا سەرێ دفنێ ژی خوە پرچەك کرینە، ب کەرەستەیێن بێهوشکەر و هێروینێ یێن زەنگین بووین، جیهادێ دژی هەڤدوو ڕادگەهینن و هەڤدوو دکوژن. ڤێجا ئێدی چ مفایەك بۆ ڤی وەلاتی د وان دا هەیە؟ لێ هەر چ نەبیت تالێبان د پاقژن و گەندەل نینن. ئەو کورێن باش و موسلمان ن، ئەگەر ئەو بهێنە ڤێرێ دێ ڤی وەلاتی هەموویێ پاقژ کەن و دگەل خوە دێ ئارامی و یاسایێ ئینن. ئێدی دەمێ خەلك دچنە سیکێ بۆ کڕینا شیری ژ بۆ زارۆکێن خوە یێن ساڤا، ناهێنە کوشتن، ئێدی دەنگێ تۆپ و مۆشەکان ناهێتە مە. هزرێن خوە باش تێدا بکەن."

ئەو دوو سال بوو تالێبانێ ڕێکا خوە بو کابولێ خوش دکر هەتا ل دوماهیێ باژێر ژ دەستێ چەکدارێن موجاهدینان دا ئینایە دەرێ و هەر جهێ لێ ئاکنجی دبوون، شەڕێ دناڤبەرا حزبان دا ب دوماهی دئینا. ئەوان فەرماندێ هەزارەیان ب ناڤێ "عەبدول عەلی مەزاری" دەستەسەرکر و سێدارەدا.

ئەو چەند هەیڤ بوو ل باشورێ کابولێ دا جێگر ببوون و شەڕ دگەل ئەحمەد شاه مەسعودی دکر و مۆشەك د هەڤدوو وەردکرن. ل دەستپێکا هەیڤا چریا یەکێ یا سالا 1996ێ، هەردوو باژێرێن جەلال ئاباد و سەروبی ئێخستنە دبن دەستێ خوە ڤە.

ڕەشیدی دگوت: "هێزێن تالّیبانێ تشتەکێ گرنگ هەیە کو ئەو تشت ل دەڤ هێزێن چەکدارێن موجاهدینێ نینە، ئەو ژی ئەوە کو ئەو د یەکگرتینە."

"بلا بهێنە دناڤ کابولێ دا، ئەز ب خوە دێ ب گولان پێشوازیا وان کەم."

ل وێ ڕۆژێ، ئەو هەر چوار پێکڤە دەرکەفتن و ڕەشید ل پێشیا وان بوو. ل دووڤ دا سواری پاسەکێ بوون دا بچن سەرکردەیێن خوە یێن نوو ببینن و پێشوازیێ لێ بکەن. دناڤ هەر کولانەکا وێرانکری دا، مەریەمێ ددیت کا چەوا خەلك یێن ژ مالێن خوە دەردکەڤن و درێژنە سەر جادەیان. وێ پیرەژنەك دیت کو ب مستان برنج ل سەر سەرێ ڕێڤینگان ڕا دهاڤێت و دکرە کەنی.

ل نێزیکی ئاڤاهیەکێ هەرفتی ژی، دوو زەلامان یەکدو هەمبێز کر و ل سەر سەرێ وان ژی دەنگێ فیتك و بخێرهاتن و یاریێن ئاگری دهات یێن زارۆکان ل سەر بانان بلند دپەڤاندین. د بلنگوویا تومارگەهەکێ ژی ڤە، سرۆدا نشتیمانی ب دەنگەکێ بلند دهاتە پەخشکرن و هەڤکری دگەل دەنگێ هۆڕنێن ترۆمبێلان دکر.

عەزیزایێ دەستێ خوە درێژ کرە کومەکا زارۆکان کو بەرەڤ جادەیا "مەیوەند" دکرە غارێ، و گوت: "سەحکێ مەریەم."

وان زارۆکان دکرە غارێ و هەر یەکی دەزیەك ب ڤودیکەکا کەڤن و ژەنگاوی ڤە گرێدابوو ل دووڤ خوە دخشاند و دکرە هەوار کو مەسعودی و ڕەبانی کابول بجهـ هێلا.

خەلکی هەموویان دکرە هەوار و ب دەنگەکێ بلند دگوت: ئاللاهوئەکبەر. مەریەمێ ل سەر جادەیا مەیوەند پاتەیەکێ مەزن دیت کو ل سەر دیوارەکی هاتبوو هەلاویستن و ب پیتێن مەزن و ڕەنگێ ڕەش نڤیسابوو: (بژیت تالّیبان).

دەمێ ئەو دناڤ جادەیان دا دەرباز دبووین، وێ چەندین نڤیسینێن دی دیتن کو ل سەر پەنجەر و دەرگەهێن دکانان هاتبوونە هەلاویستن، هەتا ل سەر شووشکێن ترۆمبێلان ڤە هاتبوونە گرێدان و هەموویان ژی هەمان تشت دووپات دکر.

***

مەریەمێ بۆ یەکەمجار ل پشتی نیڤرۆ یا وێ ڕۆژێ دگەل ڕەشید و لەیلا و عەزیزایێ ل مەیدانا پەشتوونستان، تالّیبان دیتن. ڤەرەبالغەکا زێدە ل وێرێ بوو و خەلکی هەموویان سەرێن خوە بلند دکرن داکو وان ببینن. هندەك ل دورماندوری نافورەیا ئاڤێ یا شین ل

نیڤەکا مەیدانێ و هندەکێن دی ژی ل سەر لێڤێن هشك یێن نافورێ ل نێزیکی خوارنگەها "خەیبەر"ێ دڕوونشتیبوون و بزاڤ دکر وان ببینن.

ڕەشید شیا مفای ژ ڤەلافەتا خوە ببینیت و خەلکی ژ ڕێکێ لادەت و وان ببەتە وی جهی کو کەسەك ل وێرێ یێ ڕاوەستیایی بوو و ب بلندگویێ دئاخفت. دەمێ عەزیزایێ ئەو دیتین، کرە ڤێژی و سەروچاڤێن خوە دانانە بن بورکەیێ مەریەمێ و ڤەشارتن.

ئەو کەسێ بلندگوو هەلگرتی و دئاخفتی، گەنجەکێ بەژن زراڤ و ب ڕیهـ بوو. دەرسوکەکا ڕەش ل سەری بوو و ب ڕەخ دارەکێ ڤە یێ ڕاوەستیای بوو و ئارپێچیەك د دەستێ وی دا بوو. دوو زەلاٌمێن دی ژی ب ڕەخ وی ڤە بوون کو ب وەریسکان ب ستوونا نیشانێن هاتنووچوونێ ڤە دگرێدایی بوون و لەشێ وان هەموو ببوو خوین و جلکێن وان د بەردا دڕیابوون و سەروچاڤێن وان شین و وەڕمتبوون.

مەریەمێ گوت: "ئەز وان دنیاسیم، ئەز وی زەلاٌمێ ل دەستێ چەپێ دنیاسم."

ژنەکا گەنج ل پێشیا مەریەمێ بوو، ل پشت خوە زڤڕی و گوت: "ئەو نەجیبوللاهە و یێ دی ژی برایێ وی یە."

هێشتا مەریەمێ دێمێ نەجیبوللاهی یێ ڤەلەو و سمبێلدار ل پێشچاڤان بوو کو ل سەردەمێ حوکمرانیا سوڤییەتێ دا، وێنەیێن وی ل سەر تابلوییێن ڕیکلامان یێن مەزن و جامخانەیێن دکانان دهەلاویستیبوون.

پشتی هینگێ وێ زانی کو هێزێن تالٌیبانێ نەجیبوللاهـ ل پەناگەها وی ل بنگەهێ ڕێکخراوا UN یا نیڤدەولەتی ل نێزیکی کوچکا "دارولئەمان" ئینابوو دەرێ و بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران ئەو ئەشکەنجە دا و پاشی کەلەخێ وی ل دووڤ لوریەکێ ڤەکر و کەلەخێ وی یێ بێ گیان ل سەر جادەیێن کابولێ خشاند.

ڤی گەنجی ب بلندگویێ دگوت: "ڤی زەلاٌمی هژمارەکا مەزن یا موسلٌمان ان یێن کوشتین."

ل دەستپێکێ وی ب هەردوو زمانێن پەشتوونی و فارسی دئاخفت ل دووڤ دا ب تنێ ب زمانێ پەشتوونی ئاخفت. ب چەکێ خوە ئاماژە کرە کەلەخێن ب ستوونێ ڤە داکو پتر سەنگیەکێ بدەتە ئاخفتنێن خوە، گوت: "هەموو کەس دزانن کا ڤی چەند تاوان

ئەنجامداینە. ئەڤە کەسەکێ شیوعی و کافر بوو، ئەو کافرێن تاوانان دژی ئیسلامێ بکەن، ئاها دێ ب ڤی ڕەنگی ڕەفتارێ دگەل وان کەین."

ڕەشیدی کەیف ب ئاخفتنێن وی دهات و دگرنژی. عەزیزایێ ژی د هەمبێزا مەریەمێ دا دەست ب گریێ کر.

***

ل ڕۆژا پاشتر، باژێرێ کابولێ پڕ بوو ژ ترۆمبێلێن لوری: ل خەیرخانێ، ل نێزیکی گۆڕەپانا "شار-ی-ناو"، ل کارتە پەروان، ل وەزیر ئەکبەرخان و تەیمانێ. لورییێن سۆر یێن تویوتا ب ڕێز کەفتنە پشت یەك. زەلامێن چەکدار یێن ب ڕیهـ و دەرسوکێن ڕەش ل پشت لوریان دروونشتی بوون.

هەر لوریەکێ، بلندگویەك ل سەر هەبوو و پەیامەك ب فارسی و پاشی ب پەشتوونی بۆ خەلکی دخواند. ل سەر بلندگوییێن مزگەفتان و یێن ڕادیویێ ژی کو نوکە ناڤێ وێ کربوو "دەنگێ شەریعەتی" هەمان پەیام دهاتنە خواندن. ئەڤە ژبلی وان پەیامان یێن ل سەر کاغەزان هاتینە نڤیسین و د جادە و کولانێن کابولێ دا هاتینە بەلاڤکرن. مەریەمێ یەك ژ وان کاغەزان دناڤ حەوشا مالا خوە دا دیت.

نوکە ناڤێ وەلاتێ مە، ئیمارەتا ئیسلامی یا ئەڤغانستانێ یە. ئەڤە ئەو یاسانە یێن ئەم دێ پەیرەو کەین و پێدڤە هوون ژی پێگیریێ پێ بکەن:

- هەر هاولاتیەك پێدڤیە ڕۆژێ پێنج نڤێژان بکەت، ئەگەر ل دەمێ نڤێژی تە خوە ب کارەکێ دی ڤە مژوول کر، دێ هێیە قوتان.
- پێدڤیە هەموو زەلام ڕیهێن خوە بهێلن، درێژاهیا دروست ئەوە ب کێمی بۆستەکێ د بن ئەرزنکێ، ئەگەر تو ڤێ چەندێ پەیرەو نەکەی، دێ هێیە قوتان.
- پێدڤیە هەموو کور دەرسوکان بکەنە سەرێن خوە. کورێن پولا یەکێ هەتا شەشێ دێ دەرسوکێن ڕەش کەنە سەرێن خوە، کورێن ل قۆناغا ئامادەیێ ژی دێ دەرسوکێن سپی کەنە سەرێن خوە. پێدڤیە هەموو ژی جلکێن ئیسلامی بکەنە بەر خوە، یاخەیێن جلکێ وان یێ سەری دڤێت یێ ب قولپك بیت.
- ستران گوتن قەدەغەیە.

- سەما و داوات قەدەغەیە.
- یاریێن پەرکانێ، شەترەنج، قومارکرن و یاریا بلندکرنا فرۆکەییێن کاغەزی ژی قەدەغەنە.
- نڤیسینا پەرتووکان، تەماشەکرنا فلمان، کێشانا وێنەیان ژی قەدەغەنە.
- ئەگەر هوون باڵندەییێن بەبەغایان د مالێن خوە دا ب خودان بکەن، دێ هێنە قوتان و باڵندەییێن هەوە ژی دێ هێنە کوشتن.
- ئەگەر دزیەکێ بکەی، دەستێ تە ژ گوزەکێ ڕا دێ هێتە برین، ئەگەر دووبارە دزیێ بکەیە ڤە، دێ ئەڤ جارە پێ تە هێتە برین.
- ئەگەر تو موسڵمان نەبی، ل جهەکێ هۆسا عیبادەتێ خوە بکە کو موسڵمان تە نەبینن هەکە دێ هێیە قوتان و زیندانکرن. خو ئەگەر تو بزاڤێ بکەی کەسەکێ موسڵمان ببەیە سەر ئاینێ خوە، دێ هێیە سێدارەدان.

هۆشداری بۆ ژنان:

- دڤێت تو دناڤ مالا خوە دا بمینی، دەلیڤە ناهێتە دان بۆ ژنان بێی کار ژ مالێن وە بدەرکەڤنە سەر جادەیان. ئەگەر هوون بچنە ژ دەرڤە ژی، پێدڤیە کەسەکێ مەحرەمێ هەوە یێ نێزیك دگەل هەوە بیت. ئەگەر تو ب تنێ ل سەر جادەیێ هاتیە دیتن، دێ هێیە قوتان و هنارتن بۆ مال.
- نابیت تو، ژبەر هەر ئەگەرەکێ هەبیت، سەروچاڤێن خوە دیار بکەی. دەمێ تو ژ مال دەردکەڤی پێدڤیە بورکەی بکەیە بەر خوە. ئەگەر ڤێ چەندێ نەکەی، دێ ب توندی هێیە قوتان.
- خوە خەملاندن قەدەغەیە.
- ل بەرکرنا زێڕ و خشلان قەدەغەیە.
- ل بەرکرنا جلوبەرگێن بالکێش قەدەغەیە.
- نابیت ژ دەڤ خوە باخڤی هەتا پرسیار ژ تە نەهێتە کرن.
- نابیت تەماشەی زەلاّمان بکەی.
- نابیت دناڤ خەلکی دا بکەیە کەنی، ئەگەر وەبکەی دێ هێیە قوتان.
- نابیت نینوکێن خوە بۆیاغ بکەی، ئەگەر تو وەبکەی، دێ نینوکا تە هێتە برین.

- چوونا کچان بۆ قوتابخانەییٚ قەدەغەیە. هەموو قوتابخانەییٚن کچان هەر یەکسەر دێ هێنە گرتن.
- کارکرنا ژنان قەدەغەیە.
- ئەگەر تو زینایێ بکەی، دێ هێیە ڕەجماندن هەتا مرنێ.
- گوهداریێ بکەن، باش گوهداریێ بکەن. ئەللاهوئەکبەر.

ڕەشیدی ڕادیو ڤەمراند. پشتی چەند ڕۆژان ل سەر هەلاویستنا نەجیبوللاهی ب ستوونێ ڤە، ئەو د ژوورا ڕوونشتێ ڤە ل سەر ئەردی ڕوونشتبوون و فراڤین دخوار. لەیلایێ گوت: "نابیت ئەو نیڤەکا خەلکی نەچار بکەن د مالێن خوە ڤە بمینن و شول نەکەن."

ڕەشیدی گوت: "ڤێجا بوچی چێنابیت؟"

ل دەستپێکێ مەریەمێ سەرێ خوە هەژاند وەك ڕازیبوون ل سەر ئاخفتنا وی. ئەرێ مانە ئەڤە هەر ئەو ڕەشیدە یێ بەری نوکە ژی ئەڤ چەندە دگەل وێ و لەیلایێ کری؟ هەلبەت ئەوە و وان ئەڤ چەندە ب چاڤێن خوە دیتی یە.

"ئەڤە گوند نینە، ڤێرێ کابولە. ژن یێن فێربووین کارێ پارێزەریێ و نوشداری و فەرمانبەریێ بکەن."

ڕەشیدی پێ کرە کەنی.

"تو وەکو کچەکا دفن بلند یا ماموستایەکی یا دئاخڤی ئەوێ ل زانکۆیێ هوزانان بۆ قوتابیان دخوینیت. تو چ کچەکا تاجیکی یا زیرەکی. تو هزردکەی ئەڤە هزرەکا نوو یا ڕادیکالی یە کو تالێبان دگەل خوە ئینایە؟ ئەرێ جارەکێ ب تنێ ژی تو دناڤ چوارچووڤەیێ خوە یێ بچووك دەرکەفتیە و چوویە ژ دەرڤەی کابولێ.

گولا من. ئەرێ تە ئەڤغانستانا ڕاستەقینە دیتی یە، باشور، ڕۆژهەلات، ب درێژاهیا دەڤەرێن هوزێن هەڤسنور دگەل پاکستانێ؟ نەخێر. لێ من ئەڤ دەڤەرە هەموو یێن دیتین. ئەز دشێم بێژمە تە کو گەلەك دەڤەر ل ڤی وەلاتی یێن هەین بەری نوکە ژی ب ڤی شێوازی ژیانا خوە بوراندی یە یان ژی تا ڕادەیەکی نێزیکی ڤی شێوازی، نەك وەکو وێ چەندێ یا تو دزانی."

لەیلایێ گوت: "ئەز باوەر ناکەم ڤێ چەندێ بکەن، ئاخفتنێن وان د ڕژد نینن."

ڕەشیدی گوت: "بەلێ ئەوا تالێبانێ دگەل نەجیببوللاهی کری، ل دەڤ من گەلەك کارەکێ ڕژد بوو، مانە هۆسایە؟"

"بەلێ ئەو شیوعی بوو، فەرماندێ پولیسێن نهێنی بوو."

ڕەشیدی پێ کرە کەنی

مەریەمێ ژ کەنیا وی زانی کا بەرسڤا وی چیە. ل دەڤ تالێبانێ، شیوعیبوون و بوونا نەجیببوللاهی وەك فەرماندێ نهێنی دەزگەهێ خاد یێ پولیسێن نهێنی، ب تنێ پیچەکێ ژ ژنبوونێ خراپترە.

# 38

## لەیلا

لەیلا یا خوشحال بوو دەمێ تالیبانێ دەستهەلات گرتیە دەست، چونکی بابێ وێ یێ ساخ نەبوو هەکە ئەڤ چەندە دا وی گەلەك هەرشینیت.

زەلام کوم کومە چوونە دناڤ موزەخانەیا کابولێ یا وێرانبووی و هەموو پەیکەرێن بەری ئیسلامێ شکاندن، ئانکو ئەو پەیکەرێن ژلایێ چەکدراێن موجاهدینان ڤە نەهاتیە تالانکرن.

دەرگەهێن زانکۆیان دائێخستن و قوتابی فرێکرنە مال و تابلوییێن وێنەییێن ل سەر دیواران پارچە پارچە کرن و دڕاندن. ل دووڤ دا جامەیێن تێلەڤزیونان شکاندن و هندی پەرتووکەکا هەی، ژبلی قورئانێ، ل سەر یەك خرڤەکرن و سۆتن و دەرگەهێن پەرتووکخانەیان ژی دائێخستن. هوزانێن خەلیلی، پەژواك، ئەنسارێ، حاجی دیهقان، ئەشراقی، بیتاب، حافز، جامی، نیزامی، ڕۆمی، خەیام، بیدل و گەلەکێن دی هاتنە سۆتن.

لەیلایێ گوهلێبوو کو ئەو زەلامێن ب نەکرنا نڤێژان دهاتنە گونەهبارکرن، ل سەر پشتێ دخشاندنە د مزگەفتان ڤە و پشتی لێدانەکا گران، ب خۆرتی نڤێژ پێ ددانە کرن. هەردیسان وێ گوهلێبوو کو خوارنگەها مارکۆپولو ل نێزیکی جادەیا مریشکان کربوو بنگەهەکێ ڤەکولینێ. هندەك جاران ل پشت وان پەنجەرێن ڕەش دەنگێ ڤێژی و حەواریان دهات.

ل هەموو جهان، کاربەدەستێن ڕیهـ درێژ ب ترۆمبێلێن تویوتا دگەریان و ئەگەر کەسەکێ بێی ڕیهـ دیتبایە، دا گەلەك قووتن و دەرولێڤێن وی تژی خوین کەن. هەردیسان وان سینەما ژی گرتن، سینەما پارك، ئایانا، ئاریوب. هۆلێن وان یێن نمایشکرنێ وێرانکرن و کاسێتێن فلمان ژی سۆتن.

لەیلایێ هزرا خوە د وان وەختان دا دکر دەمێ د وان ژوورێن تارێ دا دگەل تارڤی تەماشەی فلمێن هندی دکر. چیرۆکا وان فلمێن میلودرامی ل سەر وان ئەڤینداران بوون یێن ژبەر هەر ئەگەرەکێ هەی، چارەنڤیسێ وان ژێکڤەبوون بوو، قەدەرێ یەك ژ وان بۆ جهەکێ دوور دهنارت و یا دی ژی دئێخستە داڤێن هەڤژینیەکا ژ نەچاری. ئەو هەموو ڕۆندك ڕێژتن و سترانگوتن دناڤ دەشتێن پڕی گولێن بەهارێ دا و غەریبیا گەهشتنا هەڤدوو. ئەو چەندە هاتە بیرا وێ دەمێ وێ ژبەر دیتنا ڤان دیمەنان دکریە گری و تارڤی ژی ب وێ دکریە کەنی.

ڕۆژەکێ مەریەمێ گوتە لەیلایێ: "ئەز نزانم کا سینەمایا بابێ من چ لێ هاتیە؟ مەرەما من ئەوە خو هەکە سینەما مابیت ژی، تو بێژی هێشتا ئەو خودانێ وێ بیت!"

خارابات، دەڤەرا دێرینا موزیکی ل کابولێ، بێدەنگ ببوو. موزیکژەن هاتبوونە قوتان و زیندانکرن. ئامیرێن وان یێن ڕەباب و تەمبوور و هارمۆنی هاتبوونە شکاندن و تێلێن وان قەتاندبوون. تالێبان چووبوونە سەر گۆڕێ هونەرمەندێ تارڤی یێ خوشتڤی، ئەحمەد زاهیری، و گۆڕێ وی گولەباران کربوو.

" ئەڤە بیست سالە ئەو مری."

لەیلایێ گوتە مەریەمێ: "ئەرێ ما جارەکێ ب تنێ مرن بەس نینە بۆ مرۆڤی."

***

ڕەشید گەلەك ژبەر هاتنا تالێبان یێ بێهن تەنگ نەبوو، چونکی ب تنێ ل سەر وی یا پێدڤی بوو ڕیهێن خوە بەردەت و بۆ نڤێژان ژی بچیتە مزگەفتێ، وی ژی ئەڤ کارە هەردوو دکرن. ڕەشیدی ب چاڤێ دلوڤانی و داخباربوونێ تەماشەی تالێبان دکر، هەروەکو چەوا مرۆڤ سەرەدەریێ دگەل پسمامەکێ خوە دکەت یێ کو بەردەوام ڕەفتارێن ب کەنی و بالکێش دکەت.

ڕەشیدی هەموو شەڤێن چوارشەمبان گوهێ خوە ددا ڕادیویا "دەنگێ شەریعەتی" کو تالێبانێ تێدا ناڤێن وان کەسان دخواند یێن پێدڤی بوو بهێنە سزادان. پاشی ل ڕۆژێن ئەینی ژی دچوو یاریگەها "گازنی" و پێپسیەك بۆ خوە دکری و تەماشەی ڕێورەسمێن سزادانا وان دکر. ب شەڤێ ژی ل سەر جهێن نڤستنێ لەیلا نەچار دکر گوهداریا وی بکەت

داکو بەحسێ هندێ بۆ بکەت کا چەوا دەستێن خەلکی دهاتنە برین، یان ژی ب قامچیان ئەو دقووتان، زێدەباری کەسێن دهاتنە سێدارەدان یان سەرێن وان دهاتنە برین.

ل شەڤێ کو دوکێلا جگارەیێن وی تژی ژوورێ ببوو و ل دور سەرێ وی دزڤری، گوت: "ئەڤرۆ من زەلامەك دیت سەرێ بکوژێ برایێ خوە بری."

لەیلایێ گوت: "ئەڤە درندەنە."

رەشیدی گوت: "تو هۆسا هزر دکەی؟ تو وان ب کێ هەڤبەر دکەی؟ سوڤییەتان یەك ملیون مرۆڤ کوشتن. ئەرێ تو دزانی چەکدارێن موجاهدین د ماوەیێ چوار سالێن بوری دا چەند مرۆڤ کوشتن؟ پێنجی هزار کەس! ب هەڤبەرکرن دگەل برینا دەستێ چەند دزیکەرەکان. ئەرێ ئەڤە تشتەکێ نەبەرئاقلە؟ چاڤ ب چاڤی و ددان ب ددانی، قورئانێ ژی ئەڤ چەندە یا دووپاتکری. ژبلی ڤێ هەموویێ، کا تو بێژە من ئەگەر کەسەك عەزیزایێ بکوژت، ما تو حەزناکەی تۆلا وێ ڤەکەی؟"

لەیلایێ ب ئاورینەکا دلرەشبوونێ ڤە تەماشەی وی کر.

رەشیدی گوت: "ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو نموونە من بۆ تە ئینا."

لەیلایێ گوت: "تو ژی ب هەموو رووپان ڤە وەکو وانی."

"ئەز یێ دبێژم، چاڤێن عەزیزایێ گەلەك دبالکێشن، مانە هۆسایە؟ نە ب من ڤە چوویە و نە ب تەڤە."

رەشیدی تبلا خوە لێدا داکو بەرێ خوە بدەتە وی، نینوکا خوە یا تبلا شەهدێ ل سەر رانێ وێ را ئینا. پاشی گوت: "ئەگەر جارەکێ هاتە سەر هزرا من، ئەز نابێژم دێ وەکەم، بەلکو ب تنێ ئەگەر گێولێ من لێدا. من مافێ هندێ هەیە عەزیزایێ ژ مالا خوە بکەمە دەرێ و پاڤێژمە ژ دەرڤە. ل وی دەمی دێ چ بێژی؟ یان ژی ئەز دشێم رۆژەکێ بچمە دەڤ هێزا تالیبان و سەرەدانا نڤیسینگەها وان بکەم و بێژم کو من گومان ل سەر تە هەیە. تو دزانی کا ئەو دێ ب سانەهی باوەر ژ کێ کەن؟ ئەرێ تە هزرا خوە کریە کا ئەو دێ چ ب سەرێ تە ئینن؟"

لەیلایێ رانێ خوە ژێ دوور کر.

رەشیدی گوت: "من نەگوتیە دێ کارەکێ هۆسا کەم، نەخێر قەت ئەز وەناکەم، باوەرنەکە جارەکێ کارەکێ هۆسا بکەم چونکی تو ب خوە من باش دنیاسی."

لەیلایێ گوت: "تو زەلاٚمەکێ چەپەلی."

"ئەڤە ئاخفتنەکا مەزن بوو تە گوتی."

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە ئەڤ چەندە گوت و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "من هەموو گاڤان کەرب ژ ڤی تشتێ تە ڤەدبن، خو وەختێ هێشتا تو یا بچووك ژی و تە دگەل وی سەقەتی دکریە غارێ. یا ژ تەڤە ژبەر وان پەرتووك و هوزانێن تە خواندین، تو یا زیرەکی. باشە نوکە نیشا من بدە دا بزانم کا ئەو زیرەکی دێ چ مفای گەهینیتە تە؟ ئەرێ چ تشتی تو ژ سەر جادەیان پاراستی؟ زیرەکیا تە یان ژی من؟ ئەرێ ئەز یێ چەپەلم؟ نیڤەکا ژنێن ڤی باژێری دبەرهەڤن کوشتنێ بکەن ب تنێ دا زەلاٚمەکێ وەکو من بدەست وان بکەڤیت، ئامادەنە کوشتنێ بکەن."

پاشی کەفتە سەر پشتێ و دووکێلا جگارەیا خوە بەرەڤ بانی بلند کر، گوت: "تو حەز ژ ئاخفتنێن مەزن دکەی؟ دا ئەز ژی ڤی تشتی بێژمە تە: پێشبینیێ بکە. نوکە ئەز دێ وەکەم لەیلا. ئەز یێ پشتڕاستم توژی پێشبینیان پشتگوهـ ناهاڤێژی."

ئەو تشتێ بوویە ئەگەر هەتا سپێدێ زکێ لەیلایێ قورقورێ بکەت، ئەوبوو کو ئەو پەیڤێن ڕەشیدی گوتین، هەموو ڕاست بوون. لێ دنیا بۆ سپێدە و هەتا چەند سپێدەهیێن ل دووڤ دا ژی ئەو قورقورا زکێ وێ و دلڕابوون هەر یا بەردەوام بوو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ خراپتر لێ دهات هەتا بوویە ڕەوشەکا مەترسیدار.

***

ب ماوەیەکێ کێم پشتی هینگێ، ل ڕۆژەکا پشتی نیڤرۆ کو دنیا گەلەك یا سار بوو، لەیلا ل سەر ئەردی د ژوورا خوە یا نڤستێ ڤە یا ڕازای بوو. مەریەم ژی دگەل عەزیزایێ د ژوورا خوە ڤە نڤست بوون. لەیلایێ شیشکەکا تائیرا پایسکلەکێ د دەستان دابوو کو ب پلائیسی ژ پایسکلەکا هاڤێتی ل سەر جادەیێ ڤەکربوو. ئەو پایسکل د هەمان وێ کولانێ دا هاتبوو هاڤێتن یا چەند سالان بەری نوکە تارقی ئەو تێدا ماچی کری. لەیلا بۆ ماوەیەکێ درێژ ب وی شێوەی ما و پێن خو کربوونە تێکدا و بایێ دناڤبەرا ددانێن خوە دا دهەلکێشا.

هەر ژ وێ ڕۆژا لەیلایێ هەست ب هەبوونا عەزیزایێ کری، گەلەك حەز ژێ دکر. ل وێ ڕۆژێ وەرە چ گومان ل سەر ڤێ چەندێ نەبوو. د دلێ خوە دا گوت ئەرێ چەند کارەساتەکا مەزنە کو دایکەك ژ هندێ بترسیت حەز ژ زارۆکێ خوە نەکەت، ب ڕاستی ژی

تشتەکێ نەئاسای یە. هێشتا ئەو ل سەر پشتێ یا ڕازای بوو، دەستێ خوە یێ ب خوە ژی درێژکربوو تاکو ئاڕاستەیێ شیشکێ ب دروستاهی دیار بکەت.

پرسیار ژ خوە کر: "ئەرێ ئەو دێ شێت گەلەك حەز ژ زارۆکێ ڕەشیدی کەت وەکو وێ حەز ژ زارۆکا تارڤی کری.

ل دوماهییێ لەیلا نەشیا چ کارێن هۆسا بکەت کو ئەو زارۆکی نوکە دناڤ هناڤێن وێ دا پەیدابووی، ژبەر خوە ببەت. هەلبەت ترسا وێ ژبەر هندێ نەبوو کو ئەو تووشی خوینبەربوونێ بیت هەتا ئەو زارۆکێ د زکێ وێ دا دمریت، یان ژی چونکی ئەو چەندە کارەکێ نەفرەت لێکری یە.

لەیلاییێ شیشك هاڤێت و ژ بڕیارا خوە لێڤەبوو، چونکی وێ نەدڤیا بوچوونا چەکدارێن موجاهدینان پشتڕاست بکەت دەمێ دگوتی جارێن هۆسا هەنە مرۆڤ نەچار دبیت د شەڕی دا مرۆڤێن بێگونەهـ ژی بکوژیت. نوکە شەڕێ وێ ژی دگەل ڕەشیدی یە، دناڤبەرا وان هەردووان دا، سوریلانکێ د زکێ وێ دا چ گونەها خوە نینە. ب ڕاستی ژی گەلەك خەلك هاتبوونە کوشتن. د شەڕێ دناڤبەرا دوژمنان دا، وێ هژمارەکا مەزن یا خەلکێ بێگونەهـ دیتبوون کو هاتبوونە کوشتن.

# 39

## مەریەم .چریا یەکێ 1997

زێرەڤانێ ل بەر دەرگەهێ نەخوشخانێ کرە قێری: "ئێدی ئەڤ نەخوشخانە چ ژنێن دی وەرناگریت."

ئەو زێرەڤان ل سەر دەرەجکان یێ ڕاوەستای بوو و ب ئاورینەکا سارڕ تەماشەی وێ حەشامەتا خەلکی دکر یێن ل بەر دەرگەهێ نەخوشخانەیا "مەلالای" خڕڤەبووین.

هێدی هێدی قەرەبالغ ژ وی خەلکی بلند بوو.

ژنەك ل پشت مەریەمێ یا ڕاوەستای بوو، کرە هەوار: "بەلێ ئەڤە نەخوشخانەیا ژنانە!"

خەلکێ دی هەموویێ دووپاتی ل سەر ئاخفتنا وێ کر. مەریەمێ عەزیزا ب دەستەکی گرتبوو و دەستێ دی ژی دانابوو بن ملێ لەیلایێ کو وێ ژ بنێ پیان دکرە قێژی. دەستێ دی یێ لەیلایێ ژی ل سەر ملێ ڕەشیدی بوو.

زێرەڤانێ سەر ب تالێبان ڤە گوت: "ئێدی زێدەتر نەخوشان وەرناگریت."

زەلامەکێ ب خوە ڤە گوت: "ها وەختە هەڤژینا من دێ زارۆکەك بیت. تە دڤێت ئەو ل سەر جادەیێ زارۆکێ خوە بدانیت، برا؟"

ل هەیڤا کانینا دووێ یا وێ سالێ، مەریەمێ ئەو پەیاما دەولەتێ گوهلێبوو یا دگوتی پێدڤیە هەموو نەخوشخانەیێن ژن و مێران بهێنە ژێکجووداکرن و هەموو ئەو کاربەدەستێن ژن یێن ل نەخوشخانەیا کابولێ کاردکەن بهێنە ڕەوانەکرن بۆ یەك نەخوشخانێ. کەسێ باوەر ژ وێ چەندێ نەدکر و هەتا وی دەمی ژی تالێبانێ ب سەرڤە سەرڤە چاڤێ خوە ل وێ بڕیارێ نقاندبوو.

کابرایەکێ دی کرە قێری: "ئەرێ پا نەخوشخانەیا عەلی ئاباد؟"

زێرەڤانی سەرێ خوە ب نیشانا نەخێر هەژاند.

"ئەرێ پا نەخوشخانەیا وەزیر ئەکبەرخان؟"

"ئەو ژی بەس بۆ زەلامانە؟"

"ئەرێ پا ئەم چ بکەین؟"

زێرەڤانی گوت: "هەرنە نەخوشخانەیا ڕابیە بەلخی."

ژنەکا گەنج هاتە پێش و گوت ئەو بەری نوکە یا چوویە وێرێ. پاشی گوت: "نە ئاڤا پاقژ ل وێرێ هەیە و نە ئوکسجین. هەتا دەرمان و کارەب ژی لێ نینن، خو تشتەك لێ نینە."

زێرەڤانێ گوت: "پێدڤیە هوون بچنە وێرێ."

هێدی هێدی دەنگێ قەرەبالغ و خەپسا خەلکی بلند بوو، یەك دوو کەسان ئاخفتنێن کرێت گوتن و کەسەکێ دی ژی بەر د زێرەڤانی وەرکرن.

وی زێرەڤانێ تالێبان دەستێ خوە هاڤێتە کلاشینکوفا خوە و ڕێزەکا فیشەکان ل سەر سەرێ وان ڕا هاڤێت. یەکێ دی ژی قامچیەك هەلگرت و د وان وەرکر و هۆسا ئەو حەشامەت تەڕا و بەڕا کر.

***

هۆلا پێشوازیێ یا نەخوشخانەیا ڕابیە بەلخی یا پڕ بوو ژ ژنێن بورکە کرینە بەر خوە و زارۆکێن وان د ملێن وان. بایێ هۆلێ بێهنا خوها لەشی و بێهنا پێن خەلکی و میز و دووکێلا جگاران و کەرەستەیێن پاقژکرنێ ژێ دهات. ل بن وێ پانکا ڤەمراندی و ب بانی ڤە هەلاویستی، زارۆکان ل دووڤ هەڤدوو دکرە غار و خوە ل سەر پێن بابێن خوە یێن درێژ کری و نڤستی ڕا دهاڤێت.

مەریەمێ هاریکاریا لەیلایێ کر هەتا پالا خوە دایە دیوارەکی کو پارچەیێن وی هاتبوونە ڤەوراندن و نەخشەیێ وەلاتێن جیهانێ ل سەر هاتبوو کێشان. لەیلا بەرەڤ پێشڤە و پاشڤە دهات و ب هێز دەستێ خوە دانابوو سەر زکێ خوە.

"نوکە ئەز دێ کارەکێ هۆسا کەم ئەو تە ببینن، لەیلا جان. سوزێ د دەمە تە."

ڕەشیدی گوت: "لەزێ بکە."

کومەکا ژنان ل بەر پەنجەرا برینا پلێتان ڕاوەستیابوون و هەڤدوو پالددا. هندەك ژ وان هێشتا زارۆکێن خوە ل بەر ملێ خوە دانابوون و هندەکێن دی ژی هەڤدوو پالددا و

پێکڤە هێرش کرە سەر دەرگەهێ ژوورا چارەسەرکرنێ. لێ تالیبانەکی رێکا وان گرت و هەمموو بۆ پشتێ پالدانەڤە.

مەریەمێ ب خورتی خوە هاڤێتە دناڤ وێ کوما ژنان دا، کەفتە دناڤ ئەنیشك و چوك و ران و ملێن وان ژنان دا. ژنەکێ ئەنیشکەك ل پەراسیا وێ دا و وێ ژی هەمان کار دگەل کر. دەستەك نێزیکی وێ بوو پیچەك مابوو ب ناڤچاڤێن وێ بکەڤیت، لێ ئەو شیا پالەکێ لێ بدەت و وی دەستی ژ خوە دوور بکەت.

داکو بشێت بچیتە پێشیێ، مەریەمێ پێن خوە ل سەر ئەردی شداندن و کەفتە دناڤ ژنان دا، ژنەکێ دڤیا وێ بگریت و بێدەنگ بکەت لێ مەریەم شیا خوە ژ دەستێن وێ بینتە دەرێ و ژ خوە دوور بکەت.

ژ نوو مەریەم د هندێ گەهشت کا هەتا چ رادە گیانێ قوربانیدانێ ل دەڤ دایکێ ژ بۆ زارۆکێ وێ هەیە. ژ دەستدانا جوانیا خوە یەك بوو ژ وان قوربانیدانان. ب خەمگینی ڤە نانا هاتە بیرا وێ کا چەوا خوە گوری وێ کربوو. نانا دشیا وێ ژبەر خوە ببەت یان بکوژیت و پاڤێژتە د چالەکێ دا و خوە ژێ رزگار بکەت لێ وێ ئەڤ چەندە نەکر. بەلکو ل شوونا هندێ وێ شیا خوە ل بەر هەمموو وێ شەرمزاریێ بگریت و کچەکا بیژی بینتە سەر دنیاییێ. ژیانا خوە گوری مەریەمێ کر و ژ بۆ خزمەتکرنا وێ بێی بەرامبەر تەرخان کر. ل دووڤ دلێ خوە وێ گەلەك حەز ژ مەریەمێ دکر، لێ مخابن دوماهیێ ل شوونا ڤێ قوربانیدانێ هەموویێ، مەریەمێ جەلیل هەلبژارت.

دەمێ وێ خوە دناڤ وێ حەشامەتا ژنان دا رێکا خوە دکری، هیڤی دخواست کو ئەڤ رەوشا نوکە کەفتینێ، ل سەر دەمێ خوە نانا نەکەفتبیتە د رەوشەکا هۆسا دا. هیڤی دخواست کا چەوا ئەو نوکە د هەستا دایکینیێ دگەهیت، ئەو هینگێ ژی تێگەهشتبایە.

ل دوماهیێ ئەو کەفتە بەر سینگێ پەرستیارەکێ کو ژ سەری هەتا بنێ پێ خوە ب بورکەیەکێ رەنگ گەور یێ پیس نخافتبوو. وێ پەرستارێ دگەل ژنەکا گەنج دئاخفت کو چیکەکا خوینێ ب سەرێ وێ ڤە بوو،

مەریەمێ گوت: "ئاڤا سەرێ کچا من یا پەڤی و زارۆکێ وێ دەرناکەڤیت*."

---

* مەرەما وێ ئەو بوو کو ژنێن لەیلایێ یێن زارۆکبوونێ یێن دژوار بووین.

وێ ژنا چپکەکا خوینێ ب سەرێ وێ ڤە گوتێ: "ما تو نابینی ئەز یا دگەل دئاخفم. چاڤەڕێی بە هەتا گەڕا تە دهێت."

ئەو کوما ژنان جار بۆ ڤی لایی و جار بۆ لایێ دی دهاتن و چوون هەروەکو لڤینا وی گیایێ ل بەر دەرگەهێ کولبەیێ مالا وان ل هیڕاتێ ب تایبەت ل وی دەمێ با ل سەر گیایێ دناڤ حەوشا وان یا بەردای ددای.

ژنەکێ ل پشت مەریەمێ کرە هەوار کو کچا وێ ل سەر دارەکێ یا کەفتی و ئەنیشکا وێ یا شکەستی. ژنەکا دی ژی گازندە دکرن کو خوین دگەل دەستنڤێژا وێ دەردکەڤیت.

پەرستارێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تا دهێنێ؟"

بێهنەك پێڤەچوو ژ نوو مەریەمێ زانی کو پەرستار یا دگەل وێ دئاخفیت.

"نەخێر."

"تووشی خوینبەربوونێ بوویە؟"

"نەخێر."

"باشە ل کیڤەیە؟"

مەریەمێ ل سەر سەرێ وێ کوما ژنان دەستێ خوە بلند کر و ئەو جهـ نیشا دا یێ لەیلا و ڕەشید لێ ڕوونشتینە خوارێ. پەرستارێ گوت: "باشە پاشی دێ گازی وێ کەین."

مەریەمێ کرە قێری: "کەنگی؟"

کەسەکێ ملێ وێ گرت و بەرەڤ پشتێ ڤە پاڵدا.

پەرستارێ گوت: "ئەز نزانم، ب تنێ مە دوو نوشدار هەنە و نوکەژی هەردوو مژوولی ئەنجامدانا نشتەگەریانە."

مەریەمێ گوت: "بەلێ زانێن وێ یێن دژوار بووین."

وێ ژنا خوین ب سەرێ وێ ڤە گوت: "سەرێ من ژی یێ دئێشیت. خوە بگرە هەتا گەڕا تە دهێت."

مەریەمێ هند دیت ئەو ژ پشتێ هاتە پاڵدان، ئێدی ژبەر پشت و مل و سەرێن ژنان، پەرستار ل پێشچاڤێن وێ بەرزەبوو. بێهنا دلڕابوونا زارۆکێن ساڤا و شیرێ ژ دەڤێ وان درێژتی دهاتە دفنێن وێ.

پەرستارێ دیسان ب دەنگەکێ بلند گوتێ: "وێ ببە پیاسەکێ و خوە ل هیڤیا مە بگرە هەتا گازی وێ دکەین."

***

دنیا تارى ببوو دەمێ پەرستارێ گازی مەریەمێ کری. د هۆلا زارۆکبوونێ ڤە ب تنێ هەشت تەخت هەبوون و هەر تەختەکی ژی ژنەکا دووگیان ل سەر یا درێژکری بوو و هەموویان ژبەر ژانێن گران یێن زارۆکبوونێ دکرە قێری و هەوار و پەرستارێن بورکە ل بەری ژی ل دوماندوری وان خرڤەببوون.

دەمێ زارۆك دانانا دوو ژنان نێزیك بوو، چ پەردە ژی دناڤبەرا تەخێن وان دا نەبوون. ل سەرێ وێ هۆلێ تەختەکێ ڤالا کو ل بەر پەنجەرێ هەبوون گوتە مەریەمێ ئەڤ تەختە بۆ نەخوشا هەوەیە. ئەو پەنجەر ب بۆیاغەکا ڕەش هاتبوو ڕەنگکرن و دەرزەك تێدا هەبوو، هەردیسان ب پارچەیەکا قوماشی هاتبوو نخافتن و پاشماییێن دەستلێدانێ یێن ب خوین و پیس ل سەر هەبوون.

مەریەمێ مێزەکا ئەلەمنیومی ژی ل نیڤەکا وێ هۆلێ دیت کو پاتەیەکێ ڕەنگ گەور ل سەر هاتبوو دانان و بنێ وێ یێ ڤالا بوو. دەمێ ژنەکێ دیتی مەریەم یا تەماشەی وێ مێزێ دکەت، گوت: "مرۆڤێن زیندی ددانە سەر وێ مێزێ."

نوشدارێ ژی بورکەیەکێ ڕەنگ شینێ تارى کربوو بەر خوە. ژنەکا هوور و بلەز و بەز بوو، لڤینێن وێ وەکو یێن باڵندەیان بوون و هۆسا دیاربوو هەموو تشت بلەز ئەنجامددان.

نوشدارێ گوت: "دیارە ئەڤە زارۆکێ وێ یێ یەکێ یە."

"نەخێر، یێ دووێ یە."

لەیلایێ دەست ب ئاخ و ناڵینان کر و کەفتە سەر لایەکی، تبلێن دەستێ وێ دناڤ تبلێن دەستێ مەریەمێ دا بوون.

"دەمێ زارۆکێ خوە یێ یەکێ داناى، چ ئاریشە نەبوون؟"

"نەخێر."

"ئەرێ تو ژی دایکی؟"

مەریەمێ بەرسڤ دا و گوت: "بەلێ."

نوشدارێ نیڤا خوارێ یا بورکەیێ خوە لادا و ئامرازەکێ کانزایی یێ وەکو کوفکان ئینا دەرێ و پاشی بورکەیێ لەیلایێ ڕاکر و سەرێ پەحن یێ وی کوفکێ ئیخستە سەر سینگێ لەیلایێ و گوهێ خوە دانا سەر لایێ وی یێ زراڤ و نێزیکی خولەکەکێ گوهێ خوە دا لێدانێن دلێ وێ، پاشی ئەو ئامیرە دانا سەر هندەك بەشێن دی یێن زکێ وێ و گوهێ خوە ب سەرێ وی ڤەنا.

"نوکە ئەز هەست ب سۆریلانکێ د زکێ تە دا دکەم، خوشکێ."

جووتەکێ دەستگورکێن هەلاویستی ل سەر ڕستەیا جلکان، ئەوا ل هنداڤ دەستشوویێ، ئینانە خوارێ و کرنە دەستێن خوە و پاشی ب دەستەکی فشار دئێخستە سەر زکێ لەیلایێ و دەستێ دی ژی برە دناڤ لەشێ وێ دا. دەمێ نوشدار ب دوماهی هاتی، دەستگورك داڤ پەرستارەکێ و وێ ژی دناڤ ئاڤەکێ دا شووشت و دووبارە ب ڕستێ ڤە هەلاویستەڤە.

"کچا تە پێدڤی ب نشتەگەرییەکا قەیسەری یە، ئەرێ تو دزانی مەرەما من چیە؟ دڤێت ئەم زکێ وێ شەق کەین و ڕەحمێ وێ ڤەکەین و پاشی زارۆکی ژێ بینە دەرێ، چونکی پێن وی یێن ل لایێ خوارێ و ب ڕێکا سروشتی نەشێت بهێتە دەرێ."

مەریەمێ گوت: "ئەز مەرەما تە تێناگەهەم."

نوشدارێ بۆ شرۆڤەکر کو سۆریلانکێ وێ یێ د ڕەوشەکا هۆسا دا نەشێت ب دروستاهی دەرکەڤیت و دەمەکێ درێژ ل سەر وەختێ دانانا زارۆکی یێ بوری، ژبەر هندێ پێدڤیە هەر نوکە ببەنە د ژوورا نشتەگەریێ ڤە.

لەیلایێ ب دیمەکێ خەمگین ڤە سەرێ خوە هەژاند و بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا.

نوشدارێ گوت: "تشتەکێ گرنگ هەیە دڤێت بێژمە تە."

خوە نێزیکی مەریەمێ کر و چوو بن گوهێ وێ و ب دەنگەکێ ئارام و دبن لێڤکان ڕا دگەل ئاخفت. شوونوارێن ژ خوە شەرمکرنێ د تونا دەنگێ وێ دا ددیاربوون.  لەیلایێ ب خەمگینی ڤە گوت: "تو چ دبێژی. ما زارۆکی ئاریشەیەك هەیە؟"

مەریەمێ گوتە نوشدارێ: "بەلێ ئەو چەوا دێ خوە ل بەر ئێشانێ گریت."

ب کرنا ڤێ پرسیارێ، نوشدارێ هەست ب جورە تاوانبارکرنەکێ کر، ژبەر هندێ تونا دەنگێ خوە گوهاڕت هەروەکو وێ ژی دڤیا بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت.

"تو هزردکەی من ژی ب ڤێ چەندێ خوشە؟ تو چاڤەڕێی موعجیزەیەکێ ژ من دەرکەڤیت؟ ئەو تشتێن ئەز پێدڤی دبمێ بۆ من نائینن. نە مە تیشکا ئیکس و نە مێژووك و نە ئوکسجین هەنە. هەتا دەرمانێن ئەنتی بایوتیك یێن سادە ژی مە نینن. دەمێ ڕێکخراوێن نەحکومی پارەیان پێشکێشی نەخوشخانەیان دکەن، تالێبان وی پارەی وەرناگرن یان ژی ل وان جهان د مەزێخن یێن تایبەت ب زەلاّمان ڤە."

مەریەمێ پرسیار کر: "باشە نوشدارا بەڕێز، ما تە چ تشت نینە بدەییێ؟"

لەیلایێ ب گری و ژان ڤە گوت" چ چێبوویە دادێ؟"

"هوون ب خوە دشێن دەرمانی بکرن، بەلێ پا..."

مەریەمێ گوت: "ناڤێ دەرمانی بنڤیسە، ئەز دێ نوکە چم بۆ پەیداکەم."

نوشدارێ دبن پێچەیێ ڤە سەرێ خوە هەژاند.

"مە دەم نینە، دەرمانخانەیێن دەوروبەری ڤێرێ هەموویان ئەو دەرمان نینە. ژبەر هندێ پێدڤیە تو بچیە دناڤ قەرەبالغا دناڤ بازاڕی دا و ل ڤی لایی و لایێ دی بگەری و ڕەنگە ل دوماهیێ ل بازێری هەموویێ بگەڕی و هەر دەرمان ب دەست تە نەکەڤیت. نوکە دەمژمێر هەشت و نیڤە و ڕەنگە ب هێجەتا قەدەغەکرنا هاتنوچوونێ تە دەستگیر بکەن. ئەگەر دەرمان دەست ب تە بکەڤیت ژی ڕەنگە تە پارەیێ وی نەبیت یان د هەمان دەم دا کەسەکا دی یا وەکو تە پێدڤی بهێتە وێرێ و پارەیەکێ زێدەتر پێ بدەت و ل وێرێ ببیتە شەڕێ هەوە. نوکە دەمێ مە گەلەك یێ کێمە و پێدڤیە هەر نوکە ئەو زارۆك بهێتە سەر دنیایێ."

لەیلا نەچار بوو بکەڤیتە سەر ئەنیشکێن خوە پیچەکێ خوە بلند بکەت، گوت: "بێژنە من چ چێبوویە؟"

نوشدارێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوتێ دەرمانێ بێهوشکرنێ "بەنجێ" ل نەخوشخانەیا وان نەمایە.

"ئەگەر ئەم گیروبین ژی، زارۆکێ تە دێ گیانێ خوە ژدەستدەت."

لەیلایێ گوت: "باشە نشتەگەریێ بۆ من بکەن."

پاشی دووبارە خوە ل سەر تەختی درێژ کر و دەستێ خوە دانانە سەر سینگێ خوە و گوت: "هەر نوکە نشتەگەریێ بۆ من بکەن و زارۆکێ من بدەنەڤ من."

***

د ژوورا نشتەگەریێ یا کەڤن و بێسەروبەر ڤە، لەیلا ل سەر تەختێ نشتەگەریان یا درێژ کری بوو، نوشدارێ ژی دەستێن خوە د دەستشوویێ دا شووشتن. لەیلا ژ ترسان دا دلەرزی. هەر دەمێ پەرستارێ ب پارچەیەکا قوماشێ تەرکری ب ئاڤەکا رەنگ زەر بۆ سەر قەهوای ڤەبی ڤە زکێ وێ پاقژ دکری، لەیلایێ کوور بێهنا خوە دهەلکێشا. پەرستارەکا دی ژی ل بەر دەرگەهی یا ڕاوەستای بوو و پیچەکێ دەرگەهـ هێلابوو ڤەکری داکو بشێت ژ دەرڤە ببینیت.

نوشدارێ بۆرکە ل سەر سەرێ خوە ڕاکر، مەریەمێ دیت پرچا وێ یا سپی بووی و مژیلانکێن وێ ژی یێن کەفتین و هەردوو ڕەخێن دەڤێ وێ ژی ژبەر واستیانێ یێن قورمچین.

"وان دڤێت ئەم نشتەگەریان ب بورکەڤە ئەنجام بدەین."

نوشدارێ ئەڤ چەندە بۆ مەریەمێ دیارکر و پاشی ئاماژە کرە ئەو پەرستارا ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیای و گوت: "ئەو دێ چاڤدێریا مە کەت، ئەگەر کەسەك هات ئەز دێ یەکسەر بورکەی دانمە سەر سەروچاڤێن خوە."

وێ ئەڤ چەندە ب شێوەیەکێ کرداری و تا ڕادەیەکی گرنگی پێنەدان ڤە دگوت، مەریەمێ دزانی کو ئەڤ نوشدارە ژ قوناغا تۆڕەبوونێ ژی یا بوری، ژبەر هندێ ژ نوو تۆڕە نابیت. مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت: ب ڕاستی ژی ئەڤ ژنە تێدگەهیت و دزانیت ئەو یا بەختەوەرە چونکی ماف هەیە کاربکەت، ل ڤێرێ تشتەك هەیە، تشتەکێ زێدە جودایە و ئەو قەت نەشێن ژێ وەربگرن یان ببنە ڕێگر ل هەمبەر کارکرنا وێ.

دوو شیشکێن ئاسنی ل سەر شێوێ ستوونان ل هەردوو ڕەخێن ملێن لەیلایێ بوون دگەل حەلاقەیەکا جلك هەلاویستنێ. ئەو پەرستارا زکێ لەیلایێ ژی پاقژ دکری، ئەو پاتەیێ ل سەر هەردوو شیشکان ڤەدا و هۆسا پەردەیەك دناڤبەرا نوشدارێ و لەیلایێ دا دروستبوو.

مەریەم ل سەر سەرێ لەیلایێ ڕاوەستیا و سەرێ خوە خوار کر داکو بەرێ وێ بکەڤیتە سەروچاڤێن لەیلایێ. ددانێن لەیلایێ بلەز ل سەر یەك دشدیان و وان هەردووان دەستێن خوە کرنە تێکدا و ب هێز گڤاشتن.

مەریەمێ ل پشت پەردێ ددیت کو سیبەرا نوشدارێ دکەڤیتە لایێ چەپێ یێ لەیلایێ و پەرستار ژی یا ل لایێ وێ یێ ڕاستێ. لێڤێن لەیلایێ هاتبوونە کێشان و کەف ب سەر دەڤ و ددانێن وێ دکەفت و پاشی پەڤیشکێن کەفێ ل سەر ددانێن وێ دپەقین. گێز گێزەکا بلەز و پرت پتر ژ دەڤێ وێ دەردکەفت.

نوشدارێ گوت: "خوە ڕابگرە خوشکا من یا بچووك."

پاشی وێ خوە بو لایێ لەیلایێ خوار کر.

چاڤێن لەیلایێ ڤەبوون و پاشی دەڤێ وێ ژی ڤەبوو. ئەو ب ڤی ڕەنگی ما و بەردەوام دلەرزی. دەمارێن گەوریا وێ درێژ بوون و چپکێن خوهێ ل سەر دێمێ وێ دهاتنە خوارێ و تبلێن وێ دناڤ تبلێن مەریەمێ دا چووبوونە خوارێ.

ب درێژاهیا وێ دەمێ کو بەری لەیلا دەست ب ڤێژیان بکەت، مەریەمێ بەردەوام دەستخوشی و ئافەرین ل وێ دکرن ژبەر خوە ڕاگریا وێ.

# 40

## لەیلا، پائیزا 1999

ئەو چەندە هزرا مەریەمێ بوو کو بیرەکێ دناڤ مالا خوە دا بکۆلن. ل سپێدەهیەکێ، وێ دەستێ خوە بۆ جهەکی ل پشت کۆگەها دناڤ حەوشێ دا درێژ کر و گوت: "ئەم دشێن ل ڤێرێ بیرێ بکۆلین، ئەڤە جهەکێ باشە."

وان دەست هاڤێتە مەرپێلکێ و هەر بێهنەکێ یەك ژ وان ئەرد دکۆلا. دگەل هەر لێدانەکا مەرپێلکێ، وان ئاخ دهاڤێتە لایەکێ. وان ل بەر نەبوو بیرەکا مەزن یان گەلەك کوور بکۆلن، ژبەر هندێ وان هزردکر کارێ کۆلانێ هند یێ ب زەحمەت نینە و ل سەر وان یا پێدڤی نینە گەلەك وەختی بمەزێخن.

ل سالا 1998ێ، هشکەسالیێ ل وەلاتێ ئەڤغانستانێ دەستپێکربوو. ئەڤە سالا دووێ یە ئەڤ هشکەسالیە بەردەوام بووی و دگەل خوە وێرانی و نەخوشی ل هەموو جهان بەلاڤ کری. ل زڤستانا بوری ڕێژەیەکا کێم یا بەفرێ باری بوو و ل بهارێ ژی هەما ب یەکجاری باران نەباری بوو. ژبەر هندێ ل سەرانسەری وەلاتی جوتیاران زەڤیێن خوە یێن چاندنێ بجهـ هێلان و هندی تشتەکێ هەی فرۆت و ژ ڤی گوندی دچوونە یێ دی و ل دووڤ ئاڤێ دگەریان. هندەك چوونە پاکستانێ و هندەك ژی چوونە ئیرانێ و یێن دی ژی هاتنە کابولێ.

ئاڤا بن ئەردی یا کابولێ ژی ل کێمیێ دابوو، ئەو بیرێن گەلەك نە د کوور، هەموو هشك ببوون. ل سەر بیرێن کوور ژی خەلکی سرایێن درێژ ب ڕێزکربوون. ل سەر مەریەمێ و لەیلایێ یا پێدڤی بوو چەندین دەمژمێران خوە ل سرایێ بگرن هەتا گەرا وان دهێت و پیچەکا ئاڤێ ب دەست وان دکەڤیت.

ڕووبارێ کابولێ ژی ئێدی ژ لەهیێن سالانە یێن بهارێ بێبەش ببوو، نوکە ب تەمامی یێ هشك بووی، ئێدی ببوو جهێ دەستئاڤەکا گشتی و ژبلی پیساتی و ئاخێ و گلێشی، چ تشتێ دی تێدا نەبوو.

وان بەردەوام مەڕبێلك ل ئەردی ددان، لێ ژبەر تیشکا ڕۆژێ یا دژوار کو ئەرد هەموو سۆتاندبوو، ئێدی ئاخا وێ هۆسا هشك ببوو دا بێژی کەڤرێن بەرانە، ژبەر هندێ ب سانەهی نەدهاتە کولان.

نوکە ژیێ مەریەمێ گەهشتبوو چل سالان، پرچا وێ خەلەك ببوو و کەفتبوو سەر چاڤێن وێ و چەندین موویێن سپی ژی کەفتبوونە دناڤ پرچا وێ دا و هژمارەکا هێلێن قورمچینێ یێن وەکو کڤانان ل بن چاڤێن وێ دروست ببوون. هەروەسا دوو ددانێن وێ یێن دەستپێکێ ژی کەفتبوون: یەك ژ وان بەری هینگێ کەفتبوو، یەك ژی ڕەشیدی لێ شکاندبوو دەمێ ب هێجەتا هندێ بوکسەك ل دەڤێ وێ دای کو وێ "زەلەمای" ژ قەستا یێ ل ئەردی دای. مەریەم هند دناڤ حەوشێ دا ل بەر هەتاڤێ ڕوونشتبوو خوارێ، پیستێ سەروچاڤێن وێ هەموو سۆت بوو.

پشتی ژ کۆلانێ واستایی، ل سەر ئەردی ڕوونشت و تەماشەی زەلەمانی دکر دەمێ ب دووڤ عەزیزایێ ڤە دکریە غارێ.

پشتی ئەو ب دوماهی هاتین و بیرەکا بچووك کۆلای، ل سەرێ وێ ڕاوەستیان و تەماشەی کووراتیا وێ کر. لەیلایێ گوت: "نوکە ئەڤە یا باشە."

★★★

نوکە ژیێ زەلەمای ببوونە دوو سال. ئەو زارۆکەکێ قەلەو پرچ خەلەك بوو. چاڤێن وی د بچووك و ڕەنگ قەهوای یێ تاری بوون و لامێن وی ژی وەکو یێن ڕەشیدی د سۆر بوون. هێلا پرچا نیڤەکا سەرێ وی ژی دابوو ب یا ڕەشیدی ڤە. هەروەسا بریێن وی ژی وەکو یێن بابێ وی د بوش و ل سەر شێوێ کڤانێ بوون.

دەمێ لەیلا ب تنێ مایە دگەل زەلەمای، زارۆکەکێ ب ئاقل و خوشتڤی بوو ڕەفتارێن وی ژی د جوان بوون. وی حەز ل کرنا یاریان دکر. حەز دکر بچیتە قلیدانکێن لەیلایێ و دگەل وێ و عەزیزایێ دناڤ حەوشێ دا یاریا خوە ڤەشارتنێ بکەن.

دەمێ د واستایی ژی، حەزدکر ل سەر پێن لەیلایێ ب ڕوونتە خوارێ و لەیلا بۆ وی سترانان بێژیت. سترانا وی یا خوشتڤی، سترانا "مەلا موحەمەد جان" بوو. دەمێ لەیلایێ دەڤێ خوە دئێخستە سەر پرچا وی یا خەلەك و ستران بۆ دگوتن، وی پێن خوە یێن بچووك و نازك دلەیزاندن. هندەك جاران وی ژی ل دووڤ لەیلایێ ڕا ب دەنگێ خوە یێ زڤر هندەك پەیڤ دگوتن یێن دزانین.

*وەرە دا بچینە مەزاری، مەلا موحەمەد جان*

*بۆ دیتنا باخچەیێن گولێن تولیب، ئەی هەڤال گیان**

لەیلایێ گەلەك حەز ژ ماچێن تەر یێن لێڤێن زەلەمای دکر دەمێ ل ڕوویێ وێ ددان، هەردیسان حەز ژ غەمازەیێن سەر ئاڵەکێن وی و تبلێن پێن وی یێن ب هێز دکر، زێدەباری هندێ دەمێ قلیدانکێن وی ڤەدکرین. مەریەمێ بۆ وی بالیفك ددانانە سەر یەك و تونێلەك ژێ دروست دکر داکو خوە دبن ڕا بخشینیت و زێرەڤانیا ڕەوشا وی دکر دەمێ د بەر ملێ وێ د خەو دچووی و بەردەوام دەستەکێ خوە دهاڤێتیە گوهێ وێ.

مەریەمێ هەست ب دلڕابوونێ دکر هەردەمێ هزرا خوە د وێ ڕۆژێ دا کربایە دەمێ کو ل سەر ئەردی خوە درێژ کری و شیشکا تائیرا پایسکلێ د دەستێ وێ دا و دانایە ناڤ ڕانێن خوە و بزاڤ دکر وی ژبەر خوە ببەت، ئەو گەلەك نێزیك بوو ڤێ چەندێ بکەت. نوکە ئەو ب چ ڕەنگان باوەر ناکەت کا چەوا هینگێ وێ هزرێ خوە سەرێ وێ دابوو، ژبەر هندێ نوکە ڤەت یا ئامادە نینە کارەکێ هۆسا یان هەتا هزرەکا هۆسا بکەت.

ب ڕاستی ژی هەبوونا زارۆکان نیعمەتەکا مەزنە، نوکە لەیلا هەست ب بێهنفرەهیێ دکەت پشتی کو زانی چ بنیات بۆ ترسا وێ ژ ئینانا زارۆکان نینە. ئەو ژ نیڤا دلێ خوە حەز ژ زەلەمای دکەت هەروەکو کا چەوا حەز ژ عەزیزایێ دکەت.

لێ تشتێ نەخوش ئەوبوو زەلەمای پتر یێ ب بابێ خوە ڤە گرێدایی بوو. ڕەشید ژی گەلەك ب وی ڤە هاتبوو گرێدان، هەر دەمێ دهاتە مال یەکسەر خوە د بابێ خوە وەردکر.

* تێکستا ڤێ سترانێ ب زمانێ ئەفغانی ب ڤی شێوەیە:

بیا که بریم به مزار ملا ممد جان

سیل گل لاله زار وا وا دلبر جان

بۆ زانین هونەرمەند (سامی یوسف) هەمان ئاوازا ڤێ سترانێ بۆ سترانا خوە ب ناڤێ (حسبی ربی) بکارئینایە.

پشتی هینگێ ڕەفتارێن زەلەمای هێدی هێدی دهاتنە گوهورین، ئێدی بلەز قەرەبالغ دکر یان ژی کرێت دکرە کەنی.

دەمێ بابێ وی یێ ئامادە بایە، زەلەمای دبوو زارۆکەکێ شیم و نەگوهدار، گەلەك گازندە و داخوازی دکرن و ل سەر تشتێن بێ بها خوە ڕکو دکر. هندێ لەیلایێ ئەو پاشڤە ژی دبر لێ چ مفا تێدا نەبوو، لێ دەمێ ڕەشید ل مال نەبایە، وی ڤەت ئەڤ چەندە نەدکر.

ڕەشیدی دەستخوشی ل هەموو ڕەفتارێن وی دکر و دگوت: "ئەڤ چەندە نیشانا زیرەکیا وی یە."

ڕەشیدی هەمان تشت دگوت خو دەمێ وی هندەك كارێن نەباش ژی كربانە وەك داعیرانا شتەکێ پیس، تفکرن یان هەتا هلکرنا زلکێن شخارتێ و کێشانا ڤوپکێن جگارەیێن ڕەشیدی.

دەمێ زەلەمای هاتیە سەر دنیایێ، ئێدی ڕەشیدی ئەو ل دەڤ خوە و د ژوورا خوە ڤە دنڤاند. لەیلایێ ژی لاندکەکا نوو بۆ کری بوو و بربوو دەڤ نیگارکێشەکی داکو وینەیێن شێر و پلنگێن ڕوونشتی بۆ ل سەر بکێشیت. هەردیسان ڕەشیدی پارە دابونەڤ لەیلایێ هەتا کو جلك و کولاڤ و بتلێن شیری و حەفازەیێن نوو بۆ بکریت، ئەڤە سەرەڕای هندێ هێشتا هندەك کەلوپەلێن عەزیزایێ یێن کەڤن ب کێر وی دهاتن و د هەمان دەم دا ڕەوشا وان یا ئابوری نە هند یا باش بوو.

ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان، ڕەشید هاتە مال و یاریەك د دەستان دا بوو کو ب پاتریان کاردکر و ل سەر لاندکا زەلەمای ڤە هەلاویست. ئەو یاریکە پێکدهات ژ هژمارەکا مێشێن هینگڤینی یێن زەر و ڕەش ل دور گول بەڕۆژەکێ دزڤڕین و دەمێ دکەفتە سەر گول بەڕۆژێ دەنگەك ژێ دهات و دەمێ د زڤڕین ئاوازەك ژێ دەردکەفت.

لەیلایێ گوت: "یا ژ من ڤە تە گوتبوو من کو ڤان ڕۆژان کارێ تە یێ لاواز بووی و وەکو بەرێ شول نینە."

ڕەشیدی گوت: "من گەلەك هەڤال هەنە، دێ هندەك ڤەران ژێ کەم."

"باشە پاشی دێ چەوا بۆ زڤڕینی؟"

"ڕەوش دێ هێتە گوهۆڕین و بەردەوام یا د گوهۆڕینێ دا. سەحکێ چەند کەیفا وی یا پێ هاتی. تو دبینی؟"

لەیلا گەلەك ڕۆژان ژ دیتنا کوڕێ خوە بێ بەهر دبوو چونکی ڕەشیدی گەل خوە دبرە جهێ کاری و د بەردا وێرێ. ئەو ژی ب دلێ خوە دا دناڤ دکانێ کەڤیت و چیتە دبن مێزا بابێ خوە یا شولی ڤە کو یا پڕ بوو ژ پرتێن لاستیکان یێن کەڤن و پارچەیێن چەرمی و بۆ خوە یاری پێ دکرن.

دەمێ ڕەشید مژوولی درینا پێلاڤان یان بزمار د پێلاڤان دقوتان و ئامیرێ خوە یێ چەرخاندنێ ب پێی دزڤڕاند، چاڤێ وی ل زەلەمای ژی بوو. ئەگەر زەلەمای ڕێزەکا پێلاڤان سەرێکدا ئینابا خوارێ ژی، ڕەشیدی ب دەنگەکێ نەرم و گرژینەکێ گازندە ژێ دکرن. ئەگەر دووبارە ئەو کارە کربایەڤە، ڕەشید دا چاکوچێ خوە یێ دەستی دانیت و زەلەمای ل سەر مێزێ درێژ کەت و ب نەرمی و جوانی دگەل دئاخفت.

شیانێن بێهنفرەهیا وی دگەل زەلەمای وەکو بیرەکا گەلەك کوور بوو کو قەت هشك نەدبوو، ژبەر هندێ بێهنا وی ژی یا فرەهـ بوو خوە ژێ تۆڕە نەدکر.

ئێڤاری ژی دەمێ دگەل ڕەشیدی دزڤڕی مال، سەرێ وی ل سەر ملێ ڕەشیدی بوو. بێهنا پیستێ پێلاڤان ژ هەردووان دفری. وان هەردووان پێکڤە دکرە کەنی دا بێژی نهێنیەك یا دناڤبەرا وان دا هەروەکو هندێ کو ب ڕۆژێ هەموویێ ئەو مژوولی درینا پێلاڤان نەبن، بەلکو دەمێ خوە ب دانانا هندەك پیلانێن نهێنی ڤە دبوراند.

زەلەمای ل دەمێ خوارنا شیڤێ حەز دکر ب ڕەخ بابێ خوە ڤە بڕوونتە خوارێ و دەمێ مەریەم و لەیلا و عەزیزا مژوولی ڕاکرنا ئامانێن شیڤێ دبوون، ئەو دا دگەل بابێ خوە وان یاریان کەت یێن وان ب تنێ حەز ژێ دکر. هەر جار و ل دووڤ گەڕانێ وان کولم ل سینگێ هەڤدوو ددان و دبن لێڤکان ڕا دکرە کەنی و هوورکێن نانی د هەڤدوو وەردکرن.

ئەوان هندەك تشتێن هۆسا و ب دەنگەکێ نزم د گوهێن هەڤدوو دا دگوتن، یێن دی گوهلێنەدبوو یان تێنەدگەهشتن. ئەگەر لەیلایێ دگەل وی ئاخفتبنا، ڕەشیدی نەعیمێن خوە لێ دکرنە گرێ داکو بۆ وێ دیاربکەت کو ئاخفتنێن وێ دبنە جهێ دلتەنگ یا زارۆکی. ئەگەر وێ ڤیابایە بچیتە دەڤ زەلەمای و یاریان بۆ بکەت یان ئەگەر زەلەمای دەستێ خوە بۆ وێ درێژ کربایە، ڕەشید دا ب ناڤچاڤ گرێ ڤە تەماشەی لەیلایێ کەت. لەیلایێ ژی وەکو هندێ کو تشتەکی پێڤە دابیت، یەکسەر خوە ژێ دوور دکر.

★★★

پشتی هینگێ ل شەڤەکێ، ئەو ژی پشتی بورینا حەفتیەکێ ل سەر دووساليا ژیێ زەلەمای، ڕەشید ڤەگەریا مال و تەلەڤزیون و کاسێتەکا ڤیدیویێ دگەل بوون. هەرچەندە ئەو ڕۆژ یا گەرم بوو هێدی هێدی تا ڕادەیەکی هین دبوو، لێ ل دەمێ ئێڤاری سەقا پتر سارٍ دبوو. دبیت ژی شەڤەکا بێ ستێر و پری عەور بیت. ڕەشیدی ئەو تشت ل سەر مێزەیا ژوورا ڕوونشتێ دانان و گوت کو یێن ل بازاڕێ ڕەش کرین.

لەیلایێ پرسیار کر: "دیسان تە هندەك قەرێن دی کرن؟"

"ئەو ژ مارکا ماگناڤوکسە."

عەزیزا هاتە د ژوور ڤە، دەمێ چاڤێ وێ ب تێلەڤزیونێ کەفتی، یەکسەر کرە غار و چوو دەڤ دایکا خوە. لەیلایێ گوت: "تە ئاگەهـ ژ خوە هەبیت عەزیزا جان، دەستێ خوە نەکەیێ."

ڕەنگێ پرچا عەزیزایێ ژی وەکو یێ مەریەمێ یێ ڤەبی بوو. لەیلایێ غەمازەیێن خوە ل سەر ئالەکێن وێ ددیتن. نوکە عەزیزا کچەکا ئارام و گوهدار بوو و ڕەفتارێن وێ ژ ژیێ وێ یێ شەش سالی مەزنتر خویا دکرن.

لەیلا داخباری شێوازێ ئاخفتنا کچا خوە و بلندی و نزماتیا تونا دەنگێ وێ بوو، زێدەباری ئاخفتنێن وێ یێن جوان و ب ڕامان. ئەڤ ڕەفتار و ڕەوشا وێ یا هۆسا بوو کو دگەل قەبارێ بچووکێ لەشێ وێ نەدگونجان.

ئەڤە ئەو عەزیزا بوو یا هەموو ڕۆژان ب لەش و ڕح سڤکیا خوە، هەموو ڕۆژان زەلەمای ژ خەو هشیار دکری و جلکێن وی دکرنە بەر و خوارنا تێشتێ ددایێ و پرچا وی شانە دکر. هەردیسان وێ ب خوە زەلەمای نەچار دکر پشتی نیڤرۆ بێهنەکێ بنڤیت و دەمێ وی شاشیەك ژی کربایە عەزیزا دبوو بەرەڤانا وی و پشتا وی دگرت. عەزیزا ژی وەکو کەسێن مەزن بوو، دەمێ بێهنا وێ تەنگ ببایە، دا سەرێ خوە لێ بادەت.

عەزیزایێ تبلا خوە دانا سەر دوگمەیا ڤەمراندنا تێلەڤزیونێ. ڕەشیدی ناڤچاڤێن خوە لێ کرنە گرێ و چنگلێ وێ گرت و هاڤێتە سەر مێزێ و گوت: "ئەڤە تێلەڤزیونا زەلەمایە."

عەزیزا چوو دەڤ مەریەمێ و ل سەر چوکێن خوە ڕوونشت. ئەڤ هەردوو کەسە وەکو جێمکەکی لێ هاتبوون کو قەت ژ هەڤدوو دوور نەدکەفتن. ل ڤێ دوماهیێ، پشتی لەیلایێ

ئەو هاندای، مەریەمێ ئایەتێن قورئانێ نیشا عەزیزایێ ددان. نوکە عەزیزایێ دشیا سورەتا ئیخلاس و سورەتا فاتیحە ژبەر بخوینیت، هەردیسان فێری کرنا دوو ڕکاعەتێن نڤێژا سپێدێ ژی ببوو.

مەریەمێ گوتبوویێ لەیلایێ کو هندی تشتەکێ من هەی و بشێم پێشکێشی عەزیزایێ بکەم، ب تنێ ئەڤ زانینەیە، دوعا و نڤێژ. من ب تنێ ئەڤ تشتە د ژیانێ دا هەنە.

زەلەمای هاتە د ژوور ڤە، ڕەشیدی ب کەیفخوشیەکا مەزن ڤە تەماشەی وی کر، هەروەکو وان کەسان یێن ب جۆشەکا مەزن تەماشەی یارییێن سێرەبەندێن ل سەر جادەیان دکەن. زەلەمای وائیرا تێلەڤزیونێ ئێخستە پلاکی و دەستێ خوە دانا سەر دوگمەیا کارکرنێ و پاشی هەردوو دەستێن خوە ئێخستنە سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ. دەمێ وی دەستێن خوە ڕاکرین، هێدی هێدی شوونتبلێن وی ل سەر شاشەیێ نەمان. ڕەشیدی ب شانازی ڤە تەماشەی زەلەمای دکر دەمێ چەند جارەکان دەستێ خوە ددانایە سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ و پاشی ڕادکری.

تالیبانێ تێلەڤزیون قەدەغە کربوون و کاسێتێن ڤیدیوییێ ژی ل پێشچاڤێن خەلکی دشکاندن و شرێتێن وان پارچە پارچە دکرن و ل دوور ستوونان دئالاندن. لێ ڕەشیدی گوت بلا ئەو هەر ڤان تشتان قەدەغە بکەن، ئەو نەشێن ببنە ڕێگر ئێدی ئەم خوە ژێ بێبەهر بکەن و نەکڕین.

وی گوت: "سوباهی دێ چمە سیکی دا بزانم کا دێ چەند کاسێتێن فلم کارتۆنان ب دەست من کەڤن! تشتەکێ ب زەحمەت نینە. ل بازاڕێ ڕەش هەموو تشت ب دەست مرۆڤی دکەڤن."

لەیلایێ گوت: "دێ باشە، بیرەکا ئاڤێ یا نوو بۆ مە ژی بکرە."

ئەڤ ئاخفتنە بۆ ئەگەر ڕەشید ب ئاورینەکا ڕەزیلکرنێ تەماشەی وێ بکەت. پشتی هینگێ، وان برنجەکا بێ ئاڤك ژبەر نەبوونا ئاڤێ خوار و وێ شەڤێ چا ژی نەبوو ڤەخون. ڕەشیدی جگارەیەك بەردایێ و بەحسێ بڕیارا خوە یا نوو بۆ لەیلایێ کر.

لەیلایێ هەر یەکسەر گوت: "نەخێر."

ڕەشیدی گوت من پێدڤی ب بۆچون و ڕازیبوونا تە نینە.

"تو ڕازی بی یان نە، ل دەڤ من یا گرنگ نینە."

"بەلێ ئەگەر تو بابەتی هەموویێ ب دروستاهی بزانی، وێ گاڤێ دێ بۆ تە باوەری چێ بیت."

پاشی ڕەشیدی گوتێ کو هەتا حەفکێ ئەو یێ کەفتیە بن قەران و ئەو پارەیێ ژ دکانێ بۆ دهێت تێرا بخودانکرنا وان هەر پێنجان ناکەت. گوت: "بەری نوکە ژی من گوتە تە خوە دلتەنگ نەکە."

هەردیسان ڕەشیدی گوت: "تو دێ حێبەتی مینی ئەگەر بزانی ڕۆژانە ئەو دێ چەند پارەیان بدەستخوە ڤە ئینیت."

دیسان لەیلایێ ب دەنگەکێ بلند گوتی: نەخێر. ل وی دەمی ئەو د ژوورا ڕوونشتێ ڤە بوون و مەریەم و زارۆك ژی د لێناگەهێ ڤە بوون. لەیلایێ گوهـ ل دەنگێ تەق تەقا سێنیکان و کەنیا زەلەمای و وان ئاخفتنێن عەزیزایێ دبوو یێن ب دەنگێ خوە یێ ئارام دگوتنە مەریەمێ.

ڕەشیدی گوتێ: "گەلەك زارۆکێن ژ وێ بچووکتر ل کابولێ هەنە و وی کاری دکەن.

لەیلایێ بۆ دیارکر کو ئەو گرنگییێ نادەتە هندێ کا خەلکێ دی چ ل زارۆکێن خوە دکەن. پیچەك مابوو بێهنا ڕەشیدی بگەهیتە سەرێ دفنا وی، پاشی گوت: "چاڤێ من ب خوە دێ ل وێ بیت، ئەو جهێ گەلەك یێ ب سەلامەتە. ل بەر دەرگەهێ مزگەفتا ل سەر جادەیا بەرامبەری دکانا من."

لەیلایێ کرە قێری وگوت: "ئەز قەت ناهێلم تو کچا من بکەیە خازخازوکا سەر جادە و کولانان."

زللەهەك ل بن گوهێ وێ کەفت. نیڤەکا دەستێ ڕەشیدی دگەل تبلێن وی یێن زڤر ب سەر ڕوویێن نەرم یێن لەیلایێ کەفت. سەرێ لەیلایێ گێژ بوو دەنگێ خەپسا د لێنانگەهێ ڤە د گوهێن وێ دا نەما. بۆ ماوەیەکی بێدەنگییێ پەرێن خوە ب سەر مالا وان دا کێشان، پشتی دەمەکی، دەنگێ ڕەپ ڕەپا پێیان هاتە گوهێن وێ و مەریەم و زارۆك گەهشتنە د ژوورێ ڤە، چاڤێ وان جار ما ل سەر لەیلایێ و جار ژی ل سەر ڕەشیدی.

پشتی هینگێ لەیلایێ ژی کولمەك ل ڕەشیدی دا. ئەڤە یەکەم جار بوو لەیلا بدانتە کەسەکی. هەلبەت ژبلی وان کولمێن ترانە و یاریان یێن وێ و تارقی ددانانە هەڤدوو. لێ ئەو کولم ب دەستەکێ ڤەکری بوون و پتر وەکو مستان بوون نەك کولمێن ب هێز و ب تنێ

وەك دەربڕین ژ هشیارکرنەکا خوشتڤیانە بوون. ئارمانجا وان کولمان ژی ب تنێ یەك زەڤلەك بوو کو تارڤی دگوتێ زەڤلەکا سەر ملی.

لەیلایێ دیت دەستێ وێ یێ مایە ل هەوا، هەردیسان هەست ب زڤڕاتیا پیستێ زڤر یێ دەستێ ڕەشیدی ل سەر دەستێ خوە کر و ل دووڤ دا دەنگەك هات کو هەروەکو دەنگێ کەفتنا کیسکەکێ برنجی بوو دەمێ ب ئەردی دکەڤیت. ڕەشیدی بلەز ئەو پالدا تا وی ڕادەی ئەو دوو پێنگاڤان بەرەڤ پاشڤە زڤڕی.

ل لایێ دی یێ ژوورێ دەنگێ بێهنتەنگی و حەواری و ڤێژیان بلند بوو. لەیلایێ نەدزانی کا ئەو دەنگێن کێنە و ژ کیڤە دهێن. ل وی دەمی وێ هند ئاگەهـ ژ خوە نەبوو تیبینیا هندێ بکەت یان گرنگیێ پێ بدەت، وێ خوە گرت هەتا هوشێن وێ بهێنە سەرێ وێ داکو بزانیت کا دەستێ وێ چ لێ هاتیە. دەمێ وێ ئەڤ چەندە زانی، وێ باوەرنەکر ژ دل بکەتە کەنی دەمێ زانی ڕەشیدی ب هێمنی ئەو ژوور یا بجهـ هێلای.

ژ نیشکەکێ ڤە ئەو چەندە هاتە سەر هزرا لەیلایێ کو هندی ڕەنج و زەحمەتەکا وان بری و خوە ل بەر نەخوشیێن ژیانێ گرتی، ژیانا خوە و عەزیزا و مەریەمێ، هەموو د بەر ئاڤێ چوو، هەروەکو کا چەوا شوونتبلێن زەلەمای ل سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ نەدماین. بۆ وێ دیار دبوو کو ڤێ چەندێ بەهایێ خوە هەیە، بۆ وێ دیاربوو کو کارەکێ تەمسارڕ بوو وان هەتا نوکە خوە ل سەر هەموو ڕەزیلکرن و نەخوشیێن ژبەر دنالین بێدەنگ دکر، ئەڤ بەرەڤانیکرنا وێ ژ خوە دەرگەهەکە کو ئێدی دوماهیێ ب هەموو وان جورێن ڕەزیلکرنێ بینیت یێن وان هەتا نوکە هەدار ل سەر کێشای.

لەیلایێ تیبینیا هاتنا ڕەشیدی بۆ د ژوور ڤە نەکر هەتاکو دەستێ خوە دانایە سەر حەفکا وێ و پێن وێ بلند بووین و پێهن دانابنە دیواری. سەروچاڤێن ڕەشیدی یێن ڕەزیلکەر کو گەلەك نێزیکی وێ ببوون، مەزن خویا دکرن. لەیلایێ دیت کا چەوا ژبەر پیربوونێ، سەروچاڤێن وی پتر یێن تێکچووین و دەمارێن خوینێ ل سەر دفنا وی پتر یێن دەرکەفتین. ڕەشیدی چ تشت نەگوتن. د ڕاستی دا دەمێ وی لیلیکا تڤەنگێ کریە دناڤ دڤێ هەڤژینا خوە دا، دێ شێت چ بێژیت؟ ئەرێ ما ئەو پێدڤی ب گوتنا چ تشتەکی هەیە دا بێژیت؟

ئەو تشتێ بوویە ئەگەر کو ئەو دەست ب کۆلێنا چالەکێ دناڤ حەوشا مالا خوە دا بکەن، دەست ب سەرداگرتنا هێزێن تالیبان بوو بۆ سەر مالا وان کو هندەك جاران هەیڤانە و هندەك جاران ژی حەفتیانە بوو، لێ ل ڤێ دوماهیێ کێم ڕۆژ هەبوون ئەو ب سەر جهەکی دا نەگرن. پترییا جاران وان دەست ب سەر کەلوپەلێن قەدەغەکری دا دگرت. شەق ل کەسەکی ددان و کەسەکێ دی ل سەر پشتێ دخشاند و هندەك جاران ژی ل پێشچاڤێن خەلکی کەسەك دقوتا و ب قامچیان ددانا بنێ پێن وی یان دەستێن وی.

مەریەم ل سەر لێڤا چالێ کەفتبوو سەر چوکێن خوە، گوت: "هێدی هێدی و ب دلێ خوە."

پاشی وان تێلەڤزیون شۆڕکرە دناڤ چالێ دا و هەر یەکێ ژ وان سەرەکێ وی نایلونی گرتبوو یا تێلەڤزیون دناڤ دا نخافتی.

مەریەمێ گوت: "نوکە گەلەك باشە."

دەمێ ئەو ب دوماهی هاتین، ئاخ کرە د چالێ دا و پاشی دوماهیێ هندەك ئاخا دی ل سەرێ چالێ دانا و هندەکا دی ژی ب ڕەخێن وێ دا کر هەتا سنورێن چالێ ب تەمامی بەرزە بووین.

لەیلایێ دەستێن خوە ب کراسێ خوە ڤە پاقژ کرن و گوت: "ئێدی تەمام بوو."

ئەو هۆسا ڕێکەفتن ئەگەر جارەکا دی ڕەوشا ئێمناهیێ باشتر لێ هات و هێزێن تالیبانێ دەست ژ وان سەرداگرتنا ئینان، پشتی هەیڤەك یان دوو هەیڤ یان شەش هەیڤێن دی، ڕەنگە پتر ژی، دووبارە ئەو دێ وێ چالێ کۆلن و تێلەڤزیونێ ژێ ئینە دەرێ.

***

لەیلایێ د خەونێ دا ددیت کو دووبارە ئەو و مەریەم ل پشت کۆگەهێ یێ چالەکێ د کۆلن. بەلێ ڤێ جارێ ئەو یێ عەزیزایێ شۆڕدکەنە تێدا. هەناسەیێن عەزیزایێ دناڤ نایلونی دا وەکو هەلمێ لێ دهاتن. و لەیلا یا چاڤێن وێ یێن زیق و ناڤ دەستێن وێ یێن سپی ددیتن دەمێ نایلون دکێشای و دڤیای لادەت، عەزیزایێ دکرە هەوار و هیڤی دکرن وێ بینە دەرێ لێ لەیلایێ گوهێ خوە نەددایە دەنگێ وێ.

*"ب تنێ بۆ ماوەیەکی، ب تنێ بۆ ماوەیەکێ کێم. ئەو یێ ب سەر مەدا دگرن، ما تو نزانی خوشتڤیا من؟ دەمێ هێرشێن وان ب دوماهی دهێن، دایکا تە و خالەتا تە*

*مەریەم دێ هێن دا تە بینە دەرێ. ئەز سوزێ ددەتە مە خوشتڤیا من. ل وی دەمی ئەم دێ دووبارە یاریان کەین. هندی تە بڤێت دێ یاریان کەین."*

وێ مەڕبێلك تژی ئاخ دکر دا پاڤێژتە سەر نایلونی، لەیلا ب بێهن تەنگی  دگەل تاما دندکێن ئاخێ ل سەر ئەزانێ ژ خەو هشیاربوو.

# 41

## مەریەم

ل هاڤینا سالا 2000ێ، هشکە سالی چوو د سالا خوە یا سیێ دا و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ دژوارتر لێ دهات.

بازێرێن هەلمەند و زابول و قەندەهار، خەلکێ گوندێن وان ببوونە کوچەر و ژ جهەکی دچوونە جهەکێ دی ژ بۆ دیتنا ئاڤێ و شینکاتی بۆ گیانەوەرێن خوە. لێ دەمێ وان ئەڤ هەردوو تشتێن گرنگ نەدیتین و پەز و بزن و چێلێن وان مرین، نەچاربوون بهێنە بازێرێ کابولێ و ل بنارێ گرێ "کاریە ئاریانا" و دناڤ هندەك تاخێن پیس و بەروەخت ئاکنجی بنن. ژبەرکو هژمارا وان یا زێدەبوو، لەوڕا هەموو دناڤ کۆلکێن کەڤن و هەرفتی دا ژیان، د هەر کۆلکەکی ڤە نێزیکی پازدە هەتا بیست کەسان تێڤە دژیان.

هەردیسان ئەو هاڤینە، هاڤینا تایتانیکێ بوو، د ڤێ هاڤینێ هەر یەك ژ مەریەم و عەزیزایێ خوە د هەڤدوو دئالاند و ل سەر ئەردی دگەڤزین و ب هەڤدوو دکرە کەنی. عەزیزایێ پێداگیری ل سەر هندێ دکر کو ڕۆلێ جاکی بگێریت.

"هێدی، عەزیزا جان."

"جاك! ناڤێ من بێژە خالەتا مەریەم، بێژە من جاك!"

"ئەگەر بابێ تە هشیاربوو دێ تۆڕە بیت."

"ئەز جاکم و تو ژی ڕۆزی."

دەمێ ڕکمانیا وێ دگەهشتیە ڤی ڕادەی، مەریەم نەچاربوو خوە ب کەتە ڕۆز.

"باشە، بلا تو ببیە جاك، لێ ژ بیرنەکە هێشتا تو یا گەنج دێ مری و ئەز دێ هەتا ژیەکێ درێژ مینمە ساخ."

عەزیزایێ گوت: "بلا، بەس ئەز وەکو قارەمانان دێ مرم، لێ تو ڕۆژ، تو دێ ژیانا خوە هەموویێ ب نەخوشی و ڕەزالەت بورینی و هەموو گاڤان دێ هزرێن من کەی."

پاشی ل سەر سینگێ مەریەمێ ڕوونشت و گوت: "نوکە پێدڤیە ئەم هەڤدوو ماچی بکەین."

مەریەمێ سەرێ خوە بۆ ڤی لایی و لایێ دی د وەرگێڕا، عەزیزایێ ژی ب خوشحالی ڤە ب وان ڕەفتارێن خوە یێن دینا و ب لێڤێن خوە دکرە کەنی. هندەك جاران زەلەمای ل دەڤ وان دڕاوەستیا و زێرەڤانیا وان دکر و پرسیار دکر کا ڕۆلێ وی چیە.

عەزیزایێ گوتێ: "تو دشێی ڕۆلێ چیایێ بەفرێ ببینی."

ل وێ هاڤینێ، تایا فلمێ تایتانیك کابول هەموو ڤەگرتبوو. هندەك کەسان دانەیێن سەختە یێن فلمی ژ پاکستانێ دڕەڤاندن و ب قاچاخی دئینانە ئەفغانستانێ و کاسێتێن فلمی دکرنە دناڤ جلکێن خوە یێن ناڤخۆیی دا.

پشتی دەمێ قەدەغەکرنا هاتنووچوونێ، هەر کەسەك دا دەرگەهێ مالا خوە گریت و ڕۆناهیان ڤەمرینیت و دەنگێ تێلەڤزیونێن خوە یێن ب دزیکیڤە کڕین کێم کەن و ڕۆندکان ژ بۆ جاك و ڕۆز و ڕێڤینگێن ل سەر پاپۆرا نقوومبووی بارینن.

ئەگەر کارەب هەبایە، مەریەم و لەیلا و زارۆك ژی دا تەماشەی فلمی کەن. پتر ژ دوازدە جاران ل درەنگی شەڤ وان تێلەڤزیون ب دزیکی ڤە دناڤ چالاْ ل پشت کۆگەهێ ئینا دەرێ و ڕۆناهی هەموو دڤەمراندن و پەنجەرك ژی ب بەتەنیکان دنخافتن.

فرۆشیار دناڤ ڕووبارێ کابولێ یێ هشکبووی دا دهاتن وچوون و هەر زوو هەموو تشت ب ناڤێ تایتانیك دناڤ بازێری دا دهاتنە فروتن. هەر زوو پشتی بەلاڤبوونا فلمی، تو دشیای دناڤ وێ چالاْ هشك و ل بەر هەتاڤێ سۆتی، مەحفیرکێن تایتانیك، کڕاسێن تایتانیك، هەتا سپرا تایتانیك یا نەهێلا خوهێ و مەعجینێ ددانان یێ تایتانیك و گولاڤێن تایتانیك. ل دوماهییێ ژی بورکەیێن تایتانیك هاتن. لێ یا ژ وێ ژی سەیرتر ئەوبوو هەتا خازخازوکان ژی خوە ب "خازخازوکێن تایتانیکێ" ددا نیاسین.

"بازێرێ تایتانیك"ێ ژ دایکبوو.

وان دگوت: ئەڤە ئەو سترانە.

نەخێر، ئەو دەریایە، خەملاندنە، پاپۆرە.

چوونە بن گوهێن هەڤدوو دگوت: "ئەو کریارا سێکسی یە".

لیو، عەزیزایێ ب شەرم ڤە گوت: "ئەڤە هەمموو ژبەر لیو یە".

"هەمموو کەسان جاك دڤێت"

لەیلایێ ئەڤ چەندە گوتە مەریەمێ و پاشی زڤڕی و گوت: "هەمموو کەسان جاك دڤێت، هەمموویان دڤێت جاك ژ ڤێ کارەساتێ ڕزگاربیت. لێ جاك نەما، ئێدی ناڤەگەڕیت، جاك مر."

***

ڕۆژەکێ ژ وەرزێ هاڤینێ یێ وێ سالێ، بازرگانەکێ قوماشی د خەوچوو ژبیرکر جگارەیا خوە بڤەمرینیت. هەرچەندە ئەو قورتال بوو، لێ دکانا وی قورتال نەبوو و هاتە سۆتن. ئاگری دکانێن قوماشی یێن دورماندوری دکانا وی ژی سۆتن، هەتا دکانێن جلکێن کەڤن و ئەو دکانا کەلوپەلێن ناڤمالێ و فرنا نانی ژی هاتنە سۆتن.

پشتی هینگێ هندەك کەسان گوتە ڕەشیدی ئەگەر با ل شوونا ئاڕاستەیێ ڕۆژئاڤایی ل ڕۆژهەلاتی هاتبایە، دکانا وی یا درینا پێلاڤان ئەوا دکەفتیە کوژیەکێ وی بازاڕی، ڕەنگە نەهاتبایە سۆتن.

***

وان هەمموو تشتێن خوە فروتن.

ل دەستپێکێ کەلوپەلێن مەریەمێ، پاشی یێن لەیلایێ و پاشی جلوبەرگێن عەزیزایێ دەمێ هێشتا ئەو یا بچووك و ل دووڤ دا هندەك یاریکێن عەزیزایێ ئەوێن کو لەیلایێ چەندین جاران شەڕێ ڕەشیدی کری هەتا بۆ کرین.

عەزیزایێ ب خەمگینی ڤە تەماشەی ڤێ ڕەوشێ دکر. ڕەشیدی دەمژمێر و ڕادیویا خوە یا ترانزستەری یا کەڤن و دوو بوینباغ و پێلاڤ و حەلاقا خوە یا هەڤژینیێ و قەنەپە و مێزە و کورسیکێن خوە ژی فرۆتن. پێلەکا کەرب و تۆڕەبوونێ ل سەر ڕوویێ زەلەمای پەیدابوو دەمێ ڕەشیدی تێلەڤزیون ژی فرۆتی.

پشتی وێ ڕوودانا ئاگربەربوونێ، ئێدی ڕەشیدی پتریا دەمێ خوە ل مال دبوراند، زلەهـ ل عەزیزایێ ددان و شەق و پێن ل مەریەمێ ددان. هەر تشتەکێ کەتبایە بەر دەستی دا پێنەکێ لێ دەت و هاڤێژیت. هەردیسان وی بەردەوام کێماسی و عەیب د لەیلایێ ژی

دئینانه دەرێ وەك بێهنا لەشێ وێ، شێوازێ جلوبەرگێن وێ، شێوازێ شانەکرنا پرچێ وێ، هەتا مایێ خوە د ددانێن وێ کر ئەوێن پیچەکێ زەر بووین.

وی گوت: "ئەڤە چ ل تە هاتیە، من پەریەك ئینا بوو، لێ نوکە ئەز یێ ب ڕەخ پیرەژنەکێ ڤە. ها وەختە توژی دێ وەکو مەریەمێ لێ هێی."

جارەکێ ئەو ل کەبابخانەیەکا نێزیکی مەیدانکا حەجی یەعقوبی هاتبوو دەرێخستن چونکی دگەل بکرەکی کربوو شەڕ و دانابوویێ. وی بکری گازندە ل دەڤ خودانی کربوون کو ڕەشیدی ب شێوەیەکێ نەیێ جوان نان هاڤێتە سەر مێزا وی و ئاخفتنێن کرێت گوتنێ.

ڕەشیدی گوتبوویێ دێمێ تە وەکو یێ مەیمینکێن ئوزبەکی یە. کەسەکی دەمانجە ل وی ئینابوو دەرێ و یەکێ دی ژی ب شووشکێن کەبابان هێرش کربوو سەر وی، هەرچەندە ڕەشیدی دگوت کو شووشك د دەستێ وی دابوون لێ مەریەمێ گومان ل سەر ڤێ ئاخفتنا وی هەبوو باوەر ژێ نەدکر.

پشتی هینگێ ل خوارنگەها "تەیمانی" ژی هاتبوو دەرێخستن، چونکی بکڕان گازندە ژێ کربوون کو داخوازیێن وان گەلەك گیرو دکەت. ڕەشیدی ژی دگوت نە خەتاییێن منن بەلکو ئەوێ خوارن بەرهەڤ دکری یێ تەمبەل و گێژ بوو.

لەیلایێ گوت: "چێدبیت ل کوژیەکێ وێ خوارنگەهێ ڤە، چاڤێن تە د خەو چووبن."

مەریەمێ گوت: "لەیلا گیان، وی تۆڕەنەکە."

ڕەشیدی گوت: "هێ ژنێ، بلا تە ئاگەهـ ژ دەڤێ خوە بیت."

"یان وی یا وەکری یان ژی مژوولی کێشانا جگارەیان بوویە."

"سیند ب خودای..."

"تو ب خوە یێ هۆسای، نە ب دەستێ تەیە."

پشتی هینگێ دەست ب قوتانا لەیلایێ کر، مست و کولم ل سینگ و سەر و بن زکێ وێ دان و پرچا وێ کێشا و سەرێ وێ ل دیواری دا. عەزیزایێ دکرە قێژی و کڕاسێ وێ دگرت، زەلەمای ژی دکرە هەوار و بزاڤ دکر دایکا خوە ژ دەستێ وی بینتە دەرێ و ژێ دوور بکەت.

ڕەشیدی زارۆك برنە ڕەخەكی و لەیلا هاڤێتە سەر ئەردی و ب پێهنان دانایێ.
مەریەمێ خوە هاڤێتە سەر كەلەخێ لەیلایێ، لێ ڕەشیدی هەر بەلا خوە ژێ ڤەنەكر و هندەك پێهنێن وی ب مەریەمێ ژی دكەفتن. تف ژ دەڤێ وی دفڕی و ئنیەتا ئەنجامدانا تاوانەكێ ژ چاڤێن وی دفڕی، وی هەر پێهن ددانانە لەیلایێ هەتا واستای.

بێهنا وی تەنگ بوو گوت: "سوند ب خودای، دێ وەل تە كەم هەتا تە دكوژم، لەیلا."
پاشی بلەز ژ مال دەركەفت.

***

دەمێ پارەیێن وان نەماین، ئێدی برسێ دەستێ خوە ب سەر ژیانا وان دا گرت.
مەریەم مەندەهوش ما كا چەوا نوكە برساتی بوویە مەزنترین ئاریشەیا ژیانا وان و گەڤان ل سەر مانا وان د ژیانێ دا دكەت.

نوكە خوارنا وان یا بوویە برنجەكا سادە یا بێ گوشت و كەسكاتی. ڕۆژ بۆ ڕۆژێ وان خوارنێن خوە كێم دكرن و نوكە پارێێ ژیانا وان یا ب زەحمەت كەفتی. هندەك جاران ڕەشید دەمێ دهاتیە مال ڤالكەكا ماسیێن سەردین و نانەكا هشك كو تاما پیشێ دارتاشان ژێ دهات دگەل خوە دئینان.

جارەكێ ژی كیسكەكێ سێڤان دزیبوو كو ئەگەر پێ حەسیابان دا دەستێ وی برن، یان ژی ل دەڤ دكانێن فێقیفرۆشان ب دزیكیڤە ڤالكەكا مەعكەرونێن "ڕاڤیولی" كو پرتێن گوشتی و پەنیر و كەسكاتی دناڤدابوون، دكرە دبەریكا خوە دا و ل مال ل سەر هەر پێنجان بەلاڤ دكر لێ پشكا شێری بەر ب زەلەمای دكەفت. هندەك جاران ژی خوێ ب شێلمێن خاڤ دا دكر و دخوارن. بۆ دەمێ ئێڤاری ژی ئەگەر بەلگێن خەسان یێن پەرچقی و موزێن ڕەش بووی هەبانە، نیعمەت بوو.

ژ نیشكەكێ ڤە، برس ببوو مەترسیەكا مەزن ل سەر ژیانا وان و گەفێن مرنێ لێ دكرن. ئەڤ چەندە ب سەرێ وان ب تنێ نەهاتبوو، بەلكو گەلەك كەسێن دی ژی تووشی ڤێ قەیرانێ ببوون و وەلێ هاتبوو هندەك كەسان نەدڤیا چاڤەڕێی ڤێ مرنا هێدی ببن. بۆ نموونە پیرەژنەكا جیرانا وان هندەك نانێ هشك هێرابوو دگەل ژەهرا مشكان تێكەل كربوو وێ و هەر حەفت زارۆكێن خوە خوار بوو و بەهرا پتر بۆ خوە دانابوو،

پەڕاسییێن عەزیزایێ دەرکەفتن و ئاڵەکێن وێ یێن تێر گوشت نەمان، پێن وێ ژی زراڤتر لێ هاتن و ڕەنگێ وێ زەر ببوو.

دەمێ مەریەمێ ئەو هەمبێز دکری، هەستپێدکر هەستیکێن پێن وێ یێن ب لەشێ وێ دکەڤن. زەلەمای ژی ب چاڤێن برسی و نیڤ ڤەکری ڤە دنڤست یان ژی د کوشا بابێ خوە دا د خەو دچوو. هەتا هشیار ژی دبووی، هند ژ برسان دا دکرە گری هەتا دووبارە د خەو چوویەڤە، لێ خەوا وی ژی یا نیڤ نیڤە بوو.

هەموو جارێن مەریەم ڕادبوویەڤە، هندەك خالێن سپی ل پێشچاڤێن وێ خویادکرن و دلڤلڤین، سەرێ وێ گێژ دبوو گوهێن وێ دەنگ ڤەددان. ئاخفتنێن مەلا فەیزوللاهی هاتبوونە بیرا وێ دەمێ جارەکێ ل دەستپێکا هەیڤا ڕەمەزانێ بۆ گوتین.

*هەتا کەسێ ماری ژی پێڤەدای خەوا وی دهێت، لێ ب تنێ کەسێ برسی و زکێ وی ڤالا خەوا وی ناهێت.*

لەیلایێ گوت: "ها وەختە زارۆکێن من ژ برسان دا ل پێشچاڤێن من دێ مرن."

مەریەمێ گوت: "نەخێر، ئەو نامرن، ئەز ناهێلم لەیلا جان. دێ ڕەوشا مە باشتر لێ هێت. ئەز ب خوە دزانم کا دێ چ کەم.

***

ڕۆژەکا گەرم و دژوار بوو. مەریەمێ بورکەیێ خوە کرە بەر خوە و دگەل ڕەشیدی بەرەڤ هوتێلا "ئینتەرکونتێنتال" ڤە چوون. ڕەوشا وان گەهشتبوو وی ڕادەی کریا پاسێ ژی ڤێ نەبوو. دەمێ ئەو گەهشتینە سەرێ گری، بێهنا مەریەمێ تەنگ بوو. ئەو گر هند یێ ڕك بوو، سەرکەفتنا وی بوو ئەگەر مەریەم دوو جاران گێژ بیت و نەچار بیت بڕاوەستییێن داکو بێهنا خوە ڤەدەت و پاشی دووبارە دەست ب چوونێ کرەڤە.

ل بەر دەرگەهێ هوتێلێ، ڕەشیدی سلاڤ کرە زێرەڤانی و دگەل ئاخفت و هەمبێز کر. وی زێرەڤانی چاکیت و پەنتەرۆنەکێ بورگاندی یێ ڕەنگ مور ل بەربوون و کولاڤەکێ شەوقە ل سەری بوو. ژ ئاخفتنا وان یا دیاربوو کو ئەو بەری نوکە هەڤالێن یەك بوون. دەمێ ڕەشیدی دگەل زێرەڤانی دئاخفتی، دەستێ وی ل سەر ملێ وی بوو. پاشی دەستێ خوە

درێژ کره مەریەمێ و هەردووان بۆ ماوەیەکێ کێم سەحکرە مەریەمێ. مەریەمێ هەستپێکر ئەو زێرەڤان ژی وێ دنیاسیت.

دەمێ زێرەڤان چوویە د ژوور ڤە، مەریەم و ڕەشید مانە ل بەر دەرگەهی و چاڤەڕێ مان. ل وێرێ، چاڤێ مەریەمێ ب پەیمانگەها پولیتەکنیك کەفت، ب ڕەخ وێ ڤە ژی کولانا "خەیرخانە" یا کەڤن بوو و ل وێ ڤەتر ژی وێ جادەیا "مەزار" ددیت. ل لایێ باشوری ژی، کارگەها نانی و سایلویا وێ ددیت کو ئەو ماوەیەك بوو هاتیە پشتگوهـ هاڤێتن و ل هەموو لاییێن وێ شوونوارێن کونێن تۆپان ل سەر دیاربوون.

هەر ل لایێ باشوری و پیچەکێ وێ ڤەتر، شوونوارێن وێرانکری یێن کوچکا "دارولئەمان" ددیت کو چەند سالان بەری نوکە جارەکێ ڕەشیدی بۆ سەرەدان بربوو وێرێ و ببوو شوونوارەکێ کەڤن یێ دیرۆکی، ئەگەر کەسەکی بەری هینگێ نەدیتبایە، دا هزر کەت ڤی شوونواری چ پەیوەندی ب سەردەمێ ئەڤرۆکە نینن.

مەریەمێ خوە ب وان تشتان ڤە مژوول دکر، ڤان نیشانەیان، چونکی ئەو دترسیا هوشێن خوە ژ دەست بدەت و ئاگەهـ ژ خوە نەمینیت.

هەر چەند خولەکەکان جارەکێ، ترۆمبێلێن جێپ یان تەکسی دهاتنە بەر دەرگەهێ هوتێلێ و دڕاوەستیان. زێرەڤانێن بەر دەرگەهی بلەز بەرەڤ وان ڤە دچوون داکو پێشوازییێ لێ بکەن. هەموو ژی زەلاٚمێن چەکدار و ب ڕیهـ و دەرسوك بوون و ب سیمایەکێ ناڤچاڤگرێ و تۆند ڤە ژ ترۆمبێلان دهاتنە خوارێ. دەمێ دهاتینە بەر دەرگەهی دا بچنە د ژوور ڤە، مەریەمێ گوهلێدبوو کو ب پەشتوونی و فارسی دئاخفتن، جار جار ژی ب زمانێ ئوردوی و عەرەبی دئاخفتن.

" تەماشەی سەردارێن مە یێن ڕاستەقینە بکە."

ڕەشید چوو بن گوهێ وێ و هێدیکا گوتێ: " ئەڤە ئیسلامییێن پاکستانی و عەرەبن. تالێبان د دەستێ ڤان دا وەکو بووکێن شووشەی نە. ئەڤە یاریکەرێن مەزنن و ئەڤغانستان یاریگەها وان یا یاریکرنێ یە."

ڕەشیدی گوتی من یا گوهـ ل گوتگوتکەکێ بووی کو تالێبان ڕێك یا دایە وان ل سەرانسەری وەلاتی کەمپێن نهێنی دروست بکەن و لاوێن ڤی وەلاتی فێری کریارێن تیرورستی و جیهادێ بکەن.

مەریەمێ گوت: "ئەرێ ئەڤە بوچی ئەو هندە گیرو بوو؟"

ڕەشیدی تف کرە ئەردی و پێ خوە لێدا.

پشتی دەمژمێرەکێ، ئەو چوونە دناڤ هوتێلێ دا و ب دووڤ زێرەڤانی کەفتن. دەمێ ئەو ب سەر ئەردێ کاشیکری یێ هوتێلێ ڕا دبورین، دەنگێ تەق تەقا پێن وان ژ ئەردی دهات هەتا گەهشتینە هۆلەکا هین و ئارام. مەریەمێ دوو زەلاٚم دیتن کو ل سەر کورسیکێن پیستی دڕوونشتیبون و تڤەنگ و مێزەکا قەهوای دناڤبەرا وان دا بوو. وان چا ڤەدخوار و سێنیەکا تژی زەلابی ل بەر سینگێ وان بوو کو هندەك شەکر پێوەرکر بوو و ژێ دخوار. عەزیزا هاتە بیرا مەریەمێ کا چەند حەز ژ زەلابیان دکەت.

زێرەڤانی ئەو بەرەڤ ژ دەرڤە بۆ ناڤ بەلکونەکی برن و پاشی تێلەفونەکا ڕەش دگەل پارچەیەکا کاغەزێ ژ بەریکا خوە ئینانە دەرێ کو ژمارەیەك یا ل سەر نڤیسای بوو و گوتە ڕەشیدی کو ئەڤە تێلەفونا سەرپەرشتیارێ وی یێ کاری یە. پاشی گوت: "من دەستووریا پێنج خولەکان بۆ هەوە ژێ وەرگرت هەتا دگەل باخڤن نەك زێدەتر."

ڕەشیدی گوت: "سوپاس، ئەز چ جاران قەنجیا تە ژبیر ناکەم."

زێرەڤانی سەرێ خوە هەژاند و ژێ دوورکەفت، ڕەشیدی ژی هژمارا تێلەفونێ لێدا و پاشی داڤ مەریەمێ.

دەمێ مەریەمێ گوهێ خوە ددایە زەنگا چوونا تێلەفوونێ، هزرێن وێ دوور چوون. دوماهیك دیتنا جەلیلی هاتە پێشچاڤێن وێ، ئانکو بەری سێزدە سالان بوو ل بوهارا سالا 1987ێ دەمێ ل بەردەرگەهێ مالا وێ یێ ڕاوەستای. دەستێ وی ب گۆپالێ ڤە بوو و ل بەر ترۆمبێلا خوە یا مارکا بێنز یا ڕەنگ شین و هژمارا هیراتێ ل سەر و هێلەکا سپی ل سەر پشت و سەر سندوقا وێ، ڕاوەستیابوو.

جەلیل بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران ل بەر دەرگەهی ل هیڤیا وێ بوو جار جار ژی ب ناڤێ وێ گازی دکر هەروەکو کا چەوا دەمێ مەریەم یا بچووك و چوویە بەر دەرگەهێ مالا وی و ب ناڤێ وی گازی دکریێ.

دەمێ ڕەشید ژ دەرڤە، مەریەمێ د ژوورا خوە ڤە ل بەر پەنجەرکێ یا ڕاوەستای بوو پیچەکێ پەردە ڤەدابوو تەماشەی وی دکر. هەرچەندە دیتنەکا کێم بوو لێ تێرا هندێ دکر بزانیت پرچا وی یا سپی بووی و ژ بەرێ زەعیفتر یێ لێ هاتی. بەرچاڤکەك ل بەر چاڤێن

وی بوو وەکو هەرجار ژی بوینباغەکا سۆر ل ستوییێ وی بوو دەستمالەکا سپی د بەریکا وی یا سینگی دا بوو کو وێ پتر سەرنجا مەریەمێ ڕادکێشا ژ زەعیفیا وی.

چاکیتێ ڤاتا وی یا ڕەنگ قەهوای یێ تاڕی ب سەر ملێن وی دا هاتبوو. پەنتەرۆنێ وی یێ فرەهـ ژی ل سەر پێن وی خرڤەببوو. جەلیلی ژی ئەو دیتبوو لێ بۆ ماوەیەکێ گەلەکێ کێم. دەمێ بۆ وی ماوەیێ کورت چاڤێن وان ب هەڤدوو کەفتین، هەروەکو وی دەمی بوو یێ بەری چەندین سالان مەریەم دناڤ باخچەیێ مالا وی دا و چاڤێ وێ ب وی کەفتی د ژوورا ڤاتێ دووێ ڤە دەمێ ئیکسەر پەردە دانای، ژبەر هندێ مەریەمێ ژی هەمان ڕەفتار دگەل وی کر و یەکسەر پەردە دانا و چوو سەر تەختێ خوە یێ نڤستێ ڕوونشت و چاڤەڕێی چوونا وی بوو.

هەردیسان ئەو نامە هاتە بیرا وێ یا ڕەشیدی د بن دەرگەهێ حەوشێ ڕا هاڤێتیە دناڤ مال دا. بۆ ماوەیەکی ئەو نامە دانابوو بن بالیفکا خوە و هندەك جاران ژی دئینا دەرێ و بلند دکر. ل دوماهیێ ژی بێی کو وێ نامەیێ بخوینیت، چرچڕ کر و هاڤێت. لێ نوکە و پشتی ڤان هەموو سالێن درێژ، ئەو یا هاتیە ڤێرێ داکو تێلەفونێ بۆ بکەت.

مەریەم ژ خوە مەزنکرن و بێ منەتیا سەردەمێ خوە یێ گەنجینیێ پەشیمان بوو. نوکە هیڤی دخواست ل وی دەمی ڕێك دابایێ هاتبایە د ژوور ڤە. ئەرێ ما دا چ چێ بیت هەکە دەلیڤە دابایێ هاتبایە د ژوور ڤە و ل دەڤ وێ ڕوونشتبایە خوارێ و گوتبایێ کا بوچی هاتیە دەڤ وێ؟ هەر چ نەبیت ئەو بابێ وێ بوو. ڕاستە ئەو بابەکێ باش نەبوو، لێ کار و گونەهێن وی گەلەك د سادە و بچووك بوون دەمێ ب کەرب و کینا ڕەشیدی یان دڕندەیی و خراپیا هەر زەلامەکێ دی هەڤبەر دکەت.

نوکە ئەو هیڤی دخواست کو نامەیا بابێ خوە نەدڕاندبایە.

دەنگێ کوور یێ زەلامەکی هاتە گوهێن وێ و گوتێ کو نڤیسینگەها سەروکێ باژێرڤانیێ دگەل وێ یە.

مەریەم کوخی و گەوریا خوە پاقژ کر و گوت: "سلاڤ، برا، ئەز یا ل دووڤ کەسەکی دگەڕیێم ل باژێرێ هیڕاتێ دژیت، بەری چەند سالان ژی ئەو ل وێرێ دژیا و ناڤێ وی جەلیل خانە. مالا وی ل تاخێ "شار-ی-ناو" بوو سینەمایەك ژی هەبوو. ئەرێ هوون چ پێزانینان ل دور جهێ وی یێ ئاکنجیبوونێ نزانن."

دەنگێ کەسێ تێلەفون بەرسڤدای تۆڕەبوونەکا مەزن ژێ دفڕی.

"ئەرێ تە بۆ ڤی کاری پەیوەندی ب نڤیسینگەها سەروکێ باژێرڤانیێ کریە؟"

مەریەمێ بۆ دیارکر کو ژبلی وێرێ نەزانی تێلەفونێ بۆ چ جهێن دی بکەت.

"ببورە برا، ئەز دزانم هەوە کارێن گەلەك گرنگتر هەنە، لێ بابەتی پەیوەندی ب مرن و ژیانێ ڤە هەیە و گەلەگ یا گرنگە، ژبەر هندێ من تێلەفون بۆ هەوە کر."

"ئەز چ کەسێن ب ڤی ناڤی نانیاسم و ئەڤە چەندین سالە سینەمایا وی هاتیە دائێخستن."

"بەلکو کەسەك ل وێرێ هەبیت وی بنیاسیت، کا پرسیار بکە."

" ببورە چ کەسێن هۆسا ل ڤێرێ نینن."

مەریەمێ چاڤێن خوە نقاندن و گوت: "هیڤی دکەم برا، ڤی بابەتی پەیوەندی ب ژیانا زارۆکان ڤە هەیە، زارۆکێن گەلەك بچووك."

ئاخینکەکا درێژ ڕاهێلا

"بەلکو کەسەك ل وێرێ هەبیت..."

باخچەڤانەك یێ ل ڤێرێ، وی هەموو ژیێ خوە ل ڤی باژێری یێ بوراندی."

"بەلێ، زەحمەت نەبیت دێ شێی گازی وی کەی."

"سوباهی تێلەفونێ بکە."

مەریەمێ بۆ دیار کر کو ئەو نەشێت وێ چەندێ بکەت.

"ب تنێ بۆ پێنج خولەکان ئەڤ تێلەفونە یا دایەڤ من دا پێ باخڤم. نەشێم سوباهی..."

مەریەمێ گوهـ ل دەنگێ کلیکەکێ بوو. وێ هزرکر وی کابرای تێلەفون گرت و ل ناڤ چاڤێن وێ دا، لێ د ڕاستی دا دەنگێ شەپ شەپا پێیان و هندەك دەنگێن دی هاتنە گوهێن وێ. زێدەباری هۆڕنێن ترۆمبێلەکا دوور دهاتن و دەنگێ کلیکا ئامیرەکێ میکانیکی کو جار جار دهاتە بڕین، ڕەنگە دەنگێ پانکێ بیت. دووبارە تێلەفون دا بەر گوهێ خوە یێ دی و چاڤێن خوە گرتن.

جەلیل هاتە پێشچاڤێن وێ کو ب گرنژین ڤە دەستێ خوە دکرە د بەریکا خوە دا.

*باشە، چ پێنەڤێت، بێهنا خوە فرەهـ بکە، ئاها ئەڤە بۆ تە.*

*ڕستەکەك بوو ل سەر شێوێ بەلگان، مورکێن بچووك کو وێنەیێن ستێر و هەیڤێ ل سەر د کێشایی بوون پێڤە شۆر دبوون.*

*مەریەم جان کا بکە ستوویێ خوە*

*یا چەوانە؟*

*ل دەڤ من تو وەکو شاهژنان یا لێ هاتی*

چەند خولەکەك بوورین، پاشی دەنگێ تەپ تەپا پێیان و کەسەکی گوت: "تو وی دنیاسی؟"

"ژ ڕاستا؟"

"بەلێ وی ب خوە وەگوت."

مەریەمێ گوت: "ئەو ل کیڤەیە؟ ئەرێ تو دزانی کا جەلیل خان نوکە ل کیڤە دژیت."

پشتی بێهنەکێ بێدەنگ مای

"یێ دبێژیت ئەڤە دەمەکە جەلیل خانی وەغەر کری، ل سالا 1987ێ."

مەریەمێ ئاخینکەك ڕاهێلا. هەرچەندە بەری ئەو بهێت تێلەفونێ بکەت، وێ ئەڤ مگریتە ل دەڤ خوە دانابوو چونکی هەکە نوکە یێ ساخبایە دا ژیێ وی ژ حەفتێ سالان پتر بیت، لێ ..."

.1987

*هۆسا دیارە وی دزانی وەختێ مرنا وی یا هاتی ژبەر هندێ وی ئەو ڕێکا دوور هەموو ژ هیراتێ دابوو بەر خوە هەتا بهێت ب یەکجاری خاترا خوە ژێ بخوازیت.*

مەریەم چوو د بەلەکونێ دا، وی مەلەڤانگەها هوتێلێ دیت کو نوکە یا هشك و پیسە و ژ ئەنجامێ بەرکەفتنا موشەکان یا کون کون بووی و ها وەختە دێ کاشیێن وێ ژی ژ جهێن خوە هێنە دەرێ. هەردیسان چاڤێن وێ ب مەیدانا یاریا تەنسێ کەفت کو تۆڕا وێ هاتبوو دڕاندن و پیچکرن، وەکو پیستێ مری یێ ماری دەمێ ژ سەر خوە ڕادکەت.

کەسێ دی یێ ل سەر تێلەفونێ گوت: "پێدڤیە نوکە ئەز بچم."

مەریەمێ ب بێدەنگی دکرە گری، گوتێ: "ببورن کو من زەحمەت بۆ هەوە چێکر."

جەلیل هاتە پێشچاڤێن وێ دەمێ ژ سەر ڕووبارێ ئاڤێ دەرباز دبووی، ژ ڤی بەری خوە دهاڤێتە سەر بەرێ دی و بەریکێن خوە پڕکربوون ژ دیاریان بۆ وێ. هەمووگاڤان مەریەمێ بێهنا خوە تەنگ دکر و ژ خودای دخواست زووتر بابێ خوە ببینیت و پتر بمینتە ل دەڤ وێ.

هەرچەندە وێ دڤیا سوپاسیا وی کابرای بکەت، لێ هەر زوو وی تێلەفون گرتبوو.

ڕەشیدی تەماشەی وێ کر، مەریەمێ ژی سەرێ خوە لێ هەژاند.

ڕەشیدی ب تۆڕەیی ڤە تێلەفون ژ دەستێ وێ ئینا دەرێ و گوت: "نە هەرێ چ مفا تێدا نینە. ژ ڤەستا کچێ ژی نەدایە ب بابێ ڤە."

ل دەمێ ڤەگەریانا خوە بۆ ناڤ هۆلا هوتێلێ دا، ڕەشید بلەز چوو سەر مێزا قەهوای کو کەس ل وێرێ نەبوو دەستێ خوە هاڤێتە دوماهیک دانەیا زەلابییێ و دگەل خوە ڕاکر و برە مال و داڤ زەلەمای داکو بخوت.

# 42

## لەیلا

عەزیزایێ کەلوپەلێن خوە کرنە دناڤ زەرفەکێ کاغەزی دا، کراسێ خوە یێ گول گولی و جووتێ گورەیێن خوە یێن کورت و دەستگورکێن خوە یێن سوفی یێن نە هندی یەك، بەتەنیا خوە یا کەڤن و ڕەنگ پرتەڤالی یا نەخشاندی ب ستێران، کوپێ خوە یێ پلاستیکی یێ دەرزی و سێتەکێ زاڕان.

ل سپێدەهیەکا سارڕ یا هەیڤا نیسانێ ل سالا 2001ێ، بەری کو ژیێ لەیلایێ ببیتە بیست و سێ سال، ڕەنگێ ئەسمانی گەورەکێ ڤەبی بوو و جار بۆ جارێ بایەکێ تەزی یێ مژدار دگەل دندکێن خوناڤێ، پەردەیا دەرگەهێ وان دلڤلڤاند.

چەند ڕۆژەکان بەری هینگێ، لەیلایێ گوهلێبوو کو ئەحمەد شاهـ مەسعود یێ چوویە وەلاتێ فڕەنسا و گۆتارەك ل پەرلەمانێ ئەوڕۆپا پێشکێش کریە. مەسعود نوکە ل جهێ ژ دایکبوونا خوە ل باکورێ وەلاتی بوو و ڕێبەریا یەکێتیا باکوری دکر کو گرۆپێ یەکانە یێ ئوپوزسیونێ بوو یێ شەڕ دژی تالێبانێ دکری.

مەسعودی، وەلاتێن ئەورۆپی و ڕۆژئاڤایی ل مەترسیا هەبوونا وان کەمپێن تیرورستان کر یێن ل ئەڤغانستانێ هاتینە ڤەکرن ئاگەهدارکرن و داخواز ژ ویلایەتێن یەکگرتی یێن ئەمریکا کربوو هاریکاریا وان بکەت د شەڕێ دژی تالێبانێ دا.

مەسعودی گوتبوو: "ئەگەر سەروك "جورج بوش" هاریکاریا مە نەکەت، ل زووترین دەم ئەڤ گرۆپێن تیرورستی یێن تۆندرەو دێ زیانێ گەهینە ئەمریکا و ئەورۆپا ."

بەری هینگێ ب هەیڤەکێ ژی، لەیلایێ زانیبوو کو تالێبانێ کەرەستەیێن TNT دناڤبەرا هەردوو پەیکەرێن مەزن یێن بودای ب باژێرێ بامیانێ داناینە و یێن پەڤاندین ب هێجەتا گونەهـ و پەرستنێ.

هەرچەندە ل بەرامبەر ڤی کارێ وان، ل سەرانسەری جیهانێ، ژ ویلایەتێن یەکگرتی یێن ئەمریکا هەتا چینێ دەنگێن نەڕازیبوونێ بلندبوون. حکومەت و دیرۆکنڤیس و زانایێن شوونواران ل سەرانسەری جیهانێ نامەیێن هیڤی خواستنێ بۆ تالێبانێ فرێکرن و داخواز ژێ دکر ڤان هەردوو پەیکەرێن مەزن و دیرۆکی ل ئەڤغانستانێ ژناڤ نەبەن. لێ تالێبانێ داخوازیێن وان پشتگوهـ هاڤێتن و بۆمبەیێن خوە دانانە دناڤبەرا هەردوو پەیکەرێن بودای دا یێن ژیێ وان پتر ژ دوو هزار سالان. دگەل هەر پەقینەکێ وان دکرە هەوار و دگوت "الله اكبر" و کەیفا وان ب هندێ دهات دەمێ دگەل هەر پەقینەکێ دەستەك یان پێیەکێ پەیکەری ژێڤەدبوو و ژناڤ دچوو و تۆزا وی بلند دبوو.

لەیلایێ ئەو ڕۆژە ئینا بیرا خوە دەمێ ل سەر سەرێ مەزنترین پەیکەر ل جیهانێ ل سالا 1987ێ دگەل بابێ خوە و تارڤی چووینە وێرێ. هوینکەبایەکی ل ناڤ چاڤێن وان یێن ل بەر هەتاڤێ ددا و چاڤێ وان ب بازەکی کەفت کو ل سەر وان دەشت و نهالێن بەرفرەهـ یێن ل خوارێ دزڤڕی.

دەمێ لەیلایێ دەنگوباسێ پەقاندنا پەیکەران گوهلێبووی، چ کارتێکرنا هۆسا لێ نەکر و ڕەنگە هەر بۆ وێ یا گرنگ نەبیت، چونکی نوکە ژیانا وان یا هێدی هێدی یا بەرەڤ وێرانبوونێ دچیت و چ تشت نینە د مال دا بخون، ڤێجا چەوا ژ نوو خەمان بۆ پەیکەران بخوت.

هەتا وی دەمێ ڕەشیدی گوتیێ دەمێ چوونێ یێ هاتی، لەیلا د کوژیەکێ ژوورێ ڤە ل سەر ئەردی یا ڕوونشتیبوو بێی کو پەیڤەك ژ دەڤی دەرکەڤیت، دێمێ وێ ژی یێ خەمگین بوو داڤێن پرچێ وێ ژی ب سەر سەروچاڤێن وێ دا هاتبوونە خوارێ و بێهنا وێ ژی تەنگ دبوو. لەیلایێ هەستپێدکر کو وەکو پێدڤی ئەو نەشێت بێهنا خوە بهەلکێشیت و بایێ پێدڤی ناچیتە دناڤ سیهێن وێ دا.

***

د ڕێیا خوە دا بەرەڤ "کارتە-سە"، زەلەمای بەردەوام دەستێ خوە ژ دەستێ ڕەشیدی دئینا دەرێ، لەیلایێ ژی باش دەستێ عەزیزایێ گرتبوو، مەریەم ژی بلەز دگەل وان ب ڕێڤە دچوو. بای شالا ل سەر ملێ عەزیزایێ دلڤلڤاند ئەوا هەتا بەر پێن وێ درێژ دبووی. نوکە

عەزیزا یا ناڤچاڤگرێ یە، چونکی دگەل هەر پێنگاڤەکێ زێدەتر یا هەست ب هندێ دکەت کو ئەو یا هاتیە خاپاندن.

لەیلایێ ئەو جسارەت نەبوو ڕاستیێ بۆ عەزیزایێ بێژیت. لەیلایێ گوتبوویێ کو دێ وێ بەنە قوتابخانەیێ، قوتابخانەیەکا تایبەتە و ل وێرێ قوتابی دخون و ڤەدخون و دنڤن و پشتی ب دوماهی هاتنا وانەیان ژی هەر ل وێرێ دمینن و نازڤڕنە مال.

عەزیزایێ پرسیار ل دووڤ پرسیارێ ژ لەیلایێ دکرن، ئەرێ هەر قوتابییەك د ژوورەکا تایبەت ڤە دنڤیت یان ژی هەموو پێکڤە د هۆلەکا مەزن دا دنڤن؟ ئەرێ ئەو دێ شێت بۆ خوە هندەك هەڤالان پەیداکەت؟ ئەرێ ماموستایێن وان دێ ب شێوەیەکێ جوان و نەرم سەرەدەریێ دگەل کەن؟

هەردیسان وێ پتر ژ جارەکێ ئەڤ پرسیارە ژ دایکا خوە کر: "ئەرێ هەتا کەنگی ئەز دێ ل وێرێ مینم؟"

ئەو ب دووراتیا دوو کولانان ل دووری ئاڤاهیەکێ بلند ڕاوەستیان کو وەکو بنگەهەکێ سەربازی بوو. ڕەشیدی گوت: "ئەز و زەلەمای دێ ل ڤێرێ ل هیڤیا هەوە بین، ئاها بەری ژ من بچیت دا بێژم ..."

دەستێ خوە کرە د بەریکا خوە دا و دانەیەکا بەنیشتی ژ بەریکا خوە دا ئینا دەرێ. هۆسا دیارە ئەڤە دیاریا وی یا خاترخواستنێ بوو. ب سیمایەکێ سادە و هشك و ئەو بەنیشت کرە د دەستێ عەزیزایێ دا و وێ ژی ژێ وەرگرت و دبن لێڤکان ڕا سوپاسیا وی کر.

لەیلا ب دلفرەهیا عەزیزایێ و گیانێ وێ یێ لێبورینێ داخباربوو، ژبەر هندێ چاڤێن وێ تژی ڕۆندك بوون. هەر دەمێ ئەو چەندە دهاتە بیرا وێ کو ژ ئێدی وێ ڤە عەزیزا ب ڕەخ وێ ڤە نانڤیت، خەمان دلێ وێ دگڤاشت. چونکی وێ باش دزانی ئێدی ئەو هەست ب سەنگا دەستێ لەیلایێ یێ سڤك ناکەت دەمێ ددانیتە سەر سینگێ وێ و نەژی هەست ب سەرێ وێ دکەت دەمێ ل سەر پەڕاسیێن وێ خوار دکەت، ئێدی هەناسەیێن وێ حەفکان وێ گەرم ناکەن و پێهنێن بنێ پێ وێ ب زکێ لەیلایێ ناکەڤن.

دەمێ وان عەزیزا دگەل خوە بری، زەلەمای کرە گری و دکرە هەوار: زیزە! زیزە! بزاڤ دکر دەستێ خوە ژ دەستێ بابێ خوە بینتە دەرێ و بەردەوام گازی خوشکا خوە دکر

هەتا سەرنجا وی چوویە سەر گیانەوەرەکی، کو ئەو ژی مەیموونکەکا سەماکەر و پەهلەوان بوو ل لایێ دی یێ جادێ.

وان ب تنێ، مەریەم و لەیلا و عەزیزایێ، ئەو هەردوو کولان بڕین و گەهشتنە بەر دەرگەهێ وی ئاڤاهی. چاڤێ لەیلایێ کەفتە سەر دیوارێن وی یێن دەرزی و هەڕفتی بانێ وێ یێ شۆڕ بووی و وان پارچەیێن داری یێن درێژ ئەوێن ل سەر پەنجەرکێن چوارگوشە هاتینە دانان کو جامێن وان پێڤە نەمابوون زێدەباری وان هێسکان یێن ل بەر سینگێ دیوارەکێ هەڕفتی هاتینە دانان.

پشتی ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیاین، لەیلایێ دووبارە ئەو تشت گوتنە عەزیزایێ یێن بەری هینگێ گوتینێ.

"ئەگەر پرسیارا بابێ تە ژ تە کر، دێ چ بێژییێ؟"

عەزیزایێ ب هشیاری ڤە گوت: "موجاهدینان یێ کوشتی."

"گەلەك باشە عەزیزا، نوکە تو باش تێگەهشتی؟"

عەزیزایێ گوت: "ژبەرکو ئەڤە قوتابخانەیەکا تایبەتە؟"

نوکە کو ئەو یێ ل ڤێرێ، ئاڤاهی ژی تشتەکێ ڕاستەقینە و دروست دهاتە پێشچاڤێن وێ، گیانێ عەزیزایێ هەموو لەرزی، لێڤێن وێ دلەرزین و پیچەك مابوو بکەتە گری، لەیلایێ دزانی بۆ کچا وێ گەلەك یا ب زەحمەتە ل سەر خوە زالٚ ببیت.

"ئەز ڕاستییێ بۆ بێژم."

عەزیزایێ ب دەنگەکێ نازك و هێدی ئەڤ چەندە گوت، پاشی بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە: "ب ڤی ڕەنگی ئەو من وەرناگرن. ئەو قوتابخانەیەکا تایبەتە. من دڤێت بزڤڕمە مال."

لەیلایێ گوت: "کچا من یا خوشتڤی، ئەز دێ بەردەوام سەرەدانا تە کەم. سوز بیت."

مەریەمێ گوت: "و ئەز ژی."

مەریەم زڤڕی و گوت: "عەزیزایا جان، ئەم دێ بەردەوام سەرەدانا تە کەین و دێ پێکڤە یاریان کەین هەروەکو کا چەوا بەری نوکە مە پێکڤە یاری دکرن. تو ب تنێ بۆ ماوەیەکێ کێم دێ مینیە ل ڤێرێ ئەو ژی هەتا بابێ تە بۆ خوە کارەکی دبینیت."

"ل ڤێرێ وان خوارنەکا باش ژی هەیە."

لەیلایێ ئەڤ چەندە ب ڤەوژاندن ڤە گوت. ب ڕاستی ژی ئەو یا کەیخوش بوو کو بورکە کریە بەر خوە، چونکی عەزیزا ڕوندك و دل شکەستیا وێ نابینیت.

"ل ڤێرێ، تو هەست ب برسێ ناکەی. وان برنج و نان و ئاڤ هەنە. ڕەنگە فێقی ژی هەبیت."

"بەلێ پا تو ل ڤێرێ نابی. خالەتا مەریەم ژی دگەل من نابیت."

مەریەمێ گوت: "ئەز دێ هێمە سەرەدانا تە. سەحکە من عەزیزا، ئەز دێ هێمە دەڤ تە. ئەز دایکا تەمە، خوە هەکە بهێمە کوشتن ژی، دێ هەر سەرەدانا تە کەم."

★★★

ڕێڤەبەرێ ئێتیمخانێ، زەلامەکێ پست خوار و سینگ زراڤ بوو خودان دێمەکێ ڤەکری و کەیفخوش بوو. هەردیسان کەسەکێ کەچەل بوو ڕێهێن وی د ستوور و زڤر بوون و چاڤێن وی ژی وەکو فاسولیا بوون. ناڤێ وی "زەمان" بوو. کولاڤەك ل سەری بوو و شووشەیا بەرچاڤکا وی یا چەپێ ژی یا دەرزی بوو.

دەمێ وی ئەو بەرەڤ ژوورا خوە ڤە دبرین، پرسیارا ناڤێن لەیلایێ و مەریەمێ ژ وان کر و پاشی پرسیارا ناڤێ عەزیزایێ و ژیێ وێ کر. ئەو دناڤ مەمەرەکێ کێم ڕۆناهی ڕا بورین کو زارۆکێن پێخواس ژ وان کونجان دهاتنە دەرێ و تەماشەی وان دکر. پرچێن وان د ڤژ بوون یان ژی د تڕاشی بوون. بلوزێن بێ قومچك و پەنترۆنێن دەلنگ دڕیای و چاکیتێن کون کون ل بەر بوون. بێهنا سابین و پوترا و ئەمونیا و میزێ هاتە دفنێن لەیلایێ. چاڤێ وێ ب عەزیزایێ کەفت گەلەك یا دامایە و ها وەختە دێ ڕۆندك ژ چاڤێن وێ هێنە خوارێ.

لەیلایێ تەماشەی باخچەی کر. گیایەکێ زیانبەخش و پڕی ستری، هێسکێن شکەستی، تائیرێن کەڤن و یاریگەهەکا باسکتبوولێ یا ڤالاً. ئەو ژوورێن د بەرڕا بورین ژی د ڤالاً بوون و پەنجەرکێن وان ب پارچەیێن پلاستیکی دنخافتی بوون. زارۆکەك ژ ژوورەکێ دەرکەفت و چنگلێ لەیلایێ گرت و بزاڤ دکر وێ هەمبێز بکەت. کاربەدەستەك ل وێرێ بوو کو مژوولی پاقژکرنەکا تشتەکی بوو، ڕەنگە میزا زارۆکەکی بیت ل سەر ئەردی، گێزکێ خوە دانا و ئەو زارۆك ژ مەریەمێ دوورخست.

هۆسا یا دیاربوو زەمانی گەلەك ب نەرمی و دلوڤانی سەرەدەری دگەل ڤان زارۆکێن ئێتیم دکر. دەمێ د بەر هندەکان ڕا دچووی دەستێ خوە ب سەرێن وان دئینا خوارێ و

پەیڤەك دوو پەیڤێن نەرم دگوتنێ بێی جوداهی دگوتنە وان. کەیفا زارۆکان ژی گەلەك ب وی دهات و پێشوازی ل گوتنێن وی دکر و تەماشەی وی دکر. لەیلایێ هیڤی خواست ئەو ب ڤی ڕەنگی پێشوازیا وێ ژی بکەن.

پاشی وی ئەو بەرەڤ ئۆفیسا خوە ڤە برن کو ب تنێ ژوورەك بوو و سێ کورسیك و مێزەك و کومەکا کاغەزێن ل سەریەك خڕڤەبووی تێڤە بوون.

زەمانی گوتە مەریەمێ: "هۆسا دیارە تو خەلکا هیڕاتێی، ژ شێوازێ ئاخفتنا تە یا دیارە."

زەمانی ل سەر کورسیەکێ ڕووشنتە خوارێ و دەستێن خوە ل سەر زکێ خوە تێکئالاندن و گوتە وێ کو برایێ هەڤژینا وی ژی ل هیڕاتێ دژیت. سەرەڕای ڕەفتارێن وی یێن ئاسایی ژی لێ لەیلایێ تیبینیا کوالێتیەکا گران د لڤینێن وی دا دکر. هەرچەندە وی ب دەنگەکێ نزم دگرنژی، دیسان وێ هەستپێدکر کو ئاریشەیەك یان برینەك ل پشت وێ گرنژینێ یا ڤەشارتی بوو. بێ هیڤیبوون و شکەستنەکێ خوە ل بن دیمەنێ وی یێ ب گرنژین و ڕووخوش ڤەشارتبوو.

زەمانی گوت: "ل سەر دەمێ خوە وی کارێ دروستکرنا شووشەیان دکر. ڤان ڤازێن شووشەی یێن کەسك وی دروستکرینە. ئەگەر بەرێ وان ل هەتاڤێ بیت، ل دناڤ دا دێ تەیسن خوە دێ بێژی هناڤێن وان پڕی زێڕ و ئەڵماسن. ئەرێ تو نەڤەگەریایە وێ ڕێ ڤە؟"

مەریەمێ گوت: نەخێر.

"ئەز ب خوە خەلکێ ڤەندەهارێ مە. تە ڤەندەهار دیتی یە، خوشکێ؟ یان ژی نە؟ جهەکێ گەلەك خوشە. باخچەیێن وێ! تریێ وێ! ئووه تو نزانی کا چەوا تاما وی دناڤ دەڤێ مرۆڤی دا چەندا خوشە."

کومەکا زارۆکان هاتنە بەر دەرگەهێ و تەماشەی وان دکر. زەمانی ب زمانێ پەشتوونی و ب شێوازەکێ نەرم گوتێ ژ وێرێ هەرن.

"چ پێنەڤێت ئەز حەز ژ باژێرێ هیڕاتێ ژی دکەم، باژێرێ هونەرمەند و نڤیسەر و سۆفی و حەکیمان. ئەرێ ئەو نوکتە ل بیرا تەیە یا دبێژیت تو ل هیڕاتێ نەشێی پێ خوە درێژ بکەی ئیلا دێ پێ تە ب هونەرمەندەکی کەڤیت."

ب ڕەخ لەیلایێ ڤە، عەزیزایێ پرخە پرخەك کر.

زەمانی هۆسا خوە دیارکر کو ئەو یێ کەیفخوشە.

"ئووھ، نوکە. ئەز بۆ مە ئەگەر کەنیا تە بهێت خوشکا بچووك. پترییا جاران ئەڤە بەشێ هەرە ب زەحمەتە. ئەز یێ دوودل بووم، بۆ ماوەیەکی. ل دەستپێکێ من هزردکر پێدڤیە وەکو مریشکێ قد قدێ بکەم یان وەکو گوهدرێژی بزرم داکو کەیفا تە بهێت. لێ ئاها ئەڤە نوکە تو یا ل ڤێرێ، تو گەلەکا خوشتڤی."

پاشی وی گازی خزمەتکارەکی کر کو بۆ ماوەیەکی عەزیزایێ ببەتە ژ دەرڤە، لێ عەزیزایێ ب هێز دەهمەنا مەریەمێ گرت و نەبەردا.

لەیلایێ گوتی: "خوشتڤیا من ئەم دێ پیچەکێ ئاخڤین، ئەز یا ل ڤێرێ، باشە؟ ئەڤە ئەزم."

مەریەمێ گوت: "عەزیزا جان دا بێهنەکێ بچینە ژ دەرڤە؟ دایکا تە دێ پیچەکێ دگەل مامێ زەمان ئاخڤیت. ب تنێ بۆ چەند خولەکەکان. دێ دا بچین."

دەمێ ئەو چووینە ژ دەرڤە، زەمانی پرسیارا بەرواری ژ دایکبوونا عەزیزایێ کر و کا چ نەخوشی و ئاریشە ل دەڤ وێ نینن. هەردیسان پرسیارا بابێ وێ ژێ کر. لەیلا د تاڤیکرنەکا سەیر دا بوری چونکی ل دووڤ دلێ خوە وێ بەرسڤا وی ب کومەکا درەوان ددا لێ د ڕاستی دا هەمو درەو نەبوون بەلکو هەموو د ڕاست بوون. زەمانی ژی گوهێن خوە بۆ کەڕ کربوون و ب سیمایەکێ نیڤ باوەرپێکرن و نیڤ گومان تەماشەی وێ دکر.

هەردیسان گوت کو ئەو ب شێوەیەکێ سەرڤەراز ڤێ ئێتیمخانێ ب ڕێڤە دبەت. ئەگەر خوشکەك بێژیتە وی کو هەڤژینێ وێ یێ مری و ئێدی نەشێت زارۆکێن خوە ب خودان بکەت، ئێدی ئەو چ پرسیارێن دی ژێ ناکەت.

لەیلایێ دەست ب گرییێ کر.

زەمانی پێنۆسێ خوە دانا سەر مێزێ. لەیلایێ کو دەستێ خوە هاڤێتبوو بەر دەڤێ خوە، گوت: "ئەز گەلەك یا شەرم دکەم"

"سەحکێ خوشکا من."

"ئەرێ ئەو کیژ دایکە دشێت دەستبەرداری زارۆکێن خوە ببیت."

"تەماشەی من بکە."

لەیلایێ سەرێ خوە بلند کر.

"ئەڤ چەندە ژ خەمساریا تە نینە، گوهێ تە ل منە؟ ئەڤە نە ژ خەتاییێن تەنە بەلکو خەتاییێن وان دڕندانە. ئەز هندەك جاران شەرم دکەم کو ئەز پەشتوونی مە چونکی وان ناڤێ گەلێ من ژی یێ پیسکری. تو یا ب تنێ نینی خوشکێ. گەلەك دایکێن دی یێن وەکو تە بەردەوام سەرەدانا ڤێرێ دکەن. بەردەوام ئەو دایکێن دهێنە ڤێرێ ئەون یێن نەشێن زارۆکێن خوە ب خودان بکەن، چونکی تالیبان ڕێکێ نادەتێ بچنە ژ دەرڤە شول بکەن. ژبەر هندێ لومەی خوە نەکە و کەس ل ڤێرێ لومەی تە ناکەت. ئەز باش د تە دگەهم."

پاشی خوە بۆ پشتێ زڤڕاند و پالا خوە دا کورسیکێ و گوت: "خوشکا من، ئەز باش د ڤێ چەندێ دگەهم."

لەیلایێ ب ڕەخەکێ بورکەی چاڤێن خوە پاقژ کرن.

زەمانی ئاخینکەك ڕاهێلا و دەستێ خو بلند کر و گوت: "دەربارەی ڤی جهی ژی، تو ب خوە یا دبینی ڕەوشا مە چەند یا پەریشانە. مە چ داهات نینە. بەردەوام ل ڤێرێ ژی قەرەبالغە و هەموو شولێن مە د سەرپێ نە. ئەم تشتەکێ کێم ژ تالیبانێ وەردگرین لێ هندەك جاران هەر چ نادەنە مە. لێ ئەم دشێن خوە ب ڕێڤە ببەین. هەروەکو تە، ئەم ژی وێ چەندێ دکەین یا ژ مە دهێت. خودا یێ مەزن و دلوڤانە و ئەو ڕزقی ددەت. هندی ئەو ڕزقێ مە بدەت ئەز ناهێلم عەزیزا بمینتە بێ خوارن و جلك. ئەز دشێم ڤێ سوزێ بدەمە تە."

لەیلایێ سەرێ خوە هەژاند.

"باشە؟"

پاشی ب دلوڤانی ڤە بۆ لەیلایێ گرنژی و گوت: "تو ژی نەکە گری خوشکێ. من نەڤێت تە ب سەروچاڤێن گری ڤە ببینم."

لەیلایێ دووبارە چاڤێن خوە پاقژ کرن و ب دەنگەکێ کزگریوك ڤە گوت: "خودا تە بپارێزیت، خودا تە بپارێزیت برا."

★★★

دەمێ وەختێ خاترخواستنێ هاتی، ئەو دیمەنە ڕوودا یێ بەری هینگێ لەیلایێ پێشبینیی بۆ دکری.

عەزیزا گەلەك ترسیا.

ب درێژاهیا رێكێ ل دەمێ ڤەگەریا وان بۆ مال، سەرێ لەیلایێ ل سەر ملێ مەریەمێ بوو و هێشتا دەنگێ ڤێژیێن عەزیزایێ د گوهێن وێ دا دەنگڤەددان. بەردەوام ئەو دیمەن ل پێشچاڤێن وێ بوون كا چەوا دەستێن زەمانی یێن زڤر و ب هێز هەردوو ملێن عەزیزایێ گرتبوون. ل دەستپێكێ هێدی و پاشی گرانتر و ل دوماهیێ ژی ب هێز ئەو ڕاكێشا هەتا ژ لەیلایێ ڤەكەت.

لەیلایێ دیت كا چەوا عەزیزایێ پێهن ل وی ددان و وی ژی ب هێز ئەو گرتبوو بەرەڤ كوژیەكێ ژوورەكێ ڤە دبر. عەزیزایێ هۆسا دكرە ڤێژی دا بێژی ها ئەو دێ ب یەكجاری ل سەر ڕوویێ ئەردی بەرزە بیت. هەردیسان ئەو ب خوە ژی هاتە پێشچاڤ كا چەوا پشتی هینگێ ئەو بلەز ژ وی ئاڤاهی دەركەفت و سەرێ خوە چەماند و دەنگێ وێ د گەوریا وێ دا ئاسێ بوو.

ل مال وێ گوتە مەریەمێ: "هێشتا بێهنا وێ یا دهێتە دفنێن من."

بەرێ وێ ب ملێ مەریەمێ كەفت، ئەو ملێ هەموو گاڤان عەزیزا هەمبێز دكری، پاشی بەرێ وێ كەفتە باخچەی، دیواران، چیایێن ڤەهوای، هەروەكو تڤا كەسێ جگاركێش.

"بێهنا جهێن وێ یێن نڤستنێ یا دهێتە من. ئەرێ دهێتە تەژی؟ بێهنا وێ دهێتە تە؟"

مەریەمێ گوت: "ئاهـ لەیلا جان، ڤێ چەندێ نەكە، ئەرێ چ مفا تێدا هەیە تو وەبكەی؟ چ مفا تێدایە؟"

★★★

ل دەستپێكێ، ڕەشیدی ل دووڤ دلێ لەیلایێ دكر و بەردەوام دگەل وێ و مەریەمێ و زەلەمای دچوو ئێتیمخانێ. لێ ب ڕێكێ ڤە، وی دڤیا ژ هندێ یێ پشتڕاست بیت كو لەیلایێ ئاگەهـ ژ دێمێ وی یێ بێزار هەیە و گوهـ ل چیپ چیپا وی ژی هەیە و هەست ب هندێ بكەت كا چەوا وێ ڕەوشا وی یا نەخوش كری.

بەردەوام گازندە ژ هندێ دكرن كو ئەڤ ڕێكا درێژ یا ئێتیمخانێ دبیتە ئەگەر دەست و پێ و پشتا وی ب ئێشیت. وی دڤیا لەیلا بزانیت كا ئەو چەند ژبەر ڤێ هاتنوچوونێ یێ بێتاقەت بووی.

"ئەز نە ئەو ڕەشیدێ گەنج یێ جارامە، لێ بۆ تە چ تشت خەم نینن. ئەگەر تە ڕێکەکا دی هەبا، نوکە ژ مێژە تە ئەز هاڤێتبامە ژ دەرڤە، لێ تە چ ڕێکێن دی نینن. لەوا تو نەشێی وەبکەی."

هەموو جاران ڕەشید ل دووراتیا دوو کولانان ژ ئێتیمخانێ دڕاوەستیا و پتر ژ چارێك دەمژمێرێ وەخت نەددایێ. ڕەشیدی دگوت: "هوون یەك خولەك گیرو ببن، ئەز دێ چم و خوە ل هیڤیا هەوە ناگرم. ئەز تڕانا ناکەم."

لەیلایێ گەلەك هیڤی ژێ دکرن هەتا ڕازی بکەت کو پیچەکێ زێدەتر خوە ل هیڤیا وان بگریت داکو ئەو زێدەتر بمینتە ل دەڤ عەزیزایێ. ئەڤ داخوازیە نە ب تنێ بۆ وێ بوو، بەلکو بۆ مەریەمێ ژی بوو ئەوا ژبەر چوونا وێ هەست ب خەمگینیێ دکری، ئەوا هەموو گاڤان ب بێدەنگی خەمێن خوە دڤەڕەڤاندین. هەردیسان بۆ زەلەمای ژی بوو، ئەوێ هەموو گاڤان دکریە گری و داخوازا خوشکا خوە دکر و دکەفتە ڕکێ و گرییێ و ب چ تشتان تەنا نەدبوو.

هندەك جاران ل نیڤا ڕێکا بەرەڤ ئێتیمخانێ دا ڕەشید ڕاوەستیت و بێژیت پێن من یێن دئێشن. پاشی دا بەرەڤ مال زڤڕیت و ڕێکا خوە گریتە بەر و پێنگاڤێن بلەز دهاڤێتن بێی کو بواستییێت یان گازندان بکەت.

یان ژی هندەك جاران دا بێژیت ڤێ چەندێ پەیوەندی ب سیهێن من ڤە هەیە. بێهنا من یا تەنگ بووی و دێ زڤڕینە مال، بەلکو سوباهی یان دوزبا ئەز باشتر لێ بهێم پاشی دێ هێنە ڤە. دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان ئەو زەحمەت ژی بۆ خوە چێنەدکر کو ب درەو ڤە بێهنا خوە تەنگ بکەت یان کوور بهەلکێشیت، بەروڤاژی دەمێ ل زڤڕینێ بۆ مال دا جگارەکێ بەردەتێ.

لەیلایێ ژی کو وەخت بوو ژ ڤەهرادان بمریت، ب پت پت ڤە دکەفتە دووڤ وی و بەرەڤ مال دزڤڕین. پشتی هینگێ گوتە لەیلایێ کو ئێدی ئەو دگەل وان ناچیتە وێرێ.

"هەموو ڕۆژان ئەز ژ سپێدێ هەتا ئێڤاری جادەیان دشەڤینم و ل دووڤ کارەکی دگەڕییێم، ئێدی ئەز گەلەك واستیام."

لەیلایێ گوت: "باشە پاشی ئەز ب تنێ دێ چم. تو نەشێی ببیە ڕێگر د ڕێکا من دا، ڕەشید، تە گوهلێبوو؟ هندی تە دڤێت من بقوتە لێ ئەز دێ بەردەوام چمە وێرێ."

"تە چ دڤێت وە بکە، لێ نو نەشیێ خوە ژ سنورێن تالێبانێ قورتال بکەی. پاشی نەبێژە تە ئەز ئاگەهدار نەکربووم."

مەریەمێ گوت: "ئەز ژی دێ دگەل تە هێم."

لەیلا ڕازی نەبوو کو مەریەم دگەل وێ بچیت.

"من دڤێت تو ل مال دگەل زەلەمای بمینی، ئەگەر وان ئەز گرتم ژی من نەڤێت زەلەمای ب وی ڕەنگی من ببینیت."

ئێدی ژیانا لەیلایێ ب ڤی ڕەنگی دەربازبوو، ل وان ڕێکێن نهێنی و کورت دگەریا یێن ئەو بۆ دەڤ عەزیزایێ دبر. پتریا جاران نەدشیا خوە بگەهینتە ئێتیمخانێ. دەمێ د جادێ ڕا دبوری دا تالێبان هێنە پێشیا وێ و گەلەك پرسیاران ژێ کەن و سەرێ وێ گێژ کەن: ناڤێ تە چیە؟ دێ کیڤە چی؟ بۆچی تو یا ب تنێ؟ بوچی مەحرەمەك دگەل تە نینە؟ پشتی هینگێ ئەگەر یا ب بەخت بایە دا وێ ب سەلامەتی زڤڕینە مال. لێ گەلەك جاران ژی ئاخفتنێن کرێت دگوتنێ و شەق لێددان یان ژی ب قامچی و شەق و کولم و پێهنان ئەو فرێدکرە مال.

ڕۆژەکێ، تالێبانەکێ گەنج ب ئریالێ ڕادیویێ قوتا و ل دوماهیێ ژی یەك ل پشتێ دا و گوت: "جارەکا دی ئەز تە ب تنێ بینم دێ هند دانمە تە هەتا شیری دایکا تە دایە تە ژ هەستیکێن تە ب دەرکەڤیت."

وێ ڕۆژێ لەیلا زڤڕی مال و ل سەر زکی د خەو چوو، وەکو گیانەوەرەکێ گێژ و بێ بها خوە ددیت کو جهێ دلپێڤەمانێ بوو. دەمێ مەریەمێ پاتەکێ تەڕ ل سەر پشت و ڕانێن وێ ڕا ئینای و بری، لەیلایێ ژبەر ئێشانێ دەست ب ئاخ و ئوفان کر. سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ ژی، لەیلایێ خوە ب دەستڤە بەرنەددا و هۆسا بۆ دیاردکر کو دێ زڤڕیتە مال، لێ دەمێ ژ وان دوور دکەفتی دا د جادەکا دی ڕا چیت.

هندەك ڕۆژ هەبوون دوو یان سێ یان هەتا چوار جاران ژی ئەو دگرت و پرسیار ژێ دکرن و ڕەزیل دکر، پاشی ب قامچیان دقووتا. ئەو ژی ب لەشەکێ خویناوی ڤە بێی کو چاڤێ وێ ب عەزیزایێ بکەڤیت ڕێکا مال دگرت. ئێدی لەیلا فێری هندێ بوو، سەرەڕای گەرما هاڤینێ یا دژوار، وێ جلکێن زێدە ژی دکرنە بەر خوە، دبن بورکەیی ڤە دا سێ چوار بلوزەکان کەتە بەر خوە داکو ل دەمێ قوتانێ کێمتر هەست ب ئێشانێ بکەت.

دەمێ ئەو ژ دەستێن تالیبان ڕزگار دبوو، هەر یەکسەر پاداشتا خوە وەردگرت، ئێدی هندی وێ ڤیابایە و بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران دا ل دەڤ عەزیزایێ مینیت. دناڤ حەوشێ دا، ل سەر هێسکێ و دگەل زارۆکێن دی و دایکێن وان درونشتە خوارێ و بەحسێ وان تشتان دکر یێن عەزیزا د ماوەیێ وێ حەفتیێ دا فێربوویێ.

عەزیزایێ گوتە دایکا خوە کو زەمانی بڕیار یا دای هەڕۆژ وان فێری تشتەکی بکەت. پتریا ڕۆژان دەمێ وان ب خواندن و نڤیسینێ ڤە دچیت، هندەك جاران بابەتێن جوگرافیایێ و دیرۆك و زانست و پێزانێنا ل دور ڕوەك و گیانەوەران ددەتە وان.

پاشی گوت: "بەلێ دڤێت ئەم پەردان بەردەین داکو تالیبان مە نەبینن. دادێ، مامێ زەمانی هندەك دەرزیك و سۆف یێ دانایە وێرێ داکو دەمێ ژ نیشکەکێ ڤە تالیبان دهێنە دەڤ مە، بلەز پەرتووکێن خوە بڤەشێرین و هۆسا خوە دیاربکەین کو ئەم مژوولی چنین و ڕستنا جلوبەرگاینە."

دەمێ ڕۆژەکێ ئەو چوویە دەڤ عەزیزایێ، وێ ژنەکا سەرە دیت کو بورکە ل سەر سەرێ خوە هاڤێتبوو و هاتبوو دەڤ سێ کور و کچەکێن خوە. دێمێ وێ یێ پەحن و بریێن وێ یێن بوش بۆ لەیلایێ د بیانی نەبوون. لێ دەڤێ وێ یێ د ناڤێکداچووی و پرچا وێ یا ڕەنگ گەور بۆ وێ د ئاشنا نەبوون. دەرسوکا ل سەر ملێن وێ، تەنوۆڕەیێ وێ یێ ڕەش، دەنگێ وێ نازك و  چەوانیا شێوازێ بلندکرنا پرچا وێ کو بۆ پشتێ دبر ل سەر شێوێ کێکێ کو ب ڕەنگەکی داڤێن موویێن سەر پاتکا وێ دیاردکرن.

ئەڤ تشتە هەموو هاتنە بیرا وێ. هەردیسان هاتە بیرا لەیلایێ کو ئەڤە ئەو ژن بوو یا نەدهێلای قوتابیێن وێ دەرسوکێ بکەنە سەرێ خوە و دگوت کو ژن و زەلام د یەکسانن، مادەم زەلام دەرسوکێ نەکەنە سەرێن خوە پا بوچی دێ ژن کەنێ؟ خالەتا ڕەنگمال سەرێ خوە بلند کر و چاڤێ وێ ب چاڤێ لەیلایێ کەفتن. لێ لەیلایێ چ سیمایێن نیاسین بیرهاتنێ د دیمێ ماموستایا خوە یا کەڤن دا نەدیتن.

***

عەزیزایێ گوت: ل سەر ڕوویێ ئەردێ ڤی ئاڤاهی، هندەك دەرز هەنە دبێژنێ "شەق".

ل دەمێ پشتی نیڤرۆیەکا گەرم ل ڕۆژەکا ئەینی یا هەیڤا خزیرانا 2001ێ، ئەو هەر چوار پێکڤە دناڤ حەوشا ئێمتیخانێ دا ڕوونشتبوونە خوارێ: لەیلا، زەلەمای، مەریەم و عەزیزا. ڤێ جارێ ڕەشید پیچەکێ دل نەرم ببوو. ل ڤان دوماهیان پیچەکێ دلێ وی نەرمتر لێ هاتبوو، ژبەر هندێ ئەڤ جارە دگەل وان هاتبوو. ڕەشیدی ل نێزیکی گۆڕەپانا پاسەیان کو دکەفتە بنێ وێ جادێ، ل هیڤیا وان ڕاوەستیابوو.

کومەکا زارۆکێن پێخاس ل دەوروبەری وان دکرە غار و پێهن ل تەپەیەکا کەڤن ددان و بلند دکر و هەموویان پێکڤە ل دووڤ دکرە غارێ.

عەزیزایێ گوت: "ل سەر هەر لایەکێ وان شەڤان دا، تەخەکا بەران هەیە و وی ئەردی دنخێڤن."

کەسەکی پرچا عەزیزایێ بۆ پشتێ بربوو و کربوونە کەزیك و توقەك ل سەرێ وێ ژی دابوو. ئەو چەندە بۆ ئەگەر لەیلا حەسیدیێ ب وی کەسی ببەت یێ کچا وێ دانایە بەر سینگێ خوە و ژ پشتێ ڤە پرچا وێ بۆ کرینە کەزیك و ڤەهاندین.

ژ بۆ پتر ڕوهنکرنا ئاخفتنێن خوە، عەزیزایێ هەردوو دەستێن خوە بلند کرن و ل سەر یەك خشاندن. زەلەمای ژی ب کەیف و جوشەکا مەزن ڤە گوهداریا ئاخفتێن وێ دکر.

"دبێژنە وان ڕوویێن ئەردی، تەخێن کیکتونیکی."

لەیلایێ گوت: "چ؟ تیکتونیك؟"

ئێدی ئاخفتن بۆ لەیلایێ یا گران بوو ئەو دئێشان، چونکی هێشتا شەپیلکێن وێ د بریندار بوون و پشت و ملێن وێ دئێشان. لێڤێن وێ ژی وەڕمتبوون و بەردەوام ئەزمانێ وێ دچوو دناڤ وێ ڤالاهیا ددانێ وێ یێ خوارێ دا ئەوێ ڕەشیدی بەری دوو ڕۆژان لێ شکاندی.

بەری مرنا دایك و بابێن وێ و گوهۆڕینا ژیانا وێ ب یەکجاری، لەیلایێ قەت باوەرنەدکر کو لەشێ مرۆڤی دشێت خوە ل بەر هەموو لێدان و قووتان و نەخوشیان بگریت و دگەل هندێ شولێ خوە ژی بکەت.

"باشە، ئەگەر ئەو بکەڤنە سەر یەك، دێ مینە پێکڤە و ل سەر یەك هێنە ڕاکێشان، تو تێدگەهی دادێ؟ هۆسا دێ تێهنەك ژێ دەرکەڤیت و بەرەڤ ئەردی بلند بیت و ئەردی لەرزینیت."

مەریەمێ گوت: "هۆسا دیارە هێدی هێدی تو یا  زیرەك دبی، گەلەك زیرەکتر ژ خالەتا خوە یا نەفام."

سەروچاڤێن عەزیزایێ سۆر بوون. پاشی گوت: "نەخێر تو نەیا نەفامی، خالەتا مەریەم. هەردیسان مامێ زەمان دبێژیت کو هندەك جاران ل کووراتیەکا مەزن ل بن ئەردی، بەر جهێن خوە لێکدگوهۆڕن، ئەو چەندە ژی گەلەك یا ب هێز و ب مەترسی یە، لێ ئەم ل سەر ئەردی ب تنێ هەست ب لەرزینەکا بچووك دکەین، لەرزینەکا سڤك."

ل سەرەدانا وان یا بەری هینگێ دا، لەیلایێ بەحسێ گەردیلەیێن ئوکسجینی بۆ کربوو کا چەوا پێلێن شین یێن تیشکا هەتاڤێ دناڤ ئەسمانی دا بەلاڤ دکەن و کا چەوا ئەگەر ئەردی بەرگێ بای نەبایە، ڕەنگێ ئەسمانی شین دیارنەدکر بەلکو وەکو دەریایەکا ڕەش دا خویا کەت، هەردیسان گوتێ کو هەتاڤ ژی ستێرەکا مەزنە دناڤ تارڀاتییێ دا.

زەلەمای گوتێ: "ئەرێ ما تو ڤێ جارێ دگەل مە ناهێیە مال؟"

لەیلایێ گوت: "ل دەمەکێ نێزیك، خوشتڤییێ من، ل دەمەکێ نێزیك."

لەیلایێ تەماشەی وی کر کو وەکو بابێ خوە ب پشت چەماندی و تبلێن خوە یێن ل سەر یەك شداندی برێڤە دچیت. زەلەمای بەرەڤ هێسکێ چوو پاڵەك لێدا و پاشی ل سەر ئەردێ کونکریتی ڕوونشت و ئەو گیایێ دبەر لێڤێن وی ڕا شین بووی ئینا دەرێ.

"دادێ تو دزانی ئاڤا ل سەر بەلگان دبیتە هەلم؟ وەکو وێ هەلما ل سەر جلکێن شووشتی یێن ل سەر ڕستێ دهێنە دانان. ئەو ئاڤ ژی دناڤ ڕوەکان دا ژ بنی بۆ سەری بلند دبیت. ل دەستپێکێ دناڤ ئاخێ دا ژ لایێ ڕهێن داروباری ڤە دهێتە مێژان و پاشی دچیتە دناڤ قورمێ وان دا و بەرەڤ لقێن وان دچیت هەتا دگەهیتە ناڤ بەلگان، دبێژنە ڤێ چەندێ خوهدان*."

لەیلایێ گەلەك جاران پرسیار ژ خوە دکر ئەرێ ئەگەر جارەکێ تالێبان زانی مامێ زەمان ب دزیکی ڤە وانەیان ددەتە زارۆکان، ئەو دێ چ ب سەرێ وی ئینن؟

---

* خوهدان  Transpiration کریارەکا بایولوژی یە کو تێدا ڕوەك ب ڕێکا ڕهێن خوە دناڤ ئاخێ دا ئاڤێ دمێژیت و پاشی ب ڕێکا کونێن ل سەر بەلگێن داران یان ژی چەق و گولێن وێ خو ژ ئاڤا زێدەتر ڤورتال دکەت چونکی ڕوەك پێدڤی ب برەکا کێم یا وێ ئاڤێ دبیت ئەوا ژلایێ ڕهان ڤە دهێتە مێژتن و نێزیکی 97٪ ژ ئاڤا مایی ب ڕێکا هەلبوونێ ژێ دەردکەڤیت.

دەمێ وان سەرەدانا عەزیزایێ دکری، وێ بێهنا خوە فەت نەڤەددا و بێدەنگ نەدما بەلکو هەر ڤالاهیەك ب ئاخفتنێ پڕ دکر. دەنگێ وێ یێ بلند بوو دگەل ئاخفتنێ دەستێن خوە ژی بکاردئینان. نوکە ئەو دەستێن خوە هۆسا دلڤلڤینیت و بلند دکەت کو بەری هینگێ وەنەدکر، هەردیسان کەنیا وێ یا نوو ژی، کو د ڕاستی دا کەنی نەبوو، بەلکو هندەك دەربڕینێن تۆڕەبوونێ بوون، وەك گازندە یان نەڕازیبوونان، وێ ئەڤ چەندە دکر داکو یێن دی باوەریا خوە ب ئاخفتنێن وێ بینن.

هندەك گوهۆڕینێن دی ژی ل دەڤ عەزیزایێ پەیدابوون. لەیلایێ تیبینیا وێ پیساتیێ کر یا د بن نینوکێن عەزیزایێ ڤە. دەمێ عەزیزایێ ژی زانی چاڤێ دایکا وێ ب نینوکێن وێ کەفت، هەر یەکسەر دەستێن خوە دانانە بن ڕانێن خوە ڤە.

هەردەمێ زارۆکەکێ ب ڕەخ وان ڤە کربایە گری، یان ئاڤا دفنا وی هاتبایە خواری یان زارۆکەکێ ڕیس ل بەر وان ڕا بوری بایە و پرچا وێ یا پیس بایە، هەر یەکسەر عەزیزا دا هێجەتەکێ پێش سەروبەرێ وی ڤە گریت. هەروەکو وان خودانێن مالێ یێن هەست ب شەرمێ دکەن دەمێ دزانن چاڤێ مێهڤانەکی ب تشتەکێ پیس یێ دناڤ مالا وان دا کەڤت یان چاڤێ وان ب سەروبەرێ نەڕێکوپێك یێ زارۆکێن وان دکەڤیت.

دەمێ وان پرسیارا ڕەوشا وێ ژی کربایە، دا ب بەرسڤەکا ئالۆز و نەڕوهن بەرسڤا وێ دەت، لێ ب دلەکێ خوش و بەختەوەر ڤە.

"ئەم دباشین خالەت، ئەز ژی یا باشم."

"ئەڤ زارۆکە زیانێ ناگەهینتە تە؟"

"نەخێر دادێ، هەموو گەلەك دباشن."

"ئەرێ خوارن و نڤستنا هەوە یا باشە؟"

"ئەم خوارنێ دخوین، دنڤین، بەلێ. دوهی ب شەڤ بۆ شیڤێ مە گوشتێ بەرخی خوار. نە نە، ئەز دبێژم حەفتیا بوری بوو."

دەمێ عەزیزا ب ڤی ڕەنگی دئاخفتی، لەیلایێ هندەك ساخلەتێن مەریەمێ تێدا ددیتن.

نوکە دەمێ عەزیزا دئاخڤیت، ئەزمانێ وی دئالڵزیت. ل دەستپێکێ مەریەمێ د ڤێ چەندێ ئینا دەر، هەرچەندە ئالڵزیانا ئەزمانێ وێ یا کێم بوو لێ مرۆڤی هەستپێدکر،

نەخاسم د وان پەیڤان دا یێن ب پیتا "ت" دەستپێدکری. لەیلایێ پرسیارا زەمانی کربوو دەربارەی ڤێ چەندێ، وی دێمێ وێ خاڤ کر و گوت: "یا ژ من ڤە خوە ل دەستپێکێ ئەو یا هۆسا بوو."

پشتی نیڤرو یا وێ رۆژێ کو رۆژا ئەینی بوو، ئەو دگەل عەزیزایێ بۆ گەریانەکا کورت چوونە ژ دەرڤە و ل نێزیکی گەراجێ پاسەیان رەشید دیت کو ل وێرێ چاڤەرێی وان بوو. دەمێ چاڤێ زەلەمای ب رەشیدی کەفتی، کەیفادا کرە قێژی و خوە ژ ملێ لەیلایێ هاڤێت و بەرەڤ وی ڤە چوو. هەرچەندە سلاڤا عەزیزایێ بۆ رەشیدی یا هشك و بێ هەست بوو، لێ دگەل هندێ یا توند و رەق ژی نەبوو.

رەشیدی گوتێ پێدڤیە ئەم لەزێ بکەین چونکی ب تنێ من دوو دەمژمێر هەنە و دڤێت پشتی هینگێ بزڤرمە سەر کارێ خوە. ئەڤە یەکەم حەفتی بوو رەشید وەکو زێرەڤان ل بەر دەرگەهێ هوتێلا ئینتەرکونتینتال کاردکر، ژ نیڤرۆ هەتا دەمژمێر هەشتێ شەڤێ و د حەفتیێ دا شەش رۆژان.

رەشیدی دەرگەهێن ترۆمبێلان ڤەدکرن و چانتەیێن وان دهەلگرتن و هندەك جاران ژی دەمێ تشتەك رێژتبایە سەر ئەردی، ئەو دا پاقژ کەت. هندەك جاران ژی، ل دوماهیا رۆژێ، زادلێنەرێ خوارنگەها هوتێلێ دەلیڤە ددا رەشیدی هندەك بەرمایکێن خوارنێ دگەل خوە ببەتە مال مادەم ئەو ڤێ نهێنیێ دپارێزیت، وەك گوشتێ تەزی بووی یێ دناڤ دوهنی دا سۆرکری، رانکێن مریشکان یێن پیستێ وان سارِ و هشکبووی، مەعکەرۆنێن نەهێتە جووین و برنجا رەقبووی.

رەشیدی سوز دابوو لەیلایێ هەر دەمێ وی هندەك پارە بدەستخوە ڤە ئینان، دێ عەزیزایێ ڤەگەرینتە مال.

رەشیدی بەدلا خوە یا کاری دکرە بەر خوە کو بەدلەکا بورگەندی یا رەنگ سۆر بوو دگەل قەمیسەکێ سپی و بوینباغەکا حەفکێ. هەردیسان کولاڤەکێ ب شەوقە ژی پرچا وی یا سپی دڤەشارت.

خولکێ رەشیدی ب ڤان جلکێن فەرمی دهاتە گوهۆرین. ئەو وەکو کەسەکێ لاواز و حەیری و بێ زیان دهاتە پێشچاڤ. کەسەك بوو یێ ب رەوشا خوە رازی بوو بێی کو خو گازندەیەکا بچووك بکەت خوە ل بەر وان هەموو نەخوشی و سفکاتیان دگرت یێن ژیانێ ل

سەر وی سەپاندین. کەسەك بوو هەڤالینیا وی جهێ دلپێڤەمان و د هەمان دەم دا شانازیێ بوو.

ئەو هەمموو پێکڤە سواری پاسێ بوون و بەرەڤ باژێرێ تایتانیك ڤە چوون، دناڤ زەڤی و ڕووبارێ هشك ڕا دەرباز دبوون کو ل هەردوو لایێن ڕووباری هندەك خانیکێن بەروەخت هاتبوونە ئاڤاکرن.

ل نیزیکی پرێ کو ب دەرەجکان دچوونە خوارێ، وان زەلاّمەکێ پێخاس دیت کو ب سلنگەکی ڤە هاتبوو گرێدان و یێ مری بوو. گوهێن وی هاتبوونە برین و سەرێ وی ل سەر دوماهیا وەریسکێ سێدارەدانێ شۆر ببوو.

دناڤ ڕووبارێ هشکبووی دا، وان هژمارەکا مەزن یا خەلکی ددیت کو ژ بۆ کرینا کەلوپەلان هاتبوونە وێرێ. ئەوێن پارە دگوهۆڕین، کرێکارێن بێزارکەر یێن ڕێکخراوێن نەحکومی، جگارەفرۆش، ئەو ژنێن سەروچاڤێن خوە ڤەشارتین و ڕاجێتێن دەرمانان یێن سەختە دانابنە بەر سینگێ خوە و خازخوازوکی دکری.

تالّیبان دناڤ وێ قەرەبالغێ دا دهاتن و چوون و قامچی د دەستان دا بوون و بەنیشتێن "ناسوار" دجووین جورەکێ بەنیشتانە ددانانە بن ئەزمانێ خوە و خوشیەکا بەروەخت ژێ پەیدادبیت، چاڤێ وان لێ بوو کا دێ کی کەنیەکا کرێت کەت یان ژنەك بورکەی ل سەر سەروچاڤێن خوە هاڤێژیت.

ل کوژیەکێ فرۆتنا یارییێن زارۆکان، چاڤێ زەلەمای ب تەپەکا باسکتبولێ کەفت کو هێلێن زەر و شین ل سەر بوون، وی دەستێ خوە هاڤێتێ داکو بابێ وی بۆ بکڕیت.

ڕەشیدی گوتە عەزیزایێ: "توژی بۆ خوە تشتەکی هەلبگرە."

عەزیزایێ بەرسڤا وی نەدا.

"دێ لەزێ بکە، پێدڤیە دەمژمێرەکا دی ئەز ل سەر کاری بم."

عەزیزایێ ئامیرەك هەلبژارت کو بەنیشتێ گرۆڤر ژێ دهاتە دەرێ. پێدڤی بوو ل کونا وێ یا سەری پارەیەك کربا تێدا هەتاکو ل کونا وێ یا خوارێ بەنیشتێ شیرین ژێ دەرکەفتبایە. ل دوماهیێ دووبارە پارە ژی ل خوارێ دهاتە دەرێ.

دەمێ خودانێ دكانێ بهایێ وێ گوتی، ڕەشیدی بریێن خوە بلندكرن و هەردوو ملێن خوە هەژاند و ب تونەكا ڕەق گوتە عەزیزایێ: "بدانە جهێ وی، پارێ پێدڤی بۆ هەوە هەردووكا دگەل من نینە."

وی هۆسا ب ڕەقی دگەل دئاخفت دا بێژی بەری هینگێ عەزیزایێ خورتی یا ل وی كری ژ بۆ كڕینا وی ئامیرەی.

د ڕێكا خوە دا بەرەڤ ئێتیمخانێ، عەزیزا پتر تێكدچوو. ئێدی نەدشیا دەستێن خوە بلڤلڤینیت و دێمێ وێ ژی پتر تێكدچوو، ب ڕاستی ژی هەموو گاڤان ئەو یا هۆسا بوو. ل دووڤ دا گەڕا لەیلایێ هات كو دگەل مەریەمێ كەفتبوو سحبەت و تڕانەیان.

پشتی هینگێ، دەمێ ڕەشید ژ دەڤ وان چووی و سوارێ پاسێ بووی داكو بگەهیتە سەر كارێ خوە. لەیلایێ تەماشەی عەزیزایێ دكر دەمێ ب ڕەخ دیوارێ ئێتیمخانێ ڤە دبوری و بۆ خاترخواستنێ دەستێ خو بلند كر. ئالزیانا ئەزمانێ وێ هاتە بیرا لەیلایێ، هەردیسان سحبەتێن وێ یێن بەری هینگێ ل دور دەرزێن ئەردی و لێككەفتنا بەران دناڤ كووراتیا ئەردی دا و كا چەوا هندەك جاران ئەم ل سەر ئەردی هەست ب لەرزینەكا كێم و سڤك دكەین.

***

زەلەمای كرە ڤێری: "هێی تو، ژ وێرێ هەرە، ژبەر دەرگەهێ مە دوور كەڤە."

مەریەمێ گوت: "هشە، تو ل كێ دكەیە ڤێری؟"

زەلەمای دەستێ خوە درێژ كر و گوت: "ل سەر زەلامێ هەنێ."

لەیلایێ تەماشەی وی جهی كر یێ وی دەستێ خوە بۆ بلند كری. زەلامەك ل بەر دەرگەهێ وان ڕوونشتبوو و پالا خوە دابوو دەرگەهێ وان. دەمێ وی دیتی لەیلا ئەو یێ بەرەڤ مال دهێن، سەرێ خوە بلند كر و دەستێن خوە ژێكڤەكرن و چەند پێنگاڤەكان بەرەڤ وان ڤە هات.

لەیلا د جهێ خوە دا هشك بوو. ڤێژیەكا بێدەنگ ژ گەوریا وێ دەركەفت. لەیلایێ دڤیا یان پێدڤی ب هندێ بوو دەستێ خوە بۆ دەستێ مەریەمێ یان ملێ وێ یان هەر تشتەكێ وێ بەت و خوە پێڤە بگریت، لێ ئەو نەدشیا ڤێ چەندێ بكەت و ئەو وێرەكی نەبوو. هەتا وێرەكی نەبوو هەناسەیێن خوە كوور بهەلكێشیت یان چاڤێن خوە ب نقینیت ژ

**ترسا هندێ نەکو ئەڤە سەرابەك بیت ژ دوور ڤە بتەیسیت یان ژی خەیالەك بیت و ب بچووکترین لڤین ژ پێشچاڤێن وێ بەرزە بیت.**

**لەیلا وەکو دەپەکێ رەق راوەستیا و تەماشەی تارقی کر. بێهنا وێ گەلەك یا تەنگ بوو مژیلانکێن وێ ژی وەخت بوو بوەریێن.**

**پشتی وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشای و چاڤێن خوە باش ڤەکرین، دیت ئەو هێشتا یێ ل وێرێ. بەلێ ئەڤە تارق ب خوەیە و هێشتا یێ ل وێرێ راوەستیایە. لەیلایێ وێرەکی دا خوە و چەند پێنگاڤەکان بەرەڤ وی ڤە چوو، پاشی پێنگاڤەکا دی و یەکا دی و یەکا دی ژی هاڤێتن هەتا نێزیکی وی بووی.**

# 43

## مەریەم

ل ڤاتێ دووێ و د ژوورا مەریەمێ ڤە، زەلەمای یێ ئازریای بوو. بۆ ماوەیەکی تەپا خوە یا باسکتبوولێ ل سەر ئەردی و ل دیواری ددا. هندی مەریەمێ داخواز ژێ دکر وەنەکەت و وی دەنگی بڕاوەستینیت، لێ وی گوهداریا ئاخفتنێن وێ نەدکر و یێ بەردەوام بوو ل سەر یاریا خوە چونکی وی دزانی مەریەمێ چ دەستهەلاتەکا هۆسا نینە ڤێ داخوازێ ژێ بکەت یان مایێ وێ تێ ناچیت.

بۆ ماوەیەکی وان هەردووان پێکڤە یاری ب ترۆمبێلا وی یا هەوارهاتنێ دکرن ئەوا پیتێن ڕەنگ سۆر و تۆخ ل سەر هەردوو لایێن وێ نەخشاندی، زەلەمای دەستێ خوە دهاڤێتە ترۆمبێلێ و دناڤبەرا خوە و مەریەمێ دا دئینا و بر.

بەری هێنگێ ب دەمەکێ کێم، دەمێ وان تارق ل بەر دەرگەهی دیتی، زەلەمای تەپا خوە یا باسکتبولێ ل سەر سینگێ خوە شداندبوو و تبلا خوە کربوو دناڤ دەڤێ خوە دا. وی زوو ب زوو ئەڤ ڕەفتارە نەدکر ب تنێ ل وان دەمان نەبیت هەکە هەست ب دوودلیێ کربایە یان ترسیابایە.

زەلەمای ب چاڤێ گومانێ تەماشەی تارقی کر و گوت: "ئەڤ زەلامە کیە؟ ئەز حەز ژێ ناکەم."

هەرچەندە مەریەمێ بزاڤ دکر بۆ وی ڕوهن بکەت کا چەوا ئەو و لەیلا پێکڤە هەڤالێن بچووکاتیێ بوون و پێکڤە مەزن ببوون، لێ زەلەمای دەلیڤە نەدایێ بۆ وی باخڤیت، بەلکو یێ ڕژد بوو ل سەر کرنا یاریان ب ترۆمبیلا خوە یا هەوارهاتنێ. دەمێ مەریەمێ ترۆمبێل بۆ زڤڕاندی و بەرێ وێ یێ سینگی کەفتە زەلەمای، دووبارە داخواز کر یاریان ب تەپا خوە بکەت.

زەلەمای گوت: "کانێ یە؟ کانێ ئەو تەپا بابێ من بۆ من کری؟ ل کیڤەیە؟ من نوکە دڤێت، من تەپا خوە دڤێت."

دگەل هەر پەیڤەکێ و پرسیارەکێ، دەنگێ وی بلندتر و تیژتر لێ دهات. مەریەمێ گوت: "بەری نوکە ئاها ل ڤێرێ بوو."

وی کرە ڤێری: "نەخێر، یا بەرزە بووی، ئەز دزانم، ئەز دزانم یا بەرزە بووی. ل کیڤەیە؟ کیڤە بەرزە بوو؟"

مەریەمێ گوت: "ها ئەڤەیە."

مەریەمێ تەپەك بۆ ژناڤ قومسۆرێ ئینا دەرێ کو بەری هینگێ بۆ کری بوو. بەلێ زەلەمای دەست ب گری و ڤێژ ڤێژ و هەواریان دکر و خوە ل ئەردی ددا و دگوت کو ئەڤە تەپا من نینە، تەپا من یا باسکتبولێ یا بەرزەبووی، ئەڤە تەپەکا دی یە. ئەو تەپە کانێ یە؟ ل کیڤەیە؟ ل کیڤەیە؟ ل کیڤەیە؟ ل کیڤەیە؟

ئەو یێ بەردەوام بوو ل سەر ڤێژی پێن خوە هەتا لەیلا نەچاربووی ژ ڤاتێ خوارێ بهێتە سەری و وی بکەتە ملێ خوە و بهەژینیت و تبلێن خوە دناڤ پرچا وی یا ڕەش ئینان و برن. پاشی ڕۆندکێن ل سەر ڕوویێ وی پاقژ کرن و دەڤێ خوە ب گوهێ وی ڤەنا و هندەك ئاخفتنێن نەرم بۆ گوتن.

مەریەمێ ژ دەرڤەی ژوورێ چاڤەڕێی وێ دکر. ئەو ل سەر دەرەجکان یا ڕاوەستای بوو و چاڤێ وێ ل تارڤی بوو، تشتێ یەکانە یێ سەیر یێ تارڤی بۆ وێ ئەوبوو کو نوکە وێ ب چاڤێن خوە هەردوو پێن تارڤی ددیتن، پێ وی یێ ڕاستەڤینە و پێ وی یێ دەستکرد. پەنتۆنەکێ ڕەنگ قەهوای ل بەر بوو و هەردوو پێن خوە ل سەر ئەردێ ژوورا ڕوونشتێ یا ڤالاَ و بێ مەحفیر درێژ کربوون.

ب دروستاهی هاتە بیرا وێ کا بوچی ل وێ ڕۆژا دگەل ڕەشیدی چووین تێلەفونەکێ بۆ جەلیلی بکەن، ئەو زێرەڤانێ هەڤالێ ڕەشیدی یێ ل بەر دەرگەهێ هوتێلا ئینتەرکونتێنتال ڕاوەستای، بۆ وێ نەیێ غەریب بوو بەلکو سەروچاڤێن وی د نیاس بوون، لێ ل وێ ڕۆژێ نەدهاتە بیرا وێ کا ئەو کیە چونکی وی کولاڤەك کربوو سەرێ خوە و بەرچاڤك ژی کربوونە بەر چاڤێن خوە، ژبەر هندێ زیکا نەنیاسی. لێ نوکە هاتە بیرا وێ کو ئەڤ زێرەڤانە هەر ئەو زەلاَم بوو یێ بەری نەهـ سالان هاتیە مالا وان و ل ژوورا

ڕوونشتێ و ل سەر قەنەپێ ڕوونشتی و ب دەستمالێ خوها نافچاڤێن خوە پاقژ کرین و داخوازا ئاڤێ دکر.

نوکە گەلەك پرسیار د سەرێ مەریەمێ دا دزڤڕین: ئەرێ حەبکێن سولفا یێن ڕەنگ پیڤازی یێن هینگێ وی بەحس دکری بەشەك بوون ژ وێ پیلانا خاپاندنێ؟ ئەرێ کێ ئەو پیلان ژ بۆ ڤێ درەوێ دانابوو و ئەو هووردەکارییێن باوەرپێکری دانابوون؟ ئەرێ ڕەشیدی چەند پارە دابوونە عەبدولشەریفی، ئەو ژی هەکە ئەڤە ناڤێ وی یێ دروست بیت، داکو بهێتە مالا وان و چیرۆکەکا درەو بۆ لەیلایێ بڤەگێڕیت کو تارقی ل پاکستانێ گیانێ خوە ژدەستدایە؟

# 44

## لەیلا

تارڤی گوتی دەمێ ئەو هاتیە زیندانکرن، یەك ژ زەلامێن دگەل وی پسمامەك هەبوو کو جارەکێ ل پێشچاڤێن خەلکی ب ڤامچیان هاتە قووتان چونکی وینەیێن باڵندەیێ فلامینگوی کێشابوون. پسمامێ وی زەلامی کەسەکێ نیگارکێش بوو گەلەك حەز ژ کێشانا وێنەیان دکر.

"چەندین دەفتەرێن نەخشەکێشانێ، ب دەرزنان وێنەیێن زەیتی یێن وان باڵندەیان دەمێ دناڤ دەریاچە یان ژی ل بەر هەتاڤێ دڕاوەستان، یان ژی ل ئێڤارێ دەمێ بەرەڤ ڕۆژئاڤابوونێ دفڕین دگەل وی هەبوون و هەموو هاتنە ژناڤبرن."

لەیلایێ پرسیار کر : "فلامینگو؟"

لەیلایێ تەماشەی وی کر کو پالا خوە یا دایە دیواری و پێ خوە یێ دروست یێ دانایە بن چوکێ خوە. وێ گەلەك حەز دکر جارەکێ دەستێ خوە بکەتە پێ وی یان وی هەمبێز بکەت هەروەکو کا چەوا بەری نوکە دەمێ ل بەر دەرگەهی دیتی، وێ هەست ب شەرمێ دکر دەمێ هزرا خوە دکری کو بەری نوکە یەکسەر بەرەڤ وی ڤە چووی و دەستێ خوە دانایە سەر ملێ وی و پاشی سەرێ خوە ژی دانایە سەر سینگێ وی و کریە گری و چەندین جاران ب دەنگەکێ ئالۆزی و کزگریوك ناڤێ وی دگوتی.

نوکە پرسیار ژ خوە دکر ئەرێ ئەو چ خەریبی و دوورکەفتنا مەزن بوو یا بوویە ئەگەر هەتا ئەو ڤێ چەندێ بکەت؟ دبیت ئەڤ چەندە هۆسا بیت، لێ ئەو نەدشیا کونترۆلێ ل سەر خوە بکەت کو وەنەکەت. نوکە ژی هێشتا حەزا هندێ هەیە جارەکا دی دەستێ خوە بکەتە وی و هەمبێز بکەت داکو باوەری بۆ چێ ببیت کو ب ڕاستی ئەو یێ ل ڤێرێ و ئەو تشتێ ئەو دبینیت خەون و خەیال نینە.

تارڤی گوت: "بەلێ، ژبەر باڵندێ فلامینگوی بوو."

دەمێ تالێبان وێنەیێن وی دیتین، وان پێن بالندەیان یێن درێژ و ڕیس ب سفکاتیپێکرن ل قەلەمدان، ژبەر هندێ وان هەردوو پێن وی کەسێ نیگارکێش ب وەریسەکێ گرێدان و هند قامچی ل بنێ پێ وی دان هەتا خوین ژێ هاتی. پاشی دوو هەلبژارتن دانێ: یان دڤێت وێنەیێن خوە هەمیان ژناڤ ببەت، یان ژی ڤان بالندەیان ب شێوەیەکێ هۆسا وێنە بکەت کو جهێ شەرمێ نەبن. کابرایێ نیگارکێش نەچاربوو دەست ب هاڤێژتە فرچەی و پەنترۆنان بکەتە بەر هەموو بالندەیان.

"و ل دوماهیێ ، وی وێنەیێن فلامینگوییێن ئیسلامێ کێشان."

کەنیا لەیلایێ هات لێ نەشیا دەنگێ کەنیا خوە بلند بکەت، چونکی شەرم دکر ددانێن وێ یێن کرمیبووی و ددانێ وێ یێ ڕەشیدی لێ شکاندی دیاربکەن. هەردیسان وێ شەرم ژ سەروبەرێ خوە و لێڤێن خوە یێن وەرمتی دکر. وێ هیڤی دخواست دەلیڤەیا هندێ هەبایە بەری تارق وێ ببینیت دەستوچاڤێن خوە شووشتبانە یان هەر چ نەبیت پرچا خوە شانەکربایە.

تارقی گوت: "لێ ل دوماهیێ نیگارکێشێ ب تالێبان کرە کەنی. نیگارکێشی وێنەیێن پەنترۆنێن کرینە بەر فلامینگویان ب ڕەنگێن ئاڤی کێشابوون، پشتی هێزێن تالێبانێ ژ دەڤ وی چووین، وێنەیێن خوە شووشتن و وەکو بەرێ لێ هاتن."

پشتی هینگێ تارقی ژی دەست ب تیق تیقێ کر و کرە کەنی. لەیلایێ زانی کو ددانەکێ وێ ژی یێ کەفتی. ل دووڤ دا تەماشەی دەستێن وی کر.

"د ڕاستی دا..."

کولاڤەکێ پاکولی ل سەرێ وی بوو و جووتەکێ پۆتان ل پێن وی بوون و بلوزەکێ سۆڤ یێ ڕەش ل بەربوو کو هەتا سەر کەمەرا وی یا درێژبوو و ب سەر پەنتەرۆنەکێ ڕەش دا ئینا بوو. بەردەوام گرنژینەکا سڤك ل سەر لێڤێن وی و ب دزیکی ڤە چاڤێن خوە بلند دکرن و تەماشەی لەیلایێ دکر.

بیرا لەیلایێ نەدهات کو بەری نوکە وی جارەکێ ب تنێ ژی ئەڤ پەیڤە بکارئینابیت، پەیڤا "د ڕاستی دا". هەردیسان ئەڤ شێوازێ بەرێخودانا وی بۆ لەیلایێ و دانانا تبلێن خوە کو ب شێوەیەکێ ستوونی ل سەر چوکێ خوە بدانیت و سەر هەژاندنا وی، ئەڤ ڕەفتارە هەموو بۆ لەیلایێ د نوو بوون.

هەرچەندە ئەڤ ڕەفتار و ئاخفتنێن وی یێن کەسێن مەزن بوون، لێ ئەرێ بوچی لەیلا حێبەتی دمینیت؟ نوکە تارق یێ بوویە زەلامەکێ پێگەهشتی و ژیێ وێ بیست و پێنج سالن. لڤینێن وی د هێدی بوون و واستیانەك د گرنژینا وی دا یا دیاربوو. هەردیسان بەژنا وی ژی یا بلندبووی و ڕهێن وی یێن تەمامام بووین، بەژنا وی پیچەکێ زراڤتر بوو ژ وی تارقێ لەیلایێ د خەونێن خوە دا ددیتی.

دەستێن وی ب هێزبوون. دەستێن وی یێن کرێکاران بوون، ژبەر هندێ گەلەك دەمارێن خواروڤیچ ل سەر خویا دکرن. سەروچاڤێن وی ژی هێشتا وەکو بەرێ د نازك و جوان بوون لێ پیستێ وی وەکو بەرێ یێ سپی نەبوو. ناڤچاڤێن وی ژی وەکو حەفکا وی کەفتبوو ژێر کاریگەریا گەرماتیا هاڤینێ و سەرمایا زڤستانێ، دا بێژی ناڤچاڤێن وی وەکو یێن کەسەکێ ڕێڤینگن کو ژ وەغەرەکا دوور و واستیایی هات بیت.

وی کولاڤێ خوە یێ پاکولی بەروڤاژی کربوو سەرێ خوە، ژبەر هندێ لەیلایێ تێ ئینادەر کو پرچا وی یا تەنك و کێم بووی، ڕەنگێ چاڤێن وی ژی وەکو بەرێ ڕوهن و زەلال نەمابوون، بەلکو زەرتر لێ هاتبوون، یان ژی دبیت ژبەر کاریگەریا ڕۆناهیا ژوورا وان ڕەنگێ چاڤێن وی هۆسا خویا بکەن.

دایکا تارقی هاتە بیرا لەیلایێ، ڕەفتارێن وێ یێن ئارام و گرنژینا وێ یا هشیارکەر و بارۆکێ وێ یێ مور. هەردیسان بابێ وی ژی هاتە بیرا وێ، ئاورینێن وی یێن دژوار و ترانە و یارییێن وی یێن نە ژ دل.

بەری نوکە ل بەری دەرگەهی ژی لەیلایێ ب دەنگەکێ کزگریوك و ئەزمانەکێ هشك گوتبوو تارقی کو وێ ئاگەهـ ژ هندێ هەیە کا چ ب سەرێ دایك وبابێن وی هاتبوو، لێ نوکە دووبارە پرسیار ژێ کر کا ڕەوشا وان یا چەوایە؟ بەلێ دەمێ سەرێ خوە چەماندی و ب خەمگینی ڤە گوتی: "وان یا وەغەر کری." لەیلا ژ کرنا ڤێ پرسیارێ پەشیمان بوو.

"ب مخابنی ڤە. ل من ببورە بۆ ڤێ پرسیارێ."

"باشە، بەلێ، ئەز ژی هەروەسا."

پاشی وی زەرفەکێ بچووك ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و داڤ لەیلایێ و گوتی: "ئەڤ زەرفە دگەل سلاڤێن ئەلیونایێ بۆ تە هەنە."

د وی زەرفی دا، پارچەکا پەنیری یا نخافتی ب نایلونی تێدا بوو.

"ئەليونا، ناڤەكێ خوشه."

لەيلايێ بزاڤ کر خوه ئاسایی بکەت و بێی ترس و لەرزین پرسیارێ ژێ بکەت: "ئەو ناڤێ هەڤژینا تەیە؟"

"نەخێر، بەلکو ناڤێ بزنا منه."

دگەل گوتنا ڤی ناڤی، تارق چاڤەرێی پێکەنینەکێ بوو، دا بێژی ئەو ل هیڤیا هندێ بوو ئەڤ ناڤە بیرهاتنەکێ بینتە بیرا لەيلايێ.

پشتی هینگێ هاتە بیرا لەيلايێ. ئەو فلمێ روسی یێ هاتیە دوبلاژکرن بۆ زمانێ فارسی، ئەلیونا کچا کاپتنێ پاپۆرێ بوو کو ئەڤیندارا هاریکارێ بابێ خوه بوو. ئەو ل وێ رۆژێ چووبوونە پێش ڤی فلمی دەمێ وی و لەيلا و حەسینایێ تەماشەی تانك و دەبابە و ترۆمبێلێن جێپ یێن لەشکەرێ سوڤییەتێ دکر دەمێ ژ کابولێ دەردکەفتن. ئەو رۆژ بوو یا تارقی کولاڤێ خوه یێ رۆسی یێ ب کەنی کریە سەرێ خوه.

تارقی گوت: "ئەز نەچاربووم وەریسکێ بکەمە ستویێ وێ و ب وی ستوونا دناڤ ئەردی دا هاتیە چکلاندن ڤە گرێدەم. هەردیسان من پەرژانەك ژی ل دوماندوری وێ یێ دروستکری داکو ژ مەترسیا گورگان یا دوور بیت.

ل بنارێ وان گرێن نێزیکی جهێ ئەز لێ دژیم، دارستانەکا مەزن لێ هەیە کو نێزیکی چارێك میلی یا ژ مە دوورە و یا پرە ژ دارێن کاژان. هەرچەندە گورگ دناڤ وێ دارستانێ ب خوه دا دژین، لێ هەکە دەنگێ بزنەکێ بچیتە گوهێن وان دەمێ ل نێزیکی وێ دارستانێ دچەریت، گورگ دێ نەچار بن ژ ناڤ دارستانێ هێنە دەرێ و ل دووڤ دەنگێ وێ هێن. ژبەر هندێ ئەز نەچاربووم پەرژانەکی چێکەم و وێ ب سنگی ڤە گرێدەم."

لەيلايێ پرسیار کر: "کیژ بنارێ گران؟"

تارقی گوت: "گرێن (پر پەنجال) ل پاکستانێ. ئەو جهێ ئەز لێ دژیم دبێژنێ موری. ئەو جهەکێ گەشتیاری یە و نێزیکی دەمژمێرەکێ ژ ئیسلام ئاباد یا دوورە. هژمارەکا مەزن یا گران لێ هەنە و هەموو ژی د کەسکن و گەلەك داروبار ل سەر هەیە و پیچەکێ ژ ئاستێ روویێ دەریایێ بلندترە. ژبەر هندێ ل وەرزێ هاڤینێ گەلەك یا هین و فێنکە و جهێ گەشتیار و سەیرانایە."

ئینگلیزان ئەو کربوو وێستگەهەکا بلند ل نێزیکی بنگەهیێن خوە یێن سەربازی ل "ڕاوەل پیندی". بۆ هندێ دەمێ ڤیکتوریان هەست ب گەرمێ کربایە، دا قەستا وێرێ بکەن*."

نوکە ژی هندەك شوونوارێن سەردەمێ مێتینگەهێن وان ل وێرێ ماینە. هندەك ژوورێن وەکو چایخانەیان ل هندەك جهان هەنە، زێدەباری هندەك خانیێن بچووك و یەك ڤات کو بانێن وان ب تەنەکەی هاتینە نخافتن، دبێژنێ "کولبە" و گەلەك تشتێن دی یێن ب ڤی شێوەی.

ئەو باژێرك ب خوە جهەکێ گەشتیاری و خوشە. دبێژنە جادا وی یا سەرەکی "مۆل"، فەرمانگەهەکا پۆستە و گەهاندنێ ل وێرێ هەیە، زێدەباری بازاڕەکێ مەزن و هژمارەکا خوارنگەهان و کومەکا دکانێن جامێن وان ب بۆیاغێن جودا جودا هاتینە ڕەنگکرن لێ هەنە، ئەو دکان مەحفیر و فەرشێن دەستکرد ب بهایەکێ گران دفرۆشنە گەشتیاران. تشتێ سەیر ل ڤێ جادێ ئاڕاستەییێ هاتنوچوونا ترۆمبێلانە: ل حەفتیەکێ ئاڕاستەییێ هاتنوچوونا وێ ژ ڤی سەری بۆ سەرێ دی یە و ل حەفتیا ل دووڤ دا بەروڤاژی یە.

تاڕقی گوت: "خەلکێ ڕەسەنێ ڤی باژێرکی دبێژن ل گەلەك جهێن وەلاتێ ئێرلەندا ژی هاتنوچوونا ترۆمبێلان ب ڤی شێوەیە لێ من ئەڤ چەندە نەدزانی. هەرچەوا بیت جهەکێ خوشە و ژیانەکا سادە لێ هەیە. ئەز گەلەك حەز ژێ دکەم و حەز ژ ژیانا ل وێرێ دکەم."

"دگەل بزنا خوە؟ دگەل ئەلیونایێ؟"

مەرەما لەیلایێ ژ ڤێ پرسیارێ سفکاتیکرن نەبوو، بەلکو وێ دڤیا ڤێ چەندێ بکەتە هێجەت ژ بۆ گوهۆڕینا ئاڕاستەییێ سحبەتا خوە بۆ بابەتەکێ دی، هەروەکو هندێ وێ دڤیا بزانیت کا کەسەکا دی دگەل وی دژیت داکو چاڤێ خوە بدەتە بزنا وی، لێ تاڕقی ب تنێ سەرێ خوە هەژاند.

تاڕقی گوت: "ئەز ژی گەلەك بۆ مرنا دایك و بابێن تە ب خەم کەفتم."

---

* ڤیکتوری ئەو کەسێن ئینگلیزن یێن ل سەر دەمێ شاهژنا بڕیتانی ڤیکتوریایێ ل نیڤا دووێ ژ چەرخێ نۆزدێ دژیاین کو ل وی دەمی بڕیتانیا مەزنترین هێز بوو ل سەر ڕوویێ ئەردی.

"ته چەوا زانی؟"

"بەری نوکە من دگەل هندەکان جیرانان ئاخفت."

لەیلا ما گوهشی، ئەرێ تو بێژی جیرانان چ تشتێ دی گوتبیتێ.

"تو دزانی لەیلا من چ جیران نەنیاسین؟"

"هەموویان یا بارکری و کەس ل ڤێرێ نەمایە."

"هەتا من باژێرێ کابولێ ژی نەدنیاسی."

" ئەز ژ ڤێرێ نەچوویمە ژی، لێ ئەز ژی وەکو تە کەسێ نانیاسم."

***

پشتی کو تارِق ژ مالا وان چووی، ل وێ ئێڤاری، پشتی خوارنا شیڤێ زەلەمای گوت:

"دایکا من بۆ خوە هەڤالەکێ نوو یێ پەیداکری، ئەو ژی زەلاّمەکە."

ڕەشیدی سەرێ خوە بلند کر و گوت: "ژ ڕاستا؟ گەلەك باشە."

***

تارِقی پرسیار کر کا دەستووری هەیە جگارەیەکێ بکێشیت.

دەمێ ئەو چووینە پاکستانێ، بۆ ماوەیەکی ل کەمپا "ناسیر بەگ" مان کو ل نێزیکی باژێری پێشاوەرێ یە. دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان وی قوپکێ جگارێ دکرە دناڤ تەبلێکێ دا. دەمێ ئەو و دایك و بابێن خوە گەهشتینە وێرێ، نێزیکی شێشت هزار پەنابەر ل وێرێ بوون.

دیسان وی گوت: "هەر چ نەبیت ئەڤ کەمپە ژ گەلەك کەمپێن دی باشتربوو. خودا نەکەت، وەکو کەمپا "جالوزای" کو گەلەك یا خراب و نەخوش بوو."

"هندەك ژ ڤان کەمپێن نموونەیی، دروستکرنا وان ڤەدگەریت بۆ سەردەمێ شەڕێ سارِ. جهەکێ هۆسا بوو کو وەلاتێن ڕۆژئاڤایی ب ڕێکا وێ دڤیا بۆ جیهانێ بسەلمینن کو ئەو ب تنێ چەکی بۆ ئەڤغانستانێ فرێناکەن.

لێ ئەڤ چەندە ل سەر دەمێ شەڕێ سوڤییەتێ بوو، سەردەمێ جیهادێ و گرنگیپێدانا جیهانێ ب ڤی بابەتی و دابینکرنا بودجەیەکێ مەزن ژ بۆ دروستکرنا ڤان کەمپان، هەردیسان ل سەردەمێ سەرەدانێن مارگریت تاتچەرێ بوون.

"ئێدی تو ب خوە دزانی کا چ تشت ڕوویدابوو. لەیلا، پشتی ب دوماهی هاتنا شەڕی، یەکێتیا سوڤییەتێ پارچە پارچە بوو. شەڕ نەما و بەرژەوەندیێن ڕۆژئاڤایی ژی نەمان. ئێدی چ مەترسی ل ئەڤغانستانێ بۆ سەر وان نەمان. ژبەر هندێ ئەو بودجەیێ وەك هاریکاری فرێدکری ڕاگرت. نوکە کەمپا ناسیر بەگ ب تنێ کومەکا خیڤەت و تەڤن و ئاخێ و دەستئاڤێن بەردای یە. دەمێ ئەم گەهشتینە وێرێ، هندەك دارێن درێژ و خیڤەتەك دانە مە و گوت هوون ب خوە خیڤەتا خوە ڤەدەن."

تارق و خێزانا خوە ل وێ سالیێ هەموویێ ل کەمپا ناسیر بەگ بوون، تشتێ ژ هەموویان پتر نوکە مایە ل هزرا وی، ب تنێ ڕەنگێ قەهوای یە. وی گوت: "ڕەنگێ هەموو تشتان یێ قەهوای بوو، خیڤەتێن قەهوای، خەلکێ قەهوای، سەیێن قەهوای و شۆربەیا قەهوای."

ل ناڤ وێ کەمپێ، دارەکا ڕووت و بێ بەلگ لێ هەبوو کو تارق هەموو گاڤان لێ سووار دبوو و ل سەر چەقەکێ وێ دڕونشتە خوارێ و تەماشەی خیڤەتێن پەنابەرێن دی دکر ئەوێن خوە ل بەر تیشکا ڕۆژێ یا گەرم درێژ کری، برینێن وان یێن دژوار و پێن وان یێن بڕی ددیاربوون.

هەردیسان وی ئەو زارۆکێن لاواز و ڕیس و پێخاس ددیتن یێن ب تەنەکان ئاڤ دکێشای، یان ژی پیساتیا سەیان کومدکر داکو ئاگری پێ هەلکەنێ. هندەکان ژی ب کێرکێن خوار و نەتیژ، یاریێن کلاشینکوفێن AK-47 ژ داران چێدکرن و هندەك ژنان ژی ئەو ئار دکرە هەڤیر یێ خوە لێکنەددای و نەدبوویە نان. دناڤ وێ کەمپا مەزن دا، بای یاری ب خیڤەتێن وان دکر و دلڤلڤاندن و گیایێ هشك و سۆتی ژی ل هەموو جهان بەلاڤە دکر و فرۆکەیێن کاغەزی یێن زارۆکان بلند دکرنە بەر ئەسمانی.

"گەلەك زارۆکان ژبەر نەخوشیێن جودا جودا گیانێن خوە ژدەستدان، ژبەر زکچوونێ، نەخوشیا سلێ، ژ برسان دان. ب خودای کەمە لەیلا، من گەلەك زارۆك ب چاڤێن خوە ددیتن دەمێ کەلەخێن وان دهاتنە ڤەشارتن. باوەرنەکەم مرۆڤ دیمەنەکێ ژ ڤێ چەندێ نەخوشتر ببینیت."

پێ خوە دانا سەر چوکێ خوە و بۆ ماوەیەکی بێدەنگ ما.

"بابێ من نەشیا خوە ل بەر سەرمایا وێ زڤستانێ بگریت، وی د خەو دا گیانێ خوە ژ دەست دا، ئەز باوەرناکەم ئەو تووشی نەخوشیەکێ ببیت یان ب ئێشانەکێ مربیت."

هەردیسان وی گوت کو د هەمان زڤستان دا، دایکا وی تووشی هەودانا سیهان بوو، چ نەمابوو بمریت ئەگەر ئەو نوشدار نەبایە یێ ب ترۆمبێلا خوە یا کەڤن کریە کلینیکەکا کەڤن خەلك چارەسەر دکر.

ژ شەڤێ هەتا سپێدێ تایەکا گران دایکا وی دگرت و خەو نەدچوو چاڤێن وێ، کوخکەکا دژوار دکر و بلغەم دگەل دهاڤێت کو ڕەنگێ وێ وەکو یێ ژەنگا ئاسنی بوو. سرایا نەخوشان گەلەك درێژ بوو. هەموو ژی د بەر گرانیا نەساخیا خوە دلەرزین و دکوخین و هندەك ژی نەشیان ل سەر خوە زالبن و پیساتیا وان دبن دا چوو، ئەڤە ژبلی وان نەخوشێن واستای و برسی کو خو شیانێن ئاخفتنێ ژی نەبوون.

"بەلێ ئەو نوشدار کەسەکێ بەرێز بوو، وی دایکا من چارەسەرکر ئەو ژی پشتی چەند حەبك داینێ و ل وێ زڤستانا سار ژ مرنەکا مسوگەر قورتال کر."

ل وێ زڤستانێ، تارڤی زارۆکەك کرە د کوژیەکی ڕا.

وی گوت: "ڕەنگە ژیێ وێ دوازدە یان سێزدە سالێ بیت. پاشی من پرتەکا شووشێ ل حەفکا وی دا و کوشت و بەتەنیا وی ژێ وەرگرت و داڤ دایکا خوە."

ل دووڤ دا تارڤی گوت هەر ل وێ سالێ، ب تایبەت پشتی نەخوش کەفتنا دایکا وی، وی سوزدا هەتا سالا بهێت ل وێ کەمپێ نەمینن. بەلکو دێ دەست ب شولی کەت و پارەیان خرڤەکەت هەتا بشێت ل بازێرێ پێشاوەرێ شوقەیەکێ ب کرێ بگریت کو ئاڤا پاقژ و گەرماتی لێ هەبیت.

دەمێ بهار هاتی، ئەو ب دووڤ کاران دگەریا. هندەك جاران ترێلێن دهاتنە کەمپێ و نێزیکی بیست کورێن گەنج کومدکرن و دبرنە دەشتەکێ داکو بەران کوم بکەن یان ژی دبرنە ناڤ ڕەزی ژ بۆ چنینا سێڤان بەرامبەر پارەیەکێ کێم یان بەتەنیەکێ یان جووتەکێ پێلاڤان، لێ کەس ب وی ڕازی نەدبوو ئەو دگەل خوە نەدبرە سەر کاری.

"هەر دەمێ چاڤێ وان ب پێ من کەفتبایە، دا بێژن ببورە."

هندەك كارێن دی ژی هەبوون وەك كۆلانا بیران و دروستكرنا كەپران و ڤەگۆهاستنا ئاڤێ و پاقژكرنا زێرابان، لێ كورێن دی یێن ل كەمپێ شەڕ سەرا ڤان كاران دكر و ل دوماهیێ تاڕق نەدشیا چ كاران ب دەستخوە ڤە بێخیت.

ڕۆژەكێ ل پائیزا سالا 1993ێ وی زەلامەكێ دكاندار نیاسی.

"بەرامبەر هندێ كو چاكیتەكێ چەرمی بۆ وی بگەهینمە باژیرێ لاهور، وی كوژمەیەكێ پارەیان دا من، هەرچەندە كوژمەكێ مەزن نەبوو لێ تێرا كریا دوو هەیڤێن شوقەیەكێ ل لاهورێ دكر."

وی زەلامی پلێتا شەمەندەفرێ دگەل ناڤونیشانێن جادەیەكا نێزیكی وێستگەها شەمەندەفرا لاهورێ دانەڤ تاڕقی داكو ل وێرێ وی چاكیتی ڕادەستی دكاندارەكێ هەڤالێ وی بكەت.

تاڕقی گوت: "من ب خوە دزانی، من دزانی."

"وی زەلامی گوتە من كو ئەگەر هاتمە گرتن دڤێت بێژمێ من ب تنێ دەست دگەل ڤی كاری هەیە نەك كەسێ دی، پێدڤیە بوو ئەو چەندە ژی ژ بیرا من نەچووبایە كو وی زەلامی جهێ ئاكنجیبوونا دایكا من دزانی. هەردیسان ئەو پارە ژی ژ هندێ باشتر بوو ئەز بەحسێ وی زەلامی نەكەم، زێدەباری هندێ كو زڤستان ژی ب ڕێڤە بوو."

لەیلایێ پرسیار كر: ئەرێ تو هەتا كیڤە چووی؟"

تاڕقی گوت: "هەتا كیڤە نە."

ل دووڤ دا كرە كەنی، ب دەنگەكێ شەرم و لێبورین ڤە گوت: "خو ئەز سوواری پاسێ ژی نەبووم، من هزر دكر چ مەترسی ل سەر ژیانا من نینە. لێ من نەدزانی كو زەلامەك ل سەرێ وێ جادەیێ یێ ڕاوەستیایە كو قەلەمەك ل پشت گوهێ وی ڕا بوو، ئەو ب خوە بەرپرسێ ڤان كارێن نهێنێ بوو. ل دووڤ دا تەماشەی خوارێ كر و گوت: بەلێ، بەلێ، بەلا خوە ژێ ڤەكەن دا كارێ خوە تەمام بكەت و بچیت. هۆسا دیارە ڤی گەلەك جاران ئەڤ كارە یێ كری."

كەرەستەیێن بێهوشكەر دناڤ چاكیتی دا بوون، دەمێ پولیسان كێركەك ل ملێ چاكیتی دای، هەموو ڕژیا سەر جادەیێ.

دەمێ تارڤی ئەڤ چەندە گوتی، دیسان وی کرە کەنی، کەنیەکا هۆسا بوو کو جار بۆ جارێ دەنگێ وێ بلندتر لێ دهات. بیرا لەیلایێ هات دەمێ ئەو هێشتا زارۆك ژی وی هەر ب ڤی شێوەی دکرە کەنی داکو دوودلیا خوە پێ بڤەشێریت یان ژی وان کارێن نەباش و هەتکبەر پێ بڤەشێریت یێن وی ئەنجام داین.

★★★

زەلەمای گوت: "ئەو یێ سەقەت بوو."

"ئەڤە هەر ئەو کەسە یێ من هزرا وی دکری."

مەریەمێ گوت: "ب تنێ ئەو بۆ سەرەدانێ هاتبوو."

ڕەشیدی تبلا خوە بلند کر و کرە هەوار: "تو دەڤێ خوە بگرە."

پاشی وی بەرێ خوە دا لەیلایێ و گوت: "ێ، و چ دی؟ جارەکا دی لەیلا و مەجنون وەکو بەرێ گەهشتنە یەك ڤە."

سەروچاڤێن وی وەکو بەران ڕەق بوون و ب ناڤچاڤگرێ ڤە تەماشەی وێ دکر. وی گوت " تە ئەو ئینا د ژوور ڤە، بۆ ناڤ مالا وان. مانە هۆسایە تە ئەو ئینا د ژوور ڤە. ل ڤێرێ دگەل کورێ من."

لەیلایێ ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن و گوت: "تە ئەز هاڤێتم، تە درەو دگەل من کرن. تە گوتە وی زەلامی بهێتە ڤێرێ و بەرامبەر من بڕوونتە خوارێ و بێژیت ئەو یێ مری، چونکی تە دزانی ئەگەر من زانیبایە ئەو یێ مایە ساخ دا چم و ڤێرێ بجهـ هێلم."

ڕەشید خوڕی ناڤچاڤێن وێ و گوتێ: "ئەرێ پا تە درەو دگەل من نەکرن؟ یا ژ تەڤە ئەز نزانم؟ یا ژ تەڤە من نەدزانی کچا تە بیژی یە؟ تە هزر دکر ئەز یێ نەفامم، هەی دێهلا پیس."

★★★

تارڤی چەند پتر ئاخفتبایە، لەیلا زێدەتر ژ وان چرکەیان دترسی یێن وی ئاخفتنێن خوە تێدا ب دوماهی دئینان، نەخاسم ئەو بێدەنگیا پشتی هینگێ دهات، چونکی ئەو چەندە نیشا هندێ بوو کو گەڕا لەیلایێ یە بەحسێ سەرهاتییێن خوە بکەت وب دەڤێ خوە وان تشتان بێژیت یێن بەری هینگێ ئەو دزانیت.

هەردەمێ ئاخفتنا تارڤی ب دوماهی دهات، عێلنجی دهاتنە لەیلایێ. وێ تەماشەی دەستێن وی دکر، تەماشەی وان موویێن ڕەش دکر یێن ل سەر دەستێ وی هاتین کو ل دەمێ خاترخواستنا وی ژ نوو ب سەرکەفتبوون.

تارڤی گەلەك بەحسێ سالێن خوە یێن زیندانێ نەکرن ب تنێ ئەو چەندە نەبیت کو د زیندانێ ڤە ئەو فێری زمانێ ئوردوی بوویە. دەمێ لەیلایێ پرسیار ل دور ماوەیێ وی یێ د زیندانێ ڤە ژێ دکرن، وی سەرێ خوە د هەژاند و بەرسڤ نەددا.

ب ڤێ لڤین و بێدەنگیا وی، شووشەیێن ژەنگاوی یێن زیندانێ و لەشێن خوهدایی و زەلامێن دلرەق و ئاخ و ئوفێن خەلکی و دیوارێن دەرزی و بانێن ڕزی و نیڤ هەرفتی دهاتنە پێشچاڤێن وێ. ژ سەروچاڤێن تارڤی بۆ وێ دیاربوو کو ئەو جهـ، جهێ سفکاتیپێکرن و بێ ئومێدیێ یە.

تارڤی گوت کو پشتی گرتنا وی، چەندین جاران دایکا وی بزاڤ کر سەرەدانا وی بکەت.

"ئەو سێ جاران هاتبوو سەرەدانا من، لێ من ئەو نەدیت."

وی نامەیەك بۆ دایکا خوە نڤیسی، پشتی هینگێ چەندین نامەیێن دی ژی بۆ دایکا خوە نڤیسین، لێ ئەوی گومان هەبوو کو خو نامەیەك ژی نەگەهشتیە دەستێ دایکا وی.

"من بۆ تەژی هندەك نامە نڤیسیبوون."

"ژ ڕاستا؟"

بەلێ، گەلەك جاران، هەڤالێ تە جەلالەدینێ ڕۆمی دا حەسیدیێ ب من بەت ژبەر وان پەیڤێن من ب تە دڤەهاندین."

پاشی وی دووبارە کرە کەنی، لێ ڤێ جارێ دەنگێ تیق تیقێ ژێ بلند بوو. دا بێژی یێ حیبەتی بووی ژبەر وێرەکی یا وی ل لایەکی و شەرمان وی ژ لایەکێ دی.

زەلەمای ل ڤاتێ سەری دەست ب ڤێژی و گرییێ کر.

★★★

ڕەشیدی گوتی: "ئانکو وەکو ڕۆژێن بەرێ هوون پێکڤە بوون. چ پێنەڤێت نوکە تە سەروچاڤێن خوە ژی نیشا وی داینە."

زەلەمای گوتێ: "بەلێ."

پاشی وی بەرێ خوە دا دایکا خوە و گوت: "بەلێ دادێ، من تو ب چاڤێن خوە دیتی."

★★★

دەمێ لەیلا هاتیە ڤاتێ خوارێ، تارڨی گوت: "هۆسا دیارە کورێ تە چ گرنگییێ ب من نادەت."

لەیلایێ گوت: "ببورە، بابەت ئەو چەندە نینە، ئەو ب تنێ .... گوهێ خوە نەدێ."

پاشی وێ بلەز بابەت گوهۆڕی، چونکی ڤێ چەندێ وەل وێ دکر هەست ب گونەهـ و خیانەتێ بکەت، ژبەرکو زەلەمای ب خوە زارۆك بوو و گەلەك حەز ژ بابێ خوە دکر و تشتەکێ ئاسایی یە هەکە حەز ژ ڤی زەلاّمێ بیانی نەکەت. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ بەرئاقل و جهێ تێگەهشتنێ بوو.

*من بۆ تە ژی هندەك تشت دنڤیسان.*

*گەلەك و گەلەك*

"تو چەندێ ل دەڤەرا موری مای؟"

تارڨی گوت: "کێمتر ژ سالەکێ."

د زیندانێ ڤە، ئەو دگەل زەلاّمەکێ ژ خوە مەزنتر ببوو هەڤال. ناڤێ وی زەلاّمی "سەلیم" بوو خەلکێ پاکستانێ بوو. ئەو ب خوە یاریکەرێ یاریا هوکیێ بوو و بەری نوکە ژی چەندین جاران هاتبوو زیندانکرن، لێ ڤێ جارێ بۆ ماوەیێ دەهـ سالان هاتبوو حوکم کرن، چونکی کێرکەك ل پولیسەکێ نهێنی دابوو.

هەموو زیندانان کەسێن وەکو سەلیمی یێن تێڤە، کەسێن خودان نیاس و ب پەیوەندی بوون. کەسەکێ هۆسا کو چ یاسا ژ وی ناگرن و هەر تشتێ بڤێت بۆ دهێتە بەر دەستی، کەسێن هۆسا کو دورماندوری وی د پڕن ژ دەلیڤەیێن ڕەڤینێ و د هەمان دەم دا یێن مەترسیێ.

سەلیمی هندەك کەس فڕیکربوون داکو بچن پرسیارا ڕەوشا دایکا تارڨی بکەن و دەنگوباسێن وێ بینن و پاشی ب هەستەکێ بابینیێ و دەنگەکێ نەرم گوتبوویێ کو دایکا وی د ڕوودانەکا پەڤینێ دا گیانێ خوە ژدەستدایە.

تارڨ نێزیکی حەفت سالان د وێ زیندانێ ڤە مابوو.

وی گوت: "ئەز ب سانەهی هاتمە ژ دەرڤە، بەختێ من یێ سپی بوو چونکی هۆسا دیاربوو ئەو دادوەرێ دوسیەیا من د دەستێ وی دا، ژنبرایەکا ئەفغانی هەبوو. ڕەنگە وی ژبەر هندێ دلوڤانی ب من بربیت و ئەز ئازاد کربم. ئەز نەیێ پشتڕاستم."

دەمێ ل دەستپێکا زڤستانا سالا 2000ێ تارق هاتیە ئازاد کرن، سەلیمی ناڤونیشانێن برایێ خوە و ژمارا تێلەفونا وی دابوونێ، ناڤێ برایێ وی "سەعید" بوو.

تارقی گوت: "وی گوتە من سەعیدی ل موری هوتێلەکا بچووك هەیە کو بیست ژوور و هۆلەکا ڕوونشتێ تێدانە ژ بۆ پێشوازیکرنا گەشتیاران و بێژێ وی ئەز یێ فرێکریمە دەڤ تە."

دەمێ تارق ژ پاسێ هاتیە خوارێ، کەیفا وی گەلەگ ب موری هات. ئەو دارێن کاژان یێن ب بەفرێ هاتینە نخافتن، بایێ وێ یێ سارە و هشك. کولبەیێن داری یێن گرتی کو دووکێل ژ بانێ وان بلند دبوو بەر ئەسمانی. دەمێ تارقی دەرگەهێ هوتێلا سەعیدی قووتای، د دلێ خوە دا گوت ئەرێ ئەڤە جهێ ئاکنجبوونا وی یە. جهەکێ هۆسایە کو نەك تنێ وان جهێن نەخوش یێن بەری هینگێ مرۆڤی دیتین دێ ژ بیرا مرۆڤی بەت، بەلکو هەتا هزرێن شاش و خەم و نەخوشیان ژی ژ بیرا مرۆڤی دبەت، جهەکێ هۆسایە قەت ناهێتە سەر هزرا مرۆڤی.

"من د دلێ خوە دا گوت ب ڕاستی ژی ئەڤە ئەو جهە یێ هەموو خەلك خەونان پێڤە دبینن کو لێ بژین."

تارق ببوو زێرەڤانێ ل بەر دەرگەهی و کرێکارەکێ چەلەنگ ل هوتێلێ. د ماوەیێ تاقیکرنێ دا کو نێزیکی هەیڤەکێ ڤەکێشا، سەعیدی نیڤ کریا وی ددایێ.

دەمێ تارقی دئاخفتی، لەیلایێ سەعید د ئینا پێشچاڤێن خوە کو دوو چاڤێن کوور و دێمەکێ وەرمتی هەیە. د پەنجەرا هۆلا پێشوازیکرنێ دا دڕاوەستیا و زێرەڤانیا تارقی دکر دەمێ دار دبڕین و بەفر ژ سەر ڕێکێ ڕادکری. هەردیسان ئەو دئینا پێشچاڤێن خوە کو وی ل هەمبەر پێ تارقی خوە خوار دکر و زێرەڤانیا وی دکر دەمێ چوویە سەر جهێ دەستشوویێ و ئەو بۆری چاك دکری یا چیکێن ئاڤێ ژێ دهاتنە خوارێ. هەردیسان ئەو دئینا پێشچاڤێن خوە دەمێ بەردەوام تەماشەی سندوقا خوە یا پاران دکری کا چ ژێ د کێم نینن.

ژوورا تارِقی ب رەخ ئاڤاهییٚ خوارنگەهیٚ ڤەبوو. زادلێنەرا وان ژی بیژنەکا دانعەمر و قەلەو بوو، ناڤیٚ ویٚ "ئەدیبا"بوو. جهیٚ نڤستنا ڤان هەردوو کەسان پیچەکیٚ ژ هوتێلیٚ ییٚ دوور بوو. چەند دارەکێن باهیڤان و کورسیکەکا درێژ یا دناڤ باخچەی و نافۆرەکا ئاڤیٚ کو ل سەر شێویٚ هەرەمان هاتبوو دروستکرن و هاڤینان ئاڤ بلند دکر، دناڤبەرا ئاڤاهییٚ هوتێلیٚ و ژوورێن ڤان خزمەتکاران دابوو.

لەیلاییٚ تارِق ئینا پێشچاڤێن خوە کو د ژوورا خوە ڤە ل سەر تەختی ییٚ درێژ کریە و د پەنجەریٚ را تەماشەی دیمەنێن کەسك یێن ژ دەرڤە دکەت.

پشتی بوراندنا ماوەییٚ تاقیکرنیٚ ب سەرکەفتیانە، ئێدی تارِقی هەیڤانە مووچەییٚ خوە ب تەمامی وەردگرت و خوارنا وی یا فراڤینیٚ ژی یا بەلاش بوو. هەردیسان چاکیتەکیٚ سۆفی دایێ و پاشی پیٚ وی ییٚ دەستکرد پیڤا هەتاکو پێیەکی نوو بۆ وی بکرِیت. تارِقی گوت دلوڤانیا وی تا وی رادەی بوو رۆندك ژ چاڤێن من باراندن.

دەمیٚ تارِقی یەکەم مووچەییٚ خوە وەرگرتی، چوو بازارِ و ئەلیونا کری بوو.

تارِقی ب کەنی ڤە گوت: "پیرتیٚ ویٚ هەموو ییٚ سپی یە. ئەو شەڤێن بەفر دباریت، دەمیٚ سپێدیٚ مرۆڤ ژ خەو هشیار دبیت و د پەنجەریٚ را سەحدکەتیٚ، ب تنیٚ دیٚ دوو چاڤێن رەش و دەڤبێنکا "کمامە" ویٚ بینیت.

لەیلاییٚ سەریٚ خوە هەژاند و جارەکا دی بێدەنگ بوو ڤە. دیسان دووبارە زەلەمای ل سەری تەپا خوە ل دیواری ددا.

لەیلاییٚ گوت: "یا ژ من ڤە تو ییٚ مری."

"ئەز دزانم، تە بەری نوکە گوتبوو من."

دەنگیٚ لەیلاییٚ زوو ب زوو دەرنەدکەفت. نەچاربوو ب کوخیت و گەوریا خوە پاقژ بکەت داکو ل سەر خوە زالٚ ببیت دەمیٚ دئاخڤیت. ویٚ گوت: "ئەو زەلامیٚ دەنگوباسیٚ مرنا تە گەهاندیە من، وی هۆسا ب راستگویی خوە ددا دیارکرن، من باوەر ژ هەموو ئاخفتنێن وی کر. تارِق خوزی من باوەر ژ ئاخفتنێن وی نەکربایە. لیٚ ئەو رووداو یا روودای. ژبلی هندیٚ ژی، ل وی دەمی ئەز یا ب تنیٚ بووم و گەلەك دترسیام. ئەگەر من قەت شوو ب رەشیدی نەدکر، قەت..."

تارِقی کو نەدڤیا تەماشەی سەروچاڤێن وێ بکەت، گوت: "تو یا نەچار نەبووی وی کاری بکەی."

ڤێ ئاخفتنا تارِقی چ لومەکرن پێڤە دیار نەبوو، هەردیسان نە گونەهبارکرن یان شکاندن، بەلکو ب تنێ ئاخفتنەك بوو ژ دەڤێ وی دەرکەفتی.

"بەلێ ئەز یا نەچار بووم، ئەگەرەکێ گرنگ هەبوو کو ئەز نەچارکرم شوو ب وی بکەم. تو نزانی تارِق، کەسەك ... دڤێت بۆ تە بێژم."

***

ڕەشیدی پرسیار ژ زەلەمای کر: "تو ژی دگەل وی ڕوونشتیە خوارێ و دگەل ئاخفتی؟"

زەلەمای چ نەگوت، لەیلایێ دوودلی و گومان د چاڤێن وی دا دیت. هۆسا دیارە ژ نوو بۆ وی دیاربوو کا وی نهێنیەکا چەندا مەزن ئاشکەرا کریە، گەلەك مەزنتر ژ وێ چەندا وی هزر دکری.

"من پرسیار ژ تە کر، کورێ من."

زەلەمای خوزیا خوە داعیرا، ئاراستەیێ ئاورینێن وی دناڤبەرا وان دا دهاتن و چوو.

"ئەز ل سەری بووم، من دگەل مەریەمێ یاری دکرن."

"و دایکا تە؟"

زەلەمای هەروەکو دڤیا داخوازا لێبورینێ بکەت، تەماشەی لەیلایێ کر و نەوێریا چ بەرسڤا بێژیت. لێ چ نەمابوو دەست ب گرییێ بکەت.

لەیلایێ گوت: "باشە چ ئاریشە نینە، زەلەمای، ڕاستییێ بۆ بێژە."

زەلەمای ب دەنگەکێ هێدی و نازك کو وەکو پست پستێ بوو، گوت: "ئەو ل خوارێ بوو، دگەل وی زەلامی دئاخفت."

ڕەشیدی گوت: "ئەز تێگەهشتم، هۆسا دیارە پیلانەکا ب کوم دێ دژی من هێتە دانان."

***

تارِق کو ل سەر چوونێ بوو، گوت: "من دڤێت ببینم، من دڤێت نوکە وێ ببینم."

لەیلایێ گوت: "باشە ئەم دێ ژڤانەکی ڕێك ئێخین."

گرنژینەك كەفتە سەر لێڤێن تارقی و ژبەر خوە ناڤێ وێ دگوت.

"عەزیزا، عەزیزا."

دەمێ رەشیدی ناڤێ كچا وێ دئیناى، بەروڤاژی تارقی، گەلەك نەخوش ژ دەڤێ وی دەردكەفت.

"عەزیزا، چەند ناڤەكێ نازكە."

"ئەو ب خوە ژی گەلەك یا نازكە، دا جارێ تو ببینی."

"خولەك خولەك دێ هەژمێرم، هەتا وێ دبینم."

ئەو نێزیكی دەه سالان بوو وان هەڤدوو نەدیتی، هزرێن لەیلایێ دچوونە سەر وان رۆژان یێن هینگێ وەختێ پێكڤە دچوونە د وێ كولانا تەنگ دا و ب دزیكی ڤە هەڤدوو ماچی دكر. لەیلایێ د دلێ خوە دا دگوت: ئەرێ تو بێژی نوكە ئەو من چەوا دبینیت؟ تو بێژی ئەز هێشتا یا جوان بم؟ یان ژی ئەو نوكە هۆسا من دبینیت كو یا حەلیایم و تێكچوویم و جهێ دلپێڤەمانێ مە وەكو پیرەژنەكا دانعەمر و ب ناڤسال ڤە چووی یا كو ب خورتی پێن خوە ل دووڤ خوە دخشینیت؟

ئەو هەردوو ل بەر تیشكا هەتاڤێ راوەستیابوون. دا بێژی ئەو دەه سالە چ تشت روونەدای؟ مرنا دایك و بابێن وێ، شووكرنا وێ ب رەشیدی، شەر و كوشتن، تۆپبارانكرن، تالیبان، پێكدادان، برساتی، هەتا زارۆكێن وێ. دا بێژی ئەڤ تشتە هەموو وەكو خەونەكێ بوون، وەكو وەرچەرخانەكا سەیر، وەكو ماوەیەكێ كورتێ دناڤبەرا دەمێ پشتی نیڤرو یا وێ رۆژێ و خولەكێن نوكە دا.

پشتی هینگێ سەروچاڤێن تارقی هاتنە گوهۆرین و رژد بوون. لەیلا ئاشنایی ڤێ رەفتارا وی بوو. ئەڤە هەمان ئەو ئاورینە یا چەندین سالان بەری نوكە د چاڤێن وی دا ددیتی، ئەو ژی دەمێ هێشتا ئەو هەردوو زارۆك و پێ خوە یێ دەستكرد ژێڤەكر و بەرەڤ خادیمی ڤە چووی دانایێ.

تارقی دەستێ خوە درێژ كر و برە نیزیكی لێڤا وێ یا بنی و ب دەنگەكێ سار ڤە گوت: "ئەڤە وی وەلێ كریە؟"

دەمێ دەستێ وی ب لێڤا وێ كەفتی، دیسان دیناتیا وێ رۆژێ هاتە سەر هزرا لەیلایێ دەمێ وێ بەری چەند سالان پشتی نیڤرو تارقی دەستێ خوە كریە وێ و ئەو نێزیكبوونە

بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا عەزیزایێ. هەناسەیێن وی یێن گەرم ل سەر حەفکا وێ، لڤینێن زەڤلەکێن ڕانێن وی و کەفتنا سینگێ وی بۆ سەر سینگێ وێ و لێکئالاندنا تبلێن دەستێن هەڤدوو.

تارقی د بن لێڤکان ڕا گوت: "خوزی من تو دگەل خوە بربایە."

لەیلا نەچار بوو سەرێ خوە بچەمینیت و بزاڤ دکر نەکەتە گری.

"من دزانی نوکە تو خودان هەڤژینیی و یا بوویە دایك. بەلێ نوکە ئەز ژی یێ ل ڤێرە. پشتی ڤان هەموو سالێن ژێکڤەقەتیان و دوورکەفتنێ، نوکە جارەکا دی ئەز یێ ل بەر دەرگەهێ مالا تە. ڕەنگە کارەکێ باش یان دروست نەبیت من کری، لێ من ئەڤ ڕێکە هەموو یا بڕی سەر خاترا هندێ بهێم تە ببینم. ئاهـ لەیلا، خوزی من چ جاران تو نەهێلا بای."

لەیلایێ ب ڕەشبینی ڤە گوت: "وەنەکە."

"پێدڤیە بوو هینگێ من بزاڤێن مەزنتر کربانە و پێدڤی بوو من هینگێ تو مارکربای دەمێ من دەلیڤە هەی، نوکە هەموو تشت دا د جودا بن."

"هیڤی دکەم ب ڤی شێوەی نەئاخڤە، هۆسا تو من دئێشینی."

تارقی سەرێ خوە هەژاند و پێنگاڤەکێ چوو پێش ڤە و ل هەمبەری وێ ڕاوەستیا.

"من نەڤێت ئەز مگرتیا چ تشتان بێژم، مەرەما من ئەو نینە ب ڤێ دەرکەفتنا خوە یا ژ نیشکەکێ ڤە، ژیانا تە وێران بکەم. ئەگەر تە دڤێت بچم ژی، دێ نوکە چم. دێ زڤڕمە پاکستانێ. تشتەکی بێژە لەیلا، ئەز یێ ڕژدم ل سەر ئاخفتنا خوە. بێژە هەرە، دێ چم و ئێدی چ جارێن دی نازڤرم و چ ئاریشەیان بۆ تە چێناکەم."

"نەخێر."

لەیلایێ گەلەك ب هێزتر و ژ دل ئەڤ ئاخفتنە گوت ژ وێ چەندێ یا وێ دڤیای بێژیت. بێی وێ ئاگەهـ ژ خوە هەبیت دەستێ خوە بر و ملێ تارقی گرت. پاشی دەستێ وی بەردا.

"نەخێر، نەچە، تارق، هیڤی ژ تە دکەم نەچە."

تارقی سەرێ خوە هەژاند.

"ئەو هەر ژ نیڤرۆ هەتا دەمژمێر هەشتی شەڤێ شول دکەت. سوباهی پشتی نیڤرو وەرە دێ تە بەمە دەڤ عەزیزایێ."

"ئەز ژ وی ناترسم، تو باش دزانی."

ئەز دزانم. سوباهی پشتی نیڤرو وەرە."

"یٚ و پشتی هینگیٚ؟"

"پشتی هینگیٚ، ئەز دزانم، دڤیٚت هزرا خوە تیٚدا بکەم."

"ئەز دزانم، تیٚدگەهم، ببورە. بوٚ هەمەوو تشتان ل من ببورە."

"وەنەبیٚژە، چونکی تە سوز دابوو بزڤریەڤە و ها ئەڤە تە سوزا خوە بجه ئینا."

چاڤیٚن تارڤی پڕ بوون ژ ڕوٚندکان. گوت: "لەیلا ب دیتنا تە ئەز گەلەك کەیفخوش بووم."

چاڤیٚ ویٚ لیٚ بوو دەمیٚ چووی، دەمیٚ ب ڕیٚکیٚ ڤە دڕاوەستیاین دلەرزی. ویٚ هزرا خوە د گەلەك تشتان دا دکر. لەرزینەکا دی ب سەر گیانیٚ ویٚ دا هات کو وەکو پیٚلەکا خەمان بوو لیٚ د هەمان دەم دا وەکو جورەکیٚ خوشی و ئومیٚدەکا نوو بوو.

# 45

## مەریەم

زەلەمای گوت: "ئەز ل ڤاتێ سەری بووم و من دگەل مەریەمێ یاری دکرن."

"ێ و پا دایکا تە؟"

"ئەو ل خوارێ بوو، دگەل وی زەلاٚمی دئاخفت."

ڕەشیدی گوت: "ئەز تێگەهشتم، هۆسا دیارە پیلانەکا ب کوم دێ دژی من هێتە دانان."

مەریەمێ تەماشەی ناڤچاڤێن وی یێن دامای کر، تەماشەی هێلێن ڤورمچینێ یێن ل سەر سەروچاڤێن وی کر کو گەلەك د ڕوهن و ئاشکەرا بوون. بێباوەری و گومانێن خڕاب ژ چاڤێن وی دبارین. پشتی هینگێ ئەو ڕوونشت و بۆ ماوەیەکی بێدەنگ ما، دا بێژی یێ هزرێن خوە د تشتەکی دا دکەت، هەروەکو وی کاپتنێ د پاپۆرێ دا دڕوونشتیە خوارێ و هزرێن خوە دکەت پشتی کو دەنگوباسێ یاخیبوونا هندەك کەسێن دناڤ پاپۆرێ دا دگەهیتێ.

مەریەمێ دڤیا تشتەکی بێژیت، لێ ڕەشیدی دەستێ خوە بلند کر و دەلیڤە نەدایێ باخڤیت، ڕەشیدی گوت: "گەلەك درەنگە مەریەم، گەلەك."

پاشی زڤڕی و ب دلەکێ شکەستی و سارڤە گوتە زەلەمای: "تو هەڕە ڤاتێ دووێ."

مەریەمێ تڕسەکا مەزن دناڤ چاڤێن زەلەمای دا دیت، زەلەمای ژی ب دوودلی ڤە تەماشەی وان هەرسێکان دکر. وی زانی یاریا وی یا پڕبێژیێ نوکە دناڤ وێ ژوورێ دا هاتیە گوهۆڕین بۆ بابەتەکێ ڕژد و ب دروستاهی دناڤبەرا کەسێن مەزن دا. پاشی ب ئاورینەکا پەشیمانیێ تەماشەی مەریەمێ و دایکا خوە کر.

ڕەشیدی ب دەنگەکێ بلند لێ کرە ڤیژی: "بلەز، نوکە هەڕە سەری."

پاشی وی چنگلێ زەلەمای گرت و برە ڤاتێ دووێ و د ژوورا خوە ڤە زیندانکر.

مەریەم و لەیلا ژی د جهێن خوە دا ڕەق ڕاوەستیابوون و نەدزانی دێ چ کەن. بەرێ وان ل ئەردی بوو، چونکی ئەگەر وان تەماشەی هەڤدوو کربایە، دا ڕەشید زانیت ئەو تشتێ د هزرا وی دا ڕاستە. ئەو ژی کو وی هزردکر دەمێ ئەو ل سەر کاری و مژوولی ڤەکرنا دەرگەهێ ترۆمبیلێن ل بەر دەرگەهێ هوتێلێ و هەلگرتنا چانتەیان بوو، پیلانەکا نەباش ل پشت وی، دناڤ مالا وی دا و ل پێشچاڤێن کورێ وی دژی وی هاتیە دانان.

خو پەیڤەك ژ دەڤی وان دەرنەکەفت، بەلکو گوهێن هەردووان ل دەنگێ ڕەپ ڕەپا پێن وان بوو ل ڤاتێ دووێ، دەنگێ پێن یەك ژ وان ب هێز و د بلند بوون، دەنگێ پێن یێ دی ژی وەکو گیاندارەکێ بچووك بوو کو ل دووڤ وی دکرە غارێ.

ل دووڤ دا، دەنگێن پست پستەکا نەڕوهن و هیڤی خواستنەکا دگەل ڤێژیان، بەرسڤەکا بلەز و کورت، دەنگێ دائێخستنا دەرگەهی و بادانا کلیلێ د قوفلا وێ ڕا و پاشی چەند ڕەپ ڕەپێن دی کو بەرەڤ خوارێ دهاتن و نێزیکی وان دبوو، هاتنە گوهێن وان.

مەریەمێ هەردوو پێن وی دیتن کا چەوا دەمێ ل سەر دەرەجکان دهاتە خوارێ و ب هێز ل ئەردی ددان. پاشی وێ دیت کلیلا دەرگەهی کرە د بەریکا خوە دا و سەرێ ڤائیشەکێ یێ ل دەستێ خوە پێچای و سەرێ وێ یێ دی یێ ئاسنی ژی ل دووڤ وی دهاتە خوارێ و زرڕێن ژێ دهات.

مەریەمێ دڤیا ڕێکێ لێ بگریت، لێ ڕەشیدی پالەك ل وێ دا و ژ ڕێکا خوە هاڤێت. بێی کو یەك پەیڤ ژی ژ دەڤێ وی بهێتە دەرێ، هەر یەکسەر بلەزاتیەکا بێ وێنە ڤائیشەك رداوەشاندنە لەیلایێ. وی هند بلەز ڤائیش دڕاوەشاندنە وێ، وێ دەلیڤە نەبوو بچیتە پاشڤە یان ژ خوە بدەتە پاش، یان دەستێن خوە بلند بکەت و ڤائیشێ بگریت و خوە ژێ بپارێزیت.

لەیلایێ دەستێ خوە دانا سەر جێنیکێن خوە و ب حێبەتی ڤە تەماشەی وێ خوینێ کر یا مایە ب دەستێن وێ ڤە، پاشی تەماشەی ڕەشیدی کر. ماوەیێ ڤێ تەماشەکرنا وێ گەلەك یێ کورت بوو، چونکی هەر یەکسەر تشتەکێ دی یێ خراب ڕوودا.

ڕەشیدی دووبارە ڤائیشا خوە بلند کر.

ڤێجارێ لەیلا ل سەر خوە زالێ بوو بزاڤ کر ب دەستەکی ڤائیشا وی بگریت، لێ نەشیا وەبکەت و ڕەشیدی ژی دووبارە ڤائیش دانایێ. هەرچەندە جارەکێ دەستێ لەیلایێ گەهشتە ڤائیشێ و گرت، لێ ڕەشیدی بلەز ژ دەستێ وێ کێشا و ئینا دەرێ.

جار جار لەیلا د ناڤ ژوورێ دا دڕەڤی و خوە ژ ڤائیشێن وی دوور دکر. مەریەمێ ژی ب دەنگەکێ بلند ڤێژی ڤەددان و هیڤی ژێ دکرن وێ بەس بقووتیت. لێ ڕەشیدی ڕاهێلا لەیلایێ هەتا گرتی و جارەکا دی سەر و ژ نوو ڤائیش دانانە لەشێ وێ یێ نازك و بێ چارە.

د دەلیڤەیەکێ ڕا، لەیلا شیا کولمەکێ ل بن گوهێ ڕەشیدی بدەت، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ڕەشیدی گەلەك تۆڕە بیت و ئاخفتنێن کرێت بێژیتی و ب شێوەیەکێ درندەتر وێ بقووتیت. ل دوماهیێ وی لەیلا گرتەڤە و پالدا ب ڕەخ دیواری ڤە و ب دلەکێ ڕەقتر و بلەزتر ڤائیش دانانێ. سەرێ ڤائیشێ یێ ئاسنی بەر ب سینگ و مل و دەستێن وێ یێن بلندبووی و تبلێن وێ دکەفت و دگەل هەر لێدانەکێ پتر خوین ژ لەشێ وێ خوە دهلاڤێت.

بەری مەریەم ژبیربکەت کا چەند ڤائیش ب لەیلایێ کەفتبوون، کا چەند جاران وێ هیڤی ژ ڕەشیدی دکرن بڕاوەستیت، هەردیسان کا چەند جاران وێ دیت مست و کولم و شەق ب لەیلایێ دکەفتن. وێ دیت دەستەکی ب تبلێن خوە ناڤچاڤێن وی گرتن و نینوکێن وی یێن شکەستی ل سەر حەفکا وی ڕا دئینان و برن و پرچا وی دکێشا و دێمێ وی تژی جەلخە کرن. مەندەهوش ما و د هەمان دەم دا یا کەیفخوش بوو دەمێ زانی ئەو دەست، دەستێ وێ ب خوەیە.

پاشی ڕەشیدی لەیلا بجهـ هێلا و بەرەڤ وێ ڤە هات. ل دەستپێکێ وی بەرێ خوە دا مەریەمێ بێی کو وێ ببینیت یان بزانیت ئەو دەستێ وێ بوو. پاشی چاڤێن خوە باش ڤەکرن و تەماشەی مەریەمێ کر. ئاورینێن وێ ژ تۆڕەبوونێ بۆ مەندەهوشیێ هاتنە گوهورین، پاشی ب چاڤێن خوە باوەرکر کو ئەو دەست یێ مەریەمێ بوو، ژبەر هندێ بێهیڤیبوونەکا دی ل دەڤ پەیدابوو بۆ ماوەیەکی ڕك و ڕك سەحکرە وێ.

ڤێ چەندێ بیرا مەریەمێ ل هینگێ ئینا دەمێ بۆ یەکەم جار چاڤێن وێ ب چاڤێن ڕەشیدی کەفتین، ئەو ژی د خۆدیکێ دا و ل بن پێچەیێ ل ڕۆژا دەهواتا وان دەمێ جەلیل ل سەر سەرێ وان یێ ڕاوەستیای. چاڤێن وان د خۆدیکێ دا کەفتنە سەر یەك. ڕەشیدی ب

گرنگی نەدان، وێ ژی ب گوهداریکرن و داگێڕان و ب لێبورین ڤە تەماشەی هەڤدوو دکر. نوکە ژی مەریەمێ خوە دناڤ ڤان چاڤان دا ددیت کا ئەو چەند یا بێ ئاقل بوو.

وێ پرسیار ژ خوە کر، ئەرێ تو بێژی ئەو ژنەکا فێلباز بیت. ئەرێ ئەو ژنەکا ژ خوە ڕازیبوو؟ ژنەکا نە شەریف بوو؟ ژنەکا بێ شەرم بوو؟ ژنەکا سڤك و خراب بوو؟ ئەرێ ئەو چ تشتێ زیانبەخش بوو یێ وێ ئینایە سەرێ ڤی زەلامی داکو کەربا خوە د سەرێ وێ دا بشکێنیت و بەردەوام هێرشێ بکەتە سەر وێ و خوشیێ ژ قوتانا وێ ببینیت؟

ئەرێ ما دەمێ ئەو یێ نەساخ وێ چاڤێ خوە نەددایێ؟ خوارن نەددا وی و هەڤالێن وی؟ و پشتی هینگێ کەلوپەل و بەرمایکێن وان پاقژ نەدکرن؟ ئەرێ ما وێ جحێلینیا خوە پێشکێشی ڤی زەلامی نەکربوو؟ ئەرێ ئەو ژ هەژی ڤان هەموو ڕەفتارێن خرابە یێن ئەو دگەل وێ دکەت؟

دەنگەك ژ ئاسنێ قائیشێ هات دەمێ ڕەشیدی ئەو هاڤێتیە سەر ئەردی، هۆسا دیارە ڤی دەنگی دڤیا بۆ مەریەمێ دیار بکەت کو تشتەکێ خراب دێ ب سەرێ وێ ژی هێت. تشتەك کو ب هەردوو دەستان بهێتە کرن نەك ب قائیشێ.

بەلێ دەمێ مەریەمێ دیتی ڕەشید یێ بەرەڤ وێ ڤە دهێت، چاڤێ وێ ب لەیلایێ کەفت کو ل پشتێ دەستێ خوە هاڤێتە تشتەکی و ژ ئەردی ڕاکر. وێ دیت دەستێ لەیلایێ ل سەر سەرێ وی بلند بوو. پیچەکێ ڕاوەستیا و پاشی هندی ژێ هاتی ب هێز ئەو تشت ل ناڤ چاڤێن ڕەشیدی دا.

پەرداخ شکەست و هوورکێن شووشەی ل سەر ئەردی بەلاڤ بوون. دەستێن لەیلایێ بوونە خوین، شرکێن خوینێ ژ سەروچاڤێن ڕەشیدی بارین و ب حەفکا وی دا هاتنە خوارێ و کەفتنە سەر کراسێ لەیلایێ. وی ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن و ب ناڤچاڤێن تۆڕە و خویناڤی ڤە بەرەڤ لەیلایێ چوو ڤە.

ڕەشید و لەیلا ب کولم و مست و شەقان کەفتنە هەڤدوو هەتا هەردوو کەفتینە سەر ئەردی. ل دوماهیێ ڕەشیدی ئەو کێشا بن خوە و دەستێ خوە دانا سەر گەردەنا وێ.

مەریەمێ جارەکا دی نینوکێن خوە ل ناڤچاڤێن ڕەشیدی دان و مست دانانە سینگێ وی. پاشی وێ ژی خوە ب سەر ڕەشیدی دادا و بزاڤ کر دەستێ وی ژ سەر گەردەنا وێ

ڕاکەت، لێ تبلێن ڕەشیدی هۆسا ب هێز ل دور گەردەنا وێ هاتبوونە ئالاندن، مەریەمێ دزانی وی دڤێت لەیلایێ بخەندقینیت.

ڕاستە، ڕەشیدی دڤیا لەیلایێ بخەندقینیت، ئێدی کەس ژ وان هەردووان نەدشیا تشتەکی بکەن یان خوە ژ دەستێن وی بینە دەرێ.

مەریەم ڕابوو ڤە و بلەز ژ ژوورێ دەرکەفت. ژ دەنگێ ڕەپ ڕەپا سەری وێ زانی زەلەمای ل ڤاتێ دوێ یێ پێهنان ل دەرگەهێ دائێخستی ددەت. پاشی ژ وێرێ ژی بوری و بەرەڤ ناڤ حەوشێ کرە غار و ل تشتەکی دگەریا.

چوو دناڤ کۆگەهێ دا و دەستێ خوە هاڤێتە مەرپێلکێ.

ڕەشیدی ئاگەهـ ژ هاتنا وێ نەبوو دەمێ هاتیە د ژوور ڤە، چونکی هێشتا ل سەر کەلەخێ لەیلایێ بوو تبلێن وی ل دور گەردەنا وێ بوون. چاڤێن لەیلایێ ژی زیق ببوون و وەکو دینا لێ هاتبوو. وی بەردەوام نینوکێن خوە ژی ب هێز د گەردەنا لەیلایێ ڕا دبرنە خوارێ، ژبەر هندێ چاڤێن وێ شین ببوون و بیبیکێن چاڤێن وێ بۆ ڤی ڕەخی و ڕەخێ دی دهاتن وچوون.

مەریەمێ دیت ئێدی لەیلا یا بێ تاقەت بووی و شیانێن خوە لڤاندن و بەرگریکرنێ نەماینە. وێ د دلێ خوە دا گوت چ نەمایە رەشید دێ وێ کوژیت، بەلێ ڕاستە ها وەختە دێ وێ کوژیت. لێ مەریەمێ نەدڤیا ئەڤ چەندە ڕووبدەت. ب درێژاهیا بیست و حەفت سالێن هەڤژینیێ، وی گەلەك تشت ژ مەریەمێ ستاندبوون. وێ نەدڤیا نوکە ب چاڤێن خوە ببینیت لەیلایێ ژی ژێ بستینیت.

مەریەمێ پێ، خوە ل سەر ئەردی قائیم کرن و دەستکێ مەرپێلێ ب هێز گرت و سەرێ وێ بلند و ب ناڤێ وی گازی کر داکو ئەو ل پشت خوە بزڤریت و وێ ببینیت.

"ڕەشید."

ڕەشیدی سەرێ خوە بلند کر.

هندی هێز د لەشێ مەریەمێ هەی، مەرپێلك داوەشاندە ڕەشیدی.

سەرێ مەرپێلکێ ب جێنیکا ڕەشیدی کەفت، لێدانا وێ هند یا ب هێز بوو تا وی ڕادەی ئەو ژ سەر کەلەخێ لەیلایێ هاڤێت.

ڕەشیدی دەستێ خوە دانا سەر جێنیکا خوە و تەماشەی تبلێن خوە یێن ب خوین کر و پاشی بەرێ خوە دا مەریەمێ. مەریەمێ هەستپێکر سەروچاڤێن وی پیچەکێ نەرم بوون، وێ هەستپێکر تشتەك دناڤبەرا وان دا هاتە لێکگوهۆڕین، ڕەنگە ڤێ چەندێ پیچەکێ هوشێن وی ژی ئینابانە سەرێ وی.

مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت: بەلکو ڕەشید ژی تشتەکی دناڤ چاڤێن وێ دا ببینیت. تشتەکێ هۆسا بیت کو وەل وی کربیت پێداچوونەکێ د خوە دا بکەت. ڕەنگە وی دناڤ چاڤێن وێ دا نیشانەکا هۆسا دیتبیت کو دەربڕین ژ هەموو وان قوربانیدان و نەخوشی و دەردەسەریان کربیت یێن ب درێژاهیا ژیانا خوە دگەل وی دا دیتین. ژیانەکا پڕی نەرمی و بێدەنگی یا وێ و توندوتیژی و دلڕەقیا وی. ژیانەکا پڕی سفکاتی پێکرن و دیارکرنا کێماسیێن وێ. ئەرێ ئەڤە ڕێزگرتن بۆ وێ د چاڤێن وی دا ددیتی یان پەشیمانی بوو؟

لێ وێ هند دیت لێڤا وی یا سەری بلند بوو و دەست ب نڕینەکا پڕی کەرب و کین کر. د ڤی دەمی دا مەریەمێ هەست ب بێ مفای و هەتا بێ بەرپرسیاریێ ژی کر کو وێ ئەڤ کارە ب دوماهی نەئینای.

ئەگەر ئەو نوکە ڕێکێ بدەتە ڕەشیدی، ئەرێ چەند دێ پێڤە چیت هەتا ئەو کلیلێ ژ بەریکا خوە بینتە دەرێ و بچیتە سەری و دەرگەهێ وێ ژوورێ ڤەکەت یا زەلەمای تێدا زیندان کری و پاشی دەمانجا خوە بینتە دەرێ و بهێتە وێ؟

ئەگەر مەریەم یا پشتڕاستبایە کو ئەو دێ وێ ب تنێ کوژیت، دا مەڕبێلکێ هاڤێژیت و دەلیڤەیێ دەتە وی بچیت دەمانجا خوە بینیت. لێ د چاڤێن وی دا یا دیاربوو کو ڕەشیدی دڤێت وان هەردووان بکوژیت.

ژبەر هندێ مەریەمێ جارەکا دی مەڕبێلك بلند کر. هندی هێز د لەشێ وێ هەی مەڕبێلك بلند کر تا وی ڕادەی سەرێ مەڕبێلکێ گەهشتە پشت وێ و سەرێ وێ وەلێکر کو دەڤێ وێ یێ تیژ ب شێوەیەکێ ستوونی براوەستیت.

دەمێ وێ ئەڤ کارە دکری، ئەو چەندە هاتە بیرا وێ کو ئەڤە یەکەم جارە د ژیانا خوە دا ئەو بڕیارێ ل سەر چارەنڤیسێ خوە ددەت.

دگەل ڤێ هزرکرنێ، وێ مەڕبێلك داوەشاندە گەردەنا ڕەشیدی. د ڤێ گەڕێ دا هندی هێز و تێهنەك د لەشێ وێ هەی خەرج کر.

# 46

## لەیلا

لەیلایێ ئاگەهـ ژ خوە هەبوو دەربارەی وی کەلەخێ کەفتیە سەر لەشێ وێ. ددان و بێهنا جگارە و چاڤێن وی یێن ترسناك نیاسین. هەردیسان تا ڕادەیەکی وێ مەریەم ژی نیاسی کو هۆسا دهاتە پێشچاڤێن وێ ئەو یا ڕاوەستیایە و مست و کولمان ل کەسەکێ دی ددەت، ئەو ئەوێ کەفتیە سەر کەلەخێ وێ.

بانێ خانی ل بەرامبەر چاڤێن لەیلایێ بوو، ئەو بانێ سەرنجا لەیلایێ ڕادکێشای، پنیێن پیساتی و کیفکویێ ل سەر دیوار و کوژییێن وێ دیاردکرن هەروەکو کا چەوا پنیێن حبرێ ل سەر کڕاسی دیار دکەن دەمێ پێدا دڕێژیت. هەردیسان چەندین دەرز و کەند کەفتبوونە گێچا دیواری کو وان ژی وەکو دێمەکێ ب گڕنژین یان تێکچووی خویا دکر.

لەیلایێ هزرا خوە د هەموو وان جاران دا دکر دەمێ وێ پارچەکا پاتەیێ تەڕ ددانایە سەر فرچەی و تەڤنێن تەڤنپیرکان پێ پاقژ دکرین. د وان هەر سێ جارێن وێ و مەریەمێ دیوارێن مالێ ب بۆیاغەکا دوهنی بۆیاغ کری، ئێدی شەڨێن دیواری وەکو دیمەنەکێ ب گڕنژین خویا نەدکر بەلکو ئێدی ئەو دەرز و شەق بەرزە دبوون.

بانێ خانی هێدی هێدی ل پێشچاڤێن وێ بچووك دبوو، بلند دبوو و ژێ دوور دکەفت و بەرەڤ ئەسمانەکێ تاڕی و ئەور دچوو. ئێدی بانێ خانی هند ژێ دوورکەفت ل پێشچاڤێن وێ هندی پولەکا پۆستەیی لێ هات، پولەکا سپی و بریسقەدار. هەموو تشتێن ل دەوروبەری وی دناڤ تاڕیاتیەکا دائێخستی دا بەرزەبوون. دناڤ ڤێ تاڕیاتیێ دا، سەروچاڤێن ڕەشیدی وەکو پنیەکا ڕۆناهیێ یا تیژ دهاتە پێشچاڤێن وێ.

نوکە، پێلێن ڕۆناهیێ یێن کورت و بچووك دهاتنە پێشچاڤێن وێ و وەکو ستێرێن ڕەنگ زیڤی دپەڤین. دناڤ ڤێ ڕۆناهیێ دا، شێوەیێن ئەندازەیی یێن جوراوجور پەیدادبوون. شێوەیێ کرمان، شێوەیێن هێلکەیی کو بەرەڤ سەری و خوارێ دهاتن و چوون. هندەك ژی

دچوونە ناڤێكدا و ژێكدوور دكەفتن و شێوەیێن دی پێكدئینان، ل دوماهیێ ژی ئەڤ ڕۆناهیە هەمموو ل پێشچاڤان نەمان و دناڤ تارِیاتیێ دا بەرزەبوون.

هندەك دەنگێن ژ دوور و نەڕوهن هاتنە گوهێن وێ.

ل بن مژیلانكێن چاڤێن وێ، وێنەیێ زارۆكێن وێ دبریسقین. عەزیزا، یا زیرەك و ئارام و بێهنفرەهـ و نهێنی پارێز بوو. زەلەمای ژی ب جوشەكا مەزن تەماشەی بابێ خوە دكر.

لەیلایێ د دلێ خوە دگوت، هۆسا دیارە هەمموو تشت ب ڤی ڕەنگی دێ ب دوماهی هێن. چ دوماهیكەكا خەمگین و جهێ دل پێڤەمانێ بوو. لێ پشتی هینگێ هێدی هێدی تارِیاتی نەما. هەستپێكر ئەو یا بلند دبیت یان كەسەك یا وێ بلند دكەت. هێدی هێدی سەربان هاتە جهێ خوە ڤە و وەكو بەرێ لێ هات. لەیلایێ جارەكا دی ئەو دەرز و شەق دیتنەڤە، هەروەكو بەرێ وەكو دێمەكێ ب كەنی خویا دكرن.

كەسەكێ ئەو دهەژاند و دگوتێ: "تو یا ب سەلامەتی؟ بەرسڤا من بدە؟ تو یا ب سەلامەتی؟"

دەمێ وێ چاڤێن خوە ڤەكرین، مەریەم هاتە پێشچاڤێن وێ كو دێمێ وێ یێ پڕ بوو ژ برین و خیچكان، پڕی دوودلی و ترس و بەرێ وێ ژی ل لەیلایێ بوو.

وێ بزاڤ دكر بێهنا خوە بهلكێشیت، لێ ڤێ چەندێ گەوریا وێ دئێشاند. دووبارە بزاڤ كرەڤە لێ دیسان ئێشانا گەوریا وێ ژی پتر لێ هات. ڤێ جارێ نەك تنێ گەوریا وێ بەلكو سینگێ وێ ژی دگەل دئێشا. ل دووڤ دا كوخی و خرێن ژ سینگێ وێ هات. وێ دەڤێ خوە ڤەكر داكو ب ڕێكا دەڤی بێهنا خوە بهەلكێشیت. دەمێ د كوخی ژی، هەستپێدكر گوهێن وێ د ساخلەمن و گوهـ ل دەنگان هەیە.

***

یەكەم تشتێ لەیلایێ دیتی دەمێ ڕابوویەڤە، ڕەشید بوو كو ل سەر پشتا خوە یێ درێژ كری بوو بەرێ وی ڕك ل لەیلایێ بوو بێی كو مژیلانكێن خوە بلڤلڤینیت. دەڤێ وی وەكو یێ ماسیان یێ ڤەكری بوو و هندەك كەف پێدا هاتبوو خوارێ و ڕەنگێ وێ یێ پیڤازی بوو و ژ دەڤێ وی هەتا سەر ئەرزنكا وی بەلاڤ بوو. دەلنگێ وی ژی یێ تەڕ بوو. لەیلایێ جێنیكا وی دیت.

ل دووڤ دا چاڤێ وێ ب مەڕبێلکێ کەفت.

نالینەك ژێ دەرکەفت. گوت: "ئاخ."

وێ ب خورتی و لەرزین ڤە دشیا ڤی دەنگی ژ خوە بینیت و باخڤیت. "ئاخ مەریەم."

***

لەیلایێ ب نالین ڤە دەستێ خوە ب گەوری و سینگێ خوە دا دئینا خوارێ و بەرەڤ پێش ڤە دچوو. مەریەمێ ژی دەستێن خوە کربوونە د کوشا خوە دا و ب ئارامی و بێ لڤین ڤە ل دەڤ ڕەشیدی ڕوونشتبوو. بۆ ماوەیەکێ درێژ لێڤێن مەریەمێ ل سەر یەك نەڕابوون.

دەڤێ لەیلایێ ژی هشك ببوو. ئەزمانێ و ئاخفتنێن وێ دئالزین، لەشێ وێ هەموو دلەرزی. وێ بزاڤ دکر بەرێ خوە نەدەتە ڕەشیدی، دەڤێ وی یێ خاڤبووی، چاڤێن وی یێن ڤەکری و خوینا هشکبووی ل سەر ڤالاهیا هەستیکێ کلیلکا ملی.

ژ دەرڤە، ڕوناهی بەرزە دبوو و تارییاتیێ هێدی هێدی گیانێ خوە ب سە باژێری دا دئینا. دێمێ مەریەمێ لاواز و واستای دناڤ ڤێ ڕۆناهییا کێم دا خویا دکر، لێ د هەمان دەم دا چ تێکچوون و ترس ل دەڤ دیارنەبوو بەلکو ب تنێ یا مژوول بوو، هزرێن خوە دکرن و یا ل سەر خوە زال بوو تا وی ڕادەی ئەگەر پێشیەکێ دادابایە سەر ئەرزنکا وێ، وێ ئاگەهـ ژێ نەدبوو یان ژ خوە نەددا پاش. ب تنێ ئەو ل وێرێ یا ڕوونشتی بوو لێڤا وێ یا بنی شۆر ببوو و کوور چووبوو د هزران دا.

ل دوماهیێ گوت: "ب ڕوونە خوارێ، لەیلا گیان."

لەیلایێ ژی ب ئاخفتنا وێ کر.

"دڤێت ئەم لەشێ وی ژ ڤێرێ ببەین، زەلەمای نەشێت خوە ل بەر دیتنا ڤی دیمەنی بگریت."

***

بەری کو ئەو چارچەفەکێ د لەشێ ڕەشیدی بئالینن، مەریەمێ کلیلکا ژوورا وی یا نڤستنێ ژ بەریکا وی ئینانە دەرێ. لەیلایێ هەردوو پێن وی ل جهێ چووکان گرتن و مەریەمێ ژی دەستێ خوە هاڤێتە بنکەفشێن وی و بزاڤ کر وی بلند بکەن، لێ سەنگا وی گەلەك یا گران بوو، ژبەر هندێ وان ئەو ل دووڤ خوە ڕاکێشا و بر.

دەمێ وان لەشێ وی د دەرگەهێ سەرەکی یێ مالێ ڕا دڕاکێشایی، پێ ڕەشیدی ل بەر دەرگەهی ڕا ئاسێ بوو و کەفتە سەر لایەکی. ئەو هەردوو نەچار بن دووبارە بهێنە پاشیێ و ب هەر ڕێکەکا هەی بزاڤ کر لەشێ وی دەربێخن.

ل وی دەمێ دەنگێ گورمێنەکێ ژ ڤاتێ سەری هات. چوکێن لەیلایێ خاڤ بوون و کەلەخێ ڕەشیدی بەردا. ئەو ب خوە ژی کەفتە سەر ئەردی و دەست ب گرییێ کر و دگەل هندێ دلەرزی ژی. مەریەمێ دەستێ خوە دانا سەر کەمەرا خوە ل سەر سەرێ وێ ڕاوەستیا و گوتێ پێدڤیە تو ل سەر خوە زالێ بی، یا ڕوودای، ڕوودا.

لەیلا پشتی دەمەکێ کێم ڕابووڤە و سەروچاڤێن خوە پاقژ کرن، ڤێ جارێ بێی کو تشتەك ڕووبدەت وان کەلەخێ وی گەهاندە دناڤ حەوشێ دا و پاشی برە د کۆگەهێ ڤە. وان کەلەخێ وی دانا پشت وێ مێزێ یا مشارەك و چەندین بزمار و ڤەزمەك و چەکوچەك و دارەکا لولەیی ل سەر بوون کو هۆسا دیارە دا بۆ زەلەمای تشتەکی چێکەت، لێ ئەو نەگەهشت چێکەت.

پاشی ئەو هەردوو چوونە د ژوور ڤە. مەریەمێ دەستێن خوە شووشتن و ب پرچا خوە دا ئینانە خوارێ و بێهنا خوە کوور هەلکێشا.

"کا دا سەحکەمە برینێن تە، لەشێ تە هەموو یێ بریندار بووی لەیلا جان."

★★★

مەریەمێ گوت ئەو پێدڤی ب شەڤەکێ یە هەتا هزرێن خوە بکەت و بهێتە سەر هوشێن خوە و نەخشەیەکی بۆ ئەڤ چەندا ڕوودای بدانیت.

پاشی گوت: "ڕێکەك هەیە، پێدڤیە ئەم وێ ڕێکێ بزانین."

لەیلایێ ب دەنگەکێ شکەستی و هشك ڤە گوت: "دڤێت ئەم ڤێرێ بجهـ بهێلین. نابیت ئەم زێدەتر بمینە ل ڤێرێ."

پاشی ژ نیشکەکێ ڤە هندەك دەنگ هاتنە بیرا وی، هەلبەت دەنگێ مەڕبیلکێ بوو دەمێ لەیلایێ ددانایینە ڕەشیدی. دەروونێ وێ تێکچوو ئاڤا گەدەیێ وێ سەرکەفتنە دناڤ دەڤێ وێ دا.

مەریەمێ خوە گرت هەتا ڕەوشا لەیلایێ باشتر لێ هاتی، پاشی گوتێ خوە درێژ بکە و سەرێ وێ دانا سەر کوشا خوە و دەستێ خوە ب سەر پرچا وێ دا ئینا و بر و گوتێ خوە نیگەڕان نەکە چونکی هەموو تشت دێ د باش بن.

مەریەمێ گوتێ کو ئەو هەموو پێکڤە دێ چن، ئەو و لەیلا و زارۆك و تارق دێ پێکڤە چن و ڤی باژێرێ دلڕەق بجهـ هێلن. ل دەمێ وێ دەستێ خوە کریە دناڤ پرچا لەیلایێ دا، دیسان بۆ دووبارە کر کو دڤێت ژ ڤی وەلاتێ بەرتەنگ هەموویێ باربکەن و بچنە جهەکێ دوور و ب سەلامەت کو ئێدی کەس وان نەبینیت و نەنیاسیت. جهەکێ هۆسا کو بشێن بیرەوەرییێن خوە یێن کەڤن هەموویان تێدا بهاڤێژن و ژبیر بکەن و هێلینەکا نوو بۆ خوە ئاڤا بکەن.

"جهەکێ هۆسا کو داروبار لێ هەبیت، داروبارەکێ زێدە."

مەریەمێ گوت ئەو دێ چن دناڤ خانیکەکێ بچووك ل نێزیکی باژێرکەکی ژین کو کەسێ ئاگەهـ ژ وان نەبیت و دەنگوباسێن وان نەزانیت، یان ژی بچنە گوندەکێ دوور کو ڕێکا وی یا ئاخێ یا تەنگ و زراڤ بیت و ل سەر هەردوو لایێن ڕێکێ ژی داروبار و گژوگیایێن بلند هەبن، یان ژی ڕێکەکا هۆسا بیت کو یا پڕ بیت ژ گژوگیای داکو زارۆك بشێن بۆ خوە یاریان دناڤ دا بکەن. یان ژی ڕێکەکا ب بەران هاتیە نخافتن و بەرەڤ دەریاچەیەکا شین و پاقژ بچیت یاکو ماسیێن سەلەمون یێن پیلەکدار مەلەڤانیان تێدا بکەن و لەڤەنێن درێژ ژێ هاتبنە دەرێ.

ئەو دێ ل وێرێ تەرش و تەوالی و بزنان بۆ خوە ب خودان کەن. پێکڤە دێ نانی پێژن و زارۆکان فێری خواندن و نڤیسینێ کەن. دێ ژیانەکا نوو ب ئێمناهی و ڤەدەر دەست پێ کەن. ئێدی ل وێرێ نەخوشیێن وەکو بارەکێ گران کەفتینە سەر ملێن وان و چەندین سالان ژبەر دنالێن دەنە ڕەخەکی و دێ ب بەختەوەری و خوشگوزەرانی ژین.

لەیلایێ د بن لێڤکان ڕا پشتەڤانیا وێ دکر.. وێ دزانی ئەو ژیان ژی دێ یا ب زەحمەت بیت لێ دێ زەحمەتەکا ب تام و خوش بیت. دێ ب شانازی ڤە خوە ل بەر وێ زەحمەتێ گرن. دێ بهایێ وێ زەحمەتێ زانن هەروەکو وی میراتێ بهادار یێ ژ خێزانێ بۆ مرۆڤی دمینیت.

**دەنگێ نەرمێ مەریەمێ یێ وەکو دایکان بەردەوام بوو هەتا ڕادەیەکی شیا لەیلایێ ئارام بکەت. ئەوێ گوتێ ڕێکەك یا هەی و ل ڕۆژا دی سپێدی مەریەم ژی دێ بێژتە وان کا چ بکەن و چ نەکەن. ئەو دشێت هەر ژ سوباهی بەرەڤ وێ ڕێکێ بچن یا دێ وان بەرەڤ ژیانا وان یا نوو ڤە بەت. ژیانەکا پڕی دەرفەتێن خوشی و زەحمەتەکا ب تام.**

**لەیلا یا سوپاسدار بوو کو مەریەمێ ل پێش وان هەردووان ڤە دشیا بڕیاران بدەت چونکی مەژیێ وێ ب تەمامی یێ وەستایی بوو.**

**مەریەم ڕابووڤە و گوت: "نوکە هەڕە دەڤ کورێ خوە."**

**د سیمایێ مەریەمێ ب خوە ژی دا، دیمەنەکێ هۆسا دهاتە دیتن کو بەری هینگی لەیلایێ ئەو دیمەن د سیمایێ کەسێ دا نەدیتبوو.**

★★★

**لەیلایێ دناڤ تارڕیاتیا ژوورێ دا کورێ خوە دیت کو ل سەر لایەکێ دوشەکا ڕەشیدی یێ ڕازای بوو. ئەو ژی چوو ب ڕەخ ڤە و ڕازا و بەتەنی کێشا سەر خوە هەردووان.**

**"ئەرێ تو یێ نڤستی؟"**

**بێی کو بەرێ خوە بدەتە وێ، گوت: "ئەز هێشتا نەنڤستیمە. بابا جانی دوعایێن "بابالوو*"ی دگەل من نەخاندینە."**

**"ئەڤ شەڤە ئەز دێ شێم ل پێش وی ڤە دگەل تە خوینم."**

**"تو وەکو وی نەشێی دگەل من بخوینی."**

**لەیلایێ ملێن وی یێن بچووك گڤاشتن و پێڤە ماچیکر. "باشە دێ خوە جەربینم."**

**"بابێ من ل کیڤەیە؟"**

**لەیلایێ گوت: "بابا جان یێ چووی."**

**دیسان گەوریا وێ پڕ بوو ژ گریێ. ئەڤە یەکەم جار ئەو درەوەکا هۆسا مەزن بکەت. ئەرێ چەند جارێن دی ئەو دێ نەچار بیت درەوێن هۆسا مەزن بکەت.**

**وێ ب خەمباری ڤە پرسیار ژ خوە دکر، ئەرێ چەند جارێن دی ئەو دێ هۆسا زەلەمای خاپینیت؟ وێ زەلەمای دئینا پێشچاڤێن خوە دەمێ ڕەشید دهاتیە مال کا چەند ب**

---

* زاراڤەکێ ئەڤغانی یە بۆ وان جورە دوعایان دهێتە بکارئینان یێن ژلایێ مەزنێ خێزانێ ڤە دهێنە گوتن ب تایبەت بابی. ئەڤ دوعایە بۆ زارۆکان دهێنە خواندن داکو وان ژ دێو و گیانێن ب ترس بپارێزیت.

جوش و خوشیەکا مەزن ڤە بەرەڤ وی ڤە دچوو و ڕەشیدی ژی چنگلێن وی دگرتن و هند دزڤڕاند هەتا پێن وی ب تەمامی بلند دبووین و هەردووان تیق تیق ب هەڤدوو دکره کەنی. وێ هزرا خوه د یارییێن وان یێن نه ڕێکخستی و کەنیا وان یا دەنگ بلند و ئاورینێن وان یێن نهێنیێ دا دکر. خەم و شەرمێ وەکو کڕاسەکی خوه ب سەر لەیلایێ دادا.

ئەو چوویه کیڤه؟"

"ئەز نزانم خوشتڤیێ من."

ئەو دێ کەنگی زڤڕیت؟ ئەرێ بابا جان دێ دیاریان بۆ دگەل خوه ئینیت دەمێ دزڤڕیت؟

وێ دوعادە دگەل زەلەمای خواندن. بیست و یەك جاران "بسم الله الرحمن الرحیم". هەریەك بۆ یەك گەهێن تبلێن وێ. بەرێ لەیلایێ ل وی بوو دەمێ دەستێن خوه نێزیکی سەروچاڤێن خوه کری و پوف کرێ و پاشی نیڤەکا هەردوو دەستێن خوه دانانە سەر ئەنیا خوه و لڤینەك دکر هەروەکو دا بێژی ئەو یێ تشتەکی ژ خوه دوور دکەت.

د بن لێڤکان ڕا دوعایا بابالووی دخاند: "بابالوو، هەڕە، نەهێ زەلەمای. تە شوله ب چ نینه، بابالوو، هەره." و پاشی بۆ ب دوماهی ئینانا دوعایێ سێ جاران گوتی "الله اکبر."

پشتی هینگێ ب بێهنەکێ، ل درەنگی شەڤ، لەیلا حێبەتی ما دەمێ گوهـ ل دەنگێ زەلەمای بوو کو دبن لێڤکان ڕا دگوت: "ئەرێ باباجان ژبەر من چوویه؟ ژبەر وان تشتێن من گوتینێ دەربارەی تە و ئەو زەلاٚمێ ل خوارێ ڕوونشتی؟"

لەیلایێ دەستێ خوه ب سەر لەشێ وی دا ئینا خوارێ و دڤیا دلەکی ل بەر دلێ وی بدەت و بێژیتێ کو وی چ پەیوەندی ب ڤی بابەتی ڤە نینه. خەتایێن تە نینن، لێ ل وی دەمی زەلەمای د خەو چووبوو. سینگێ وی یێ بچووك بلند و نزم دبوو.

٭٭٭

دەمێ لەیلا چوویه د لێنانگەهێ ڤە، مەژیێ وێ یێ ئالۆز و تێکشێلیای بوو و شیانێن هزرکرنێ ب شێوەیەکێ باش نەبوون. دەمێ ل دووڤ دەنگێ مەلای و بانگێ سپێدێ ژ خەو هشیار بووی، تا ڕادەیەکی هاتبوو سەر هوشێن خوه. بۆ ماوەیەکی ل سەر تەختێ خوه یێ نڤستێ ڕوونشت و تەماشەی زەلەمای دکر کو نڤستبوو و دەستێ خوه یێ مچاندی دانابوو بن ئەرزنکا خوه.

لەیلایێ مەریەم ئینا پێشچاڤێن خوە کو ل نیڤا شەڤێ ب دزیکی ڤە هاتیە د ژوورا وان ڤە و ل سەر سەرێ وان ڕاوەستیایە و باش تەماشەی هەردووان کریە و هزرا خوە د دانانا نەخشەیەکی دا کریە.

لەیلا ڕابوو ژ پێرڤە. هەرچەندە ڕابوونا وێ هند یا ب سانەهی نەبوو، چونکی ئەندامێن لەشێ وێ هەموو دئێشان، ملێن وێ، پشتا وێ، گەوریا وێ، ڕانێن وێ. ئەندامێن لەشێ وێ هەموو ژ بەر قائیشێن ڕەشیدی دانایە وێ هەموو بریندار ببوون. لەیلا ب هەستکرن ب ئێشانێ و ب بێدەنگی ژ ژوورا خوە یا نڤستنێ دەرکەفت.

ڕوناهیا ژوورا مەریەمێ پیچەکێ ژ ڕەنگێ گەور تاڕیتر بوو. ئەو ڕۆناهیا هەموو گاڤان دەنگێ بانگێ دیکلان و چیکێن خوناڤا ل سەر بەلگێن داروباران دئینایە بیرا وێ. مەریەم د کوژیەکێ مالێ دا ل سەر جهنڤێژکەکێ ڕوونشتبوو و بەرێ خوە دابوو پەنجەرێ و نڤێژا سپێدێ دکر. لەیلا ژی ب بێدەنگی و هێدی ب ڕەخ وێ ڤە ڕوونشت.

مەریەمێ گوت: "سپێدێ زوو دڤێت تو بچیە دەڤ عەزیزایێ."

"ئەز دزانم تە دڤێت چ بکەی."

" ب پیان نەچە، سواری پاسێ ببە، چونکی هۆسا تو دناڤ خەلکی دا دێ بەرزە بی و کەس نزانیت تو یا ب تنێ، ئەگەر د تەکسیەکێ دا بی دێ گەلەك هێیە پێشچاڤ و ئەگەر وان دیتی تو یا ب تنێ د تەکسیێ دا، پشتڕاست بە دێ تە گرن و زڤڕینە مال."

"باشە ئەو سوزا شڤێدێ ب شەڤ تە دای..."

لەیلایێ نەشیا ئاخفتنا خوە تەمام بکەت. داروبار، دەریاچە، گوندێ بێ ناڤ، هەستپێکر هەموو درەوەکا جوان بوو مەریەمێ بۆ کری و ب تنێ بۆ هندێ بوو داکو دلەکی ل بەر دلێ وێ بدەت. هەروەکو کا چەوا تو زارۆکەکی دخاپینی.

"ئەز یا ڕژد بووم لەیلا، من ئەو چەندە ژبەر تە دگوت لەیلا جان."

لەیلایێ د بن لێڤکان ڕا گوت: "من خو تشتەك ژ ڤان بێی تە نەڤێت."

مەریەمێ گرنژینەکا سڤك کر.

"من دڤێت وەکو وێ چەندێ بیت یا تە گوتی. مەریەم ئەم هەموو دێ پێکڤە چین، ئەز و تو و زارۆك. تارقی ل پاکستانێ جهەك هەیە کو ئەم دشێن ماوەیەکی ل وێرێ بمینین هەتا ڕەوش ئاسای دبیتەڤە."

مەریەمێ گوت: "ئەڤ چەندە یا ب زەحمەتە."

لەیلایێ کو گەوریا وێ پڕ بوو ژ گریێ و چاڤێن وێ پڕ بوون ژ ڕۆندکان، گوت: "دێ مە ئاگەهـ ژ هەڤدوو هەبیت، هەروەکو تە گوتی. نەخێر. ئەز دێ چاڤێ خوە دەمە تە هەتا خوە دگوهۆڕی."

"ئاخ لەیلا جان."

ئەزمانێ لەیلایێ کو دئالۆزی، کەفتە هیڤی خواستنێ و گوت کو هەر کارەکێ پاقژکرنێ و لێنانا خوارنێ ئەز دێ کەم بەس تو ڕازیبە.

"ئەز ناهێلم خو تو دەستێ خو بکەیە تشتەکی. خو تشتەکی. تو ب تنێ بێهنا خوە ڤەدە و بنڤە و دناڤ باخچەی دا وەرە و هەڕە و تە چ بڤێت بێژە من ئەز دێ بۆ تە کەم. کارەکێ هۆسا نەکەی کو ژ مە جودا بی. تو ژ مە جودا نابی. دلێ عەزیزایێ نەشکێنە."

مەریەمێ گوت: "ئەو سەرا دزینا نانەکێ دەستێ خەلکی دبڕن، ئەرێ پا هەکە کەلەخێ زەلاٚمەکی و دوو ژنێن ڕەڤی بینن دێ چ لێ کەن."

لەیلایێ گوت: "کەس نزانیت، کەس مە نابینیت."

"چ درەنگ یان زوو ئەو دێ هەر مە بینن. دێ بێژی ئەو سەیێن نێچیری نە."

مەریەمێ ب دەنگەکێ نزم و ل سەر خوە دئاخفت. ئەڤێ چەندێ ژی وەدکر ئاخفتنێن لەیلایێ وەکو هندەك ئاخفتێن خەیالی و بێ ڕامان بهێنە پێشچاڤێن وێ.

"مەریەم، ئەز هیڤی ژ تە دکەم."

"ئەگەر وان ئەم دیتین و دەستەسەر کرین، ل وی دەمی توژی وەکو من دێ یا تاوانبار بی. هەروەسا تارق ژی. من نەڤێت هوون هەموو گاڤان وەکو پەنابەران بڕەڤن. ئەگەر هەوە ژی دەستەسەر بکەن، تو بێژی دێ چ ب سەرێ زارۆکان هێت."

چاڤێن لەیلایێ پڕ بوون ژ ڕۆنکان.

"ل وی دەمی، کی دێ چاڤێ خوە دەتە وان؟ تالێبان؟ لەیلا جان وەکو دایکەکێ هزرێن خوە بکەن. وەکو دایکەکێ. وەکو من."

"ئەز نەشێم."

"دڤێت تو یا هۆسا بی."

لەیلایێ دەڤێ خوە تێکئینا و بر و گوت: "ئەڤ چەندە تشتەکێ ڕەوا و بەرئاقل نینە."

"بوچی یێ بەرئاقل نینە؟ وەرە پێشڤە؟ وەرە ل ڤێرێ ب ڕەخ من ڤە پاڵدە."

لەیلا نێزیکی وێ بوو سەرێ خوە دانا سەر کوشا وێ. هەموو ئەو ئێڤاری هاتنە بیرا وێ یێن وان هەردووان پێکڤە دبوراندین و پرچێن هەڤدوو دڤەهاندین. مەریەمێ ب بێهنفرەهی ڤە گوهێ خوە ددا بۆچون و چیرۆکێن وێ یێن ئاسایی کو د سیمایێ وێ ژی دا سوپاسداری خویا دکر. سیمایێ کەسەکا هۆسا کو تشتەکێ تایبەت و دلخوشکەر ب ڕەوا و بەرئاقل ببینیت.

مەریەمێ گوت: "ئەڤ چەندە تشتەکێ ڕەوایە. من هەڤژینێ خوە کوشت و کورێ تە هێلا بێ باب. ئەز نابینم ڕەڤین کارەکێ دروست بیت. ئەز نەشێم وەبکەم. ئەگەر خوە ئەو نەشێن من بگرن ژی، لێ ئەز هەر نەشێم بڕەڤم."

لێڤێن وێ دلەرزین، بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە: "ئەز نەشێم ژبەر خەمێن کورێ تە بڕەڤم. چەوا تەماشەی چاڤێن وی بکەم؟ چەوا دێ وەل خوە کەم بشێم تەماشەی چاڤێن وی بکەم؟ لەیلا جان؟"

مەریەمێ یاری ب پرچا لەیلایێ دکرن و گرێکا وێ خاڤ دکر.

"ئێدی ئەز ل ڤێرێ ب دوماهی هاتم. ئێدی من چ تشت ژ ژیانێ نەڤێت. ئەو تشتێ هەر ژ زارۆکینییێ من هیڤی بۆ دخواست تە دا من. تە و زارۆکێن خوە ئەز گەلەك کەیفخوش و بەختەوەر کرم. گوهێ خوە نەدێ کا دێ چ ب سەرێ من هێت. لەیلا جان. ئێدی دێ هەر هۆسا بیت. خەمان نەخو."

لەیلایێ چ بەرسڤێن لوژیکی بۆ ئاخفتێن مەریەمێ نەبوون، بەلکو ژ دەڤ خوە دئاخفت و وەکو زارۆکان بەحسێ وان شتلێن داران دکر یێن چاڤەڕێبوون بچینن، وان باڵندەیێن ل بەر بوو نێچیر بکەن، وان خانییێن بچووك یێن دکەڤنە وی گوندێ بێ ناڤ دا، پیاسەیێن وان بەرەڤ کنارێ دەریایێ ئەوا پڕ ژ ماسیێن سەلەمون.

ل دوماهیێ دەمێ ئاخفتنێن وێ ب دوماهی هاتین، لێ ڕۆندکێن وێ ب دوماهی نەهاتبوون. لەیلایێ چ تشت نەما بێژیت ب تنێ ئەو چەندە نەبیت کو وەکو زارۆکەکی داگێڕانێ بۆ ئاخفتنێن لوژیکی یێن کەسەکێ مەزن بکەت و خوە ب دەستڤە بەردەت. تشتێ

یەکانە یێ ئەنجامدای ئەو بوو دووبارە سەروچاڤێن خوە دکوشا گەرما مەریەمێ دا نقووم کرن.

پشتی هینگێ ب بێهنەکێ، ل سپێدەهیا هەمان رۆژ، مەریەمێ هندەك نان و کتکێن هژیران یێن هشك بۆ فراڤینا زەلەمای پێچان. هەردیسان هندەك کتکێن هژیران و پسکێت کو ل سەر شێوێ گیانەوەران بوون، بۆ عەزیزایێ ژی دانان. هەموو کرنە د زەرفەکێ کاغەزی دا و کرنە د دەستێ لەیلایێ دا.

پاشی گوت: "ژ پێش من ڤە عەزیزایێ ماچی بکە و بێژێ ئەو ڕۆناهیا چاڤێن منە، شاهژنا دلێ منە، دێ وەبێژیێ؟"

لەیلایێ سەرێ خوە هەژاند.

"هەروەکو من گوتیە تە، سوواری پاسێ ببە و سەرێ خوە بچەمینە.

"مەریەم، ئەز دێ کەنگی تە بینم؟ من دڤێت بەری بۆ دیدەڤانیێ، تە ببینم. ئەز دێ بێژمێ کا ئەڤ ڕوودانە چەوا ڕوودا. دێ بۆ وان ڕوهن کەم کو خەتایێن تە نەبوون بەلکو تو نەچاربووی وەبکەی، ئەو ژی دێ تێگەهن. مانە هۆسایە، مەریەم؟ ئەو دێ تێگەهن."

مەریەمێ ب دلەکێ نەرم تەماشەی وێ کر.

پاشی مەریەمێ خوە چەماند هەتا سەروچاڤێن وێ بهێنە ڕاستا سەروچاڤێن زەلەمای. زەلەمای تیشێرتەکێ سۆر و پەنترۆنەکێ ڤەهوای یێ کەڤن کربوونە بەر خوە و جووتەکێ پوتێن کابۆی یێن بالاْ کربوونە پێن خوە کو ڕەشیدی ژ "ماندای" بۆ کڕیبوون. هەردیسان وی تەپا خوە یا باسکتبوولێ ب هەردوو دەستێن خوە گرتبوو. مەریەمێ ڕوویێ وی ماچیکر.

پاشی گوتێ: "تو یێ بوویە کورەکێ باش و ب هێز. دڤێت تو دگەل دایکا خوە یێ باش بی."

مەریەمێ ب هەردوو دەستێن خوە سەروچاڤێن وی گرتن. زەلەمای دڤیا پیچەکێ بچیتە پاشڤە لێ مەریەمێ ئەو ب هێز گرت و گوتێ: "زەلەمای جان. ل من ببورە. باوەر بکە ئەز گەلەك یا خەمگینم ژ بەر وان ئێش و خەمێن تە هەین."

دەمێ ئەو ل سەر جادەیێ دچووین، لەیلایێ دەستێ زەلەمای باش گرتبوو. بەری کو ل دوماهیا جادێ بەرزە ببن، لەیلایێ سەرێ خوە زڤڕاند و مەریەم دیت کو ل بەر دەرگەهی

یا ڕاوەستیای بوو دەرسوکەکا سپی ل سەری بوو بلوزەکێ شینێ ڤەبی کو قومچکێن وی دگرتیبوون ل بەر بوو. هەردیسان پەنتەرۆنەکێ کتانی یێ سپی ژی ل پیان بوو. هندەك داڤێن پرچا وێ یا ڕەنگ گەور ب ناڤچاڤێن وێ دا هاتبوونە خوارێ. تیشکا ڕۆژێ ژی ل سەر مل و ناڤچاڤێن وێ دبرسقی. مەریەمێ ب دلوڤانی ڤە دەستێ خوە لێ هەژاند؟

پاشی ئەو ل سەر جادەیێ بورین و ئێدی لەیلایێ بۆ هەتا هەتایێ مەریەم نەدیتەڤە.

# 47

## مەریەم

پشتی ڤان هەموو سالێن درێژ، دا بێژی ئەو جارەکا دی زڤڕی ڤە بۆ ناڤ کولبەی.

زیندانا "والایات" یا ژنان ل ئاڤاهیەکێ پیس و بێ سەروبەر و چوارگوشە بوو ل دەڤەرا "شارـی-ناو" ل نێزیکی تاخێ مریشکان. ئەڤ زیندانە ژی ل ناڤەڕاستا کومەکا زیندانێن دی یێن مەزنتر دا بوو کو د تایبەت بوون ژ بۆ زەلاّمان. ئەو دەرگەهێ وی یێ ب قوفلێ دائێخستی، مەریەم و ژنێن دی ژ زەلاّمان جودا دکر.

مەریەمێ شیا هەر پێنج ژوورێن وێ زیندانێ بهەژمێریت کو هەموو ژوورێن بێ سەروبەر و نەڕائێخستی بوون و دیوارێن وان ژی د پیس و دەرزی بوون و هندەك پەنجەرکێن بچووك پێڤە بوون کو بەرێ وان دکەفتە حەوشا مەزن یا زیندانێ. ئەڤ پەنجەرە ژی ب شیشکێن ئاسنی یێن ستوور هاتبوونە گرتن.

دەرگەهێن ڤان هەر پێنج ژووران د ڤەکری بوون و ژن دشیان بچنە دناڤ حەوشێ دا و بزڤڕنەڤە. پەنجەرکان ژی شووشە و پەردە پێڤە نەبوون، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو زێرەڤانێن تالّیبان یێن دناڤ حەوشێ دا دهاتن و چوون، ب سانەهی دشیان زێرەڤانیا ژووران بکەن و بزانن چ تێڤە ڕوددەت.

هندەك ژنان سکالا ل سەر وان زێرەڤانان دکرن کو ل پێشچاڤێن وان جگارەیان دکێشن و ب چاڤێن حیز و بێ شەرم تەماشەی وان دکەن و چاڤان لێ دنقینن و دناڤ خوە دا بەحسێ وان دکەن و بۆ خوە یاری و تڕانەیان پێ دکەن.

ژبەر هندێ، پتریا ژنان ب درێژاهیا ڕۆژێ بورکە ل سەر سەرێ خوە نەڕادکر، ب تنێ ل دەمێ ئێڤاری کو دەرگەهێ سەرەکی یێ هۆلا زیندانێ دهاتە دائێخستن و زێرەڤان دچوونە د بنگەهێن خوە ڤە، ژ نوو ڤان ژنان بورکە ل سەر سەرێ خوە دهاڤێت.

ئەو ژوورا مەریەم و پێنج ژن و چوار زارۆکێن دی تێڤە گەلەك یا تارِی بوو. ل وان شەڤێن کارەب هەی، وان پێکڤە "نەغەم" بلند دکر، کو کچەکا کورتەبالاٚ و پرچ رِەش و خەلەك بوو، داکو دەستێ وێ بگەهیتە بنبانی کو تێلەکا رِیس پێڤەبوو. نەغەمێ ب دەستی ئەو تێلە دگرت و ددانا سەر بنێ گلۆپێ هەتاکو هەلبیتێ.

جهێن وان یێن دەستئاڤێ د تەنگ و بێ سەروبەر بوون و کونکریتێ وان هەموو پرِی کەند و دەرز ببوو. د ناڤەرِاستا دەستئاڤێ دا، کونەکا لاکێشەیی تێدابوو و تژی پیساتی ببوو، ژبەر هندێ مێشومور و کێز لێ خرِڤە ببوون.

هەردیسان د ناڤەرِاستا وان زیندانان دا، حەوشەکا لاکێشەیی یا ڤەکری هەبوو کو د ناڤەرِاستا وێ ژی دا بیرەکا ئاڤێ هەبوو لێ چ جوك ل سەر وێ بیرێ نەبوون، ژبەر هندێ ژی بەردەوام ئەو حەوش یا پرِ بوو ژ ئاڤا گەنی و گلێشی و بێهنەکا گەلەك پیس ژێ دهات.

هەر دناڤ وێ حەوشێ دا، چەندین رِستەیێن جلکان هاتبوونە دانان و جلوبەرگ و دەرپێن زارۆکان پێڤە دهەلاویستی بوون. ل ڤی جهی، زیندانی دشیان هەڤدیتنێ دگەل مێهڤانێن خوە بکەن، هەردیسان وان ب خوە ل ناڤ وێ حەوشێ دا برنج دلێنا و خوارن بەرهەڤ دکر، چونکی زیندانێ ب خوە چ خوارن نەددا وان.

ئەو حەوشە جهەك بوو ژ بۆ زارۆکان ژی داکو یاریان لێ بکەن. مەریەمێ زانی کو پترِیا ڤان زارۆکان هەر دناڤ زیندانا والایات ب خوە دا ژ دایکبووینە و چ جاران جیهانا ل پشت ڤان دیواران نەدیتی یە.

مەریەمێ تەماشەی وان دکر دەمێ د راهێلا هەڤدوو. ئەو د پێخاس بوون و پێن وان دچوونە دناڤ هەرِیێ دا. ب درێژاهیا رِۆژێ وان دکرە غارێ و ب کرنا یاریان ڤە د مژوول بوون و قەت گوهـ نەددا بێهنا پیس یا حەوشێ یان ژی بێهنا پیس یا میزێ ئەوا ژ زیندانێ دهاتی. هەردیسان پووتە ب زێرەڤانێن تالێبان ژی نەدکر هەتا یەك نەهاتبایە و ئەو نەدانابانە بەر شەقان.

مەریەمێ چ مێهڤان نەبوون. ئەڤ چەندە تشتێ یەکانە بوو یێ وێ داخواز ژ بەرپرسێن تالێبان کری کو دەلیڤێ نەدەنە کەسێ سەرەدانا وێ بکەت.

***

ژبلی مەریەمێ، چ ژنێن دی دگەل وێ د زیندانێ ڤە سەرا تاوانێن مەزن و گران نەهاتبوونە زیندانکرن، بەلکو هەموو ژبەر هندەك تاوانێن بچووك و بەربەلاڤ وەك ڕەڤین ژ مال، هاتبوونە گرتن. ژبەر ڤێ چەندێ وان ب چاڤەکێ مەزن تەماشەی مەریەمێ دکر و وەکو ژنەکا زیرەك و چاڤنەترس سەرەدەری دگەل دکر. وان بەتەنیکێن خوە ددانە ڤێ و هەڤرکی سەرا هندێ دکر کا دێ مەریەم خوارنێ دگەل کیژ ژ وان بخوت.

ژنا ژ هەموویان پتر بوویە هەڤالا مەریەمێ، نەغمە بوو. هەموو گاڤان ب ڕەخ مەریەمێ ڤە درۆونشت و ئەو بۆ کیڤە چووبایە، نەغمە ژی دا د دووڤ ڕا چیت. نەغمە ژ وان کەسان بوو یێن گەلەك حەز ژ بەلاڤکرنا دەنگوباسێن نەخوش دکر ڤێجا چ دەنگوباسێن وێ بانە یان یێن کەسێن دی.

نەغمەیێ گوتە مەریەمێ کو بابێ وێ گوتبوویێ دێ وی دەتە جلکدرەکی کو نێزیکی سیهـ سالان ژ وێ مەزنتر بوو. وێ ژی گوتە جلکدری: "بێهنا گووی ژ تە دهێت. ژمارا ددانێن تەژی ژ ژمارا تبلێن دەستی کێمترە."

نەغمەیێ دڤیا خوە دگەل کورە جحێلەکی بدەتە ڕەڤان کو کەفتبوو داڤێن عەشقا وێ. ئەو گەنج کورێ مەلایەکێ وێ دەڤەرێ بوو و وان ل بەر بوو بەرەڤ دەڤەرا "گاردز"ێ ڤە بچن. لێ هێشتا ئەو دناڤ کابولێ دا بوون دەمێ هاتینە گرتن و زڤڕاندن.

دەمێ کورێ مەلای کەفتیە بەر قامچیان، یەکسەر توبە کر و گوتی کو نەغمەیێ ئەو یێ ب جوانیا خوە د سەردا بری و سێرەك یا لێکری هەتا ب دووڤ وێ کەفتی. پاشی سوز دا دەمێ خوە هەموویێ بۆ فێربوونا قورئانێ تەرخان بکەت. ژبەر هندێ وان ئەو ئازاد کر و نەغمە ژی ب پێنج سالان زیندان کر.

نەغمەیێ گوت کو ژیانا وێ د زیندانێ ڤە هند یا نەخوش نینە، چونکی بابێ وێ سوز یا دای ئەو ڕۆژا دهێتە ئازاد کرن، ب کێرکەکێ وێ سەرژێ بکەت.

ل وی دەمێ مەریەمێ گوهێ خوە ددایە ئاخفتنێن نەغمێ، ڕوناهیا کز یا ستێرێن سارِ ل ئەسمانی و عەورێن ڕەنگ پیڤازی یێن ل پشت چیایێ "سافید کوخ" یێن وێ سپێدەهیێ ئەو چەندە ئینا بیرا وێ دەمێ نانایێ گوتییێ: "کا چەوا میلێ قیبلەنمایێ هەموو گاڤان بەرەڤ ئاڕاستێ باکوری یە، ئاها هۆسا تبلا تاوانبارکرنا زەلامی ژی هەموو گاڤان بەرەڤ ژنێ یە. چ جاران ئەڤ چەندە ژ بیرا تە نەچیت مەریەم."

★★★

دادگەهکرنا مەریەمێ بەری هینگێ ب حەفتیەکێ هاتبوو کرن. نە چ ئەنجومەنێن یاسایی ل وێرێ بوون و نەژی چ دادگەهێن ئاشکەرا و نە پرسیارکرن ژ دیدەڤانان هاتە کرن. مەریەمێ دەست ژ مافێ خوە ژی بەردا ژ بۆ گازیکرنا دیدەڤانان، دادگەهکرنا وێ هەموو پازدە خولەکان نەڤەکێشا.

قازیێ ل نیڤەکێ، تالیبانەکێ هشك و سارِ خویا دکر. ئەو سەروکێ دادگەهکرنا وێ بوو. پیستێ وی یێ زەر دا بێژی لاستیکە و ڕهێن وی ژی د سۆر و خەلەك بوون و بەرچاڤکەکا زەر ژی ل بەر چاڤان بوو کو دبن ڤە چاڤێن وی مەزنتر دیاردکرن.

وی ب دەنگەکێ واستیای ڤە دووبارە پرسیار کر: "خوشکێ، تو دانپێدانێ ب تاوانا خوە دکەی."

"بەلێ من یا وەکری."

زەلامێ دانعەمر سەرێ خوە هەژاند، یان ڕەنگە هەر نەهەژاند ژی بیت. ب ڕاستی ژی گوتنا وێ چەندێ یا ب زەحمەتە ژی، لێ دەمێ وی دەست و سەرێ خوە دهەژاندی، لڤینێن مەلا فەیزوللاهی دهاتنە بیرا مەریەمێ. دەمێ وی دەستێ خوە نێزیکی پەیالا چایێ کری، نەشیا ب دەستێ خوە باش پەیالێ بگریت، ژبەر هندێ تەماشەی کابرایێ ل لایێ خوە یێ چەپێ کر و وی ژی ب ڕێز ڤە پەیالە نێزیکی دەڤێ وی کر دا فرەکێ لێ بدەت، زەلامێ دانعەمر ژی وەك سوپاسیکرن، چاڤێ خوە لێ نقاند.

مەریەمێ ساخلەتەکا ئارام و دلوڤان ل دەڤ وی ددیت. دەمێ وی دئاخفتی، دلوڤانی و د هەمان دەم دا خاپاندنەك د دەنگێ وی دا خویا دکر و گرنژینەکا ئارام ل سەر لێڤێن وی بوو. وی ب چاڤێ کەربوکینێ تەماشەی مەریەمێ نەدکر و ب ڕەزیلکرن یان تاوانبارکرن دگەل وێ نەدئاخفت، بەلکو ب تونەکا نەرم و لێبورین ڤە پرسیار ژێ دکرن.

"ئەرێ تو ب دروستاهی تێدگەهی کا تو چ دبێژی؟"

ئەو تالیبانێ سەروچاڤ مەزن و هەستیك دەرکەفتی یێ ل لایێ ڕاستێ یێ قازی ڤە ئەڤ پرسیارە ژ مەریەمێ کر، ئانکو نەك وی زەلامێ پەیالا چایێ بۆ قازی گرتی. ئەڤ تالیبانە ژ یێ دی بچووکتر بوو و گەلەك بلەز و ب پشتڕاستی دئاخفت. ئەو یێ تۆڕەبوو چونکی مەریەمێ ب زمانێ پەشتوونی نەدئاخفت.

مەریەمێ هۆسا زانی کو ئەو گەنجەکێ شەڕوکەیە و حەز ژ دەستهەلاتێ دکەت و هەموو تشتان ب گونەهـ دهەژمێریت و دادگەهکرنێ ب مافێ سروشتی یێ خوە دزانیت.

مەریەمێ گوت: بەلێ ئەز تێدگەهم."

تالێبانێ گەنج گوت: "ئەز یێ هزرێن خوە د هندێ دا دکەم کا چەوا خودای مەزن ئەم ژێکجوودا ئافراندینە، هوون ژن و ئەم زەلام. مەژیێ مە یێ ژێکجوودایە. هوون نەشێن وەکو مە باش هزربکەن. نوشدارێن ڕۆژئاڤایی و زانستێ وان ژی ئەڤ چەندە یا سەلماندی. ژبەر هندێ ژی، بەرامبەر یەك دیدەڤانێ زەلام، ئەم پێدڤی ب دوو دیدەڤانێن ژنین."

مەریەمێ گوت: "ئەز دانپێدانێ دکەم کو من ئەو تاوان ئەنجامدایە، برا. بەلێ هەکە من ئەو چەندە نەکربایە، ئەو دا وێ کوژیت، دا وێ خەندقینیت."

"تو ب خوە وەدبێژی. لێ ئەڤ چەندە سروشتێ ژنایە، بۆ هەموو تشتان سووندێ دخون."

"ئەڤ چەندە ڕاستی یە."

"تە دیدەڤانەك هەیە؟ هەلبەت ژبلی هەویا تە؟"

مەریەمێ گوت: "نەخێر. من نینە."

وی دەستێن خوە بلند کرن و پێ کرە کەنی. پاشی گوت: "باشە. ئانکو..."

پاشی ئەو تالێبانێ ل نیڤەکێ کو ڤازی بوو و هۆسا دیاربوو یێ نەساخ بوو، دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت: "ل پێشاوەرێ ئەز نوشدارەکێ باش دنیاسم کو گەنجەکێ پاکستانی یە. بەری هەیڤەکێ من دیتبوو. هەردیسان حەفتیا بوری ژی من دیتبوو. من گوتێ هەڤال چ هەیە؟ ب ڕاستی بۆ من بێژە کا ڕەوشا من یا ساخلەمیێ یا چەوایە؟. ئەوی گوت سێ هەیڤێن دی جەنابێ مەلای، ڕەنگە شەش هەیڤێن دی. هەموو تشت ب حەزکرنا خودای نە."

پاشی سەرێ خوە بەرەڤ کابرایێ دەستێ خوە یێ چەپێ هەژاند و وی ژی فرەکا دی یا چایێ دایێ و ل دووڤ دا ب پشتا دەستێ خوە یێ لەرزی، دەڤێ خوە پاقژ کر.

"ئەز ژ هندێ ناترسم ڤێ ژیانێ بجهـ بهێلم. کورێ من یێ یەکانە بەری پێنج سالان ژ ڤێ جیهانێ بارکریە. ئەڤ ژیانە یا پرە ژ خەم و نەخوشیان تا وی ڕادەی ئەم نەشێین خوە

ل بەر بگرین. نەخێر. هەر دەمێ وەختێ من هات، دێ ب خوشحالی ڤە ژ ڤێ جیهانێ بارکەم.

خوشکێ، تشتێ من دترسینیت، ئەو ڕۆژە یا ئەز دچمە دیدارا خودایی، ئەو دێ پرسیارێ ژ من کەت. مەلا تە بوچی فەرمانێن من بجه نەئینان؟ بوچی تە گوهداریا فەرمانێن من نەکر؟ ل وی دەمی ئەز دێ چەوا بەرڤانییێ ژ خوە کەم؟ تشتێ یەکانە یێ ئەز دشێم بکەم ئەوە کو ئەم وان یاسایان پەیرەو بکەین یێن وی د ژیانێ دا بۆ مە دانایین. خوشکێ، کا چەند ئەز دوماهیا خوە ڕوهنتر دبیتم و ڕۆژا لێپرسینا من نێزیکتر دبیت، پتر ئەز یێ ڕژدم ل سەر هندێ کو فەرمانێن خودای بجه بینم خو هەکە ئەنجامێن وێ چەند د دلئێش و گران بن."

ڤازی ل سەر دوشەکێ خوە لڤاند و چاڤێن خوە نقاندن

"ئەز باوەر ژ تە دکەم کو زەلامێ تە یێ دەستنەخوش بوو."

پیچەکێ ڕاوەستیا، پاشی ب هەردوو چاڤێن خوە یێن کز و ب ئاورینەکا ڕژد و پڕی دلوڤانی ڤە تەماشەی مەریەمێ کر و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

"بەلێ خوشکێ ئەز نەشێم چاڤێ خوە ل وی کارێ توندوتیژی یێ تە ئەنجام دای بنقینم و خوە بێدەنگ بکەم. ئەز یێ دلگرانم ژبەر وی کارێ تە کری. یا ژ وێ دلگرانتر دەمێ تە ئەو کارە کری، کورێ وی ل ڤاتێ سەری بوو و دکرە گری و گازی بابێ خوە دکر.

ئەز گەلەك یێ واستیای مە و ل بەر مرنێ مە، من دڤێت ل تە ببورم، لێ پا دەمێ دچمە دەڤ خودایی، ئەو دێ بێژیتە من تە ماف نەبوو ل وێ ببوری، مەلا. ل وی دەمی ئەز دێ چ بێژمە وی؟"

هەڤالێن وی ژی پێکڤە سەرێ خوە هەژاند و ب دەستخوشی ڤە تەماشەی وی کر.

"هەستەك یێ د ناخێ من دا خوە دهەژینیت و دبێژیت کو تو نە ژنەکا خڕابی، خوشکێ. لێ تە کارەکێ خڕاب یێ ئەنجام دای و پێدڤیە ل سەر تە تو بهایێ وی کاری بدەی. یاسایێن خودای د ڤێ تاوانێ دا ددیارن. یاسا دبێژیت پێدڤیە ئەز تە فرێکەمە وی جهی یێ کو ئەز ژی ل دەمەکێ نێزیك دێ هێمە وێرێ.

" تو تێدگەهی کا ئەزچ دبێژم، خوشکێ."

مەریەمێ تەماشەی دەستێن خوە کر، پاشی بۆ دیارکر کو د ئاخفتنا وی دگەهیت.

"باشه، خودای مەزن دلوڤانییێ ب تە ببەت."

بەری ئەو وێ فڕیکەنە ژ دەرڤە، سوزنامەك داڤ مەریەمێ و گوتێ ل بنێ ئیفادەیێن خوە و حکمێ قازی ئیمزا بکە. ل دەمێ سێ تالێبان ل سەر سەرێ وێ و تەماشەی وێ دکر. مەریەمێ پیتێن ناڤێ خوە نڤیسین: م، ە، ر، ی، ە، م.

هەردیسان هینگێ هاتە بیرا وێ دەمێ دوماهیك جار ناڤێ خوە نڤیسی و ئیمزا کری. ئەو ژی بەری بیست و حەفت سالان بوو دەمێ ل سەر مێزا مالا جەلیلی ڤە و ل پێشچاڤێن مەلایەکێ دی.

★★★

مەریەمێ دەھ ڕۆژ د زیندانێ ڤە بوراندن. ئەو بەردەوام ل بەر پەنجەرێ دڕوونشت و تەماشەی ژیانا دناڤ حەوشا زیندانێ دا دکر. دەمێ بایێ هاڤینێ ڕادبووی، تەماشەی وان پرتێن کاغەزان دکر یێن وەکو باهۆزان ل ڤی لایی و لایێ دی بەلاڤ دبوون و ب سەر دیوارێن زیندانێ دا دزڤڕین. هەردیسان تەماشەی وێ ئاخێ دکر یا بایی دگەل خوە بلند دکری و وەکو زڤڕۆکەکێ دناڤ حەوشێ دا دروست دکر.

هەموو زێرەڤان و زیندانی و زارۆك و هەتا مەریەمێ ژی، سەروچاڤێن خوە نخافتن، لێ دگەل هندێ ژی هەر ئاخێ بەلا خوە ژێڤە نەدکر و دچوو کونێن گوھ و دفن و سەروچاڤ و ناڤبەرا ددانێن وان دا. ب تنێ ل دەمێ ئێڤاران ئەڤ هڕۆبایە دڕاوەستیا.

پشتی هینگێ ئەگەر هوینکەبایەك ب شەڤێ ژی هاتبایە، دا هۆسا ب شەرمینی هێت هەروەکو دڤیا ئەو زێدەڕوویا بایێ سپێدێ کری، بۆ وان قەرەبوو بکەت. ل دوماهیك ڕۆژا مەریەمێ ل زیندانا والایات، نەغمەیێ لالنگەك کرە د دەستان دا و پاشی تبلێن وێ ل سەر لالنگێ شداندن و گەوریا وێ تژی گری بوو.

وێ گوت: "هەتا نوکە تو باشترین هەڤالێ من بووی."

مەریەمێ ل پشت شیشکێن پەنجەرێ تەمامەتیا دوماهیك ڕۆژا خوە ب تەماشەکرنا زیندانیان ڤە بوراند. یەکێ ژ وان خوارن بەرهەڤ دکر. بێهنا کەمونێ دگەل بایێ گەرم د پەنجەرێ ڕا دهاتە ژوور. مەریەمێ زارۆك ددیتن یێ یاریا چاڤنقاندنێ دکەن. دوو کچێن بچووك ژی هوزانەکا زارۆکان دگوت کو بیرا زارۆکینیا مەریەمێ هاتە بیرا وێ دەمێ جەلیل

ب ڕەخ وێ ڤە ل سەر کەڤرەکێ مەزن دڕووشنتە خوارێ و ئەڤ هوزانە بۆ دگوتی و پێکڤە ماسی نێچیر دکرن.

لی لی لی لی حەوزا بالندا

ل سەر حەوزەکا پیس ڕوونشت

میناو یا ل سەر لێڤا وێ ڕوونشتی و ئاڤێ ڤەدخوت

تەحسی و د ئاڤێ دا نقووم بوو

مەریەمێ چەندین خەونێن تێکەل و سەیر دیتن. وێ خەون ب کومەکا بەران ڤە دیت، یازدە بەر بوون کو ب شێوەیەکێ ستونی ل سەر یەك ددانای بوون. جەلیل سەر و ژ نوو جحێل ببوو ڤە و گڕنژنێن وی گەلەك د جوان بوون، غەمازەیا سەر ئەرزنکا وی و خوها ب ناڤچاڤێن وی ڤە. چاکیتێ خوە دانابوو سەر ملێ خوە. ل دوماهییێ هات داکو کچا خوە ب ترۆمبێلا خوە یا ژ جورێ بویك ڕودماستەر یا ڕەنگ ڕەش و بریسقەدار ببەتە گەریانەکێ.

مەلا فەیزوللاهی ژی یاری ب تەسبیحێن خوە دکرن و ب درێژاهیا ڕووبارێ ئاڤێ پیاسە دگەل دکرن، سیبەرا هەردووان ل سەر ئاڤێ دخشیا و دکەفتە سەر گژوگیاییێ ب ڕەخ ڕووبارێ ئاڤێ ڤە کو ژ گولێن ئاڤەندەر یێن شین و گول سەوسەنێن کیڤی لێ شین ببوون. بێهنا وێ د ڤێ خەونێ دا وەکو بێهنا قرەنفلێ بوون.

هەردیسان وێ خەون ب نانایێ ڤە دیتن کو ل بەر دەرگەهێ کولبەی یا ڕاوەستای بوو ب دەنگێ خوە یێ نزم و ژ دوور ڤە گازی وێ کر داکو بچیت فراڤینێ بخوت. مەریەمێ ژی دناڤ گیایی دا یاری دکرن و مێری ل سەر کڕاسێ وێ دهاتن و چوون. کێز بلەز دهاتن و چوون و کولیان ژی بلەز وە دناڤ کەسکاتی دا بلند دکرن. خر خرا عەرەبانەیەکا دەستی هاتە گوهێن وێ کو ب زەحمەت ب سەر وی ژێهەلی دا ب سەر دئێخست. دەنگێ زەنگلێن ل ستوییێ چێلان و بزن و پەزێ ل وان جهان ژی دچەری دهاتە گوهێن وێ.

★★★

د ڕێکا خوە دا بەرەڤ یاریگەها "قازی" دا، دەمێ ئەو لوریا مەریەم تێدا ل سەر تەسەکێ یان بەران دا چووبایە، مەریەم دا ب ڤی لایی و لاییێ دی کەڤیت. ئەڤ چەندە بوو

ئەگەر کەلێژیا وێ بئێشیت. تالێبانەکێ گەنج ژی ب ڕەخ وێ ڤە یێ ڕوونشتی بوو و زێرەڤانی لێ دکر.

مەریەمێ د دلێ خوە دا دگوت: تو بێژی ئەڤ گەنجە یێ کو ئاورینێن وی پڕی دلوڤانی و گەش و تبلا وی یا ڕەش ل سەر دەستکێ تڤەنگێ، ئەو ب خوە حوکمی سێدارەدانێ ل سەر وێ بجھ بینیت.

وی گەنجی گوت: "تو یا برسی نینی. دایکێ؟"

مەریەمێ سەرێ خوە ب بەرسڤا نەخێر بۆ هەژاند.

"پسکێتەك یاڤ من، خراب نینە. ئەگەر تو یا برسی بخو."

"نەخێر، سوپاس، برا."

وی گەنجی سەرێ خوە هەژاند و ب چاڤێ دلوڤانییێ تەماشەی وێ کر.

"تو دترسی، دایکێ؟"

گەوریا وێ پڕ بوو ژ ترسێ و ب دەنگەکێ لەرزوك ڤە ڕاستی بۆ گوت: "بەلێ، ئەز گەلەك یا دترسم."

وی گەنجی گوت: "من وێنەیەکێ بابێ خوە هەیە. ئەو ناهێتە بیرا من، لێ یا ئەز دزانم ماوەیەکی ئەو هوستایێ پایسکلان بوو. ئێدی من نەزانی کا ئەو چەوا ب ڕێڤە دچیت، یان چەوا دکرە کەنی و دەنگێ وی یێ چەوابوو."

بەرێ خوە دا جهەکێ دی و پاشی دووبارە بەرێ خوە دا مەریەمێ: "دایکا من دگوت ئەو چاڤنەترسترین زەلام بوو وێ د ژیانا خوە دا نیاسی. وێ دگوت ئەو وەکو شێران بوو. لێ ئەو ڕۆژا شیوعیان ئەو دەستگیرکری، وەکو زارۆکان دکرە گری. ئەز ژ بەر هندێ بۆ تە یا بەحسێ ڤێ چەندێ دکەم داکو بزانی کو تشتەکێ ئاسایی یە تو بترسی. پێدڤی ب شەرمێ ناکەت."

وێ ڕۆژێ بۆ یەکەم جار ژ زیندانکرنا وێ، مەریەمێ پیچەك کرە گری.

***

ب هزاران خەلکی تەماشەی وێ دکر. ل سەر سەکوییێن یاریگەهێ هەر کەسەکی ژلایێ خوە ڤە بزاڤ دکر سەرێ خوە بلند بکەت داکو وێ باشتر ببینیت. دەنگێ پست پستا وان

بلندتر لێ هات دەمێ مەریەم ژ لوریێ هاتیە خوارێ. دناڤ یاریگەهێ دا بۆ قەرەبالغ و ب بلندگوییێ تاوانا وێ بۆ خەلکی هاتیە خاندن.

مەریەمێ دئینا پێشچاڤێن خوە کا چەوا خەلك هەموو یێ بزاڤان دکەن سەرێن خوە بلند بکەن و تەماشەی وێ بکەن، لێ وێ قەت سەرێ خوە بلند نەکر هەتاکو بزانیت کا خەلکی ب دلوڤانی یان ب تۆڕەیی ڤە تەماشەی وێ دکەن. مەریەمێ بەرێ خوە ژ هەموویان دا پاش.

ل وێ سپێدێ زوو، مەریەم ژ هندێ دترسیا نەکو ل دەمێ بجهئینانا حکمێ سێدارەدانێ ئەو کارەکێ نەبەرئاقل بکەت و بکەتە گری یان داخواز ژ خەلکی بکەت ل وێ ببورن. دترسیا بکەتە ڤێژی یان دلێ وێ ڕابیت یان خوە تەڕ بکەت. دترسیا ل دوماهیك چرکێن وێ، غەریزەیا وێ یا گیانەوەران ل وێ خائین بیت و تووشی شەرمزارییێ بکەت.

لێ دەمێ ئەو ژ لوریێ هاتیە خوارێ، نە پێن وێ دلەرزین و نە دەستێن وێ ژی دڕەجفین. ژبەر هندێ پێدڤی ب هندێ نەبوو دەستێ وێ بگرن. دەمێ هەستپێکری کو ترس یا نێزیکی وێ دبیت، هزرا خوە د زەلەمای دا دکر، ئەو زەلەماییێ وێ هەموو ئەڤینا ژیانا وی ژێ ستاندی، ئەوێ کو دێ ڕۆژێن وی هەموو ب خەم و کوڤان بن ژبەر مرنا بابێ وی. ل وی دەمی، لەیلاییێ پێن خوە ڕەفکرن و ل سەر خوە زالێ بوو و شیا ب ڕێڤە بچیت بێی کو کەس خورتییێ لێ بکەت.

زەلامەکێ چەکدار ل نێزیکی وێ بوو و داخواز ژێ کر بەرەڤ گولپارێزا باشورێ یانێ ڤە بچیت. مەریەمێ هەستپێکر خەلك هەموو یێ ل چاڤەڕێی وێ و یێن گەرم بووین. ژبەر هندێ وێ سەرێ خوە بلند نەکر، هەردیسان سەرێ خوە نەچەماند بوو ژی، بەلکو تەماشەی سیبەرا خوە دکر دەمێ ب ڕێڤە دچووی، زێدەباری سیبەرا وی چەکدارێ ل پشت دهاتی.

هندەك دەمێن خوش د ژیانا مەریەمێ دا هەبوون. لێ ب شێوەیەکێ گشتی وێ دزانی کو پتریا سالێن ژییێ وێ، ژیان ل هەمبەری وێ یا دلڕەق بوو. هەرچەندە نێزیکی بیست پێنگاڤان ژ دوماهیا خوە یا دوور بوو، لێ هێشتا هەر دڤیا بژیت. هیڤی دخواست دووبارە لەیلاییێ ببینتەڤە، دووبارە گوهـ ل دەنگێ کەنیا وێ بیت و پێکڤە قوریکەکێ چاییێ و هندەك حەلاوێ ببەنەناڤ باخچەی دا و ل بن ڕۆناهیا ستێران بڕوونە خوارێ.

**خەما هندێ ما د دلێ وێ دا کو مەزنبوونا عەزیزایێ ب چاڤێن خوە نابینیت. وێ نابینیت دەمێ دبیتە ژنەکا گەنج و جوان و نەشێت ل شەڤا دەهواتا وێ خەنایێ د دەستێن وێ بدەت. چ جاران نەشێت دگەل زاڕۆکێن عەزیزایێ یاریان بکەت. ئەو چەند حەسرەتا هندێ بوو کو شیابا هەتا وی دەمی ژیابا و د ژیێ پیراتیێ دا دگەل زاڕۆکێن عەزیزایێ یاری کربانە.**

**ل دەڤ ستوونا گولپارێزێ، ئەو چەکدارێ دگەل هاتی، گوتێ ل جهێ خوە بڕاوەستە. مەریەم ڕاوەستیا. د بن کونێن پێچەیا بورکەی ڤە، وێ سیبەرا وی چەکداری ددیت، پاشی سیبەرا کلاشینکوفا وی ژی بلند بوو.**

**مەریەمێ د دوماهیك چرکەیێن ژیانا خوە دا گەلەك هیڤی و ئارەزوو هەبوون. دەمێ وێ چاڤێن خوە نقاندین، هەست ب پەشیمانیێ نەکر بەلکو ئارامیەکێ ب سەر گیانێ وێ هەموویێ دا گرت. وێ هزر ل هاتنا خوە بۆ ناڤ ڤێ دنیایێ کر. زاڕۆکەکا بیژی یا گوندیك و بێ عەسل، بونەوەرەکا بێ بها و نەخوشتڤی.**

**ڕوودانەك بوو کو جهێ دلپێڤەمان و د هەمان دا جهێ پەشیمانیێ بوو. وەکو گیایەکێ زیانبەخش. سەرەڕای ڤێ چەندێ ژی، ئەو وەکو ژنەکێ دێ ڤێ جیهانێ بجهـ هێلیت کو هەر چ نەبیت هندەك خەلکی تێدا یا حەز ژێکری و وێ ژی یا حەز ژ هندەکان کری. دێ ڤێ جیهانێ وەکو هەڤالەکی، هەڤدەمەکی، زێرەڤانەکی، وەکو دایکەکێ بجهـ هێلیت.**

**وەکو کەسەکێ کو دوماهیك جار تشتەك ل پاش خوە هێلابیت. مەریەمێ د دلێ خوە دا گوت: ئەڤ مرنە هند یا خراب نینە. هۆسا یا خراب نینە وەکو ئەز هزر دکەم. ئەڤە دوماهیا شەرعی یا دەستپێکەکا نەشەرعی بوو. دوماهیك هزرێن مەریەمێ، چەند ئایەتێن قورئانا پیرۆز بوون کو د دلێ خوە دا دگوتن:** (خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى أَلا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ)*

**تالێبانی گوت: "بکەڤە سەر چوکان."**

**"خودای مەزن ل من ببورە و دلوڤانیێ ب من ببە. چونکی تو دلوڤانێ هەموو دلوڤانای."**

---

* سورەتا (الزمر)، ئایەتا 5ێ.

"ئاها ل ڤێرێ بکەڤە سەر چوکان. خوشکێ، تەماشەی خوارێ بکە."

مەریەمێ بۆ دوماهیك جار ئەو تشتێ ژێ هاتیە داخواز کرن، ئەنجامدا.

# 48

## نوکه سەرێ تارقی دئێشا

هندەکان شەڤان لەیلا دا ژ خەو هشیار بیت و بینیت تارق یێ ل سەر لێڤا تەختی رووىشتیە و فانیلێ خوە یێ د سەرێ خوە ئالاندی، وی دگوت ئەڤە خو ژ رۆژا ئەو ل کەمپا ناسیر بەگ وەرە سەرێ وی دئێشیت و پشتی دەمێ هاتیە زیندانکرن ئەڤ سەرئێشانە پتر لێ هاتیە.

هندەك جاران ئێشانا سەرێ وی دگەهشیە وی رادەی دلێ وی رابیت و چاڤەکێ وی تارى دبیت. وی گوتی دەمێ تووشی ڤێ چەندێ دبیت و ئێشانا سەرێ وی دئارییێت، هەروەکو هندێ یە کێرکەکا گوشتفرۆشان بکەنە د جێنیکەکا وی را و پاشی دناڤ مەژیێ وی دا بادەن هەتا د رەخێ دی را دەردکەڤیت.

"دەمێ ئەز هەست ب وێ ئێشانێ دکەم، خوە تاما ئاسنی ژی دهێتە سەر ئەزمانێ من."

هندەك جاران لەیلایێ پارچەکا قوماشی تەڕ دکر و ددانا سەر ئەنیا وی، هەرچەندە ڤێ چەندێ کاریگەریەك هەبوو، لێ یا بەروەخت بوو. ئەو حەبکێن سپی یێن گرۆڤر یێن نوشدارێ سەعیدی ژی داینێ تا رادەیەکی سەرێ وی تەنا دکر.

ل هندەك شەڤان ژی ئێشا وی هۆسا گران دبوو ب هەردوو دەستان سەرێ خوە دگرت و ئاخ و ئوف دکرن. چاڤێن وی دا تژی خوین بن و ئاڤ ژ دفنا وی دهاتە خوارێ. دەمێ ڤێ ئێشانێ ئەو بێ تاقەت دکری، لەیلا دا ل پشت وی رووىتە خوارێ و پشتا وی ڤەمالێت. هەردیسان دا تبلێن وی کەتە دناڤ دەستێ خوە دا کو دەستێن وی ژی هند د تەزی بوون لەیلایێ هەست ب تەزیاتیا حەلاڤا هەڤژینیا ل تبلا وی دکر.

ل وێ ڕۆژا ئەو گەهشتینە دەڤەرا موری، تارقی ئەو مارکر. هەلبەت دەمێ تارقی بڕیاردای ئەو هەردوو دەهواتا خوە بکەن، کەیفا سەعیدی ژی گەلەك ب ڤێ چەندێ هات، چونکی هندی دهاتێ نەدشیا بێژیتە وی کا هەبوونا ژن و مێرەکان کو هەڤژینێن هەڤدوو نەبن د ژوورەکا هوتێلێ ڤە چەند بابەتەکێ هەستیارە و ب ئاریشەیە.

سەعید ب وی ڕەنگی نینە یێ بەری هینگێ لەیلایێ د هزرا خوە دا وێنەکری. سەروچاڤێن وی د سۆر و چاڤێن وی یێن وەڕمتی و وەکو باقلکان بوون. سمبێلێن وی ژی د بوش بوون و دوماهییێن وان د خەلەك بوون و پرچا وی یا ڕەنگ گەور ژی بۆ پشتێ دبر. زەلامەکێ دلساخ و نەرمە و ئاخفتن و ڕەفتارێن وی ژی ب سەنگ و جهێ ڕێزگرتنێ بوون.

ل وێ ڕۆژا مارەکرنا وان، سەعیدی هەڤالەکێ خوە و مەلایەك داخوازکرنە هوتێلێ ژ بۆ مارکرن و دیدەڤانیێ. سەعیدی تارق برە د کوژیەکی ڕا و هندەك پارە دانەڤێ، هەرچەندە تارقی ل دەستپێکێ نەوەرگرتن، لێ سەعیدی خورتی لێ کر.

ل دووڤ دا تارق چوو بازاڕی و دەمێ زڤڕی دوو حەلاقەیێن هەڤژینیێ یێن سادە و تەنك دگەل خوە ئینان. ل وێ شەڤێ، پشتی زارۆك د خەو چووین، مەلای ئەو ل هەڤدوو مارکرن.

د خۆدیکێ دا، ل بن وێ پێچەیا ڕەنگ کەسك یا مەلای دانایە سەر سەرێ وان، چاڤێن وێ ب چاڤێن تارقی کەفتن. نە ڕۆندك ژ چاڤان دهاتنە خوارێ و نەژی گڕنژینا ڕۆژا دەهواتێ و نە ژی سوزێن تامدای ب ئەڤینەکا هەروهەر.

لەیلایێ ب بێدەنگی تەماشەی وێنەیێ خوە د خۆدیکێ دا دکر، ب دوو چاڤێن خوە یێن کو بەری دەمێ خوە قورمچین. ب وان هێلێن قورمچینێ یێن ل دورماندوری چاڤێن وێ پەیدابووین کو ڕۆژەکێ بەری نوکە گەلەك د پاقژ و بریسقەدار بوون. تارقی دڤیا تشتەکی بێژیتە وێ، لێ ل وی دەمی دیدەڤانەکی ئەو پێچە ل سەر سەرێ وان ڕاکر و لەیلایێ نەزانی کا تارقی دڤیا چ بێژیت.

هەر ل وێ شەڤێ، وەکو دوو هەڤژینان ل سەر تەختەکی ب ڕەخ هەڤدوو ڤە نڤستن. زارۆك ژی ل خوارێ ل سەر هندەك تەختێن بچووك نڤستبوون.

بیرا لەیلایێ ل ڕۆژێن وان یێن گەنجینیێ هات دەمێ وێ و تارقی ڤالاهیا دناڤبەرا خوە دا ب پەیڤان پڕ دکری. دەمێ هێشتا ئەو زارۆك، وان بەردەوام ئاخفتنا هەڤدوو دبڕی.

هینگێ گەلەك تشت ڕوودابوون، پێدڤی بوو وان بەحسێ گەلەك تشتان کربایە. لێ مەزناهیی و پیرۆزیا شەڤا وان یا یەکێ هەموو تشتێن کەڤن ژ بیرا وان برن و هەموو تشت بێ ڕامان دهاتنە پێشچاڤێن وان.

ئەو چەندە بۆ وێ بەس بوو کو نوکە ئەو یا د گوپیتکا بەختەوەریا خوە دا، ژبەرکو تارق یێ ب ڕەخ وێ ڤە. وێ هەست ب گەرماتیا لەشێ وی دکر و سەرێن هەردووان ل سەر یەك بالیفك بوون. دەستێ ڕاستێ یێ تارقی دناڤ دەستێ وێ یێ چەپێ دا بوو.

ل نیڤا شەڤێ دەمێ لەیلا ژ تێهنا دا ژ خەو هشیار بووی، وێ دیت هێشتا دەستێن وان یێن دناڤ یەك دا و ب هێز یێن گرتین، هەروەکو کا چەوا زارۆك دەرزیێ فرۆکەیێن خوە یێن کاغەزی ب هێز دگرن دەمێ دفڕینە بەر ئەسمانی.

★★★

لەیلایێ گەلەك حەز ژ سەقایێ سارِ و مژەوی یێ سپێدەهیێن موری و و تەیسینا ئەسمانێ شەڤێن وێ یێن تارِی دکر، زێدەباری دارێن کاژان یێن کەسك، سڤورەیێن ڕەنگ قەهوای یێن خوە ژ سەر چەقەکی دهاڤێتیە سەر چەقەکێ دی، تەڤیێن بارانێن بهارێ یێن ژ نیشکەکێ ڤە دبارین کو دبوونە ئەگەر کریار ل دکانان هەڤدوو پاڵدەن و بچنە بن سیڤاندەکی.

وێ گەلەك حەز ژ وان دکانان دکر یێن دیاری دفروتن، وان هوتێلێن جوراوجور یێن پێشوازیا گەشتیاران دکری. هەرچەندە خەلکێ وێ دەڤەرێ گازندە ژ وان ئاڤاهیان دکرن و دگوت کو یێن بووینە ئەگەرێ تێکدانا جوانیا سروشتی، لێ لەیلا حێبەتی دما کا بوچی دلێ خەلکی ب ڤان ئاڤاهیان یێ نەخوشە. چونکی ئەگەر ئاڤاهیەکا هۆسا ل ئەڤغانستانێ هەبایە، خەلك دا ژبەر ئاهەنگان گێرن.

ئەو یا خوشحال بوو کو وان سەرشوویەك هەیە و نە ژ دەرڤەی مالا وانە، بەلکو سەرشوویەکا ڕاستەقینەیە دناڤ مال دا و تەوالێتەکا ب کورسیك و دوش و جهەکێ دەستشووشتنێ ژی تێڤە هەنە. دوو حەنەفی تێدا هەنە و ب تنێ دەستلێدانەکێ تو دشێی ڤەکەی داکو ئاڤا گەرم یان تەزی ژێ بهێتە خوارێ.

لەیلایێ حەزدکر ل سپێدەهیان ل دووڤ دەنگێ ئەلیونایێ هشیار ببیت دەمێ مەهـ مەهـ دکری، زێدەباری دەنگێ زادلێنەرا خوارنگەهێ، ئەدیبایێ، ئەوا ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك خوارنێن خوش و هەمەجور بەرهەڤ دکرین.

هندەك جاران، دەمێ لەیلایێ تەماشەی تارقی دکری ئەوێ دناڤ خەوێ نقووم بووی، زارۆکێن وێ ژ بەر خەو دئاخفتی و خوه بۆ سەر ڤی لایی و لایێ دی د وەرگێڕای، ژ کەیفان دا گەوریا وێ تژی گری و چاڤێن وێ پڕی ڕۆندك دبوون.

ل سپێدەهیان، لەیلا ب دووڤ تارقی ڤە بوو ئەوێ ژ ڤێ ژوورێ دچوویە ژوورا دی و دەنگێ زڕزرا کلیلێن ب کەمەرا وی ڤەبوون، ب سەر وان جهان بلند دبوو. هەردیسان سپرەیەکا پاقژکرنا جامێن پەنجەران ژی د بەر قائیشا پەنتەرۆنێ وی یێ کابووی ڕا ڤەبوو.

لەیلایێ سەتلەکا تژی ژ پارچەیێن قوماشی و کەرەستەیێن پاقژکرنێ و فرچەکێ تەوالێتان و سپرەکا تەیساندنا قومسۆر و کەلوپەلێن داری ب دەستێ خوە هەلدگرت. عەزیزایێ ژی فرچەکێ هشکرنا ئەردی ب دەستەکی هەلدگرت و ب دەستێ دی ژی ئەو بووکا مەریەمێ بۆ دروستکری، دهەلگرت. زەلەمای ژی ب چەند پێنگاڤەکێن ژ وان دوورتر دا ل دووڤ وان هێت.

لەیلایێ گێسکێ کارەبایی ژ بۆ پاقژکرنا ژوورێن هوتێلێ بکاردئینا و پاشی چارچەڤێن ل سەر تەختان دپێچان و ب سەروبەر دکرن و یێن بکارهاتی ژی دشووشتن. تارقی ژی بانیو و تەوالێت پاقژ دکرن و ئەردێ وان دماڵشت و خاولی یێن پاقژ دکرنە د قومسۆران دا و شامپو و سابینێن نوو و بێهنخوش ژی ددانانە سەر لێڤێن دەستشوویان. عەزیزایێ سپر ب پەنجەرەکان دا دکر و ب پاتەکی پاقژ دکرن و دگەل هندێ بەردەوام بووکا وێ ژی د دەستان دا بوو.

لەیلایێ پشتی چەند ڕۆژەکان ل سەر مارکرنا وێ، دگەل عەزیزایێ ئاخفتبوو و گوتبوویێ کا تارق چییێ وێ یە. ب ڕاستی ژی تشتەکێ سەیر بوو، د هەمان دەم دا نەیێ ئارام بوو. هێشتا تارقی تشتەك نەگوتبایە عەزیزایێ بۆ تەمام دکر یان ژی بەری تارق تشتەکی ژێ داخواز بکەت دا عەزیزا دەتەڤێ. ئەو گرنژینا ل سەر شیڤێ دناڤبەرا وان دا دهاتیە لێکگوهۆڕین، ئەو چەندە خویا دکر خو دا بێژی ئەو د بیانی نەبوون، بەلکو بەری

هینگێ هەڤدوو دنیاسی و پشتی چەندین سالێن ڤەقەتیان و دوورکەفتنێ، جارەکا دی ب دیتنا هەڤدوو شاد بوونەڤە.

دەمێ لەیلایێ بەحسێ تارقی بۆ وێ دکری، لەیلایێ ب هزرکرن ڤە تەماشەی دەستێن خوە دکر.

پشتی ماوەیەکێ کورت ژ بێدەنگییێ، گوت: "ئەز گەلەك حەز ژ وی دکەم."

"ئەو ژی گەلەك حەز ژ تە دکەت."

"وی ب دەڤێ خوە ئەڤ چەندە گوتیە؟"

"پێدڤی ب گوتنێ ناکەت، ئەز دزانم."

"ێ باشە، چ دی؟ دادێ. بێژە من چ دی هەیە دا بزانم."

لەیلایێ هەموو تشت بۆ بەحسکرن.

"بابێ تە مرۆڤەکێ باشە. باشترین مرۆڤە هەتا نوکە من نیاسی."

عەزیزایێ گوت: "پا هەکە ئەو بچیت و مە بهێلیتە ب تنێ؟"

"ئەو چ جاران مە ناهێلیتە ب تنێ. سەحکە من عەزیزا، بابێ تە چ جاران زیانێ ناگەهینتە تە و چ جاران مە ناهێلیتە ب تنێ."

ئەو ئارامیا ل سەر دێمێ عەزیزایێ پەیدابووی، دلێ لەیلایێ خوش کر.

★★★

تارقی هەسپەکێ داری یێ لڤوك بۆ زەلەمای کریبوو و عەرەبانکەك بۆ دروست کربوو. بەری هینگێ ژ هەڤالەکێ دگەل خوە د زیندانێ ڤە فێری هندێ ببوو چەوا دێ وێنەیێن گیانەوەران ژ کاغەزان دروست کەت. وی کاغەز دبڕین و شێر و پلنگ و کەنگەر و هەسپ و باڵندەیێن ب پەڕێن ڕەنگاوڕەنگ بۆ زەلەمای ژێ دروست دکرن، بەلێ زەلەمای ئەڤ کارێن وی پشتگوهـ دهاڤێن و هندەك جاران ب کەرب ڤە ڕەتدکرن.

زەلەمای دکرە قێری: "تو کەری، من یارییێن تە نەڤێن."

لەیلایێ شەرم دکر و ب دەنگەکێ بلند دگوتێ: "زەلەمای!!!"

تارقی دگوت: "پێدڤی ناکەت لەیلا، بەلا خوە ژێ ڤەکە."

"تو بابا جانێ من نینی، بابا جانێ من یێ چوویه گەشتەکێ. دەمێ دزڤڕیتەڤە دێ تە قووتیت و توژی نەشیێ ژبەر برەڤی چونکی وی دوو پێ و دوو دەست هەنە و تە ب تنێ پێیەك هەیە."

هەرشەڤ لەیلایێ زەلەمای ددا بەر سینگێ خوە و دوعایا بابالوو بۆ دخواند. دەمێ پرسیار ژێ دکر، دیسان دا درەوا خوە دووبارە کەت و بێژیتێ بابا جان یێ چوویە گەشتەکا دوور و نزانیت دێ کەنگی زڤڕیت. ڤێ درەوێ ئەو گەلەك بێ تاقەت دکر و یا پێ نەخوش بوو وەبێژیت، لێ دگەل هندێ ژی ئەو یا نەچاربوو درەوان ل وی زارۆکی بکەت.

لەیلایێ دزانی کو ئەو دێ چەندین جارێن دی ڤێ درەوێ دووبارە کەت چونکی زەلەمای پشتی هەر جارەکێ ژ دێدیکێ دهاتە دەرێ، دەمێ ژ خەوا پشتی نیڤرو هشیار دبووی، ئەڤ پرسیارە ژ وێ دکر. هەتا وی دەمی کو ئەو ب خوە دشیا قەیتانکێن پێلاڤا خوە گرێبدەت و بچیتە قوتابخانەیێ، لێ هێشتا ئەڤ پرسیارە دکر و لەیلا ژی نەچار دبوو وێ درەوێ بۆ بکەت.

لەیلایێ دزانی دێ ڕۆژەك هێت و زەلەمای دێ دەستان ژ ڤێ پرسیارێ بەردەت کا بوچی بابێ وی ئەو بجھ هێلایە. ئێدی ل سەرێن ڕێکان و دناڤ باخچەیان دا بابێ خوە دناڤ کومێن وان پیرەمێران دا نابینیت یێن ڕاوەستای و هندەك ژی ب کوم کومە ل سەر جادەیێ بەرەڤ خوارێ دچن یان د چایخانەیان ڤە بەرامبەر سەماوەرێ چایێ دڕوونە خوارێ و فڕان ل پەیالێن چایێ ددەن.

یان ژی دەمێ ڕۆژەکێ د بەر لێڤێن ڕووبارەکێ خواروڤیچ ڕا دبوریت یان چاڤێ خوە ل دەشتەکێ بگێریت کو بەفرێ سپی کربیت، ژ نیشکەکێ ڤە ئەو چەندە دێ هێتە سەر هزرا وی کو دیارنەمانا بابێ وی ئێدی برینەکا بەروەخت و نوو نینە بەلکو یا هاتیە گوهۆڕین بۆ تشتەکێ دی، تشتەکێ کەڤن و بێ ئێشان، تشتەکێ هۆسا وەکو چیرۆکێن ئەفسانەیی یێ کەڤن بیت. یان ژی تشتەکێ هۆسا کو ڕێزێ لێ بگری و ب چاڤەکێ مەزن سەحکەیێ.

لەیلا، ل ڤێرێ، ل مورییێ، گەلەك یا بەختەوەرە، لێ بەختەوەریا وێ ژی ب سانەهی بۆ نەهاتیە و تشتەکێ هۆسا نینە کو بهایێ وێ نەدابیت.

***

ل ڕۆژێن بێهنڤەدان، تارِقی لەیلا و زارۆك دبرنە بازارِی کو ل هەردوو ڕەخێن وی هندەك دکانێن فرۆتنان خشلان هەبوون و ب ڕەخ ڤە ژی دێرا "ئەنگلیکان" یا کەڤن هەبوو کو ل ناڤەڕاستا چەرخێ نوزدێ هاتبوو ئاڤاکرن.

تارِقی کەبابێن تیژ یێن چاپلی ژ فرۆشیارێن گەرۆك و ل سەر جادەیان بۆ وان دکرین. دناڤ جادەیێن پرِی قەرەبالغ یێن ئاکنجیێن ناڤخۆیی و ئەورۆپی دا یێن تێلەفونێن دەستی و کامیرەیێن دیجیتال د دەستان دا دهاتن چوون و ئەو پونجابیێن* ژبەر گەرماتیا دەشتێ ڕەڤینە وێرێ، دبورین.

جار جارە ژی سوواری پاسەیێن وێستگەها کەشمیرێ دبوون. ل وێرێ، تارِقی بەندەرێ ڕووبارێ "ژیلوم" و ئەڤرازیێن پرِی دارێن کاژان و گرکێن بلند و دارستانێن کەسك نیشا وان ددان و دگوتێ هێشتا دناڤ وان دارستانان دا مەیموونك دژین و ژ ڤێ دارێ خوە دهاڤێژنە سەر دارا دی.

پاشی دا چنە ناڤ دارستانا "ناتیاگالی" کو سێ کیلومەتران ژ موریێ یا دوور بوو. دا دەستێ لەیلایێ گریت و دناڤ ڕێکەکا سیبەر و هەردوو لایێن وێ دار دا بورن هەتا دگەهشتنە مالا پارێزگەری. دا ل لایێ گۆڕستانا کەڤن یا ئینگلیزان ڕاوەستن. هندەك جاران ژی دا تەکسیەکێ گرن و بەرەڤ گوپیتکا چیای چن داکو دیمەنێن کەسك و دلڤەکەر یێن بەندەرێ بینن دەمێ دناڤ مژێ دا بەرزە دبووی.

هندەك جاران د ڤان گەریانان دا دەمێ دبەر جامخانەیێن دکانان ڕا دەرباز دبووین، لەیلایێ وێنێ خوە ددیت. وێنەیێ زەلەمای و ژن و کچ و کورەکان. وێ دزانی کو ل دەڤ خەلکەکێ نەنیاس، ئەو وەکو خێزانەکا گەلەگ ئاسای خویا دکەن، خێزانەکا بێ نهێنی و درەو و خەم.

★★★

عەزیزایێ خەونێن نەخوش ددیتن و ب ڤێژی ڤە ژ خەو هشیار دبوو. لەیلا نەچاردبوو د هەوارا وێ بچیت و ل دەڤ برِوونتە خوارێ و ب دەهمەنا کراسێ خوە ڕوویێن وێ پاقژ بکەت و ب نەرمی و دلوڤانی دەستێ خوە ل پشتا وێ دا بینتە خوارێ هەتا خەو دچیتە چاڤێن وێ.

---

* مللەتەکێ هندو ئەورۆپی نە و پتریا وان ل هندستان و پاکستانێ دژین.

لەیلایێ ژی بەردەوام خەون ددیتن کو یا ڤەدگەریتە ڤە بۆ مالا خوە یا کەڤن ل کابولێ و ل مەمەری دا دبوریت و پاشی ب دەرەجکان سەردکەڤیتە ڤاتێ دووێ. ئەو یا ب تەنێ بوو، لێ ل پشت وێ ژوورا دەرگەهێ وێ پێڤەدای، دا دەنگێ ئوتیکرنێ و وەرپێچانا بەتەنیکان دهاتە گوهێن وێ. هندەك جاران ژی دەنگێ ژنەکێ یێ نزم دهاتە گوهێن وێ کو ب شێوازێ هیڕاتێ ستران دگوتن، لێ دەمێ ئەو دچوویە د وێ ژوورێ ڤە، دا بینیت یا ڤالأیە و کەس تێڤە نینە.

ڤان خەونان گشت گیانێ وان دلەرزاند. دەمێ ژ خەو هشیار دبوو، لەشێ وێ خوهێ دگرت و ڕۆندك ژ چاڤێن وێ دبارین. تشتەکێ وێرانکەرە، هەموو گاڤان، تشتەکێ وێرانکەرە.

# 49

ل ڕۆژەکا یەکشەمبی ل هەیڤا ئیلونا هەمان سال، دەمێ لەیلا مژوولی نڤاندنا زەلەمای بوو، کو پەرسیف هاتبوویێ و هەست ب سەرمایەکا دژوار دکر، تارق هاتە د ژوور ڤە و بێهنا وی پیچەکێ تەنگ ببوو. گوت "ئەرێ تە گوهلێبوو؟"

"وان ئەحمەد شاهـ مەسعود یێ کوشتی. ئەو نوکە یێ مری."

"چەوا؟"

تارق هێشتا ل بەر دەرگەهی بوو، هندی ئەو دەنگوباسێن دزانین بۆ وێ ڤەگێڕان.

"دبێژن وی دەلیڤە دابوو دوو ڕۆژنامەیێن بەلجیکی کو د بنیات دا خەلکێ مەغریبێ بوون، بهێنە دەڤ و وی و دیدارەکا ڕۆژنامەڤانی دگەل ساز بکەن. ل دەمێ ئەنجامدانا دیدارێ، ئەو بۆمبەیا وان کریە دناڤ کامیرەیا وێنەگرتنێ دا پەقی. مەسعود و ڕۆژنامەڤانەك هاتنە کوشتن و ئەو ڕۆژنامەڤانێ دی ژی دەمێ دڤیای برەڤیت تەڤە لێ هاتە کرن و هاتە کوشتن. ڕەنگە ئەو ڕۆژنامەڤان، هندەك کەسێن سەر ب ڕێکخستیا قاعیدە ڤە بن."

بیرا لەیلایێ ل پوستەرێ ئەحمەد شاهـ مەسعودی هات ئەوێ دایکا وێ ب دیوارێ ژوورا خوە یا نڤستنێ ڤە هەلاویستی. د وێنەی دا مەسعود پیچەکێ بۆ پێش ڤە هاتبوو خوە چەماند بوو، بریەکا وی یا بلند و کڤاندار بوو و دێمێ وی ژی یێ خورت بوو، هەروەکو دا بێژی ئەو یێ ب هشیاری گوهداریا کەسەکی دکەت دەمێ بۆ وی دئاخڤیت.

هەردیسان بیرا لەیلایێ دهات کا دایکا وێ چەند یا سوپاسدار بوو، ژبەرکو مەسعودی ب خوە نڤێژ ژ سەر کەلەخێن کوڕێن وێ کربوو، وێ ب شانازی ڤە بەحسێ ڤێ چەندێ بۆ هەمووو کەسان دکر، هەتا دەمێ پشتی هینگێ شەڕ دناڤبەرا وی و هێزێن دی یێن چەکدار ل ئەڤغانستانێ پەیدابووی ژی، دایکا وێ قەت یا ئامادە نەبوو لومەی وی بکەت.

وێ بەردەوام دگوت کو ئەو زەلامەکێ باش بوو حەز ژ ئاشتیێ دکر، وی دڤیا دووبارە ئەڤغانستانێ ئاڤا بکەت لێ هێزێن دی ل دژی وی ڕاوەستیان و دەلیڤە نەددایێ. ل دەڤ دایکا

وێ، هەتا دوماهیێ ژی و هەتا هەموو تشت بەرەڤ ئاقارەکێ خراب و نەباش ڤە چووین و کابول ب تەمامی هاتیە وێرانکرن، هێشتا مەسعود د چاڤێن وێ دا شێرێ پانجشێرێ بوو.

لەیلا وەکو وێ یا ب لێبورین نەبوو. هەرچەندە چارەنڤیسێ دوماهیێ یێ مەسعودی نەبوو ئەگەرێ کەیفخوشیا وێ، لێ باش بیرا وێ دهات کا چەوا کولانێن کابولێ ل پێشچاڤێن وی دهاتنە وێرانکرن و کەلەخێن کوشتیان ل بن داروبەرێن خانیێن هەرفتی ڤە دئینانە دەرێ و پشتی ڤەشارتنا ڤان کەلەخان ب ماوەیەکی ژ نوو دەست و پێن ژێڤەبووی یێن وان ل سەر بانێن بلند یان چەقێن داران دهاتنە دیتن.

گەلەك ب ڕوهنی بیرهاتنێن دایکا وێ دهێنە بیرا وێ ب تایبەت بەری چەند خولەکێن کێم یێن موشەکەك بەر ب مالا وان کەفتی و پەقی. تشتێ ژ هەموویان پتر دلێ وێ دئێشاندی و بزاڤ دکر ژ بیرا خوە ببەت، کەلەخێ بابێ وێ یێ بێ سەر بوو ئەوێ کەفتیە ب ڕەخ وێ ڤە، کو پرەکا ب بۆڕج ل سەر تیشیرتێ وی بوو و کەلەخێ وێ دناڤ دووکێل و خوینێ دا بەرزە ببوو.

تارڤی گوت: "دێ ڕێوڕەسمێن ڤەشارتنا وی هێنە ئەنجامدان. ئەز یێ پشتڕاستم ژ ڤێ چەندێ. ڕەنگە ل دەڤەرا "ڕەوالپەند"ێ بیت. چ پێ نەڤێت دێ ڕێوڕەسمەکێ مەزن بیت."

زەلەمای، ئەوێ بەری هینگێ خەو کەفتیە چاڤێن وی، نوکە هشیاربوو ب هەردوو دەستێن خوە یێن بچووك و نازك، چاڤێن خوە دپەرخاندن.

پشتی هینگێ ب دوو ڕۆژان، دەمێ ئەو مژوولی پاقژکرنا ژوورەکا هوتێلێ، تارڤی گوهـ ل دەنگێ ڤەرەبالغەکێ بوو. بلەز گێسك هاڤێتە وێرێ و دەرکەفتە ژ دەرڤە و گەهشتە دەڤ لەیلایێ.

دەنگێ وێ ڤەرەبالغێ ژ هۆلا ڕوونشتێ ل هوتێلێ ڤە دهات. ل لایێ ڕاستێ یێ پرسگەهێ جهەکێ تایبەت بۆ ڕوونشتێ هەبوو کو چەندین کورسیك و دوو ڤەنەپەیێن کو قوماشێ وێ یێ سویدی و ڕەنگ بێجی بوو، لێ ددانایی بوون. ل کوژیەکێ وێ هولێ و ل بەرامبەر وان هەردوو ڤەنەپەیان، تێلەڤزیونەك ل سەر مێزەکێ یا دانای بوو. سەعید و زێرەڤانێن ل بەر دەرگەهی و کومەکا مێڤهانان ل بەر تێلەڤزیونێ دراوەستایی بوون. تارڤی و لەیلایێ ڕێکا خوە دناڤ وێ ڤەرەبالغێ دا کر و چوونە پێش تێلەڤزیونێ.

تێلەڤزیون ل سەر کەنالێ BBC بوو و دیمەنێ بۆرجەکێ نیشان ددا کو دووکێلەکا ڕەش ژ ڤاتێن وێ یێن سەری بلند دبوو. تارقی تشتەك گوتە سەعیدی و ئەو ژی مژوولی بەرسڤدانا پرسیارا وی بوو، لێ ژ نیشکەکێ ڤە د گوشەیەکا شاشێ دا فرۆکەیەك پەیدابووی و خوە ل بۆرجێ ب ڕەخ ڤە دا و پەڤینەکا هند مەزن ژێ پەیدابوو کو لەیلایێ د ژیانا خوە هەموویێ دا تشتێن هۆسا نەدیتبوون. هەموو کەسێن دناڤ هۆلێ دا کرە قێژی.

د ماوەیێ کێمتر ژ دوو دەمژمێران دا، هەردوو بۆرج ب تەمامی هەرفتن. هەر بلەز، ئێدی هەموو کەنالێن دنیایێ بەحسێ ئەڤغانستان و هێزێن تالیبان و ئوسامە بن لادنی دکر.

***

تارقی پرسیار کر: "ئەرێ تە گوهلێبوویە کا تالیبانێ چەوا بەحسێ بن لادنی کریە؟"

عەزیزا ل سەر تەختێ نڤستنێ یێ بەرامبەر وان یا ڕوونشتی بوو و تەماشەی یاریا شەترەنجێ دکر کو بەری هینگێ تارقی ئەو فێری ڤێ یاریێ کربوو. ناڤچاڤێن وێ د گرێ بوون و لێڤا خوە یا خوارێ دپەرخاند. وی ژی وەکو بابێ خوە ب زمانێ لەشی دئاخفت دەمێ بڕیار دابا یاریکەرەکێ یاریێ بلڤلڤینیت.

نوکە پەرسیڤا زەلەمای سڤکتر لێ هاتیە و یێ نڤستی یە. لەیلایێ سینگێ وی ب لیفکەکی دپەرخاند.

وێ گوت: "بەلێ من یا گوهلێبووی."

هێزێن تالیبانێ بڕیار دابوو ب چ ڕەنگان دەستا ژ پشتەڤانیا بن لادنی بەرنەدەن، چونکی ئەو مێهڤانە ل دەڤ وان و نوکە وی پەنارگەهەك ل ئەڤغانستانێ بۆ خوە دیتی یە. ڕادەستکرنا مێهڤانی دژی دابونەریتێن پەشتوونیایە. تارقی دکرە کەنی و لەیلا باش د مەرەما کەنیا وی دگەهشت کو تارق ب هەموو ڕەنگان دژی ڤان کارێن نەبەرئاقلە ب هێجەتا دابونەریتێن پەشتوونی یێن ڕەسەن. ئەڤ چەندە کرێتکرنا دابونەریتێن ڤی مللەتی یە.

پشتی بورینا چەند ڕۆژەکان ل سەر ڤێ هێرشێ، جارەکا دی تارق و لەیلا د هۆلا ڕوونشتێ یا هوتێلێ ڤەبوون. ل سەر کەنالەکێ تێلەڤزیونێ، سەروکی وی دەمی یێ ئەمریکا، جورج دەبلیو بوشی، دئاخفت و ئالایەکێ ئەمریکا یێ مەزن ل پشت وی بوو. دەنگێ وی د ڕەجفی، یا ژ لەیلایێ ڤە ها ئەو دێ کەتە گری.

سەعیدی، کو زمانێ ئینگلیزی دزانی، بۆ وان ئاخفتنێن بوشی شرۆڤەکرن کو بڕیارا شەڕی یا دای.

تاڕقی گوت: "شەڕ دژی کێ؟"

"دژی وەلاتێ هەوە، ل دەستپێکێ دژی هەوە."

★★★

تاڕقی گوت: "من نەباوەرە ئەڤ چەندە کارەکێ خڕاب بیت."

ئەو ژ ئەنجامدانا کارێ ئەڤینێ ب دوماهی هاتن. ئەو ب ڕەخ وێ ڤە یێ ڕازای بووی و سەرێ وی ل سەر سینگێ وێ بوو. دەستێ خوە ژی ل دور کەمەرا وێ ئالاَند بوو.

ل جارێن دەستپێکێ یێن وان بزاڤ دکری، پیچەکێ بۆ وان یا ب زەحمەت بوو خوە نێزیکی هەڤدوو بکەن، تاڕقی بەردەوام داخوازا لێبورینێ دکر و لەیلایێ ژی بەردەوام دلەك ل بەر دلێ وی ددا. نوکە ژی وان هندەك ئاریشە هەنە لێ نە ئاریشەیێن جەستەی، بەلکو یێن ئاریشەیێن دەروونی نە.

ژوورا وان گەلەك یا بچووکە و زارۆك ژی ل سەر وان تەخێن بچووك و لڤوك یێن د بن وان دا دنڤستن. ژبەر هندێ وان تایبەتمەندیەکا گەلەك کێم هەبوو. پتریا جاران لەیلایێ و تاڕقی ئەنجامدانا کریارا سێکسی ب شێوەیەکێ گەلەك نهێنی ئەنجام ددا بێی کو دەنگەکی ژ خوە بینن یان جلکێن خوە بێخن، بەلکو ب دزیکی ڤە ل بن بەتەنیکێ بوون و خوە بۆ هەر لڤینەك یان هشیاربوونەکا ژ نیشکەکێ ڤە یا زارۆکان بەرهەڤ کربوو.

ئەو گەلەك د دوودل و ل خوە دهشیاربوون، هەتا دەنگێ لڤینا بەتەنیکێ ژی کاریگەریا خوە ل سەر وان هەبوو. زێدەباری دەنگێ سپرنگێن تەختی. لێ ل دەڤ لەیلایێ، هەبوونا تاڕقی ب ڕەخ وێ ڤە ژ ڤان هەمموو مەترسیان گرنگتر بوو. دەمێ وان ئەڤ کریارە ئەنجام ددای، لەیلایێ هەستپێدکر ئەو یا پاراستی و ب پشتەڤانە. دوودلیا وێ ژ هندێ کو ژیانا وان یا پێکڤە دێ یا بەروەخت بیت و بەردەوام نابیت و هەمموو تشت دێ تێکچن، ئێدێ نەدما و هەست ب ئارامیێ دکر.

ئێدی ئەو ترس ل دەڤ وێ نەما کو جارەکێ ژێکدوور بکەڤنەڤە

وێ نوکە گوت: "مەرەما تە چیە؟"

"ئەرێ ما چ زیان تێدا هەیە ئەگەر ئەم بزڤڕینە وەلاتێ خوە ڤە. هەر چ نەبیت ل دوماهیێ ڕەوش هند یا ب مەترسی نینە."

ل ناڤ وەلاتێ وان، جارەکا دی موشەك یێ ل ئەسمانی دبارن، لێ ڤێ جارێ موشەکێن ئەمریکی نە. ڕۆژانە لەیلایێ دەمێ مژوولی گوهۆڕینا چارچەفێن سەر تەختان و پاقژکرنا ژووران، دیمەنێن شەڕی ل سەر تێلەڤزیونێ ددیتن. ئەمریکیان دووبارە شەڕکەرێن خوە یێن ب چەك ئێخستین و هەڤکاریا هێزێن هەڤپەیمان یێن باکوری دکەن داکو جارەکا دی شەڕێ تالیبان بکەن و بن لادنی دەستەسەر بکەن.

ئەڤ ئاخفتنا تارقی ببوو جهێ دلگرانیا لەیلایێ و ب توندی ناڤچاڤێن خوە لێ کرنە گرێ و بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا.

"ڕەوشا وەلاتی یا خراب نینە؟ مرنا مرۆڤان؟ ژن و زارۆك و پیر؟ دیسان دووبارە کاڤلکرنا مالێن خەلکی؟ ئەڤ چەندە هێشتا ب دیتنا تە کارەکێ خراب نینە؟"

"هش هش، دێ زارۆك هشیاربن."

لەیلایێ دەنگێ خوە بلند کر: "تو چەوا دشێی تشتەکێ هۆسا بێژی، تارق؟ پشتی وێ ڕوودانا ل "کارام"ێ کو وان گوت مە ب شاشی ڤە ئەنجامدایە؟ ئەو ڕوودانا بوویە ئەگەرێ کوشتنا سەدان کەسان!! تە ب خوە کەلەخێن وان دیتن."

تارقی گوت: "نەخێر."

پاشی وی دەستەکێ خوە دانا بن سەرێ خوە و تەماشەی لەیلایێ کر.

"تو شاش د من گەهشتی، مەرەما من ئەو بوو ..."

لەیلایێ گوت: "تو نزانی."

لەیلایێ دزانی کو پیچەکێ وێ دەنگێ خوە یێ ل تارقی بلند کری، ئەڤە یەکەم شەڕێ وان یێ ژن و مێران بوو.

"دەمێ موجاهدینان دەست ب شەڕی کری، تە ژ وەلاتی بارکر، ل بیرا تەیە؟ ئەو ئەز بووم کو ل ناڤ وەلاتی مایم. ئەز دزانم کا ڕامانا شەڕی چیە. من دایك و بابێن خوە د شەڕی دا ژدەستدان، دایك و بابێن خوە، تارق. لێ ژ نوو نوکە تودبێژی شەڕ تشتەکێ هندێ ب مەترسی و خراب نینە."

تارِقی ب هەردوو دەستان ڕوویێن لەیلایێ گرتن و گوتێ: "ل من ببورە لەیلا، ببورە. تو ڕاست دبێژی. مەرەما من ئەو بوو دەمێ شەڕ ب دوماهی دهێت، هیڤی هەیە وەلات ئارام بیتەڤە. ئەم دشێین پشتی چەندین سالێن درێژ بۆ یەکەم جار ..."

لەیلایێ گوت: "من نەڤێت زێدەتر ل سەر وی بابەتی باخڤم."

بۆ وێ ب خوە ژی یا سەیر بوو کا چەوا هۆسا ب توندی بەرسڤا وی ددا. وێ دزانی مافێ وێ نینە هۆسا ڕەق دگەل وی باخڤیت، چونکی مانە هەر دایك و بابێن وی ژی هەر ژ بەر شەڕی گیانێ خوە ژ دەست دا؟ دەمەکێ کێم پێڤە نەچوو، تۆڕەبوونا وێ هاتە خوارێ. تارِقی ژی هەر ب نەرمی دگەل وێ دئاخفت و دەمێ کێشایە بەر سینگێ خوە ژی، وێ خوە بێدەنگ کر و چ بەرڕەڤانی ژ خوە نەکر.

هەردیسان دەمێ دەست و ناڤچاڤێن وێ ماچی دکرین، وێ ڕێك لێ نەدگرت. وێ دزانی ڕەنگە ئاخفتنا وی ژی یا ڕاست بیت. نوکە وێ دزانی کا مەرەما وی چ بوو. ڕەنگە پشتی جورج بوش تۆپبارانکرنێ دڕاوەستینیت، ئومێدەك پەیدابیت. لێ ئەو تشتێ هاتیە سەرێ دایك و بابێن وێ، نوکە یێ ب سەرێ خەلکەکێ دی ژی دهێت.

هندی کچ و کورێن بێگونەهـ یێن وەلاتێ وێ ژبەر تۆپبارانکرنێ وەکو وێ ببنە ئێتیم و سێوێ، ئەو چ جاران بەحسێ ڤێ هیڤیێ ناکەت. نەخێر، قەت ناکەت. خوە بەختەوەر کرن ل سەر بنیاتێ ڤان هیڤیان، خاپاندنەکا تەمساڕە.

هەر ل وێ شەڤێ، زەلەمای ژبەر کوخکێ ژ خەو هشیار بوو. بەری لەیلا خوە بلڤلڤینیت، تارِقی بلەز پێ خوە یێ دەستکرد گرێدا و بەرەڤ زەلەمای ڤی چوو هەلگرت و کرە ملێ خوە. لەیلایێ دناڤ وێ تارِیاتیێ دا سیبەرا تارِقی ددیت کو ب دلوڤانی و هێدی زەلەمای دهەژاند.

سیبەرا سەرێ زەلەمای ل سەر ملێ وی بوو دەستێ خوە یێ دانایە سەر پشتا وی و پێن وی یێن بچووك ل سەر کەمەرا تارِقی دلڤلڤین.

دەمێ تارِق دووبارە زڤڕیە ناڤ جهێن خوە ڤە، کەسێ ژ وان نەئاخفت. لەیلایێ تەماشەی سەروچاڤێن تارِقی دکر و دەستێ خوە لێ ددا. ڕۆندکان ڕوویێن تارِقی تەڕ کربوون.

# 50

ل دەڤ لەیلایێ، ژیان ل موریێ یا خوش و ئارام بوو. کارێ وان ژی هند یێ گران نینە. ل ڕۆژێن بێهنڤەدان وێ و تارڤی زارۆك دبرنە گەریانەکێ و سوواری تلیفرێکێ ل گرێ "پاتریانا" دکرن، یان ژی دا چنە دەڤەرا "پیندی پۆینت" کو هەکە ئەسمان یێ ڕوهن و بێ ئەور بایە، ب سانەهی وان باژێرێ ئیسلام ئاباد و باشورێ "ڕەوالپەندی"ێ ددیتن. ل وێرێ، وان بەتەنیکەك ل سەر ئەردی درائێخست و ساندەویچێن پڕی گوشت و خیار و باجان دخوارن و سارڕدەمەنیا جەنجەفیلێ ب سەر دا دکرن.

لەیلا د دلێ خوە دگوت ئەڤە ژیانەکا تەنا و ڕحەتە ئەو تێدا، ژبەر هندێ پێدڤیە سوپاسدارێن خودای مەزن بن. ب ڕاستی ژی ئەڤە ئەو ژیانە یا وێ د تارپترین ڕۆژێن ژیانا خوەدا  دگەل ڕەشیدی دئینایە پێشچاڤێن خوە و هیڤی بۆ دخواست.

ل شەڤەکا گەرم ل هەیڤا تیرمەها سالا 2002ێ، وێ و تارڤی دبن بەتەنیکێ ڤە خوە د هەڤدوو وەرکر و ب دەنگەکێ نزم بەحسێ دوماهیك گوهۆڕینێن سەر ب وەلاتی دا هاتین دکر. هەلبەت گەلەك گوهۆڕین یێن ڕوودابن.

هێزێن هەڤپەیمانان هەموو چەکدارێن تالێبان ژ باژێرێن مەزن دەرێخستبوون و نەچار کربوون بەرەڤ سنورێن پاکستان و چیایێن باشور و ڕۆژهەلاتێ ئەفغانستانێ ڤە بچن. هەردیسان ISAF کو هێزەکا ئاشتیپارێزا نیڤدەولەتی هاتبوو هنارن بۆ ناڤ کابولێ و سەرۆك کومارەکێ بەروەخت ب ناڤێ "حامد کارازیی" ژی بۆ وەلاتی دەستنیشان کربوو.

لەیلایێ بڕیار دا کو دەمێ هندێ یێ هاتی ئەو دەربارەی بابەتەکی دگەل تارڤی باخڤیت. سالەکێ بەری نوکە، ب نیڤا دلێ خوە یا ئامادە بوو دەستێ خوە بکەتە دناڤ دەستێ وی دا و ژ کابولێ دەرکەڤن. لێ ل ڤان چەند هەیڤێن دوماهیێ هەستپێدکر هندەك جاران بیریا وی باژێری دکەت یاکو تێدا ژ دایکبووی.

دلێ وێ بۆ قەرەبالغا دناڤ بازارێ"شۆر" و بۆ باخچەیێن "بابور" تەنگ دبوو. غەریبیا دەنگێ بلندێ ئاڤفرۆشان دکرن یێن هندەك مەشکێن ژ پیستێ بزنان دروستکری

کرینە ملێن خوە و ئاڤ دفرۆشتی. بیریا دکانێن جلکفروش یێن بازارێ "مورگا" و پێلاڤ فرۆشێن "کارتە-پەروان" دکر.

لێ بێهنتەنگی و غەریبیا وێ ب تنێ نەبوو یا بوویە ئەگەر لەیلا بیریا وەلاتێ خوە و باژێرێ کابولێ بکەت. بەلکو جورەکێ بێ ئارامیێ و نەنڤستنێ ژی ل دەڤ پەیدابببوو.

لەیلایێ گوهلێبوو کو چەندین ڤوتابخانەیێن نوو ل کابولێ هاتینە دروستکرن و چەندین جادە و چوستە هاتینە ڤێرکرن. ئێدی ژن ژی وەکو زەلاٌمان کار دکەن. ڕاستە ژیانا وێ ل ڤێرێ ژی یا خوش و بێ ئاریشەیە و ئەو هەردەم یا سوپاسدارە، لێ ڤێ چەندێ تێرا وێ نەدکر و حەزا وێ پڕ نەدکر، ل ڤێرێ هەموو تشت ل دەڤ وێ د بێ بهابوون، یا ژ وێ خراپتر ژی زێدەتر مانا وێ ل ڤێرێ ب تنێ ژ دەستدانا وەختی یە.

ل ڤێ دوماهیێ دووبارە دەنگێ بابێ وێ د گوهێن وێ دا دلەزریت.

*"تو دشێی ببیە ئەو تشت یێ تە حەز ل سەر هەی، لەیلا. ئەز یێ ژ ڤێ چەندێ پشتڕاستم دەمێ ئەڤ شەڕە ب دوماهی دهێت، ئەڤغانستان دێ پێدڤی ب تە بیت."*

هەردیسان دەنگێ دایکا وێ ی د گوهێن وێ دا دەمێ بابێ وێ پێشنیارا بارکرنێ ژ ئەڤغانستانێ بۆ دکری. بیرا وێ دهێت کا دایکا وێ چەوا بەرسڤا بابێ وێ ددا.

*"من دڤێت ب چاڤێن خوە ببینم دەمێ خەونا کورێن من بجهـ دهێت. دەمێ ئەڤ چەندە دهێتە ڕوودان و ئەڤغانستان ئازاد دبیت، من دڤێت ئەز ل ڤێرێ بم داکو کورێن من ب ڕێکا چاڤێن من ڤێ چەندێ ببینن. ئەو دێ ب ڕێکا چاڤێن من ڤێ ئازادکرنێ بینن."*

لەیلایێ پیچەکێ دڤیا ژبەر دایك و بابێن خوە ژی ب ڤەگەریتە ئەڤغانستانێ داکو نوکە ئەو ژی ب ڕێکا چاڤێن لەیلایێ ئازادکرنا وەلاتی ببینن.

ل دووڤ دا ژی، ئەو تشتێ ژ هەموویان پتر دبوویە هاندەرێ وێ ب زڤڕیتە ڤە، مەریەم بوو. لەیلایێ پرسیار ژ خوە دکر: ئەرێ مەریەم ژبەر ڤێ چەندێ مر؟ ئەرێ بۆ هندێ خوە کرە قوربان داکو لەیلا ل وەلاتەکێ دی ببیتە کرێکار؟ ڕەنگە ل دەڤ مەریەمێ هندی لەیلا و زارۆکێن خوە ب سەلامەت و بەختەوەر بن، بۆ وێ یا گرنگ نەبیت کا دێ چ کەت یان چ هێتە سەرێ وێ. بەلێ نوکە ل دەڤ لەیلایێ یا گرنگە. ژ نیشکەکێ ڤە وێ گرنگی ب ڤێ چەندێ دا.

لەیلایێ گوت: "من دڤێت ڤەگەڕینە کابولێ."

تاڕق ل سەر تەختی ڕوونشت و تەماشەی وێ کر.

دیسان جارەکا دی ئەو ژبەر جوانیا تاڕقی مەندەهوش ما، ئەنیا وی یا ڕاست و زەڤلەکێن دەستێن وی یێن ب هێز و چاڤێن وی یێن پڕی ئارامی و دلوڤانی. ئەڤە سالەك ژی بووری، لێ هێشتا لەیلا باوەرناکەت کو ئەو یێن گەهشتینە یەك، باوەرناکەت کو تاڕق یێ ب ڕەخ وێ ڤە و هەڤژینێ وێ یە.

تاڕقی پرسیار ژێ کر: "ب ڤەگەڕین؟ بۆ کابولێ؟"

"بێگومان، لێ هەکە توژی حەز بکەی."

"ما تو ل ڤێرێ یا بەختەوەر نینی؟ یا ژ من ڤە تو ل ڤێرێ گەلەك یا کەیفخوشی، هەروەسا زارۆك ژی."

لەیلا ڕوونشت، تاڕقی جهێ خوە گوهوڕی و ئەو برە ب ڕەخ خوە ڤە.

لەیلایێ گوت: "چ پێنەڤێت ئەز ل ڤێرێ یا کەیفخوش و بەختەوەرم، بەلێ ل ڤێرێ دێ گەهینە چ تشت، تاڕق؟ هەتا کەنگی دێ ل ڤێرێ بین؟ ئەڤە وەلاتێ مە نینە. کابولێ باژێرێ مەیە. ل وێرێ ژی گەلەك تشت یێن ڕوودایین کو هەتا ڕادەیەکی دباشن. من دڤێت د وان تشتێن باش دا بەشداربم. من دڤێت کارەکی بکەم. من دڤێت من ژی بەشداریا خوە هەبیت. تو د من دگەهی؟"

تاڕقی ب ئارامی سەرێ خوە هەژاند و گوت: "ئانکو تە ئەڤ چەندە دڤێت، تو یا پشتڕاستی؟"

"بەلێ من ئەڤ چەندە دڤێت و ئەز یا پشتڕاستم ژی. بەلکو پتر ژ هندێ ژی. ئەز هەست پێدکەم ل سەر مە پێدڤیە بزڤڕینەڤە و ئێدی مانا مە ل ڤێرێ ب کارەکێ باش نزانم."

تاڕقی تەماشەی سەرێ دەستێن خوە کر و پاشی تەماشەی وێ کر.

"بەلێ ب مەرجەکی، کو تەژی دل ل سەر ڤێ چەندێ هەبیت."

گرنژینەك کەفتە سەر لێڤێن تاڕقی. خەتەك دناڤ چاڤێن وی دا دیاربوو ڤە و بۆ ماوەیەکی دبوو تاڕقێ بەرێ. ئەو تاڕقێ تووشی سەرئێشانێ نابیت. ئەو تاڕقێ دا بێژی یێ

ل سیبیریا و بەری ئاڤا دفنا وی بکەڤیتە سەر ئەردی دبوو بەستی. ڕەنگە هۆسا هاتبیتە سەر هزرا لەیلایێ، بەلێ ل ڤان ڕۆژان تارڤێ وەکو جاران دهاتە پێشچاڤێن وێ.

وی گوت: "ئەز؟ هەتا لایێ دی یێ دنیایێ دێ ل دووڤ تە هێم، لەیلا."

لەیلا نێزیکی وی بوو ماچەك ل ڕوویێ وی دا. هەستپێدکر چ جاران هندی نوکە وێ حەز ژ تارڤی نەکریە. پاشی گوتێ: "سوپاس." و ناڤچاڤێن خوە ب ناڤچاڤێن وی ڤە نان.

"ئانکو دا بزڤڕینە وەلاتێ خوە."

لەیلایێ گوت: "بەلێ ل دەستپێکێ من دڤێت بچینە هیڕاتێ."

"هیڕاتێ؟"

لەیلا بۆ ڕوهن کر کا مەرەما وێ چی یە.

***

ل دەستپێکێ زارۆك پێدڤی ب پشتڕاستکرنێ بوون. هەر یەك ل دووڤ شێوازێ خوە یێ تایبەت. پێدڤی بوو لەیلا ل دەڤ عەزیزایێ بڕوونتە خوارێ. هەتا نوکە ژی هەرشەڤ عەزیزا تووشی کابووسان دبوو، حەفتیەکێ بەری هینگێ ژی دەمێ ل ئاهەنگەکا بووك ڤەگوهاستنێ کو ل نێزیکی وان هاتبوو سازکرن، دەمێ دەهواتیان چەند فیشەکەکێن خوشیێ بەردابنە ئەسمانی، عەزیزا گەلەك ترسیابوو و چاڤێن وێ تژی ڕۆندك ببوون.

نوکە لەیلا یا نەچارە بۆ عەزیزایێ ڕوهن بکەت کو دەمێ ئەو دزڤڕنە کابولێ، باژێر یێ ئارامە و تالیبان ل وێرێ نەماینە و کەس وێ فڕیناکەتە ئێتیمخانێ.

"ئەم هەمو پێکڤە دێ ژین، ئەز و تو و زەلەمای و بابێ تە. تو چ جاران ژ من دوورناکەڤی، ئەز سوزێ ددەمە تە، عەزیزا."

پاشی دا بۆ کەتە کەنی و بەردەوامیێ دەتە ئاخفتنا خوە: "ئانکو هەتا وی دەمی دێ ل دەڤ من مینی هندی تە بڤێت. هەتا وی دەمێ تو مەزن دبی و دبیە ئەڤیندارا گەنجەکی و بڕیارێ ددەی هەڤژینیێ دگەل پێکبینی."

ئەو ڕۆژا وان دەڤەرا موری بجهـ هێلایی، زەلەمای گەلەك یێ دامایی و نەئارام بوو. دەستێ خوە هاڤێتە ملێ ئەلیونایێ و نەبەرددا. عەزیزایێ گوت: "دادێ ئەز نەشێم دەستێ وی ژ ئەلیونایێ ڤەکەم."

لەیلایێ دگەل زەلەمای ئاخفت و بۆ ڕوهن کر: "کورێ من زەلەمای، ئەم نەشێن بزنێ دگەل خوە ببەین، ئەم نەشێن وێ سواری پاسێ بکەین."

تارڕق کەفتە سەر چووکان و سوزدایێ بزنەکا وەکو ئەلیونایێ ل کابولێ بۆ وی بکڕیت. پاشی زەلەمای ب خورتی دەستێ خوە ژ ملێ ئەلیونایێ ڤەکر. ل دووڤ دا وان خاترا خوە ژ سەعیدی خواست.

بۆ پاڕاستنا وان ژ بەلایێن دنیایێ، سەعیدی قورئان ب دەستێ خوە گرت و هەر یەکی ژ وان سێ جاران ماچیکر و دبن ڕا بورین. ل دووڤ دا هاریکاریا تارڕقی کر هەتا هەردوو چانتەیێن وی کرینە د ترۆمبێلا خوە دا و وی ب خوە ئەو گەهاندنە وێستگەها پاسەیان. ل دوماهیێ ژی ل سەر چوستەیێ ڕاوەستیا و بۆ خاترخواستنا دوماهیێ، دەستێ خوە ل وان بلند کر و پاشی پاسێ شول کر و دەست ب گەشتا خوە کر.

دەمێ لەیلا ڕوونشیە خوارێ و ل پشت خوە زڤڕی، د پەنجەرکا دوماهیێ یا پاسێ دا دوورکەفتنا سەعیدی ددیت، دوودلیەك د مەژیێ وێ دا دەنگڤەدا و دگوتێ ئەرێ ما ئەڤ چەندە کارەکێ نەفام نینە وان جهەکێ ئارام و بەختەوەر بجهـ هێلای؟ دێ زڤڕنە وەلاتەکی کو دایك و باب و برایێن وێ لێ هاتینە کوشتن. وەلاتەکێ هۆسا کو چ جاران دووکێلا بۆمبان لێ ب دوماهی ناهێت. ل دووڤ دا، دناڤ دەرزێن تارڕی یێن بیردانکا وێ دا، دوو دێرێن شعرەکێ هاتنە بیرا وێ کو بابێ وێ دەمێ دڤیای خاترا خوە ژ کابولێ بخوازیت، دگوتن.

***کەس نەشێت وان ستێران بهەژمێریت یێن ل ئەسمانێ وێ دبرسقن***

***یان هزار ڕۆژێن گەش یێن خوە ل پشت چیایێن وێ دڤەشێرن***

لەیلا ل سەر کوشنێ خوە یا ڕوونشتی بوو تەڕاتیا ناڤچاڤێن خوە پاقژ دکرن. نوکە کابول یا ل هیڤیا وان، کابول یا پێدڤی وانە. ئەڤ گەشتا وان بەرەڤ وەلاتی کارەکێ ڕاست و دروستە.

بەلێ بەری ڤێ چەندێ، هێشتا دوماهیك خاترخواستن یا مای.

شەڕێن ناڤخۆیی یێن ئەڤغانستانێ بووینە ئەگەرێ وێرانکرنا جادەیێن دناڤبەرا کابول و هیڕات و قەندەهارێ. نوکە ب سانەهیترین ڕێك بۆ باژێرێ هیڕاتێ، ڕێکا باژێرێ

"مەشهەد"ێ یە ل ئیرانێ. لەیلا و خێزانا خوە ب تنێ شەڤەکێ دێ ل وێرێ مینن. وێ شەڤێ دێ ل هوتێلێ مینن و ڕۆژا دی سپێدێ زوو دێ سواری پاسەکا دی بین.

مەشهەد باژێرەکێ ب قەرەبالغ و خەبسەیە. دەمێ ئەو د بەر پارك و مزگەفت و خوارنگەهێن وێ یێن کەبابان ڕا دەرباز دبن، لەیلایێ تەماشەی وان دکر. دەمێ پاس دبەر مەرقەدێ ئیمام ڕەزای کو هەشتەمین ئیمامێ شیعانە دبوری، لەیلایێ سەرێ خوە بلند دکر داکو قەرمیدێ وێ یێ جوان و بریسقەدار و منارەیێن وێ یێن بلند و قوبەیا وێ یا زێری باشتر ببینیت کو خەلکی ب عەشق و ڤیانەکا مەزن ڤە پاراستینە.

پەیکەرێن بودای یێن وەلاتێ وێ دهاتنە پێشچاڤێن وێ. نوکە یێن هاتینە وێرانکرن و ل جهێ وان ئاخ و خیز بلند دبیتە بەر ئەسمانی.

ئەو پاسەیا بەرەڤ سنورێ ئیران-ئەڤغانستانێ دچیت، پێدڤیە بۆ ماوەیێ دەه دەمژمێران ڕێکێ ببڕیت هەتا نێزیکی ئەڤغانستانێ دبیت. هەرچەند ئەو نێزیکتر دبوون، ئەردێ وێ ڕووتر و بەیارتر و خەمگینتر خویا دکر. ب ماوەیەکێ کێم بەری سنورێ ئەڤغانستانێ ببرن و بەرەڤ هیراتێ بچن، ئەو د بەر کەمپەکا پەنابەرێن ئەڤغانی ڕا دەربازبوون. ئەو کەمپە وەکو دیمەنەکێ تۆزگرتی و زەر و تاکە ژوورێن ب تەنەکەیان دروستکری دهاتە پێشچاڤێن وێ. وێ دەستێ خوە درێژ کر و دەستێ تارڤی گرت.

***

ل باژێرێ هیراتێ، پتریا جادەیان هاتبوونە ڤێرکرن و ل ڤی لایی و لایێ دی یێ جادێ، دارێن کاژان و پارکێن گشتی و ئاڤاهیێن نەتەمامکری یێن پەرتووکخانەیان و باخچەیێن پڕی کەسکاتی و پاقژ و ڤلەیێن بۆیاغکری هەبوون.

ڕۆناهیا ترافیکلایتان کار دکر، لەیلایێ ب حێبەتی ڤە دیت کو کارەب ژی یا هەی. لەیلایێ گوهلێببوو کو شەڕکەرێ فیودالی یێ هیراتێ "ئیسماعیل خان"ی ڕابوویە ب دووبارە ئاڤاکرنا باژێری ب ڕێکا وان پارەیێن کریێ یێن ژ گومرکا ل سەر سنورێ ئیران و ئەڤغانستانێ ب دەست دکەڤتن. وان دگوت ئەو پارەیێ ل کابولێ ب دەست دکەڤیت نەیێ وی یە بەلکو دڤێت بۆ حکومەتا ناڤەندی بزڤڕینیت.

ئەو شۆفێرێ تەکسیێ یێ ئەو بەرەڤ هوتێلا "موەفەق" ڤە دبرین، دەمێ ناڤێ ئیسماعیل خانی دئیناى، ب ترس ڤە و هەر ب رێزگرتن ڤە ناڤێ وی ژ دەڤێ وی دەردکەفت.

مانا وان بۆ ماوەیێ دوو شەڤان ل هوتێلا موەفەق دێ بیتە ئەگەرێ مەزاختنا پێنجەکا وی پارەیێ دگەل وان هەى، لێ ئەو نەچارن ڤێ چەندێ بکەن چونکی گەشتا وان ژ مەشهەدێ گەلەك یا درێژ بوو و زارۆك ژی گەلەك د واستایی بوون.

سەرپەرشتیارێ هوتێلێ ل جهێ پێشوازیکرنێ، ل دەمێ کلیلێن ژوورێ داینەڤ تارقی، گوتێ کو هوتێلا وان ب هندێ یا ناڤدارە، رۆژنامەنڤیس و کارمەندێن رێکخراوێن نەحکومی ڤەستا وان دکەن.

پاشی گوت: "ل سەر دەمەکی، بن لادن ژی ل ڤێرێ بوو."

ئەو ژوورا وان گرتی، دوو تەخت و سەرشوویەك تێڤە بوون کو ئاڤا وێ یا سار بوو. دناڤبەرا هەردوو تەختان دا ژی تابلویەکا زەیتی یا "خواجە عەبدولا نەسارى" یێ شاعیر یا هەلاویستی بوو.

لەیلایێ د پەنجەرکێ دا دیمەنێن سەر جادەیا ب ڤەرەبالغ یێن ل خوارێ و پارکا ل بەرامبەرى جادەى ددیتن کو رێکێن وێ یێن کورت دناڤ رێزێن داروبار و گولان دا هەڤدوو دبرن.

زارۆك ژی کو گەلەك فێرببوونە تێلەڤزیونێ، بێهنا وان گەلەك یا تەنگ بوو کو تێلەڤزیون د ژوورا وان ڤە نەبوو. لێ ژبەرکو گەلەك د واستایی بوون، هەر زوو خەو ب چاڤێن وان کەفت. پشتی بێهنەکا کێم، چاڤێن تارقی و لەیلایێ ژی کەفتنە سەر یەك.

د هەمبێزا تارقی دا، لەیلا کەفتە د خەوەکا کوور دا. ئەو چەندە نەبیت کو ل نیڤا شەڤێ خەونەکێ دبینیت و دەمێ هشیار دبیت خو تشتەك نامینتە ل بیرا وێ.

***

ل دەمێ سپێدێ، پشتی وان تێشت خوارى کو نان و چا و مرەبا سێڤا و هێکێن کەلاندى بوون، تارقی تەکسیەك بۆ لەیلایێ پەیدا کر. تارقی گوت: "ئەرێ تو یا پشتراستی کو تە نەڤێت ئەز دگەل تە بهێم."

عەزیزایێ دەستێ وی گرتبوو. زەلەمای ژی ب ڕەخ تارڤی ڤە یێ ڕاوەستایی بوو و دەستێ خوە ئێخستبوو سەر کەمەرا وی.

– "بەلێ ئەز یا پشتڕاستم."

پاشی لەیلایێ گوت: "ئەز تووشی چ ئاریشەیان نابم. سوزێ ددەمە تە. توژی زارۆکان ببە بازاڕی و تشتەکی بۆ بکڕە."

دەمێ تەکسی ژ وان دوورکەفتی، زەلەمای دەست ب گرییێ کر. دەمێ لەیلا ل پشت خوە دزڤڕی، وێ دیت زەلەمای یێ دەستێ خوە درێژ دکەت و خوە دگەهینتە تارڤی. ڤێ چەندێ  بێهنا وێ تەنگ دکر و د هەمان دەم دا کەیفا وێ ژی پێ دهات.

★★★

شۆفێری گوتێ: " تو خەلکا هیڕاتێ نینی."

شۆفێری پرچەکا ڕەش و درێژ هەتا سەر ملان هەبوو، وێ دزانی ئەڤ چەندە کارڤەدانەك بوو بەرامبەر تالیبان ئەوێن نوکە ل سەر حوکمی نەماین. ل لایێ چەپێ یێ سمبێلێن وی ژی دا جهێ برینەکێ هەبوو. ل بەرامبەری خوە ژی وێنەیێ بچووك یێ دانای کو وێنەیێ کچەکا گەنج بوو و پرچا خوە د نیڤەکێ ڕا کربوو دوو شاخك.

لەیلایێ گوتێ کو ل ڤان سالێن دوماهیێ ئەو ل کابولێ بوو، لێ نوکە دڤێت ڤەگەڕیتە کابولێ بۆ دەڤەرا "دەهمازانگ."

پاشی پرسیار کر: "تو ژ مێرە ل ڤێرێ دژی، برا؟"

"بەلێ، من ژیانا خوە هەموو ل ڤێرێ بوراندی یە. ئەز ل ڤێرێ ژ دایکبوومە و من هەموو تشت ب چاڤێن خوە یێن دیتین. سەرهلدان ل بیرا تەیە؟"

لەیلایێ ب بەلێ بەرسڤا وی دا. پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

"ل هەیڤا ئادارا سالا 1979ێ، نێزیکی نەهـ هەیڤان بەری هێرشا یەکێتیا سوڤییەتێ. هندەك هیڕاتییێن دلسۆتی و تۆڕە، هژمارەکا شیرەتکارێن لەشکەری یێن سوڤییەتی کوشتن. د ئەنجام دا سوڤییەتێ تانك و هەلیکوپتەرێن خوە فڕیکرن و باژێر تۆپباران کر. خوشکێ، سێ ڕۆژان ل سەر یەك وان ئەڤ باژێرە تۆپباران کر. هژمارەکا مەزن یا ئاڤاهیان خڕابکرن. منارەك ڕاست کر و ب هزاران خەلکێ سڤیل کوشتن. ل وێ ڕۆژێ، دوو خوشکێن من هاتنە کوشتن کو ژییێ یەك ژ وان چواردە سال بوو."

پاشی ب تبلا خوە ئاماژە ل وێنەیی وێ کچا گەنج دا و گوت: "ئەڤە وێنێ وێ یە."
لەیلایێ گوت: "ب مخابنی ڤە."

لەیلا مەندەهوش دما کا چەوا ژیانا هەر ئەڤغانیەکی یا پڕە ژ ڕوودان و کارەساتێن نەخوش و ژ دەستدانا کەسێن خوشتڤی و خەم و ئازارێن کوور. لێ دگەل هندێ وێ دیت کا چەوا خەلك یێ خەباتێ دکەن و بۆ بەردەوامیدان ب ژیانا خوە، پەنایێ دبەنە بەر ڕێکێن جودا جودا.

لەیلایێ هزرا خوە د ژیانا خوە و هەموو ئەو بەلاٚ و نەخوشیێن هاتینە سەرێ وێ دکر. ب ڕاستی ژی ئەو یا حێبەتی یە کا چەوا سەرەڕای ڤان نەخوشیان، ئەو هێشتا یا ساخە و د ژیانێ دا مایە و نوکە د ڤێ تەکسیێ دا یا ڕوونشتیە و گوهێ خوە ددەتە سەرهاتیا ڤی زەلاٚمی.

***

گول دامان، گوندەکە ژ چەند مالەکان پێکدهێت کو هەر مالەکێ دیوار ل چوار ڕەخێن وێ هەنە و خەلکێ وێ دناڤ هندەك کولبەییێن ژ ئاخێ دروستکری ژیانا خوە دبورینن. لەیلایێ ئەو ژن ددیتن یێن مژوولی بەرهەڤکرنا خوارنێ و ژ ئەنجامێ وێ هەلما ژ مەنجەلێن مەزن یێن ل سەر ئاگرێ داران بلند دبووی، سەروچاڤێن وان یێن پڕی خوەه بووین.

هێستر ژی دناڤ گیای دا دچەرین و ئەو زارۆکێن ب دووڤ مریشکان ڤە دکریە غارێ، نوکە یێن ب دووڤ تەکسیێ دکەنە غار. هەردیسان لەیلایێ ئەو زەلاٚم ددیتن یێن عەرەبانەییێن تژی بەر پاڵددان و پاشی دڕاوەستان و تەماشەی ترۆمبێلێ دکرن.

شۆفێری ترۆمبێل بادا و ب ڕەخ گۆڕستانەکێ ڤە بوری. دناڤەڕاستا وێ گۆڕستانێ دا، گۆڕەکێ مەزن هەبوو، شۆفێری گوت ئەڤە گۆڕێ سوفیەکێ ڤی گوندی یە. ل دووڤ دا چاڤێ وێ ب ئاشەکێ بای کەفت کو ل بن سیبەرا پەڕێن وێ یێن ژەنگی گرتی دا، سێ کچێن بچووك دڕوونشتی بوون و یاری ب ئاخێ دکرن. شۆفێری سەرێ خوە ژ جاما ترۆمبێلێ ئینا دەرێ و پرسیار ژێ کر. کچا ژ هەموویان مەزنتر بەرسڤا وی دا و دەستێ خوە بۆ خانیەکی درێژ کر کو دکەفتە دوماهیا وێ کولانێ. شۆفێری سوپاسیا وێ کر و پێ خوە دانا سەر پانزینێ.

شۆفێری ترۆمبێلا خوە ل بەر وی خانییێ یەك قات و چوار ڕەخان دیوار ڕاوەستاند. لەیلایێ ل سەر دیواری دارەکا هژیرێ ددیت کو هندەك چەقێن وێ هاتبوونە ژ دەرڤە.

لەیلایێ گوتە شۆفێری: "ئەز گەلەك گیرو نابم."

***

زەلامەکێ د ناڤەڕاستا ژیێ خوە دا یێ بەژن کورت و لاواز و پرچ خەناکری دەرگەهـ ڤەکر. هندەك داڤێن ڕەنگ گەور دناڤ پرچا وی دا دهاتنە دیتن. چاپانەك ل سەر کڕاسێ خوە یێ پیرهان-تومبانی دا کربوویێ.

لەیلایێ سلاڤ کرێ و پاشی پرسیار ژێ کر: "ئەرێ ئەڤە مالا مەلا فەیزوللاهی یە؟"

"بەلێ، ئەز هەمزەیێ کورێ وی مە. فەرموو خوشکێ دێ چەوا شێم هاریکاریا تە کەم؟"

"ئەز یا ژبەر هەڤالەکا بابێ تە یا کەڤن ڤە هاتیمە، ناڤێ وێ مەریەمە."

هەمزەی مژیلانکێن خوە لڤاندن و ئاورینەکا حەیری ل سەر دێمێ وێ خویا بوو.

"مەریەم ..."

"کچا جەلیل خانی."

دووبارە مژیلانکێن چاڤێن خوە لڤاندن و پاشی دەستێ خوە ب سەروچاڤێن خوە دا ئینانە خوارێ و گرنژینەك ل سەر دێمێ وێ پەیدابوو و ددانێن وی یێن ڕزی و کەفتی دیاربوون.

وی گوت: "ئاهاااا..."

وی هۆسا ئەڤ پەیڤە درێژ کر هەروەکو بێهنا خوە کوور بهەلکێشیت.

"ئاهااا، مەریەم! تو کچا وێی؟ ئەو ژی ..."

پاشی ب جوشەکا مەزن ڤە تەماشەی پشت لەیلایێ کر.

"ئەو ل ڤێرەیە؟ ئەڤە ژ مێژە ئەو چووی؟ مەریەم دگەل تەیە؟"

"بەداخەوە. مەریەمێ یا وەغەر کری."

بۆ ماوەیەکی ئەو مانە ل بەر دەرگەهی، هەمزەی تەماشەی ئەردێ ل بەر دەرگەهی کر. زڕینا گوهدرێژەکی ژ دوور ڤە هاتە گوهێن وان.

هەمزەی گوت: "فەرموون وەرنە د ژوور ڤە."

پاشی دەرگەهـ بۆ ڤەکر و دووبارە گوتێ: "فەرموو، هیڤی دکەم."

★★★

د ژوور ڤە کو چ کەلوپەلێن هۆسا تێڤە نەبوون، ئەو ل سەر ئەردی ڕوونشت. فەرشەکا هیڕاتێ یا ڕائێخستی بوو و هندەك بالیفك ددانای بوون و وێنەیەکێ چوارچوڤەکری یێ باژێرێ مەکەهێ ب دیواری ڤە یێ هەلاویستی بوو. ل بەر دیواری و ل بەر وێ هەتاڤا د پەنجەرێ ڕا دهاتیە ژوور ڤە ڕوونشتنە خوارێ.

لەیلایێ گوهـ ل پست پستا هندەك ژنان بوو کو ل ژوورا دی ڤە دهات. پاشی زارۆکەکێ پێخاس هات و چا و سێنینکەکا کادە و فستەڤان دانا بەر سینگێ وان. هەمزەی دەستێ خوە ب سەری دا ئینا و گوت: "ئەڤە کورێ منە."

کورێ وی ب بێدەنگی چوو ژ دەرڤە. هەمزەی ب دەنگەکێ واستایی ڤە گوت: "نوکە بۆ من ب درێژاهی بەحس بکە."

لەیلایێ دەست ب ئاخفتنێ کر و هەموو تشت بۆ ڤەگێڕان. ڤێ چەندێ وەختەکێ پتر ڤەکێشا ژ وی وەختێ بوو د هزرا خوە دا بۆ دانای، ل دوماهیێ بزاڤ دکر ل سەر خوە زالێ ببیت. هەرچەندە سالەك ل سەر مرنا وێ ڤە یا بوری، لێ هێشتا بۆ وێ یا ب زەحمەتە بەحسێ مەریەمێ بکەت.

دەمێ ئەو ب دوماهی هاتی، هەمزەی بۆ ماوەیەکێ درێژ چ نەگوت. هێدی پەیالا چایا خوە د تەبلێکێ دا دئینا و بر، بۆ ڤی لای و بۆ لایێ دی.

ل دوماهیێ گوت: "بابێ من، خودا ژێ ڕازی بیت، گەلەك حەز ژ وێ دکر. دەمێ ئەو ژ دایکبووی، بابێ من بانگ د گوهێ وێ دا خواند بوو، تو ڤێ چەندێ دزانی؟ هەموو حەفتیان ژی سەرەدانا وێ دکر و هەڤالێن یەك بوون. بابێ من زەلامەکێ خێرخواز بوو، دەمێ جەلیلی ب وی شێوەی دەستێن خوە ژ کچا خوە شووشتین، بابێ من گەلەك سەرا ب خەم کەفت."

"بەداخەوە بۆ مرنا بابێ تە، خودا ژێ ڕازی بیت."

هەمزەی سەرێ خوە هەژاند و سوپاسیا وێ کر.

"ژیێ بابێ من یێ درێژ بوو، هەتا ژیێ وی ژ یێ جەلیلی ژی درێژتر بوو. مە ل گۆڕستانا گوندی و ل نێزیکی گۆڕێ دایکا مەریەمێ ڤەشارت. بابێ من گەلەك یێ خوشتڤی بوو ل دەڤ خەلکی. هیڤیا من ئەوە جهێ وی بەهەشت بیت."

لەیلایێ پەیالا خوە دانا

"دێ شێم تشتەکی ژ تە داخواز کەم؟"

"بێگومان."

لەیلایێ گوت: "دێ شێی وی جهی نیشا من دەی یێ مەریەم تێڤە ژیای؟ تو دێ شێی من بەیە وێرێ؟"

***

شۆفێر ڕازیبوو ماوەیەکێ دی ژی خوە ل هیڤیا وان بگریت.

هەمزە و لەیلا چوونە ژ دەرڤە و د وی گری دا چوونە خوارێ هەتا گەهشتینە وێ ڕێکێ یا گول دامان و هیڕاتێ پێکڤە گرێددەت. پشتی پازدە خولەکان، هەمزەی دەستێ خوە درێژ کرە ڕێکەکا تەنگ و درێژ یاکو ل هەردوو ڕەخێن وێ ب گژووگیایی دا هاتیە نخافتن.

پاشی گوتێ: "ل ڤێرێ دێ ب سەرکەڤی، ل دوماهیێ مەمەڕەك هەیە دێ گەهیە کولبەیێ وان.

ئەو ڕێك یا درێژ و خواروڤیچ و نەڕاست بوو. چەندین کەند و کور د ڕێکێ دا هەبوون. بایێ ب هێز یاری ب گژووگیایێ بلند دکر و ل ناڤچاڤێن لەیلایێ ددا. ئەو و هەمزە گەهشتنە مەمەڕی و هەر جار یەك ژ وان دچوو بەری یێ دی. ل هەردوو لایان گولێن جوراوجور لێ شین ببوون، پەڕێن هندەك گولان د نڤستی بوون و یێن هندەکێن دی ژی ڤەببوون.

هەر ل وی جهی، چەندین گول هەلالان سەرێ خوە دناڤ ستریان ئینا بوو دەرێ. لەیلایێ گوهـ ل دەنگێ چیچکان ل سەر سەرێ خوە فرت فرتا کولیان ل بن پێن خوە دبوو.

ب ڤی ڕەنگی، نێزیکی دووسەد پێنگاڤان ئەو سەر ب گری کەفتن. پاشی ڕێك ڕاست بوو و گەهشتنە دناڤ پارچە زەڤیەکا بەرفرەهـ دا. ئەو ڕاوەستیان و بێهنا خوە کوور هەلکێشا. لەیلایێ دهەمەنا کراسێ خوە ل ناڤچاڤێن خوە ددا داکو مێشوموران ژ خوە بدەتە

پاش. ل وێرێ، لەیلایێ چەندین چیایێن نزم و دار چنار و سپیندار و دارێن ئاقاری دیتن کو لەیلایێ ناڤێن وان نەدزانین.

هەمزە کو پیچەکێ یێ واستای بوو، گوت: "بەری نوکە ڕووبارەکێ ئاڤێ یێ مەزن د ڤێرێ ڕا دبوری، لێ نوکە یێ هشك بووی."

پاشی گوتێ ئەو دێ ل وی جهی ل هیڤیا وێ مینیت هەتا دزڤڕیت. لێ بەری بچیت گوتێ دڤێت دناڤ ڤی ڕووبارێ هشکبووی ڕا دەرباز ببیت هەتا دگەهیتە سەرێ گرەکی. ئەو ل سەر بەرەکێ مەزن و ل بن سیبەرا سپیندارەکێ ڕوونشت و گوت: "ئەز دێ ل ڤێرێ چاڤەڕێی تەبم. نوکە تو هەرە."

"ئەز ب تنێ..."

"دلگران نەبە و وەختێ خوە ژ ڤەستا نەبورینە. هەڕە، خوشکێ."

لەیلایێ سوپاسیا وی کر و د ڕووبارێ هشکبووی ڕا دەرباز بوو کو پێیەکێ خوە ژ سەر بەرەکی دهاڤێتە سەر بەرەکێ دی و چەندین پرتێن شووشەیێن شکەستی دناڤبەرا بەران دا ددیتن. هەردیسان چاڤێ وێ ب قودیکەکا ژەنگی کەفت کو نیڤەك چووبوو د ئەردی ڕا و یا تژی ئاخ بوو.

لەیلا بەرەڤ گری و دارێن چناران بسەرکەفت کو بای لڤێن وان یێن بچووك دگەل خوە دهەژاندن. دلێ وێ دناڤ سینگێ وێ دا خوە بلەز دقووتا. دار چنار ب وی ڕەنگی بوون یێن مەریەمێ بۆ بەحسکرین. دارستانێ ژی شێوەیەکێ بازنەی هەیە و ل ناڤەڕاستا وان ژی جهەکێ دیار و ڤالا هەیە.

لەیلایێ بلەز دکرە غارێ، دەمێ ل پشت خوە دزڤڕی، وێ دیت دیمەنێ هەمزەی ل پێشچاڤێن وێ یێ بچووکتر لێ دهێت، لێ کڕاسێ وی یێ چاپانی ل بەر ڕەنگێ قورمێ دارێ یێ ڤەهوای دیار دکەت. پێ لەیلایێ کەفتە سەر بەرەکی و تەحسی، لێ هەر زوو ڕابووڤە و دەلنگا پەنتەڕۆنێ خوە بلند کر و ڕێکا مای بلەز بڕی . وەختێ گەهشتیە دەڤ سپینداران، بێهنا وێ چك بوو.

دەمێ نێزیکی کولبەی بووی، دیت شووشەیا پەنجەرا وی یا یەکانە و دەرگەهێ وی پێڤە نەماینە. مەریەمێ گوتبوویێ کو کۆلکەکێ مریشکان و تەنیرەك ژی یێ ب ڕەخ خانیێ

وان ڤە، زێدەباری جهەکێ دەستئاڤێ یێ ژ داری دروستکری، لێ لەیلایێ خو یەك ژ وان نەدیت.

لەیلا ل بەر دەگەهێ ڕاوەستیا و گێز گێزا دەنگێ مێشێن د ژوور ڤە هاتە گوهێن وێ. بۆ هندێ بشێت بچینە د ژوور ڤە، یا نەچارە خوە ل وان تەڤنێن تەڤنپیرکان بدەت یێن ل بەر دەرگەهی. دناڤ کولبەیێ تاڕی دا، لەیلایێ پیچەکێ بێهنا خوە فرەهـ کر هەتا شیای چاڤێن خوە ڤەکەت. وێ دیت کولبە گەلەك ژ هندێ بچووکترە ژ یا وێ هزر بۆ دکری و ب تنێ تەختەکێ شکەستی دناڤ کولبەی دا مابوو.

لەیلایێ د دلێ خوە دا گوت ڕەنگە خەلکی تەختێن دی بربن داکو بۆ سۆتاندنێ مفای ژێ وەربگرن. نوکە کولبە یێ پڕ بووی ژ بەلگێن هشك و شووشەیێن شکەستی و کاغەزێن بەنیشتی و کڤارکێن کیڤی و قوپکێن جگارەیێن زەربووی. هەردیسان گەلەك گیا یێ تێڤە شینبووی و هەتا نیڤەکا دیواران یێ بلند بووی. لەیلایێ هزرا خوە دکر، ئەو چەوا پازدە سالان ل ڤی جهی ژیایە، پازدە سالان؟

پاشی وێ پشتا خوە دا دیواری و ڕووشنتە خوارێ و گوهێ خوە دا دەنگێ بای دەمێ یاری ب بەلگ و پەڤێن دار چناران دکرین. گەلەك تەڤنێن تەڤنپیرکان ب بنبانێ خانی ڤە دهەلاویستی بوون و کەسەکی ب سپرێ تشتەك ل سەر دیواری نڤیسابوو، لێ نوکە پتریا بۆیاغا وی ژێ کەفتیە و یا وەرپایی ژبەر هندێ وێ نەزانی کا چ ل سەر دیواری هاتیە نڤیسین.

دەمێ باش تەماشەی وێ نڤیسینێ کری، دیت پیتێن وێ یێن زمانێ ڕۆسی نە. ل قولاچکەکا بنبانێ وێ دا هێلینکا چیچکەکێ و ل قولاچکەکا دی هێلینا پێلستانکەکێ (حاجیرەشك) لێ هەبوو.

لەیلایێ چاڤێن خوە نقاندن و ماوەیەکی ل وێرێ ما.

ل پاکستانێ، بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو ب دروستاهی سەروسیمایێ مەریەمێ بینتە پێشچاڤێن خوە، هەروەکو کا چەوا هندەك جاران پەیڤەك ل سەر ئەزمانێ مرۆڤی بەس ناهێتە بیرا مروڤی، سیمایێ مەریەمێ ژی ب وی ڕەنگی بوو. لێ نوکە و ل ڤی جهی، ل بن مژیلانکێن خوە یێن ل سەر یەك، ب سانەهی مەریەم ل پێشچاڤێن خوە بەرجەستە دکر.

ئاورینێن وێ یێن گەش، ئەنیا وێ یا درێژ، پیستێ گەردەنا وێ یێ زڤر، گرنژینا وێ دبن لێڤێن وێ یێن گرتی ڤە.

ل ڤێرێ، لەیلا دشیا سەرێ خوە بدانیتە سەر کوشا مەریەمێ. دشیا هەست ب وێ بکەت دەمێ خوە بۆ پێشڤە و پاشڤە دلڤاندی و ئایەتێن قورئانا پیرۆز دخواندین. هەست ب لەرەلەرێن پەیڤان ل سەر لەشێ مەریەمێ و چوکێن وێ و گوهێن وێ دکر.

ژ نیشکەکێ ڤە، گیایێن زیانبەخش بەرزەبوون، دابێژی تشتەکی ئەو ژ ڕهان بەرەڤ خوارێ ڕاکێشان. هەموو چوونە ناڤێکدا هەتا ئەردێ کولبەی دوماهیك بەلگێ وان یێ هشکبووی داعیرای.

تورێن تەڤنپیرکان ب شێوەیەکێ بالکێش چوونە دناڤ یەك دا. چیلکێن هێلینکێ ژێکڤەبوون و وەریان و هێدی هێدی بەرەڤ دەرڤەی کولبی چوون. لیفکەکێ نەدیار نڤیسینا ڕۆسی ژ سەر دیواری ژێ بر.

ل دووڤ دا تەختێ شکەستی یێ ل سەر ئەردی چوو جهێ خوە و نوکە لەیلایێ دوو تەختێن نڤستنێ و مێزەکا داری و دوو کورسیك و سوپەك د کوژیەکێ ژوورێ ڤە دیتن. چەندین ڕەفانك ژی ل سەر دیواری بوون کو مەنجەل و ئامانێن ژ تەڤنێ دروستکری ل سەر هاتنە دانان. زێدەباری مەنقەلەکا ئاگری و قوریکەکێ چایێ یێ ڕەش و کوپ و کەفچکان.

ژ دوور ڤە، لەیلایێ گوهـ دەنگێ قد قدا مریشکان ژ دەرڤە و شڕ شڕا ئاڤا ڕووباری بوو.

هەردیسان هاتە پێشچاڤێن وێ کو مەریەما گەنج یا ل سەر کورسیکێ و ب ڕەخ مێزێ ڤە ڕوونشتی یە و ل بەر ڕۆناهیا فانۆسکێ یا یاریکەکێ بۆ خوە دروست دکەت و دبن لێڤکان ڕا یا سترانەکێ بۆ دبێژیت. سەروچاڤێن وێ د پاقژ و گەش بوون. پرچا وێ ژی یا شووشتی بوو کو ژ پشت ڤە هاتبوو شانەکرن و ددانێن وێ ژی هەموو د ساخلەمبوون.

لەیلایێ تەماشەی مەریەمێ دکر کو یا ب داڤێن دەرزی پرچەکێ بۆ بووکا خوە چێدکەت. د ماوەیێ چەند سالەکان دا، ئەڤ کچا نوکە ل بەر سینگێ وێ دێ بیتە ژنەکا پێگەهشتی کو ب تنێ هندەك داخوازیێن بچووك ژ ژیانێ هەنە. چ جاران نابیتە بارگرانی بۆ سەر ملێن کەسێن دی. هەموو گاڤان ڕێکێ نادەتە کەسێن دی هەست ب هندێ بکەن کو وێ خەم و نەخوشی و خەونێن هۆسا هەنە کو ڕەنگە کەسێن دی یاریێن خوە پێ بکەن.

ژنەکە وەکو وان بەرێن دناڤ ئاڤێ دایە یێن خوە ل بەر هەمموو تشتان دگرن بێی کو گازندان بکەن. خەم و نەخوشیێن ژیانێ سەنگینیا وێ نائینتە خوارێ و سەرێ وێ سپی ناکەن.

لەیلایێ دناڤ چاڤێن ڤێ کچێ دا تشتەك ددیت، تشتەکێ کوور دناڤ کووراتیا ناخێ وێ دا کو نە ڕەشید و نە تالێبان نەشێن بشکێنن. تشتەکێ هۆسایە د ڕەڤاتیا خوە دا وەکو بەری یە، تشتەکێ هۆسایە کو ل دوماهیێ دێ بیتە ئەگەرێ ژناڤبرنا خوە و ڕزگارکرنا لەیلایێ.

کچکێ سەرێ خوە بلند کر و بووکا خوە دانا سەر ئەردی و بۆ لەیلایێ کرە کەنی.

"لەیلا جان؟"

لەیلایێ ژ نیشکەکێ ڤە چاڤێن خوە ڤەکرن و دلێ وێ ڕەپ ڕەپ کر و لەشێ وێ بۆ پێشڤە چەمیا. چەکچەکیلە دترسیا و ژ ڤی سەرێ کولبەی بۆ یێ دا دهات و چوو. فرفرا دەنگێ پەرێن وێ وەکو دەنگێ هلدانا پەرێن پەرتووکەکێ بوو. پاشی ل دووڤ دا د پەنجەرکێ دا چوو ژ دەرڤە.

لەیلا ڕابووڤە و بەلگێن هشك یێن ماینە ب پەنترۆنێ وێ ڤە داقووتان. ژ کولبەی چوو دەرێ، دیت ڕۆناهیا ژ دەرڤە پیچەکێ یا هاتیە گوهۆڕین. بایەکێ ب هێز یێ ڕابووی و گژووگیایێ هشك دگەل خوە بلند کر و چەقێن لاواز یێن دار چناران دگەل خوە دئینان و دبرن.

بەری وی باخچەی بجهـ بهێلیت، بۆ دوماهیك جار تەماشەی وی کولبەی کرەڤە یێ مەریەمێ تێدا خوارن دخواری و دنڤستێ و خەون تێڤە ددیتین و بۆ دیتنا جەلیلی بێهنا خوە فرەهـ کری. دگەل هەر پێلەکا بای دا، دار چناران سیبەرا خوە یا نوو ل سەر دیوارێن دەرزی و سەلخی بەلاڤ دکر. چەکچەکیلەك ل سەر بانێ کولبەی دادا. دمێ خوە ل تشتەکی ددا و ڤێژڤێژەك دکر و پاشی دووبارە دفڕی.

– "ب خاترا تە مەریەم."

دگەل ڤێ خاترخواستنێ، لەیلا بێی کو گوهـ بدەتە ڕۆندکێن خوە، دناڤ گژوگیای ڕا بوری. وێ دیت هێشتا هەمزە ل سەر بەری یێ ڕوونشتیە و دەمێ چاڤێ وی ب لەیلایێ کەفتی، یەکسەر ڕابوو ژ پێرڤە.

پاشی وی گوتە لەیلایێ: "دا بچین. تشتەکێ ل دەڤ من، پێدڤیە ب دەمەڤ تە."

***

لەيلايێ دناڤ باخچەی دا و ل بەر دەرگەهێ چاڤەڕێی هەمزەی دكر. كورێ وی ژی ل بن دارا هژیرێ یێ ڕاوەستای بوو و مریشكەك كربوو د هەمبێزا خوە دا و تەماشەی وێ دكر. لەيلايێ دبن گوشەيا چاڤێن خوە ڤە دوو كەسێن دی ژی دیتن. پیرەژنەك و كچەكا گەنج كو دەرسوكەك ل سەری بوو د پەنجەرێ دا تەماشەی وێ دكرن.

دەرگەهێ مالێ ڤەبوو هەمزە هاتە ژ دەرڤە و قوديكەك يا د دەستێن وی دا و پاشی داڤ لەيلايێ.

"جەليلی بەری مرنا خوە ب دوو هەيڤان ئەڤە دابووڤ بابێ من و داخواز ژێ كربوو وەكو ئەمانەتەكی ل دەڤ خوە بپارێزیت و هەردەمێ مەریەم هاتە ڤێرێ بدەتە ڤێ. ئەڤ ئەمانەتە دوو سالان ما ل دەڤ بابێ من و بەری وەغەر بكەت وی ژی داڤ من و ئەز ڕاسپاردم كو بۆ مەریەمێ ب هەلگرم. بەلێ ئەو... هەروەكو توژی دزانی چ جاران نەهاتیە ڤێرێ."

لەيلايێ تەماشەی قوديكا شێوە هێلكەیی كر، ڕەنگێ وێ یێ زەیتینی بوو و هەردوو ڕەخێن وێ یێن ڕەنگ زەرێ ڤەبی وەكو قوديكا كەڤنا دناڤ ئاخێ ڕا نقووم بووی دچوو. هەردوو لايێن وێ پیچەكێ ژەنگێ یێن گرتین و دوو پنی ژی ل سەر ڕەخێن وێ بوون. لەيلايێ بزاڤ دكر قوديكێ ڤەكەت لێ ب قوفلەكێ یا گرتی بوو ژ بەر هندێ نەشیا ڤەكەت.

لەيلايێ پرسيار كر: "چ تێدايە؟"

هەمزەی كليلكا وێ داڤێ و گوت: "بابێ من چ جاران نەڤەكریە. من ب خوە ژی نەڤەكریە. لێ هۆسا دیارە ئەڤ چەندە حەزكرنا خودای بوو كو تو ڤەكەی."

***

دەمێ لەيلا ڤەگەریایە هوتێلێ، هێشتا تارق و زارۆك نەزڤڕیبوون. لەيلا ل سەر تەختی ڕوونشت و قوديك دانا سەر چوكێن خوە. هەروەكو كەسەكی د ناخێ وێ دا دگوتێ قوديكی نەڤەكە و ئەو تشتێ جەليلی بۆ مەریەمێ نڤیسای بلا وەكو نهێنیەكێ بمينيت.

لێ ل دوماهیێ هەستێ مايتێكرنێ ئەو هاندا قوديكێ ڤەكەت داكو بزانیت كا ئەو چ نهێنیە جەليلی بۆ كچا خوە كریە تێدا. وێ كليل كرە د قوفلێ دا و سێ چوار جارەكان بادان. ڤێ چەندێ ژی پیچەك وەخت ڤەكێشا چونكی قوديك یا كەڤن بوو ب خورتی ڤەبوو. ل دووڤ دا قوديك ڤەبوو.

وێ دیت سێ تشت یێن د ڤودیکێ دا، زەرفەك و کیسکەکێ پاتەی و کاسێتەکا ڤیدیوییێ.

لەیلا کاسێت دگەل خوە بر و چوو دەڤ مێزەیا هۆلا پێشوازیکرنێ ل هوتێلێ. سەرپەرشتیارێ هوتێلێ ئەوێ ل وێ ڕۆژا یەکێ ب خێرهاتنا وان کری گوتێ کو ل هوتێلا وان هەموویێ ب تنێ یەك ئامیرێ ڤیدوییێ لێ هەیە و ئەو ژی یێ د مەزنترین هۆلا هوتێلێ ڤە.

لێ نوکە ئەو هۆل یا ڤالاُیە و کەس لێ نینە و ئەو دشێت نوکە وێ دگەل خوە ببەتە وێرێ. وی زەلاُمی گەنجەکێ خودان سمبێلێن ڕەش و ب ڤات کو مژوولی ئاخفتنێ بوو ب تێلەفونێ، ل جهێ خوە دانا.

سەرپەرشتیارێ دانعەمر لەیلا دگەل خوە برە ڤاتێ دووێ و بەرەڤ دەرگەهەکی بر کو دکەفتە دوماهیا مەمەرێ درێژێ وی ڤاتی. وی دەرگەهـ ڤەکر و برە ژوور. لەیلایێ تێلەڤزیونەك د کوژیەکێ وێ هۆلێ ڤە دیت، ژبلی وی ئامیرەی چ تشتێ دی سەرنجا لەیلایێ نەڕاکێشا.

ل دووڤ دا لەیلایێ ئامیرێ تێلەڤزیون و ڤیدوییێ هەلکرنێ و کاسێت کرە د جهێ وێ دا و دەستێ خوە دانا سەر دوگمەیا کارکرنێ. بۆ ماوەیەکی شاشەیا تێلەڤزیونێ یا ڕەش بوو. لەیلایێ د دلێ خوە دا پرسیار کر ئەرێ ئەڤە چ زەحمەتە جەلیلی بری و کاسێتەکا ڤالاُ بۆ مەریەمێ ل پاش خوە هێلای. لێ پشتی هینگێ موزیکێ دەستپێکر و وێنەی ل سەر شاشێ دەستپێکر.

لەیلایێ بریێن خوە تێکبرن و بۆ ماوەیێ دوو خولەکان ل سەر یەك تەماشەی وێ ڤیدیوییێ کر و پاشی دەستێ خوە دانا سەر دوگمەیا ڕاوەستانێ و ل دووڤ دا دووبارە دوگمەیا کارکرنێ، لێ وێ دیت هەمان فلم یێ ل سەر کاسێتێ.

زەلاُمێ دانعەمر ب حێبەتی تەماشەی لەیلایێ دکر.

ئەو فلمێ ل سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ دەردکەفتی، فلمێ "پینۆکیۆ"یێ کومپانیا "والت دیزنی"بوو.

لەیلا تێنەگەهشت کا مەرەما جەلیلی ژ فلمی چ بوویە.

★★★

پشتی دەمژمێر شەشێ ئێڤاری، تارِق و زارۆك ڤەگەریانە هوتێلێ. عەزیزا بەرەڤ لەیلایێ ڤە هات و ئەو گوهارك نیشادان یێن تارِقی ژ بازارِی بۆ کرِین. جووتەکێ گوهارِکێن زیڤی بوو و ل سەر هەر کتەکێ ژی وێنەیێن پەلاتینکەکێ ل سەر بوو. زەلەمای ژی دولفینەك د دەستان دا بوو. دەمێ پوف دکریێ و دەستێ خوە ددانایە سەر دەڤێ وی، دەنگێ ڤێژیەکێ ژێ دهات.

تارِقی دەستێ خوە دانا سەر ملێ لەیلایێ و گوتێ: "تو یا چەوانی؟"

لەیلایێ بەرسڤ دا: "ئەز یا باشم، پاشی دێ بۆ تە بەحسێ هەموو تشتان کەم."

ئەو هەر چوار پێکڤە بەرەڤ کەبابخانەیەکا نێزیکی هوتێلێ چوون داکو شیڤێ ل وێرێ بخون. هەرچەندە جهەکێ بچووك بوو مێزە ب نایلونی هاتبوونە نخافتن، لێ دگەل هندێ ژی ڤەرەبالغ بوو دووکێل ل هەموو جهان بلند دبوو. کەبابێن وان یێن گوشتێ بەرخی یێ تەرِ بوون و نانێ وان ژی یێ گەرم بوو.

ل دووڤ دا پیچەکێ وان ل سەر وان جادەیان پیاسە کرن. تارِقی ل سەر جادەیەکێ، ئایسکریمەکا بادایی بۆ زارۆکان کری و ل سەر کورسیکەکا درێژ رِوونشتنە خوارێ و ئایسکریما خوە خوار. چیایێن ل پشت وان رِەنگەکێ ڤۆرمزی یێ سەر ب سۆری ڤە خویا دکرن. سەقایێ فێنك بوو و بێهنا دارێن ئەزر ل هەموو جهان دفرِی.

پشتی لەیلایێ تەماشەی کاسێتا ڤیدیویێ کری، زڤرِیبوو ژوورا خوە و زەرف ڤەکربوو نامە ژێ ئینابوو دەرێ کو ب حبرەکێ شین ل سەر کاغەزەکا زەر یا هێلدار هندەك پەیڤ ل سەر هاتبوونە نڤیسین.

دەقێ نامەیا جەلیلی بۆ کچا وی مەریەمێ ب ڤی رِەنگی بوو:

13 گولانا 1987ێ

*خوشتڤیا من مەریەم:*

هیڤیا من ئەوە دەمێ ئەڤ نامە دگەهیتە دەستێن تە، تو یا ب سەلامەت بی.

وەکو تو دزانی بەری هەیڤەکێ ئەز هاتبوومە دەڤ تە ل کابولێ داکو دگەل تە باخڤم. لێ تە نەدڤیا من ببینی. هەرچەندە ئەز ب وێ هیڤیێ هاتبووم کو تە ببینم، لێ ئەز لومەی تە ناکەم چونکی ئەگەر ئەز ژی ل جهێ تە بام دا هەمان رِەفتار کەم.

ئەڤە چەندین سالە ئەز یێ ژ حەز ژێکرنا تە بێ بەهرم و ژبەر ڤێ چەندێ ژی ئەز لومەی خوە ب تنێ دکەم. بەلێ ئەگەر تو نوکە ڤێ نامەیێ بخوینی، هۆسا دیارە تە ئەو نامە ژی یا خواندی ئەوا من ل بەر دەرگەهێ مالا تە بۆ تە دانای. هۆسا دیارە تە یا خاندی، ژبەر هندێ تو بۆ سەرەدانا مەلا فەیزوللاهی یا هاتی.

ئەز سوپاسیا تە دکەم کو تە ئاخفتنا من ل ئەردی نەدای. سوپاس بۆ تە کو تە ئەڤ دەرفەتە دایە من داکو هندەك تشتان بۆ تە بێژم.

ئەرێ ژ کیڤە دەست پێ بکەم؟

مەریەم جان، ل وی دەمێ کو مە بۆ دوماهیك جار پێکڤە ئاخفتی، بابێ تە تووشی خەم و نەخوشیەکا مەزن بوو. ئەفسۆنا زڕدایکا تە ل یەکەم ڕۆژا ڕاپەرینا سالا 1979ێ هاتە کوشتن. هەر ل هەمان ڕۆژ، گولەیەك بەر ب خوشکا تە نیلوڤەرێ کەفت و ئەو ژی کوشت. نوکە نیلوڤەرا بچووك یا ل پێشچاڤێن من کو ل سەر دەستان دڕاوەستیا داکو مێهڤان دەستخوشییێ لێ بکەن.

فەرهادێ برایێ تە ژی ل سالا 1980ێ گەهشتە ڕێزێن جیهادێ، لێ سوڤییەتیان ل سالا 1982ێ ل ژ دەرڤەی هێلمەندێ کوشت. ئەڤە ژ وێ ڕۆژێ وەرە من کەلەخێ وی نەدیتی یە. ئەز نزانم کا نوکە تە زارۆك هەنە یان نە. هەکە تە هەبن، ژ خودای مەزن دخوازم بۆ تە بهێلیت و تە ژ وان خەمان دوور بکەت یێن ئەز توشبوویمێ. هەتا نوکە ژی ئەز خەونان پێڤە دبینم. هەتا نوکە ژی زارۆکێن من یێن مری دهێنە د خەونا من دا.

ئەز خەونان ب تەڤە ژی دبینم، مەریەم جان. ئەز گەلەك بیریا تە دکەم، بیریا دەنگێ تە و پێکەنینا تە دکەم. بیریا وان دەمان دکەم وەختێ من کتێبەك بۆ تە دخواندی و مە پێکڤە ماسی نێچیر دکرن. ئەرێ بیرا تە ل وان وەختان دهێت دەمێ مە پێکڤە ماسی نێچیر دکرین؟

مەریەم جان، تو کچەکا باش بووی. دەمێ تو دهێیە سەر هزرا من، هەست ب شەرم و پەشیمانیێ دکەم. مەریەم جان، ئەز د ئوقیانوسەکێ شەرم و پەشیمانیێ دا نقووم دبم. یا بوویە کول د دلێ من کو وێ ڕۆژێ هاتمە هیراتێ و من تو نەدیتی. ئەز گەلەك یێ پەشیمانم کو ل وێ ڕۆژێ من دەرگەهێ خوە بۆ تە نەڤەکری.

ئەز یێ پەشیمانم کو من وەکو کچێن خوە یێن دی تەماشەی تە نەدکر و ڕەفتار دگەل تە نەکر و نەهێلای تو دگەل من بژی. یێ پەشیمانم کو بۆ وی ماوەی هەموویێ من هێلا تو ل وی جهێ کاڤلێ و نەخوش بژی.

ئەرێ ژ بەر چ؟ ئەرێ ئەز ژ جهێ خوە دترسیام؟ ژ ناڤودەنگیا خوە یا باش وەکو خەلك هزر دکەن؟ پشتی من ئەو تشت هەموو ژ دەستداین، ئەو ئەو تشتێن نەفرەتی یێن من د ڤی شەڕی دا دیتین. نوکە ژ نوو من زانی ئەو تشتێن بچووك چەند ل دەڤ من د بێ بهابوون، لێ نوکە گەلەك درەنگە. ڕەنگە ئەڤ چەندە سزایەك بیت بۆ مرۆڤێن دلڕەق. دەمێ د هەموو تشتان دگەهن، ل وی دەمی شول یا تێکچووی و چ ژ دەستێ وان ناهێت.

نوکە تشتێ یەکانە یێ ژ دەستێن من دهێت ئەوە کو بێژمە تە، ژ ڕاستا تو کچەکا باش بووی. ئەز هەردەم ژ هەژی تە نەبووم، مەریەم جان. نوکە ب تنێ ئەڤ چەندە ژ دەستێ من دهێت. داخوازا لێبورینێ ژ تە دکەم. ل من ببورە، مەریەم جان. ل من ببورە. ببورە، ببورە.

نوکە ئەز ئەو زەلامێ زەنگینێ جاران نینم. شیوعیان دەستێ خوە دانا سەر پتریا مال و ملك و فرۆشگەهێن من. لێ ئەڤ چەندە سکالایەکا بێ ڕامانە ئەز دکەم. چونکی هێشتا خودای مەزن، ژبەر هندەك ئەگەڕان کو ئەز ب خوە ژی نزانم کا ئەو ئەگەر چنە، هێشتا یێ دگەل من دلوڤانە پتر ژ دگەل گەلەك کەسێن دی.

دەمێ ئەز ژ کابولێ زڤڕیم، من کاروبارێن خوە ڕێکخستن و شیام وان زەڤیێن بچووك بفرۆشم یێن بۆ من ماین. پشکا میراتێ تە ژی دێ دناڤ ڤی کیسکی دا دانم. هەرچەندە سامانەکێ مەزن نینە، بەلێ پا تشتەکە دێ جهەکی گریت. بەلێ تشتەکێ باشە. وەکو تو دبینی ژی من پارە بۆ تە یێ کریە دولار، من دیت هۆسا باشترە، چونکی ژبلی خودای کەس چارەنڤیسێ پارەیێ ڤێ وەلاتێ نەجێگیر نزانیت.

هیڤی دکەم هۆسا تێنەگەهی کو ب ڤی پارەی من دڤێت لێبورینا تە بکڕم. هیڤیدارم تە هند باوەری ب من هەبیت کو ئەز دزانم لێبورین هند تشتەکێ ب سانەهی نینە ب پارەی بهێتە کڕین و فروتن. نەخێر، قەت تشتەکێ هۆسا نینە.

ب تنێ مەرەما من ئەوە، هەرچەندە درەنگە ژی، تشتەکی بدەمە تە کو مافێ تەیە. هندی ئەز یێ ساخ، ئەز بابەکێ باش نەبووم بۆ تە. لێ بەلکی مرنا من ڕەنگە ئەز ببمە بابەکێ هۆسا.

ئاخ، مرن، من نەڤێت سەرێ تە ب هەموو هووردەکارییێن ئێشا خوە گێژ بکەم، لێ نوکە مرن یا ل بەر دەرگەهێ مالا من، نوشدار دبێژن دلێ من گەلەك یێ لاواز بووی و ئێدی تاقەتا ژیانێ نینە.

ئەز دبێژم مرن ژ هەژی کەسەکێ وەکو من یێ لاوازە.

مەریەم جان.

ئەز دوێرم، ئەز دوێرم دەلیڤەیێ ب دەمە خوە کو هیڤیا هندێ بخوازم کو پشتی تو ڤێ نامەیێ دخوینی، تو دگەل من گەلەك یا باشتر بی ژ هندێ وەك ئەز دگەل تە یێ باش. بەلکو دلێ تە دلوڤانی تێدا هەبیت و بهێیە سەرەدانا بابێ خوە.

جارەکا دی بهێی و دەرگەهێ مالا بابێ خوە بقووتی و وێ دەرفەتێ بدەیە من ئەڤ جارە دەرگەهی بۆ تە ڤەکەم و بخێرهاتنا تە بکەم و تە هەمبێز بکەم، کچا من، ئەو تشتێ کو پێدڤی بوو چەندین سالێن بەری نوکە من کربایە.

ئەڤ چەندە ئومێدەکا لاوازە، وەك لاوازیا دلێ من. لێ دگەل هندێ ژی دێ هەر چاڤێ من ل هاتنا تە بیت. چاڤێن من، گوهێن من، چاڤەڕێی دەرگەهـ قووتانا تەنە. ئەز چ جاران وێ هیڤیێ ژ دەست نادەم.

کچا من، هیڤیا من ئەوە خودای مەزن ژیەکێ درێژ و ژیانەکا پڕی بەرەکەت بکەتە بەهرا تە. خودا کومەکا زارۆکێن جوان و ساخلەم بکەتە ڕزقێ تە. خودا وێ بەختەوەری و ئارامی و ڕێزگرتنێ بدەتە تە یا من نەدایە تە. هیڤیا من ئەوە یا ساخ و ب سلامەت بی. خودا دگەل تە بیت.

بابێ تە یێ نە ژ هەژی

جەلیل

ل وێ شەڤێ، پشتی ئەو ڤەگەریاینە هوتێلێ و زارۆکان یاری کرین و نڤستین. لەیلایێ بەحسێ نامەیێ بۆ تارِقی کر و ئەو پارە نیشادان کو د کیسکەکێ پاتەی دابوون. دەمێ وێ دەست ب گرییێ کری، تارِقی چاڤێن وێ پاقژ کرن و هەمبێز کر.

# 51

## نیسان 2003

هشکەسالی ب دوماهی هات. ل ڤێ زڤستانا بووری بەفر هەتا سەرچووکان باری بوو ڕۆژ نینە باران ژی نەباریت. سەر و ژ نوو ئاڤ دناڤ ڕووبارێ کابولێ دا هەڕکی ڤە و لەهیێن بارانێن بهارێ باژێرێ تایتانیك ب یەکجاری ڕامالی.

جادە هەموو یێن بووینە هەڕی و تەقن. پێلاڤ و. ترۆمبێل یێن ئاسێ دبن و گوهدرێژ ب خۆرتی دشێن عەرەبانەیێن ب پشتا وان ڤە گرێدای بڕاکێشن کو دناڤ لەهیێن بارانێن ب تەقن. سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ، تو کەسێ نابینی گازندەیان بکەت یان خەمان سەرا باژێرێ تایتانیك بخوت. خەلکی دگوت مە دڤێت سەر و ژ نوو کابول شین بیتەڤە.

دوهی لەیلایێ تەماشەی زارۆکێن خوە دکر دەمێ ل بن ئاسمانەکێ ڕەنگ گەور و ل بەر بارانەکا بوش، ژ ڤێ چالێ خوە دهاڤێتە ناڤ چالا دی. وێ د پەنجەرا ژوورا لێنانگەهێ یا وی خانیێ دوو ژوور و بچووك ڤە تەماشەی وان دکر یێ کو وان ل دەڤەرا دەهمازانگ ب کرێ گرتی.

دارەکا هنارێ و ڕێزەکا گول نەسرینان دناڤ حەوشا وی دا بوون. تارقی دیوارێن وی سەخبێرکرن و هێسکەك و جولانکەك بۆ زارۆکان و جهەکێ بچووك بۆ بزنا نوو یا زەلەمای دناڤ حەوشێ دا دروستکرن.

لەیلایێ تەماشەی وان چپکێن بارانێ دکر یێن ب سەر گوهـ و ئەنیا زەلەمای دا دتەحسین و دهاتینە خوارێ. وی ژی دڤیا سەرێ خوە وەکو یێ تارقی سفر بکەت. نوکە، تارق هەر شەڤ دوعایا بابالووی بۆ دخوینیت. بارانێ پرچا عەزیزایێ ژی تەڕکربوو، ژبەر

هندێ دەمێ سەرێ خوە بلند دکری، چیکێن ئاڤا دناڤ پرچا وێ دا ب ناڤچاڤێن زەلەمای دکەفتن.

نوکە ژیێ زەلەمای نێزیکی شەش سالانە و یێ عەزیزایێ ژی نێزیکی دەھـ سالانە. ل حەفتیا بوری، وان جەژنا بوونا عەزیزایێ کر و هەموو پێکڤە چووبوونە سینەمایا پارکێ کو ڤێ جارێ ب ئاشکەرای و بێ ترس فلمێ تایتانیك بو خەلکی نمایش دکر.

★★★

پشتی لەیلایێ خوارن بۆ زارۆکێن خوە بەرهەڤ کری و کریە د زەرفەکی دا، گوتێ: "گەلی زارۆکان وەرن، دا گیرو نەبین."

نوکە دەمژمێر هەشتێ سپێدێ یە. لەیلا هەر شەڤ دەمژمێر پێنجی سپێدێ ژ خەو هشیار دبیت و وەکو هەرگاڤ عەزیزایێ ژی بۆ نڤێژا سپێدێ ژخەو هشیار دکەت. لەیلا دزانیت کو کرنا نڤێژان ب تایبەت یا سپێدێ ل دەڤ عەزیزایێ، هێمایەکە مەریەمێ دئینتە بیرا وێ. شێوازەکە ژ بۆ هندێ مەرەیەم هەموو گاڤان ل نێزیکی وێ بیت، هەتا دەم ب سەر ڤە دچیت و هێدی هێدی وێ ژبیر دکەت هەروەکو کا چەوا مرۆڤ گیایەکی ژ ڕهان هەلدکێشیت، ئاها هۆسا دەم ژی دێ ڕۆژەکێ مەریەمێ ژ بیرا وێ بەت.

لەیلا پشتی نڤێژا سپێدێ، دووبارە چووبوو دناڤ جهێن خوە دا ڤە. دەمێ تارق ژ مال دەرکەفتی، ئەو هێشتا یا نفستی بوو. وێ نەدزانی کا چ وەخت تارق ژ مال دەرکەفت بوو، ئەرێ کا بەری بچیت ژی ماچەك ل ڕوویێ وێ دابوو یان نە؟

نوکە تارق ل ڕێکخراوەکا نە حکومی یا فرەنسی کاردکەت کو کارێ وان ئەوە ئەو کەسێن ژبەر مینان، پێن خوە ژدەستدابن، پێن دەستکرد بۆ دروست دکەن.

زەلەمای ل دووڤ عەزیزایێ ڤە بوو هەردوو بەرەڤ لێنانگەهێ دهاتن.

"ئەرێ هەوە هەردووان دەفتەر هەنە. پێنۆس؟ کتێب؟"

عەزیزایێ چانتا خوە یا قوتابخانەیێ ب دەستی گرت و گوت ئەو تشت هەموو یێن د چانتەیێ وێ دا، لەیلایێ تیبینیا هندێ کر کو ئالزیانا ئەزمانێ وێ پیچەکێ باشترە ژ بەرێ.

"باشە یا دا بچین."

لەیلایێ زارۆکێن خوە بەرەڤ دەرڤە برن و پاشی وێ دەرگەهـ دائێخست. بایێ تەزی یێ سپێدەهیان ب ناڤچاڤێن وان دکەفت. ئەڤرۆکە دنیا ساهی بوو و باران نەدباری، لەیلایێ سەحکرێ چ پنییێن عەوران ل ئەسمانی نینن.

هەرسێکان دەستێن هەڤدوو گرتبوون و بەرەڤ وێستگەها پاسان دچوون. جادە یا پڕی قەرەبالغ بوو: عەرەبانێن ب دووڤ گوهدرێژان ڤە، تەکسی، لورییێن UN، پاس، ترۆمبێلێن جێپ یێن ئیساف ISAF ب بەردەوامی دهاتن و چوون.

خودانێن دکانان ب چاڤێن نیڤ خەوگرتی ڤە یێ خەڤەنکێن دکانێن خوە بلند دکەن ئەوێن کو شڤێدی درەنگ گرتین. فروشیارێن گەرۆك ژی سندوقێن علك و پسکێت و جگارەیان ب ملێن خوە ڤە کرینە و دەست ب شولی دکەن. ژنێن بێ هەڤژین ژی هەر ژ نوکە هەر یەك ل کوژیەکی یا ڕوونشتی و داخواز ژ ڕێڤینگان دکر پارەیەکی بدەنێ یان خێرەکێ دگەل بکەن.

لەیلایێ ئەڤ ڤەگەریانا خوە بۆ کابولێ گەلەك ب مەندەهوشی ددیت. باژێر ل پێشچاڤێن وێ یێ هاتیە گوهۆڕین. وێ ڕۆژانە خەلك ددیت یێ داروبار و گولان دچینن، خانییێن خوە یێن کەڤن بۆیاغ دکرن، بلوك و کەلوپەلێن ئاڤاکرنێ بۆ خانییێن خوە یێن نیڤ هەڕفتی دئینان و سەخبیر دکرن، بیرێن ئاڤێ و زێرابێن دەستئاڤان دکۆلان.

لەیلایێ ل سەر دەرازینك و پەنجەران، ل جهێ مۆشەکێن موجاهدینان، گولدانکێن گولێن ڕەنگاو ڕەنگ ددیتن. کابولی ل شوونا ناڤێ گولدانك دبێژنێ "گولمۆشەك".

بەری هینگێ ب دەمەکی، تاڕقی لەیلا و زارۆك بربوونە باخچەیێن "بابوور" کو ل ڤێ دوماهیێ دووبارە هاتبوو سەخبێریکرن. پشتی چەندین سالێن درێژ، بۆ یەکەم جار لەیلایێ گوهـ ل دەنگێ موزیك و سترانان ل سەر جادەیان بوو. دەنگێ ئامیرێن ڕەباب و تەبلێ و گیتار و ئەکوردیون و تەمبور و سترانێن کەڤن یێن "ئەحمەد زاهیر"ی بوون.

لەیلایێ هیڤی دخواست نوکە دایك و بابێن وێ ژی د ساخبانە و ئەڤ هەموو گوهۆڕینە ب چاڤێن خوە دیتبانە. لێ هەروەکو نامەیا جەلیلی، توبەکرنا کابولێ ژی درەنگ گەهشت.

دەمێ لەیلایێ و زارۆکان دڤیای ژ جادەیێ دەرباز بن داکو بگەهنە وێستگەها پاسەیان، ژ نیشکەکێ ڤە لەندگروزەکا جام ڕەش بلەزاتیەکا زێدە ب ڕەخ وان ڤە بوری و هندی تەڤن و هەڕیا سەر جادەیێ ژ تائیرێن وێ پەشی و کەفتە سەر جلوبەرگێن زارۆکان.

لەیلایێ بلەز دەستێن زارۆکێن خوە کێشان و بۆ پاشڤە زڤڕاندن. تڕۆمبێلا لەندگروز بەرەڤ لایێ خوارێ یێ جادەیێ چو دوو جاران هۆڕن ل وان ڤەدان و پاشی ب هێز شکاندنە د کولانەکا لایێ چەپێ دا.

لەیلا ب دیتنا وی دیمەنی گەلەك تێکچوو. پێدڤی بوو ڕێك نەدابا وان چەکدارێن بەری وەلات وێران کری، نوکە دووبارە ب ئازادی بزڤڕنە کابولێ ڤە. چێنەدبوو ئەو کەسێن بووینە ئەگەرێ کوشتنا دایك و بابێن وێ، نوکە ل کوچك و ڤلەیێن گرانبها ڤە بژین و بووینە بەرپرس و وەزیر و جێگرێن وەزیران. ل شوونا هندێ بهێنە سزادان، نوکە ب تڕۆمبێلێن گولەنەبڕ ب ئازادی و سەربلندی ڤە دناڤ جادەیێن باژێری دا دهێن و چن.

لێ لەیلایێ بڕیار یا دای خوە ل بەر هەموو خەم و نەخوشیان بگریت و گوهێ خوە نەدەتە ڤان کەسان و ل بەر کەسێ نەدانیت. مەریەمێ ژی ئەڤ چەندە ژ وێ دڤیا. ب گرنژینەکا پاقژ و زیرەکانە د دلێ خوە دا دگوت: "لەیلا جان، ئەرێ مفایێ خوە بدەستڤەبەردانێ چیە؟"

ب ڤی ئاوای لەیلایێ قەناعەت بۆ خوە چێکربوو کو دڤێت بەردەوامیێ بدەتە کاروانێ خوە. ئەڤ چەندە ژی هەر ژبەر خوە و تارقی و زارۆکان، هەر ژ بەر مەریەمێ ژی کو بەردەوام د خەونان دا سەرەدانا وێ دکر و چ جاران ژێ دوور نەدکەفت.

لەیلایێ بەردەوامی دا ڕێکا خوە چونکی وێ دزانی ل دوماهیێ ئەڤە کارێ یەکانەیە یێ ئەو دشێت ئەنجام بدەت. هەلبەت ژ مێژە ژی ئەڤ کارە هیڤیا وێ بوو، ئەو ژی کو ببیتە ماموستا و وانەیان بدەتە قوتابیان.

***

زەمان ل سەر تەختێ پێشیێ یێ ڕوونشتی بوو و چوکێن خوە دانابوونە بن پێ خوە و تەپا باسکتبوولێ ل ئەردی ددا و کومەکا زارۆکان فێردکر کو هەموویان جلوبەرگێن وەکهەڤ کربوونە بەر خوە و ب شێوێ بازنەیێ ل نیڤا گۆڕەپانێ دا ڕوونشتبوون.

دەمێ زەمانی لەیلا دیتی، تەپە دانا بن ملێ خوە و دەستێ خوە بۆ بلندکر. پشتی کو وی تشتەك گوتیە زارۆکان، هەموویان دەستێن خوە بلند دکرن و گوت: "سلاڤ، ماموستا."

لەیلایێ ژی دەستێ خوە بۆ بلند کر و بەرسڤا سلاڤان وان دا.

نوکە ل باخچەیێ یاریان یێ ئێتیمخانێ، ڕێزەکا شتێلێن دارێن سێڤان ل بەر وی دیواری هاتینە چاندن یێ بەری وی دکەفتە ڕۆژهەلاتی. لەیلایێ هزرا خوە د هندێ دا دکر کو ب ڕەخ دیوارێ خوارێ ژی ڤە شتلێن هندەك دارێن دی بچینن. هەردیسان جولانکەکا نوو ئاسنەکێ خوە پێڤەگرێدانێ و ئامیرەکێ جمناتیسکێ دناڤ باخچەی دا هەبوون.

لەیلا دناڤ دەرگەهێ پەردەدار دا چوو د ژوور ڤە.

نوکە، هەموو دیوارێن دەرڤە و ناڤ ئێتیمخانێ هاتینە بۆیاغکرن. تارقی و زەمانی پێکڤە هەموو ئەو دەرز و کەندێن سەربانی گرتن یێن ئاڤ ژێ دهاتیە خوارێ. هەردیسان وان دیوار ژی سەخبێرکرن و پەنجەرکێن وان گوهۆڕین و فەرشێن نوو ل وان ژووران ڕائێخستن یێن زارۆك تێڤە دنڤن.

ل زڤستانا بوری، لەیلایێ بۆ ژوورا نڤستنا زارۆکان، تەخت و بالیفك و بەتەنیکێن هریێ کڕیبوون و سۆپەکا ئاگری ژی بۆ کربوو تێڤە.

ئەنیس، کو یەکە ژ ڕۆژنامەیێن ناڤدار ل کابولێ، ل هەیڤا بووری د هەژمارەیەکا خوە دا دەنگوباسێ نووژەنکرنا ئێتیمخانێ بەلاڤ کربوو و دگەل وێنەیەکێ زەمان و تارق و لەیلایێ و کاربەدەستەکی کو دگەل کومەکان زارۆکان پێکڤە ڕاوەستیابوون.

دەمێ لەیلایێ ڕۆژنامە دیتی، ڕۆژێن بەرێ یێن دگەل گێتی و حەسینایێ هاتنە بیرا وێ. هەردیسان ئاخفتنا حەسینایێ هاتە بیرێ دەمێ گوتیێ:

*" دەمێ ژیێ مە دبیتە بیست سال، من و گێتیێ دێ چوار پێنج زارۆك هەبن، لێ تو لەیلا، تو بۆ کچێن وەکو مە دێ بیە جهێ شانازیێ. هەردیسان دێ ب کێر خوە ژی هێی و بیە تشتەك. یا ئەز دزانم دێ ڕۆژەکێ ڕۆژنامەیەکێ ب دەستێ خوە گرم و وێنەیێ تە ل بەرپەرێ یەکێ بینم."*

هەرچەندە وێنەیێ لەیلایێ ل لاپەرێ یەکێ بەلاڤ نەببوو، لێ پێشبینیا حەسینایێ ڕاست دەرکەفت.

لەیلا د مەمەری ڕا بوری، ئەڤە هەمان ئەو مەمەر بوو یێ ئەو بەری دوو سالان تێرا بورین دەمێ چووین عەزیزاییێ تەسلیمی زەمانی بکەن. نوکە ژی هێشتا یا ل بیرا لەیلاییێ کا چەوا ژ نەچاری تبلێن عەزیزاییێ ئەوێن ب هێز هچکێ مەریەمێ گڤاشتی، ژ وێ کرن. هێشتا یا ل بیرا وێ کا چەوا ل دەمێ زڤڕینێ ل ڤی مەمەری کرە غارێ داکو ل سەر خوە زالێ بیت و نەکەتە ڤێژی.

نوکە دیوارێن مەمەری ب پوستەرێن مەزن یێن وێنەیێن دەیناسۆر و کەسایەتییێن کارتۆنی و بوودایێن باژێرێ بامیان و هندەك کارێن دەستی یێن زارۆکان هاتینە نخافتن. پتریا ئەو وینەیێن زارۆکان کێشاین، وێنەیێ وان تۆپ و تانکان بوون یێن خانی و مالێن خەلکی وێران دکرین. یان ژی وێنەیێ چەکدارەکی بوو یێ کو کلاشینکوفەکا AK-47 هەلگرتی، یان ژی وێنەیێن کەمپێن پەنابەران و دیمەنێن شەڕی بوو.

دەمێ لەیلا ژ مەمەری بوری، وێ دیت قوتابی ژ دەرڤەی پولێ یێ ل هیڤیا وێ. هندەکان لحافە یێن کرینە ستوییێن خوە و هندەکێن دی سەرێن خوە یێن سفر کرین و کولاڤێن ب شەوقە یێن کرینە سەرێن خوە، ب لەشێن خوە یێن بچووك و شوخ و شەنگ و جوان ڤە ب خێرهاتنا لەیلاییێ دکرن.

دەمێ چاڤێن زارۆکان ب لەیلاییێ کەفتین، هەموویان بەرەڤ وێ ڤە کرە غارێ و دەستێن وێ گرتن. پێلەکا مەزن یا بخێرهاتنان ب دەنگێن بلند هاتە گوهێن وێ. هەر یەکی ژ لایێ خوە ڤە هەڤالێ خوە دهاڤێت داکو ئەو دەستێ لەیلاییێ بگریت. هندەکان ب ناڤێ "دادێ" گازی دکرێ، لەیلاییێ ژی چ لاریبوون ل سەر ڤی ناڤی نەبوو.

ل ڤێ سپێدێ دێ لەیلا پێدڤی ب هندێ بیت وان ئارام بکەت و ل دووڤ دا وان نەچار بکەت ب ڕێز ڕاوەستن و بچنە د پولا خوە ڤە. تارڤی و زەمانی ئەو دیوار هەرفاند بوو یێ دناڤبەرا هەردوو ژووران دا، ب ڤی ڕەنگی پولەکا مەزن ژێ پەیدابببوو جهێ هەموو زارۆکان تێڤە دکر.

ئەردێ پولێ هێشتا یێ بێ سەروبەرە و هندەك کاشیێن وی نەماینە لێ نوکە وان یێن ب ڤێری پڕ کرین. تارڤی سوز یا دای وان ڤالاهیان ژی کاشی بکەت و ل دووڤ دا بنێ ژووری ب مەحفیرەکێ بنخێڤیت.

تابلویەکێ لاکێشەیی ل سەر دیوارێ ل سەر دەرگەهێ پولێ ڤە هاتبوو هەلاویستن کو زەمانی خیز کربوو سەر و ب ڕەنگێ سپی بۆیاغ کربوو. زەمانی ب فرچەی چوار دێرێن شعرەکێ ل سەر نڤیسابوون.

لەیلایێ دزانی ئەڤ چەندە بەرسڤەکە بۆ وان کەسان یێن گازندەیان دکەن کو ئەو پارەیێ بڕیار بوو پێشکێشی ئەڤغانستانێ بکەن ناگەهیت و کاروانێ ئاڤەدانکرنێ گەلەك ب هێواشی ب ڕێڤە دچوو. گەندەلیا دارایی هەبوو، هێزێن تالێبان مژوولی هندێ بوون سەر و ژ نوو ڕێزێن خوە ڕێکبێخن بۆ تولڤەکرنێ بڤەگەرنەڤە دەمێ وەلاتێن جیهانێ دووبارە ئەڤغانستانێ پشتگوهـ دهاڤێژن.

زەمانی ئەو هەر چوار دێر ژ غەزەلەکا حافزی وەرگرتبوون کو لەیلایێ گەلەك حەز ژێ دکر.

*یوسف دێ زڤرِیتە ڤە کەنعانێ، خەمان نەخو*

*کولبەیێ خەمان ڕۆژەکێ دێ بیتە گولستان، خەمان نەخو*

*ئەی دل، ئەی لەهی هات بۆ تێبرنا هەموو ڤان گیانداران*

*نوح دێ بیتە ڕێبەرێ تە د چاڤێن تۆفانێ دا، خەمان نەخو**

لەیلا ل بن تابلوییێ بچووك ڕا بووری و چوو د پولێ ڤە. زارۆك ڕوونشتنە خوارێ و پەرتووکێن خوە ڤەکرن و دگەل هەڤدوو دئاخفتن. عەزیزاییێ دگەل کچەکا ب ڕەخ خوە ڤە دئاخفت. فرۆکەیەکا کاغەزی ژ ڤی سەرێ پولێ هەتا سەرێ دی یێ پولێ بلند دبوو، زارۆکەکی بزاڤ دکر بگریت.

دەمێ لەیلایێ پەرتووکێن خوە دانایەنە سەر مێزێ، گوت: "گەلی زارۆکان، نوکە پەرتووکا خوە یا زمانێ فارسییێ ڤەکەن."

---

* دەقێ رەسەن یێ هوزانێ ب ڤی رەنگی یە:

یوسف گمگشته باز اید به کنعان، غم مخور

کلبه، احزان شود روزی گلستان، غم مخور

ای دل ار سیل فنا بنیاد هستی برکند،

چون تو را نوح است کشتیبان، ز توفان غم مخور

دگەل هاتنا دەنگێ خشخا ڤەدانا پەڕێن پەرتووکان، لەیلا بەرەڤ پەنجەرا ژوورێ یا بێ پەردە چوو. د گۆڕەپانا یاریکرنێ دا وێ زارۆکێن کور دیتن کو یێن بۆ ڕاهێنانێن وەرزشی ڕاوەستیان. ل سەر وان دا ژی، ل پشت چیای ها وەختە دێ ڕۆژ سەرێ خوە بلند کەت. ل دووڤ دا تیشکێن ڕۆژێ کەفتنە سەر ستونێن یاریا باسکتبولێ. فیرکەك ل ستۆیێ زەمانی بوو بەرچاڤکەکا نوو ل بەر چاڤێن وی بوو.

لەیلایێ دەستێن خوە دانانە سەر پەنجەرکێن گەرم و چاڤێن خوە گرتن و تیرۆژکێن ڕۆژێ کەفتنە سەر ئەنی و بری و دێمێ وێ هەموویێ.

دەمێ ژ نوو ئەو زڤڕیە کابولێ، بێهنا وێ گەلەك تەنگ بوو و بێزار بوو چونکی نەدزانی کا تالێبان مەریەم ل کیڤە ڤەشارتیە. هیڤیا وێ ئەو بوو سەرەدانا گۆڕێ مەریەمێ بکەت، بۆ ماوەیەکی ب تنێ ل سەر گۆڕێ وێ بڕاوەستیت و دەستکەکێ گولا ل سەر کێلیا وێ بدانیت.

لێ نوکە ئەو یا د هندێ گەهشتی کو دیتنا گۆڕێ وێ تشتەکێ هند گرنگ نینە. مەریەم یا ژ وێ دوور نینە، بەلکو نوکە گیانێ وێ یێ ل ڤێرێ، دناڤ ڤان دیواران دا یێن وێنە ل سەر هاتینە کێشان. دناڤ وان شتلێن داران دا یێن وان چاندین، دناڤ وان بەتەنیکان دا یێن زارۆکان گەرم دکەن، دناڤ وان بالیفك و پێنۆس و پەرتووکان دا، دناڤ گڕنژین و کەنیا زارۆکان دا، دناڤ وان شعران یێن عەزیزا دخوینیت، د وان نڤێژ و دوعایێن ب شەڤێ دکەت. لێ ژ ڤان هەموویان پتر، ئەو یا دناڤ دلێ لەیلایێ دا. ل وی جهی یێ هزار ڕۆژێن گەش تێدا دبرسقن.

لەیلایێ هەستپێکر کەسەکێ گازی وێ کر، دەمێ سەرێ خوە بلند کری، دیت عەزیزایە.

"دادێ، تو یا باشی؟"

ئەو ژوور یا بێدەنگ بوو، زارۆکان تەماشەی وێ دکر.

لەیلایێ دڤیا بەرسڤا وێ بدەت، لێ ژ نیشکەکێ ڤە بێهنا وێ تەنگ بوو دەستێن وێ خاڤ بوون. دەستێ خوە دانا سەر وی جهی یێ بەری نوکە تێدا هەس ب لڤینەکێ کری. بێهنا خوە فرەهـ دکر لێ هەست ب چ لڤینێن دی نەکر.

"دادێ؟"

لەیلایێ ب گرنژین ڤە گوت: "بەلێ کچا من، ئەز یا باشم. ئەز گەلەك یا باشم."

دەمێ لەیلا بەرەڤ مێزا خوە ڤە دچووی ئەوا ل هەمبەری زارۆکان هاتیە دانان، لەیلایێ هزرا خوە د دوهی ئێڤاری دا دکر کو وان یاری ل سەر دیتنا ناڤەکی بۆ زارۆکێ دناڤ زکێ خوە دا دکرن. هەر ژ وی دەمێ لەیلایێ دەنگوباسێ دووگیانبوونا خوە گەهاندیە تارقی، ئێدی ئەڤ چەندە ببوو یاریا وان یا شەڤ. هەر یەك دهات و چوو ناڤەك دئینا و هێجەتەك بۆ وی ناڤی دگرت.

تارق حەز ژ ناڤێ "محەمەد" دکەت. زەلەمای ژی کو ل ڤێ دوماهیێ تەماشەی فلمێ سوپەرمانی کربوو، حێبەتی دما کا بوچی ناڤێ کەسەکێ ئەڤغانی "کلارك" بیت. عەزیزایێ ژی پێداگیری ل سەر هندێ دکر کو ناڤێ وی بکەنە "ئەمان". لەیلا ب خوە ژی حەز ژ ناڤێ "عومەر" دکەت.

لێ ئەڤ یاریە ب تنێ ل دور ناڤێ کوران بوو، چونکی ئەگەر زارۆك کچ بایە، ئەڤە ژ مێژە لەیلایێ ناڤەك بۆ دانای.

دوماهیك.

# پرۆفایلێ نڤیسەری

## دیان جەمیل سالح

- ل باژێرێ دهۆکێ هاتیە سەر دونیایێ
- دەرچوویێ کۆلیژا زانست پشکا بایۆلۆژی ل زانکۆیا دهۆکێ سالا 2010
- هەلگرێ باوەرنامەیا ماستەرێ یە د زانستێ بۆماوەزانیا خانەیی دا ل سالا 2015
- مامۆستایە ل زانکۆیا دهۆك، کۆلیژا پزیشکی هەر ژ سالا 2012
- بریاردەرێ پشکا دەرمانسازی یە ل پەیمانگەها ئارارات یا تایبەت.
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا بایۆلۆژییێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا ڕۆژنامەڤانێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- سەرپەرشتێ بەرپەڕێن زانستی و ساخلەمی بوویە ل چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان تایبەت گوڤارێن کوردزووم و پێرومەگەزین.
- کارکریە د کار و چالاکیێن چەندین ڕێکخراوێن نەحکومی دا ب تایبەت PIN.
- پشکداربوویە د چەندین کۆنفرانس و سمینار و وۆرك شۆپێن زانستی و ڕەوشەنبیری و ئەدەبی دا کریە ژ نافخۆ و دەرڤەی هەرێمێ، هندەك ژ وان ژی ژ پێشکێشکرنا نڤیسەری ب خوە بووینە
- ڕابوویە ب ڕێڤەبرنا چەندین پۆستێن ڕۆژنامەڤانی مینا "ڕێڤەبەرێ نڤیسینێ و دەستەکا نڤیسەران ل گوڤارێن کوردزووم و پیرۆمەگەزین).
- بۆ ماوەیەکی ب وەکالەت بوویە ڕێڤەبەرێ ڕێڤەبەریا تەندروستی و سەلامەتی یا سەر ب زانکۆیا دهۆکێ ڤەبوویە.

**بەرهەمێن چاپکری و نەچاپکری:**

1- **وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی ژ زمانێ ئینگلیزی بۆ زمانێ کوردی**

| ناڤێ پەرتووکێ | دەزگەهێ چاپکرنێ | سال |
|---|---|---|
| 1. بایۆلۆژیا گەردی و خانەیی | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2012 |
| 2. مایکرۆبایۆلۆژی | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2012 |
| 3. فرمانزانی و کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی | ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 4. بۆماوەزانی | ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 5. مشەخۆرزانیا پزیشکی | ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 6. ناڤرێژزانی | ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ | 2014 |

2- **وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی و چیرۆکان بێن زارۆکان:**

| ناڤێ پەرتووکێ | دەزگەهێ چاپکرنێ | سال |
|---|---|---|
| 7. گەڕیانەك بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤی | ---------- | ---------- |
| 8. بۆچی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن؟ | ---------- | ---------- |
| 9. سەیروسەمەرێن جیهانا گیانەوەران | ---------- | ---------- |
| 10. دیاریا سەرێ سالێ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 11. هیڤیا ماسیێ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 12. بۆچی بۆبی نەوێریت بفڕیت؟ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 13. ڕەوشتێ سلاڤێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 14. ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 15. ڕەوشتێ کرنا یاریان | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 16. ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 17. زەحمەت نەبیت | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |

3- **ئامادەكرن و وەرگێرانا پەرتووكێن گشتی:**

| ناڤێ پەرتووكێ | دەزگەهێ چاپكرنێ | سالا چاپكرنێ |
|---|---|---|
| 18. 100 كاریگەرترین كەسایەتی د دیرۆكێ دا و ل پێشیا وان محمد (س.خ) – د. مایكل هارڤ | ———— | ———— |
| 19. سێكس د چوارچۆڤەیەكێ ڕەوشەنبیری دا (زانستی) | جزیری | 2016 |
| 20. ڤێ بەڤێ بخۆ! (گەشەپێدانا مرۆڤی) – برایان ترێسی | نالبەند | 2016 |
| 21. ئەو مریشكا دڤیای بفرپت (ڕۆمان) – سون می هوانگ | كەسایەتی | 2016 |
| 22. ڕەجماندنا سوڕەیایێ (ڕۆمان) – فرەیدون ساحیبجەم | كەسایەتی | 2016 |
| 23. ڕۆژانێن گوهدرێژەكی (ڕۆمان) – دی سینگور | كەسایەتی | 2017 |
| 24. دەمژمێرا بەغدا (ڕۆمان) – شەهەد ئەلڕاوی | كەسایەتی | 2017 |
| 25. جیهانا سۆفیایێ (ڕۆمان) – یوستاین گاردەر | جزیری | 2017 |
| 26. هزار ڕۆژێن گەش (ڕۆمان) - خالد حوسێنی | كاسپین | 2018 |
| 27. حەز ژ ژیانێ بكە. (گشتی) – علا دیوب | نورسین | 2018 |
| 28. ڕەوشەنبیریا ساخلەمیێ - د. حەسان شەمسی | ———— | ———— |
| 29. بەزۆكێ فرۆكەیان (ڕۆمان) – خالد حوسێنی | ———— | ———— |
| 30. بنەماییێن فەلسەفێ – د. رجب بو دبوس | ———— | ———— |

| سال | نڤیسەر | بابەت | ناڤێ پەرتووکێ | # |
|---|---|---|---|---|
| 2018 | و. دیان جەمیل | ڕۆمان | هزار ڕۆژێن گەش | 1. |
| | | | | |